ناوی کتێب

پەرەسەندنی شوناسی نەتەوایەتی کوردو ئەگەرەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان

وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە:

پرۆفیسۆر.ی. دکتۆر یاسین سەردەشتی

دیزاینی بەرگو ناوەوە:

ئومێد محەمەد

تیراژ: ١٠٠٠ دانە – نرخ: دینار

ژمارەی سپاردن

ی ساڵی ٢٠١٤ی پێدراوە

سەرپەرشتیاری کتێبەکان

بەختیار سەعید

لەبڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان ٢٠١٤

ناونیشان: سلێمانی - کاسۆ مۆڵ - بەرامبەر مزگەوتی گەورە - نهۆمی چوارەم

سوودو سەرمایەی ئەم بڵاوکراوانە بۆ کەسوکاری شەهیدان و ئەنفال کراوانە.



لەسەر ئەرکی (د. تەها رەسوڵ) چاپکراوە

# پەرەسەندنی شوناسی نەتەوایەتی کوردو ئەگەرەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان

وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە:
پرۆفیسۆر.ی. دکتۆر یاسین سەردەشتی

ئەم بەرهەمە پێشکەشە بە:

- هاوسەری بەڕێزو دڵسوزم «سۆزان»
- هەر سێ کچی خۆشەویستم «ئارین‌و نارین‌و لەرین»

# نێوەرۆک

## تێبینی وەرگێڕ

خوێنەری ئازیز، ئەم کتێبە کە کۆڵینەوەیەکی بەنرخی کۆمەڵناسیی سیاسییە سەبارەت بە پەرەسەندنی شوناسی نەتەوایەتی کوردو هەڵوێستی سیاسیی هەرێمیو نێودەوڵەتی سەبارەت بە ئەزموونە خودحوکمڕانییەکەی هەرێمی کوردستان لەعێراقو مشتومڕکردن لەسەر هێزە نێوخۆییەکانی وەك چین، خێڵ، ئاینو زمان، تێزێکی دکتۆرایەو لەلایەن خانمە کۆڵەری ئەکادیمیستو پسپۆڕ "سۆفیا ئێزابێلا وانچ"وە لەبەشی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستو کۆڵینەوە ئیسلامییەکانی زانکۆی دورهام لەساڵی ٢٠٠٢دا پێشکەشکراوە. شایەنی باسە، خاتوو سۆفیا جگەلە توانای ئەکادیمیو کارکردنی وەك وانەبێژ لە زانکۆی دورهامو چەند زانکۆیەکی دیکە، کەسێکی چالاکە لەبواری هەڵسوڕان لە کاری پێشکەشکردنی راوێژو ئامادەکاری راپۆرت سەبارەت بە ناوچە کارەسات لێدراوەکانی جیهانو ئەزمونی زۆری لەو بوارەدا هەیە، لەساڵی ٢٠٠٤دا لەپاش کارەساتە گەورەکەی تسونامی، لەلایەن ئۆفیسی هەماهەنگی کاروباری مرۆیی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە رەوانەی ئەندەنوسیا کراوە بۆئەوەی هاوکاربێت لەبواری هەڵسەنگاندنی هەلومەرجەکە بۆ یارمەتی مرۆیی، هەروەها لەساڵی ٢٠٠٥دا، بەهەمان مەبەست نێردراوەتە سودان. لەپێش داگیرکردنی عێراقیش لەلایەن ئەمریکاوە لەساڵی ٢٠٠٣دا، هاتۆتە عێراقو چەند کۆڵینەوەیەکی مەیدانی ئەنجامداوەو لەماوەی سەرۆکایەتی سوید بۆ ئەنجومەنی یەکێتی ئەوروپی، لەسەفارەتی سوید لەتاران وەك راوێژکار کاری کردووە. هەروەها ئەندامی رێکخراوی (KMOP) یە کە رێکخراوێکی یۆنانی ئێن جی ئۆی مەدەنییە. سۆفیا وانچ جگە زمانەکانی یۆنانی، ئینگلیزی، ئەڵمانی، فرەنسی، فارسیو سویدی دەزانێت.

خوێنەری ئازیز، ناونیشانی بنەڕەتی ئەم تێزە دکتۆرایە لەبنەڕەتدا " Identity, nationalism and the state system : the case of Iraqi Kurdistan / شوناس، نەتەوایەتیو سیستمی دەوڵەت: کەیسەکەی کوردستانی عێراق"ە ، لەپێشەکییەكو چوار بەشو هەشت باس پێکهاتووە لەگەڵ لیستی سەرچاوەکان. شێوازی کۆڵینەوەو راڤەکردنو شرۆڤەکاری ئەم تێزە زۆر سەرنجڕاکێشە،

کۆڵەر بناغەیەکی پتەوی بۆ فۆرمەڵەکردنی سەرنجو ئەنجامگیرییەکانی داڕشتووە، هەر لەباسی یەکەمەوە کە لایەنی جیۆپۆلیتکیو سەرنجێکی گشتی لەمێژووی سیاسی کوردستانی عێراق پێشکەشدەکات تاکو دواتر بەنێو باسەکانی دیکەدا تێدەپەڕێت لەمەڕ دیاردە گرنگەکانی وەك نەتەوایەتیو دوڵەتو پاشتر شرۆڤەکاری سەبارەت بە دینامکییەتی هێزە نێوخۆییەکانی کۆمەڵگای کوردیی وەك :چین، خێڵ، ئاینو زمانو کاریگەرییان لەسەر واقیعی سیاسی دەکۆڵێتەوە، دواتر دێتە سەر باسی شوناسی نەتەوەیی کوردو کوردو سیستمی دەوڵەت، جگە لەئاماژەدان بە کاریگەرییو هەڵوێستی سیاسەتی هەرێمیو نێودەوڵەتی لەحاست هەرێمی کوردستان، پاشتر هەموو ئەمانە دەکاتە بنەما بۆ ئەنجامگیرییو تێڕوانینە ئایندەییەکانی سەبارەت بە ئەگەری دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان.

شێوەنووسینو زمانی ئەم کۆڵینەوەیە نەك هەر ئاسان نییە بەڵکو هێندێکیش ئاڵۆزە، کۆڵەر چەند بوارێکی زانستی جیاوو ئاڵۆزی پێکەوە کۆکردۆتەوەو هەوڵدەدات بەشێوەیەکی چڕو پڕ بیانکاتە بنەمای شرۆڤەکارییەکانی، هەرچەندە، هەوڵیداوە لەرێی پەراوێزەکانیەوە کەمێك تەمومژی نووسینەکەی برەوێنێتەوە، ئێمەش لەکاتی وەرگێڕاندا ئەگەر لەشوێنێك بەپێویستمان زانیبێت روونکردنەوەمان داوە. دواجار ئێمە وەرگێڕانی ئەم تێزە بەگرنگ دەزانین نەك هەر بۆ کتێبخانەی کوردییو خوێنەرانی کورد، بەڵکو هەروەها بۆ بەشە زانستییەکانی زانکۆکانی کوردستانیش.

## پێزانین

کۆڵینەوەو نووسینی ئەم تێزی دکتۆرایە هەر لەبنەڕەتدا ئەرك وپابەندییەکی خودیی بوو، بەڵام مرۆ هیچ کات نەیدەتوانی بەبێ هاوکاریی و بەشدارییەکی گرنگی کەسانێکی بەهادار و بەبایەخ سەرکەوتووانە تەواوی بکات. هەربۆیە بەشداریی ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەی کە بەشێوەگەلی ماقووڵ لەماوەی کاری مەیدانییەکەمدا هاوکاریی و پشتگیرییان کردووم بەرز دەنرخێنم.
من بەشێوەیەکی تایبەت خۆم بە قەرزارباری پرۆفیسۆر ئانوش ئیحتیشامی دەزانم، ئەوەی کە وەك سەرپەرشتیارێك رۆڵی بینیو ئەم پرۆژەیەی بە رەخنە بونیادی و پێشنیازە وردو کۆمێنتە هاندەرەکانیو هەروەها بەئارامییەوە گرتەئەستۆ. هەوڵەکانی بەڕێزیان لەکۆتایی کۆڵینەوەکە بەشێوەیەك بایەخداربوون، کاتێك فۆکوسی تێفکرین بەچەشنێك ماندوو بوو کەپێویستی بە تیژکردنەوەی بەردەوامبوو.
هەروەها سوپاسێکی خێزانەکەشم قەرزارم کە دەبوو مل بەو داواکارییانە بدەن کە بەهۆی کۆڵینەوەکەوە سەپێنرابوو. ئەم تێزە پێشکەشە بە دایبابم کەهەر لە سەرەتای قۆناغەکانی خوێندنی زانکۆییمەوە هەمیشە پشتگیریی و هاندەری بەردەوامم بوون. نیکۆلاس پۆلیتس بەشدارییەکی جدیی لە دوا قۆناغە گرنگەکانی ئەم تێزەدا کردووە، ئەوەی تواناو لێوەشاوەیی خۆی لەرووی زمانیی و رێکخستنی زاراوەکانەوە سەلماند، بەڵام لەسەروو هەموو شتێکەوە، پاڵپشتی دۆستانەو بەرزکردنەوەی ورەم بەبەردەوامی هۆکارێکی سوودبەخش بوو لە نزیککردنەوەی ئەم پرۆژەیە لەسەرکەوتن .
لەوەش زیاتر، فرە قەرزاری هاشم ئەحمەدزادەم،هاوڕێ و کاندیدی دکتۆرا لە زانکۆی ئۆپسالا لە سوید، کە ئەرکی خوێندنەوەیەکی رەخنەیی رەشنووسی تێزەکەی گرتەئەستۆ، لەکاتێکدا بەشێکی ئە ئەرکە لەژێر فشاری کەمیی کاتدا بوو، زانیارییەکانی بایەخێکی زۆریان بەخشی بە چۆنایەتیی دوانووسینی بەرهەمەکە،

پێشنیازە رۆشنکەرو کۆمێنتە پڕ زانیارییەکانی تێکڕا کاری خۆیان کرد.

دواجار، لەڕووی پشتگیریی داراییەوە خۆم بە قەرزارباری ئەم لایەنانەی خوارەوە دەزانم: ئەکادیمیای پاشایەتیی سودی بۆ زانستەکان، سەندوقی هاوکاریی ئۆلف پاڵمە بۆ لێکتێگەیشتنی نێودەوڵەتیی، سندوقی هاوکاریی جۆنس نۆردێنسۆن لەزانکۆی ئۆپسالا، دەزگای بریتانی بۆ بەرەوپێشبردنی ژنانو بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگە، زانکۆی دورهام.

## پێشەکی

لەپاشماوە ئاڵۆزەکانی جەنگی کوەیت لەسەرەتای ١٩٩٠کاندا، دامەزراندنی قەوارەیەکی ئۆتۆنۆمی کوردیی بوو لەباکووری عێراق لەرێی هەوڵی کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە. دینامیکییەتە نێوخۆیی‌و دەرەکییەکانی ئەم ناوچە خودحوکمڕانەو پەرەسەندنە سیاسییەکەی دڵی ئەم کۆڵینەوەیە پێکدەهێنێت، ئەوەی پرسێکی ناوەندییە لەسەر شانۆی سیاسیی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە کەمی لەبارەوە نووسراوە. کارلێکردنی ئەو دینامیکییەتە نێوخۆیی‌و دەرەکییانەی دەبنەهۆی شەقڵگرتنی پەرەسەندنەکان لەکوردستانی عێراقدا لە بواری تێگەیشتنی تەمومژو ئاڵۆزییەکانی سیاسەتی کوردییدا ئامرازێکی بنەڕەتییە. ئەم تێزە ئەوە پێشاندەدات کە هێزە نێوخۆییەکان زۆرجار سەنگێکی یەکسانو، تەنانەت هێندێك کاتیش مەزنتریان، لەکاریگەرییە دەرەکییەکان هەیە کاتێك کە مەسەلەکە پەیوەندیی بە پەرەسەندی سیاسیی لە باکووری عێراقدا هەیە.

شێوازی تێفکرینێك کە ئەم کۆڵینەوەیە ئاراستە دەکات ئەوە دەردەخات، کە پەرەسەندنی سیاسیی لەباکووری عێراق دەرئەنجامی کۆمەڵێك پرسی جیاوازە، هەروەك چین، خێڵگەرایی، ئاینو هەروەها زمان کە هەموویان بەسیاسییکراون. ئامانجی سەرەکیی ئەم کۆڵینەوەیە بریتییە لە بەدواداچوونو لێکۆڵینەوە لەوەی بۆچی دەوڵەتسازیی کوردیی ( بە فۆکوس کردن لەسەر کوردستانی عێراق ) لەوانەیە وەك مەسەلەیەکی لەبیرکراوو نائامادە بمێنێتەوە، ئەوەی کە گریمانەیەکی بنەڕەتییە. بۆ پەردەلادان لەسەر ئەم ئامانجە، دەبێت مرۆ تەماشای تێکڕای سیماو شێوازە جیاوازەکانی نەتەوایەتی، سیستمی نێونەتەوەیی دەوڵەتو هەروەها سروشتی نەتەوایەتی کوردیی بکات: شرۆڤەکارییەك کە تیشك بخاتە سەر باسلێکردنو هەڵسەنگاندنی کاریگەریی شوناسی کۆمەڵایەتیی-سیاسیی لەسەر پرۆسەی سیاسیی. ئەو فاکتەرە سەرەکییانەی رووخسارگەلی شوناسی کوردیی دیاریدەکەن بۆخۆیان لەلایەن هێزە دەرەکییەکانەوە کاریان تێدەکرێت، ئەوەی ئاکاریان بەشێوەیەکی مەزن بەهۆی بەرژەوەندییە جیۆپۆلیتیکییەکانەوە دیاریدەکرێن.

رێبازێکی بەم چەشنە پرسیارگەلی کۆڵینەوەیی دەگرێتەخۆ وەك ئەوەی: چ دەرفەتو مەودایەك هەیە ئەگەر یەکێك لە سیستمە نێودەوڵەتییە درێژخایەنەکانی دەوڵەت، دەوڵەتێکی کوردیی گریمانکراو لە لەگەڵ بونیادی خۆیدا بگونجێنێت؟ پەیوەندیی نێوان ململانێی چینایەتیی‌و بەرژەوەندیی نەتەوەیی لەکوردستانی عێراقدا چیەو ئەوەش چ پەیوەندییەکی بە بونیادی خێڵەکیی کۆمەڵگەی کوردییەوە هەیە؟ ئایا وەفاداریی‌و ئینتیمای خێڵەکیی بەهەستێکی نەتەوەیی یەکگرتوو شوێنی دەگیرێتەوە؟ ئایا ئاین هێزێکی تەیارکردنە لە سیاسەتی کوردیی لەعێراقدا؟ دیسکۆرسی سیاسیی لەناوچە خودحوکمڕانەکەدا چ کاریگەرییەکی لەسەر نەبوونی زمانێکی یەکگرتوو و ستاندارد هەیە؟ کاریگەریی فرە شوناسی کوردیی لەسەر سیاسەتی کوردیی لەعێراق چییە؟ هێزە نێوخۆییەکان چ رۆڵێك لەدیارییکردنی ئاکارو ئاراستە دەرەکییەکاندا دەبینن؟.

بەشی سەرەکیی هزری سیاسیی، هیچ تیۆرێك پێشکەش ناکات کە بوارێك بۆ تێگەیشتنی تەواوی کۆمەڵگەو سیاسەتی کوردیی فەراهەمبکات، ئەوەی کە پاڵ بەم تێزەوە دەنێت بەدوای پێویستیی رێبازێکی دووڕەگو فرەئاستدا بگەڕێت. ئەمەش لەرێگەی رووماڵێکی قووڵی کەیسی کوردستانی عێراقەوە روونەکرێتەوە، پێکەوەگرێدانی سیماکانی ئەنترۆپۆلۆجیای سیاسیی‌و کۆمەڵناسیی لەچێوەی پەیوەندییە سیاسییە نێودەوڵەتێکەیەوە. هەروەها رێبازێکی بەم چەشنە وادەکات خۆی لەسەر کاری چەندین کۆڵەرو زانای دەرکەوتوو بنیاتبنێت، ئایدیاکانی بۆ هزری کۆنکرێتی زیاتر پەرەپێبدات، هەروەها بیرۆکەو کۆنسێپتگەلێك پێکەوە ببەستێتەوە کە پێشتر پێکەوە کۆنەکراونەتەوە. چێوە شرۆڤەکارییەکەی کۆنسێپتگەلێکی جۆراوجۆرو ئاڵۆزی وەك نەتەوە، دەوڵەتی نەتەوەیی، شوناسی کۆمەڵایەتیی-سیاسیی دەگرێتەخۆ، لەنێو ئەوانەی دیکەشدا، لەگەڵ دیدێك بۆ پێشکەشکردنی تێگەیشتنی دینامیکییەتی نێوخۆیی کوردیی پێش ئەوەی بخرێتەسەر هاوکێشەی کاریگەریی فاکتەرە دەرەکییەکان. ئەنجامگیرییەکان سەبارەت بە ئەگەری سیناریۆ ئایندەییەکان لەسەر بنەمای رێحەزەکانی رابردوو و ئێستا وێنا

**کـراون، وێـڕای تێگەیشـتنی خـودی نووسـەر لەئاوێتـەکردنی کۆنسـێپتەکان لەمـەڕ شوناس، نەتەوایەتیو سیستمی دەوڵەت.**

**لەمیانــەی تێزەکــەدا، لێکدانــەوەی نــوێ بــۆ داتاکــانی بەردەســت کــراون لەرێگــەی سەرچاوەی نوێی زانیارییەکان، هەروەها سیماگەلێکی پەیوەندیدار بەچەندین دیـدی تیۆریی جۆراوجۆر لەبەرچـاوگیراوە. هـەروەك پێکهێنـەرێکی تێزەکـە، بـواری تیـۆری سـەرکیی، مشـتومڕ سـەبارەت بـە نەتەوایـەتیی کـاری چـەندین کۆڵـەری بەرچـاو پێکەوەگرێدەدات، بەڵام تیۆرگەلێکی کەم بەتەواویی لێرەدا گونجاون، هەروەك ئەوەی بابەتەکەی ئێستا لەچـەندین بـواردا مـل بـەملێ تێۆرەکـانی بەردەسـت دەکـات. ئـەوە تەنیا چەند تیۆرێکی جیاوازو پێکدژە پێدەچێت کە بنەمایەکی باش بۆ باسلێکردنو ناســاندنی تایبەتمەنــدی رەوشــە تایبەتەکــەی کوردســتانی عێــراق پێکبهێنێــت. تیۆرتاشییەکی بەم چەشنە زەمینەی داتاشینی "تیۆری دوورەگ" لەمیانەی پرۆسەی کۆڵینەوەکەدا دەخولقێنێت.**

**هـەروەك پێشـتر پێشـاندرا، بابـەتی ئـەم تێـزە پێویسـتیی بـە کۆڵینـەوە لـەنێو بەشـە جیاوازەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە. وێڕای زانستە سیاسییە بەرچـاوەکان، ســـەرنج و تیـــۆری کۆمـــەڵناسو مێـــژووناسو ئەنترۆپۆلۆجیســـتەکان بەباشـــیی بەرجەسـتەکراون. هەرچـەندە گرنگـی هێنـدێك لەوانـە لەوانەیـە، ئـەم کۆڵینەوەیـە لەبەشــی زانســتە سیاســییەکاندا لەنگــەر دەگرێــتو دەبێــت لەســەربنەمای ئــەوە پرسیارەکانی وەڵامبدرێنەوە، بەڵام ئەوە پێچەوانەی رێبازە کلاسیکییانەیە کە تـەنیا لەچوارچێوەی لقێکی دیارییکراو و بەرتەسکدا قەتیسدەکرێت.**

**ئــەو سەرچـاوانەی سـوودیان لێبینــراوە جۆراوجـۆرو بـەرفراوانن: ئــەو ئەدەبیاتــە بەرفراوانــەی ئەمێســتا لەچــەندین بــواردا هــەن پشــتی پــێ بەســتراوە. جگــە لــە کتێبخانــەی نـاوداری بریتـانیی، بەدواداچـوونێکی تایبـەتو بـەرفراوان ئەنجامـدراوە، بەشـێوەیەکی سـەرەکیی لـە کتیبخانـەی کـوردیی لـە سـتۆکهۆڵم لەسـوید[1]، هـەروەها**

١ بایەخی کتێبخانەی کوردیی لەستۆکهۆڵم نابێت بەکەم بگیرێت. لەساڵانی ١٩٨٠کاندا سوید وەك یەك لەو وڵاتـە پێشەنگانە دەرکەوت کە ئەدەبیاتی نووسـراوی کـوردیی گرتۆتـەخۆ. بـوونی چـەند سـەد نووسـەرو بڵاوکـەرەوە

**پەیمانگای کۆڵینەوە سیاسیی‌و نێونەتەوەییەکان لەتاران، ئێران.**

**سەرچاوەی دووەم دیدارو چاوپێکەوتنەکانە، کە مێتۆدێکی زۆر گونجاوە بۆ ئەم جۆرە کۆڵینەوانە. ئەوەی کەسەبارەت بەوانەی لە پۆستی دەسەڵاتدان شێوەی چاوپێکەوتنی بونیادی فەرمیی وەرگرتووە، لەکاتێکدا رێبازی چاوپێکەوتنی ئەوانەی پلەوپایەیان خوارەوترە لەشێوەی گفتوگۆی نیوە بونیادیدا ئەنجامدراوە، زۆرجار ئەمە ئەو کەیسانەیە کە تێیدا سەلمێندراوە کە گوێگرتن گرنگییەکی زیاتری لە پرسیارکردن هەیە. چاوپێکەوتنەکان لەشوێن‌و وڵاتانی جۆراوجۆر ئەنجامدراوە، لەچوارچێوەی فەرمیی‌و نافەرمیشدا.**

**ئەو کاری مەیدانییەی لەسەر قۆناغەکان‌و سروشتی بابەتی لێکۆڵراو ئەنجامدراوە پێویستی بە رادەیەکی بەرچاوی نەرمونیانی هەبوو. بەهۆی قەیدو سنووردارییە سیاسییەکانەوە، شێوازێکی دیارییکراوو تایبەتی کاری مەیدانی ئەستەم بوو، دەبوو زۆر بەشێوەیەکی دپلۆماسی کۆڵینەوەکە کرابا بەجۆرێك نەبێتەهۆی خولقاندنی گرژیی‌و دژواری. لەوەش زیاتر، ئاشنابوون بە ژینگە سروشتییەکە کە چێوەی سیاسەتە کوردییەکانە، تێگەیشتنێکی باشتر سەبارەت بە هەرێمەکەو خەڵکەکەی لەسۆنگەی ئەو راستییەوە کە فێربوونی چۆنێتیی لێکدانەوەی داتایەکی دیارییکرا لە خودی کۆکردنەوەی داتاکان گرنگترە. لەڕاستییدا، تێبینییە شەخسییەکان پەردە لەسەر راستییگەلێك هەڵدەداتەوە کە زۆرجار دەتوانرێت بۆ لێکدانەوەی زانیارییە کۆکراوەکان سوودبەخشبێت. هەروەها برێکی زۆریش تێبینی سیاسیی ئەنجامدراون لەماوەی شەش مانگ لەتاراندا لە بەهاری ٢٠٠١دا لەکاتی کارکردن لە باڵیۆزخانەی سویدو لە فەزایەکی دپلۆماسی فرەنەتەوەییدا.**

**نووسەر دەتوانێت بەچەندین زمان زانیاریی دەستکەوێت‌و داتا کۆبکاتەوە.**

---

چالاکی کوردیی، وێڕای ژمارەیەك گۆڤاری کوردیی وادەکات ستۆکهوڵم ببێتە شارێکی ئەدەبیاتی نووسراوی کوردیی. ئەم کتێبخانە نەتەوەییە کوردییە لە پایزی ساڵی ١٩٩٧ لە پایتەختی سوید دامەزرا. ماتێریاڵەکانی ئەم کتێبخانەیە بە بەزمانە سەرەکییەکانی عەرەبیی، تورکیی، فارسیی‌و هەروەها ئینگلیزیی، فرەنسیی، ئەڵمانی، سویدیو روسییە، بەڵام لەوانەیە زۆر لە نووسراوە گرنگەکانی بە سۆرانیی‌و کۆمانجییە.

گرنگییەکی تایبەت بریتیە لە بەکارهێنانی زمانە هەرێمییەکان لە چاوپێکەوتنە نابونیادییەکانو وتووێژە راوێژکارییەکان. بایەخی پێویست بەو لاگرییە خۆلێلانەدراوانە دراوە کە لەدیدو بۆچوونی ئەوانەدا پێشکەشکراوە کە چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا کراوە. هەڵوێستەی ئاگایانە لەهەمبەر خولیاو ئاراستەی سیاسیی هێندێك لەسەرچاوەکان کراوە، تاوەکو هەر کاریگەرییەك لەسەر بێلایەنیی تێزەکە کەمبکرێتەوە. بەبارکردنی ئەم بەهایانە بۆ بابەتێکی وەك کێشەی کورد، هەوڵگەلێکی تایبەت دراوە لەپێناو بنیاتنانی پێودانگێکی هاوسەنگ بۆ وەرگرتنی سەرچاوەکان لە لایەنە جیاوازو جۆربەجۆرەکانەوە.

هەر لەسەرەتاوە کێشەیەکی تێرمینۆلۆجی تێبینیدەکرێت. لە زۆربەی ئەژماردنەکانی هەرێمە، کوردستانی ئۆتۆنۆمی عێراق زۆرجار بە "enclave/ گیرفان" ئاماژەی بۆ دەکرێت. ئەم زاراوەیە لەم تێزەدا بەکارنەهاتووە، لەراستییدا، گیرفان بە پارچە خاکێك دەوترێت کە هی دەوڵەتێك یان گەلێك بێت،و بە گیرفانی دیکەی ئەوانی دی دەورەدرابێتو جیاکرابێتەوە. کوردستانی عێراق ناوچەیەکی خودحوکمڕانە کە وەك قەڵەمڕەوێکی تاڕادەیەك بچووکی کوردو عێراق دانپیێدانراوە، بەڵام گەلێکی دیکە یان دەوڵەتێکی دیکە دەوری نەداوە. بەبەراورد لەگەڵ ناوچەی (ناگۆرنۆ-قەرەباغ)- کە ناوچەیەکە بەگەرمیی کێشەلەسەرەو بەتەواویی لەناوەوە خەڵکی ئەرمەنیی گرتۆتەخۆو بە ئازەربایجانیش دەورەدراوە- کە گیرفانێکی راستەقینە. شایەنی تێڕامانە، کە لەچێوەی باکووری عێراقی ئۆتۆنۆمدا، نەتەوە یەکگرتووەکان هەرگیز بە وشەی گیرفان ئاماژەی بۆ ناوچە کوردییەکانی بن دەسەڵاتی خۆی نەکردووە. وشەی گیرفان خاوەن مانایەکی ئاماژەییە کە کاریگەریی لەسەر سەروەریی عێراق هەیە، هەروەها لەکاتی هەڵایسانی جەنگی کوەیتدا، لەڕاستییدا پێشنیازێك سەبارەت بە ئەگەری دامەزراندنی گیرفانگەلێك لەسەر خاکی عێراق لەئارادا بوو، هەرچەندە، ئەو مشتومڕانە کاریگەرییەکی بەردەوامو کۆتاییان نەبوو.

لەوەش زیاتر، پێویستە ئاماژە بەوە بدرێت کە لەمیانەی ئەم تێزەدا جیاکارییەکی

گرنگ لەنێوان (گرفتی کوردیی)و (کێشەی کوردیی) دا کراوە. ئەوەکەی پێشوویان ئاماژەیەکە بۆ ئەو"تەحەدا نێوخۆ"یيەی کە جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد بۆ وڵاتە هەرێمییەکانی ناوچەکە بەرجەستەی دەکات، لەکاتێکدا ئەوەکەی دواییان ئاماژەیەکە بۆ سیماکانی جوڵانەوەی نەتەوەیی کوردیی لەسەر ئاستی دەوڵەتەکانی ناوچەکە.[2]

تێزەکە دابەشکراوە بۆ چوار بەش، لەبەشی (أ)دا چێوەی تێزەکە فەراهەمکراوە، ئنجا بەشی (ب) بەدوادا دێت کە شرۆڤەکاری نەتەوەو نەتەوایەتیو شوناسە. بەشی (ج) باس لەکوردستانی عێراق دەکات لە سیستمی دەوڵەتیی هەرێمییو نێودەوڵەتییدا، لەکاتێکدا دوابەش کە (د) ە ئەنجامگیرییو ئەگەرە ئایندەییەکان دەگرێتەخۆ.

هەروەك ئەوەی گرنگە کە لە رەوشی ئەورۆکەی هەرێمەکە بەئاگابین، هەڵەیەکی گەورەیە گەر کارێکی بەو چەشنە بێ لەبەرچاوگرتنی رابردوو ئەنجامبدەین. لەهەر بەدواداچوونێکی مێژوویی-سیاسیی دا پێویستە ئەو تێبینیە لەبەرچاوبگیرێت کە ناوەندی جوڵانەوەی نەتەوەیی کوردیی هەرگیز هەمیشەییو بەردەوام نەبووە، بەڵکو بەشێوەیەکی سەرەکیی لەنێوان وڵاتانی تورکیا، ئێرانو عێراقدا گۆڕاوەو رووی لەشوێنێك کردووە کە فەزا سیاسییەکە گونجاوتر بووەو رێگەی بەبرێکی زیاتری چالاکیی کوردخواهیی داوە. بەدوای دامەزراندنی کۆماری عێراق لەپاش کودەتاکەی ژێنراڵ قاسم لە ساڵی ١٩٥٨، خەباتی کوردایەتیی کە پێشتر لەئێراندا بەپشکوتنی کۆمارە تەمەن کورتەکەی مەهابادی ساڵی ١٩٤٦ ئۆقرەی گرتبوو، گەڕایەوە بۆ عێراق[3]. رووخاندنی پاشایەتیی هاشمیی چەندین کودەتای لە ١٩٦٠کاندا بەدواداهات و تاکو ساڵی ١٩٦٨ جێگیرییەکی دیارییکراوی سیاسیی نەهاتەدی، ئەویش لە کاتێکدا کە حیزبی بەعس جارێکی دیکە گەڕایەوە نێو بژاردەی دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتیی. لەسۆنگەی دەستپێکردنی ئەو پەیوەندییە ئاڵۆزو دژوارەوە، لەدوای هاتنی بەتاوی

2 Olson (1998a), p. 11.

٣ بۆ زیاتر :

Archie Roosevelt Jr. 'The Kurdish Republic of Mahabad' in The Middle East Journal, July 1947, Vol. 1, No. 3, pp. 247-260 and Willim Eagleton (1963), The Kurdish Republic of 1946, London: Oxford University Press.

بەعسییەکان بۆسەر تەختی دەسەڵات مێژووی کوردستانی عێراق دەستپێدەکات، پاش ئەوەی پێشینەی مێژوویی پەیوەندیی گرفتئامێزی بەردەوامی نێوان بەغداو کوردستانی عێراق بەکورتی باسیلێکراوە. لەبەدواداچوونی پەرەسەندنی پەیوەندییەکانی بەعس وکورد هەتاوەکو ساڵانی ۱۹۹۰کان، و هەروەها پەرەسەندنی تاکو رۆژگاری ئەمڕۆ، ئەوەی وەك کۆنتێکستێك لەپێناو شرۆڤەکارییەکانی دواتردا دانراوە.

ئامانجی باسی دووەم ئەوەیە لەسروشتی چەمکەکانی نەتەوەو دەوڵەتو ئەو ئایدیۆلۆجییە بکۆڵێتەوە کە لەپشتیانەوەن، نەتەوایەتیی کە بەخۆی بابەتێکی گەورەو ئاڵۆزە، ئەوەندە قوڵایی وەرگیراوە کە پەیوەندییەکی روونو ئاشکرای بە بابەتی کۆڵینەوەکەوە هەیە. دیاردەیەکی (سیاسیی) ئاڵۆزی وەك نەتەوەو نەتەوایەتیی سەرنجی بەشێکی بەرفراوانی کۆڵەرانو بیرمەندانی بۆخۆی راکێشاوە، لێکدانەوەکانی دیاردەکەش لەو دابەشبوونەوە سەرچاوە دەگرێت کە سەبارەت بە کۆمەڵگاو بونیادە کۆمەڵایەتییە-دەروونییەکان لەئارادان. مشتومڕ لەوبارەیەوە دەکرێت کە نەتەوە ئاماژەیەکە بۆ کۆمەڵە خەڵکێك لەهەمان ریشەو تۆرەمە کە بەشداریی لە مێژوو و کەلتورێکی هاوبەشدا دەکەنو هەروەها زۆرجاریش بەهەمان زمان قسان دەکەن. ئەویش پێکەوە لەگەڵ دەوڵەتدا دەبەسترێتەوە- کە باڵاترین دەسەڵاتی سیاسیی سەرەکییە لەنێو قەڵەمڕەوێکی دیارییکراودا- لەرێگەی ئایدیۆلۆجیای نەتەوایەتییەوە، ئەو تیۆرەی کە گریمانەی ئەوە دەکات کە دانیشتووانی نێو دەوڵەت- نەتەوە هەموویان سەر بەهەمان نەتەوەن. راشکاوانە هەروەك دەردەکەوێت، ئەم بیرۆکانە زۆر لەوە دوورن کە سادەو روون بن. ئەم دیاردە سیاسییەو پێکهاتەکان هەڵدەسەنگێنرێنو هەروەها چەمکە سەرەکییەکان دەگشتێنرێتو دواتر تیۆرگەلێکی تایبەت بەکاردەهێنرێن بۆ شرۆڤەکردنو لێکدانەوەی کەیسی نەتەوایەتیی کوردیی.

ژمارەیەکی زۆر لەو تیۆرانەی سەبارەت بە بابەتەکە لەبەردەستدان لەسەر بنەمای ئەزمونە ئەوروپییەکان چەسپاون: لەنێو ئەو ئایدیایانەدا باس لەوەیان دەکرێت کە

بەباتەکـەوە پەیوەندیـدارە، و ئەگـەر لەراسـتییدا هێنرابێتـەئارا بۆئـەوەی بـەباڵای کەیسـی کوردییـدا ببڕێـت. شـایەنی باسـە، ئـەوە ئەوروپییـەکان بـوون کـە ڕۆڵـی پێشـەنگیان لـە سیسـتمی نێونەتـەوەیی دەوڵەتـدا بینیـوە، ئـەوەی چـێوەیەکی کـارای هــەموو دەوڵەتــە هاوچــەرخەکانە (هــەروەها ئەوانــەی لەداهاتووشــدا ئەگــەری دروستبوونیان هەیە). ئەوەش لێرەدا مشتومڕی لەبارەوە کراوە ئەوەیە کە بۆئـەوەی هەوڵی شـرۆڤەکاریی شـێوەو فـۆرمی ئاینـدەیی سیسـتمی دەوڵـەت بکـەین ( هـەروەها ئەگەری شوێنی دەوڵەتی کوردیی لەنێویدا )، پێویسـتە بـاس لـە پێشـینەی مێـژوویی ئەو سیستمە بکرێت.

مشتومڕەکە لەسەر ئەو گریمانەیە راوەستاوە کە نەتەوەی هاوچـەرخی کـورد لەسـەر پەیوەندییەکانی پێش-ئیتنیی پشکوتووە ( جەختکردنەوە لێی کە دەشـێت خزمـەتی بە زێدەکردنی هـۆگریی میللیـی بـۆ ئایـدیۆلۆجی نەتـەوەیی کردبێـت ). ئـەوە زیـاتر بــەهۆی نکــۆڵیکردنی تونــدی نەتەوەکەیانــەوە بــوو لەلایــەن دەوڵــەتو نەتــەوە سەردەستەکانی دەوروبـەروە، کـە سیاسـەتکاران و ڕۆشـنبیرانی نەتـەوەیی کـورد، وردە وردە درکیـان بـە پێویسـتیی تێـوەگلان لـە خـەبات بـۆ " nation-bulding / نەتەوەسـازیی[٤] یـان " nation-strengthening / بـەهێزکردنی نەتـەوەیی" کرد. بەتێڕوانین لەمێژووی گشتیی کوردان، پێدەچێت ئـەرکی پێشخسـتنی نەتـەوەو ئەگەری هێنانەئارای دەوڵەتی ئایندەیی زیاتر لە بەشەکانی دیکەی جیهـان ئەسـتەمو ئاڵۆزتر بێت. بۆنموونە، هەوڵو خەباتی نەتەوەسازیی لەعێراق هاوکات پێویستی بـە "nation-destroying / نەتەوەشــکێنیی" کــوردان هــەبوو.[٥] هەرچــەندە، لەدیدێکی جیاوازەوە، کوردان لـەڕووی نەتەوەسـازییەوە لەگـەڵ بـارگرانیو گرفتێکـی ناوەنـدیی رووبـەڕوو نـەبوون هـەروەك ئـەوەی کـە زۆر لـە بـژاردەی دەوڵـەتان لـە ئـەفریقاو ئاسـیادا تووشـی بـوون، بەتایبـەت لـەڕووی نـەبوونو لاوازیـی مێـژووو

---

٤ ئەم زاراوەیە ئاماژەیەکە بۆ پشکووتنی هەستکردن بە سۆزی نەتەوەیی هاوبەش، وەفاداریی بۆ نیشتیمان، لەبەرامبەردا دەوڵەتسازیی ئاماژەیە بۆ بنیاتنانی دامەزراوە سیاسییەکان.

٥چەمکی نەتەوەشکێنیی وەرگیراوە لە: .Walker Connor (1972)

کەلتووری هاوبەش. بێگومان، ئەزموونگەلێکی مێژوویی هاوپشك کە لە یادگەی دەستەجەمعیدا شوێنیان گرتووە، لەگەڵ بوونی ناوکێکی ئیتنیی، توانیوێتی لەڕووی تیۆرییەوە پرۆسەیەکی نەتەوەسازیی هێور فەراهەم بکات، هەرچەندە، بەکردار سەلماوە کە نەهاتۆتەدی.

باسی سێیەم لە هۆکارە نێوخۆییەکانو دەرکەوتە دەرەکییەکانی دەکۆڵێتەوە.ئاین، زمان، خێڵو هەروەها چین پرۆسەگەلێکی دینامیکی ئاڵۆزی پەیوەندییە نێوخۆییەکانن، نابێت وا لەقەڵەمبدرێت کە پەیوەندییەکیان بە نەتەوایەتییەوە نییە، بەڵکو تەواو بەپێچەوانەوە. هەرچەندە، پێویستە مرۆ ئاماژەبدات بەجیاوازییەکانی نێوان لەقەڵەمدانیان وەك بەشێکی بنەڕەتیی لە نەتەوایەتیو دیاریکردنی رەگەزەکانی لەم فاکتەرە کۆمەڵایەتییانەدا، کە تێیدا دیاردەی نەتەوایەتیی رۆڵێکی گەورە دەگێڕێت. هەریەك لەم پرسانە سیمای گرنگی شوناسی کۆمەڵایەتی-سیاسی کوردیی پێکدێننو ناتوانرێت لەیەکدی جیابکرێنەوە، ئەوانە تێکڕایان لەڕووی تیۆرییو هەروەها سیاسییەوە سەروکاریان پێکەوەیە. هەستکردنێك هەیە بە بوونی پەیوەستییەکی هاوبەش لەنێوان بەشەکاندا. تیۆرێکی تایبەت سەبارەت بە لێکدانەوەی گونجاوی پەرەسەندنی هاوچەرخی کوردیی لەبواری چین، زمان، خێڵو پەیوەندییە ئاینییەکان نییەو پێویستە تیۆرەکانی بەردەست کۆبکرێنەوەو بەرفراوانبکرێن بۆئەوەی زەمینەی لێکدانەوەیەکی بەو چەشنە فەراهەمبکرێت. بۆ نموونە، زۆرجار سۆزی زمانییو ئیتنییو ئاینیی لەگەڵ شوناسی خێڵەکیی لەناوچە گوندنشینەکاندا هاوجووت دەبێت، هەروەك کاریگەریی مینتەلێتەی خێڵو پتەویی رەگەزە ئتنییەکان.

بەدرێژایی مێژووی کورد، خەباتی نەتەوایەتیی لەهەر ململانێیەکی چینایەتیی لەپێشتربووە. هیچ بەڵگەیەکی روون نییە کە ململانێیەکی چینایەتیی بەو چەشنە سیمایەکی دەرکەوتەی کۆمەڵگای کوردیی بووبێت، بەڵام مرۆ دەبێت چاوەڕوانی ئەوە بکات کە گۆڕانی بەرچاوی سالانی ١٩٩٠کان لەشانۆی سیاسییدا دەشێت کاریگەریی بکاتە سەر پێکهاتەی توێژاڵکی کۆمەڵایەتیی کۆمەڵگا کە ئەگەری ئەوەی

هەیـە زەمینـە بـۆ پشـكووتنو یەكخسـتنی گروپـە كۆمەڵایەتییـەكان بـەرەو چـینی كۆمەڵایەتیی خۆشبكات.
كاتێك باس لە دینامیكییەتی سیاسیەتی كوردیی لەساڵانی ١٩٩٠كانو پاشـتر دەكرێـت، هەڵەیە رەگەزی خێڵگەرایی لێدەربهاوێژرێت، بـەڵام هاوشـانی ئـەوەش پێویسـتە ئـەو هەڵەیە نەكرێت كـە ئۆبـاڵی قەیرانـە هەرێمییـەكانو نـاجێگیریی بخرێتـە ئەسـتۆیو خولیا خێڵەكییەكانیان. لەكۆتایی سەدەی بیسـتەمدا وەرچـەرخان بەسـەر كۆمـەڵگای كوردییدا هاتووە، خێرایی ئەم وەرچەرخانە بە هەڵمەتی بەناوبانگی ئەنفال زێـدەتر بووە، هەروەها بەكرداریش پـاش رووداوەكـانی ١٩٩١، ئاشـكرایە كـە گـۆڕانێكی گـرنگ روویدا. هێشتا كۆمەڵگای كوردیی لەچـەندین رووەوە هـەر كۆمەڵگایـەكی خێڵەكییـە، بەڵام رەگەزیی خێڵگەرایی لەسیاسەتی كوردییدا دوراییەكی نوێی گرتۆتەخۆ، ئەوەی ئەمڕۆكـە بـە " new tribalism / خێڵگـەرایی نـوێ " ناودەبرێـت، یـاخود خێڵگـەرایی لەبـەرگێكی نوێـدا. ئەمـەش مانـای ئەوەیـە كـە هێشـتا مێنتەڵێتـەی خێڵگەرایی نەریتی فەرمانڕەوایە، بـەڵام نـەك لـە هەسـتێكی جیـۆگرافی بەرتەسكدا. ناوچـەگەرێتیی چیدی تـەنیا پێگـەی خێڵگـەرایی نییـە، بـەڵكو دیاردەكـە گەیشـتۆتە ناوچـەگەلێك كـە لەزێـدی نـەریتی خێڵـەكیی دوورن. ئـەوەی كـە مۆدێرنیزاسـیۆن زەمینەی بۆ كۆمەڵگا خۆشكردووە كە پیاوانی خێڵەكیی روو لە شارو قەزا گـەورەكان بكەن بێئەوەی پەیوەندیی خۆیان بـە سـەرۆكە خێڵەكییـە نەریتییەكانیانـەوە بـبڕن. ئـەو گۆڕانكارییانـەی پشـكووتنی خێڵگـەرایی نـوێ هێناوێتیـەئارا سروشـتی مرۆیـیو ژینگەیی هەیەو پەیوەست نییە بە دابەشبوونی جیۆگرافی خێڵەكییەوە.
لـەماوەی دەیـەی رابـردووی حـوكمڕانی ئۆتۆنـۆمی كـوردیی لـە بـاكووری عێـراق، پێناچـێت ئـاین وەك سەرچـاوەیەكی ناتـەبایی مـەزنی دووبـەرەكیی زۆر ئاشـكرای شانۆی كۆمەڵایەتیی-سیاسیی كوردیی بووبێت. لەم سۆنگەیەشەوە، وادەردەكەوێت كە رەوا بێت لەوە بكۆڵینەوە كە داخۆ هیچ یەك لەو جوڵانـەوە رادیكاڵە ئیسلامییانەی كە لەزۆربەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست سـەریانهەڵداوە ئامادەییـەكی چەسـپاویان لـە بـاكووری عێراقـدا هەیـە. هەرچـەندە، بۆئـەوەی ئەمـە بكرێـت، بەسـوودە

لێکۆڵینەوەیەك لە سروشتی ئاینگەرایی کوردیی بکرێتو هەروەها ئەوەی کە چۆن پەرەسەندنی "ئیسلامی کوردیی" کاریگەریی بەسەر سیاسەتەکەیەوە هەیە

لەکۆتایی باسی سێیەمدا، کە لە سیماکانی زمانیی سیاسەتی کوردیی کۆڵراوەتەوە، تیشك خراوەتە سەر سیماکانی کۆمەڵایەتیی-سیاسیی زمان. ئەوەش پەیوەستە بەو بابەتانەی کە دەکەونە دەرەوەی بواری زمانەوانی، بەوەش جیاوازییەکی پەیوەستی هێمایی لەنێو زماندا کراوە، بەو مانایەی کە ئاماژە بەزمان نەکراوە وەك ئامرازێکی پەیوەندیی، بەڵکو زیاتر وەك ئاماژەو هێمایەکی گروپگەرایی، وەك خاڵێکی کۆبوونەوەو لێکئالآن.[6] لەو بیرۆکەیە کۆڵراوەتەوە کە بانگەشە سیاسییەکانی کورد لەسەر بناغەی زمان راوەستاوە. لەوڵاتانی پیشەسازیی، پێشکەوتن لە بواری تەکنەلۆژیاو کۆمیۆنیکاسیۆندا ئاسانکاریی بۆ یەکخستنی زمانییو یەکڕەنگیی کەلتووریی کردووە.[7] وێڕای ئەو پەرەسەندنانەی هێشتا کوردستان وەردەچەرخێنن، لاوازیی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیی بایەخدار لەزۆربەی ناوچە زیندووەکانی کۆمەڵگای کوردیدا پێدەچێت یەك لەو هۆکارانە بێت کە بۆچی کوردان هێشتا لەرووی زمانییو کەلتوورییەوە دابەش ماونەتەوە.

ئەو گریمانەی کە نەتەوەبوون لەسەر جیاوازیی نێوان نەتەوەکان رادەوەستێت، ئەو پرسیارە دێنێتەپێش، کە چ جیاکەرەو تایبەتمەندیەك وادەکات کەسێك وەك کورد بناسێنرێتو لە ناکوردێك جیابکرێتەوە. بەدەربڕینێکی دیکە، چ شتێك وا لەکەسێك دەکات کورد بێت؟ باسی سێیەم کە ئاماژە بە پێکهاتەکانی شوناسی کۆمەڵایەتی-سیاسیی کوردیی دەکات، زەمینەی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش فەراهەمدەکات. هەوڵەکانی باسی چوارەم بۆ بەستنەوەی هەموو ئەوانەیە پێکەوە بۆئەوەی پێشانبدرێت کە چۆن ئەوانە شوناسی لاوەکیی بەرهەمدێنن کە تێکڕا دەتوانن ئەوە پێکبێنن کە دەتوانرێت بە شوناسی نەتەوەیی کورد ناوببرێت. بنیاتنانی شوناس پرۆسەیەکی بەردەوامی ئاڵۆزەو خۆی لەخۆیدا لەخۆگرتنو پەنابردنە بۆ

6 Edwards (1985), p. 17.
7 Linklater (1998), p. 145.

شوناسگەلێکی جۆراوجۆرو هیندێك جار پێکدژیش. هەموو ئەو پێکهاتانە لەباسی سێیەمدا باسیان لێوەدەکرێت. بەمانایەکی دی، چین، زمان، ئاین‌و هەروەها خێڵ تێکڕا هەر یەکەو بەگوێرەی مافو قەبارەی خۆی بە پایەیەك دەدرێتە قەڵەم کە شوناسی نەتەوەییان لەدەور کۆدەبێتەوە، هەریەك لەوانەش تایبەتمەندییەکی جیاکەرەوە پێکدێنن کە شوناسی نەتەوەیی کوردیی لەسەر شکۆفە دەکات.هەروەها ئەوانە بناغەی جیاواز بۆ پێکهێنانی هەر شوناسێك فەراهەمدەکەن. دواتریش درککردنی بەرژەوەندیی گشتیە لەڕووی هۆشی چینایەتی‌و وابەستەیی خێڵەکیی‌و ئاگاهیی ئاینی‌و جیاوازیی زمانیی-زاراوەییەوە. هزری ئەوەی کە کەسێك چالاکانە درك بە خولیاو ئینتیما جۆراوجۆرەکانی بکات بە پشکووتن‌و پەرەسەندنی شوناسی نەتەوەییەوە بەستراوەتەوە، ئەم سۆزو ئیحساساتە پشت بەیەکتر دەبەستن‌و پێکەوە گەشەدەکەن‌و دەچەسپێن.

باسی پێنجەم هەوڵی روونکردنەوەی مشتومڕە سەرەکییەکان لەبارەی ئایندەی دەوڵەتی نەتەوەیی‌و هەوڵی هەڵسەنگاندنی کێشەی کورد دەدات لەبەر تیشکی تیۆرەکانی پێشوو، ئەوەش بەرەو باسی ئەنجامگیریی‌و هەڵسەنگاندنمان دەبات کەداخۆ کوردستانێکی سەربەخۆ دەتوانێت لەرووی تیۆریی‌و کردارییەوە قەوارەیەکی پایەدار بێت.

پرەنسیپی مافی خۆدیارییکردنی چارەنووس دەکرێتە خاڵی دەستپێکی ئەم مشتومڕەو ئنجا کۆڵینەوەیەکی گونجاوو تاڕادەیەك کورت‌و پوختی سەبارەت بە سیستمی دەوڵەت‌و بنەماو پەرەسەندنی بەدوادادێت، ئەوەی چێوەیەکی وێناکراوو گریمانەیی سەبارەت بە خاڵە ناوەندییەکانی شرۆڤەکاریی فەراهەمدەکات کە مشتومڕێکە سەبارەت بە ئایندەی دەوڵەتی نەتەوەیی. ئەمانە پێشانیدەدەن داخۆ سەدەی بیست‌و یەکەم کەمبوونەو دابەزنێکی گشتیی سەبارەت بە دەوڵەتی نەتەوەیی بەخۆوە دەبینێت یان ئەم نۆرمە پێگەی خۆی زیاتر وەك دوابالاترین شێوازی رێکخراوی سیاسیی دەچەسپێنێت. سەرەتا لەسەر ئاستی گشتی، مشتومڕ لەبارەی ئەم دوو قوتابخانە جیاوازەی فیکرو بیرکردنەوەیە دەکرێت لەپەیوەندییان

بەکێشەی کوردەوە، هەروەها هەوڵ دەدرێت شرۆڤەی ئـەوە بکرێـت کـە چ شـێوازێکی ئـەم پرۆسـانە لەئاینـدەی کوردسـتانو ئەگـەری سـەروەریی سیاسـیی کوردییـدا دێتەکایەوە.

زۆرجاران، ئەفراندنی وڵاتێکی نـوێ، دەوڵـەتێکی سـەربەخۆ کـە تێیـدا " -nation as-people / گەل وەك نەتەوە " مەکەی بتوانێـت پێشکەوێت[٨]، هـەر ئەوەیـە کـە لایـەنگرانی مـافی خۆدیـاریکردنی چـارەنووس خولیـای دەکـەن. هەرچـەندە، ئەمـە لەنێوەندی هێندێك لەو بەڵگانەیە کـە نزیکـەی ئـەو١٩٠ دەوڵـەتـەی کـە هـەن تادێـت لاوازیان زێدە دەبێت.[٩] لەوانەیە مـرۆ ئـەنجامگیریی بکـات کـە ئێمـە لـەجیهانێکی بـێ سنووردا دەژین کە دەوڵەتـەکان بـۆ ئەکتـەرێکی لاوەکیـی بچـووك دەبنـەوە. جا مـرۆ پشتگیریی ئەنجامگیرییەکی لەم چەشنە بکات یان نا، ئەوە ئاشکرایە کە گۆڕانکارییـە سیاسییەکانی ئەم دواییە، بەتایبەت ئەوانەی کە بـەدوای کۆتاییهاتنی جـەنگی ساردا هـاتن، لەگـەڵ ئەوانـەدا تێکـەڵبوون کـە لەگـەڵ گەشەسـەندنی سـەربەخۆیی لەسـەر ئاسـتی جیهـانی پشـکووتبوون، لـە زۆربـەی نموونەکانـدا دەوڵەتەکـەو کۆمـەڵگای نێودەوڵەتی سەبارەت بە مـافی سـەروەریی دەوڵەتەکـەو دەسـەڵاتی ئەوەکـەی دواییـان رووبـەڕوو کردۆتـەوە.لەواقیعـدا، ئەمـە دەخوازێـت سـەرلەنوێ هەڵسـەنگاندنەوە بـۆ چەمکی دەوڵەتی نەتەوەیی بکرێت، بگـرە لەڕاسـتییدا بـۆ تـەواوی سیسـتمی دەوڵـەت وەك بنیاتێکی جیاکەرەوەی رژێمی نێونەتەوەیی ئێستا.

دەشـێت ژاکـانو سیسـبوونی سیسـتمی دەوڵـەتو پشـکووتنی جیهـانێکی بێسـنوور ئاکامێکی ئەرێیی بۆ نەتەوەی بێدەوڵەتی کورد هـەبێت، بـەڵام ئایا دەبێـت دەوڵـەتی نەتـەوەیی وەك گرانیـیو زێدەبارییـەك لەسـەر پێوانـە جیهانییەکە تەماشـابکرێت؟ پرۆسـەی گلۆبالێزەیشـن دەبێتـە هـۆی دارمـانی بونیـادی دەوڵـەت لـە بەشـە تـەواو پیشەسازییەکانی جیهاندا، بەڵام داخۆ ئەمە هەمان کاریگەریی لـەوڵاتانی رۆژهـەڵاتی

---

٨ زاراوەی پەیوەست بریتیە لە " nation-as-state " ئەم دوو چەمکە لە باسی دووەمدا ناسێنراون.

٩ ١٨٩ دەوڵەت وەك ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان دانیان پێدانراوە. بروانە"
(www.un.org/Overview/brief.html)

ناوەڕاست دەکات شتێکی کەمتر روونە. پێویستە دەوڵەت هەڵبوەشێتەوە، کوردان دەبێت خۆیان لە یەکەو قەوارەگەلێکدا رێکبخەن کە هاوشێوەی میرنشینە کوردییەکانی سەدەکانی شازدەو حەڤدەیە. دەرفەتو ئەگەرەکانی بەردەم دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی، چ بەشێوەی " microstate / دەوڵەتۆکە"یەکی قەتیسکراو سنووردار لە کوردستانی عێراقدا یان بەشێوەی "کوردستانی گەورە"- تەنانەت ئەگەری پشکووتنی چەند کۆمارێکی کوردیی لەسەدەی نوێدا، لەبەشی ئەنجامگیرییەکەدا لێکدراوەتەوە. هەرچەندە، پێدەچێت کە ئەلتەرناتیڤێکی بڕواپێکراوی زیاتر ئەوەبێت کە بونیادی ئێستای دەوڵەت لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست لەئایندەیەکی نزیکدا ئەگەری گۆڕانێکی قووڵی نییە. هەربۆیە دەبێت کوردان لەچێوەی سیستمی ئیستای دەوڵەت لەناوچەکەدا ملی رێگا بگرنەبەر. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە کەیسە کوردییەکە وەك کەیسێکی ماف خۆدیارییکردنی چارەنووس لەگەڵ یەکپارچەیی خاکی دەوڵەتدا پێکدادەدەن.

مۆزائیکێکی دوژمنایەتیی ئاڵۆز تایبەتمەندیی ناوچەکە پێکدەهێنێت، ئەوەش لە باسەکانی شەشەمو حەوتەمدا هەڵسەنگێنراوە کە لەدیدو دوراییەکی هەرێمییو نێودەوڵەتییەوە دەڕوانێتە کوردستانی عێراق. بەهای کۆڵینەوەکە لەوەدایە کە کەیسە پێکدژەکانی ململانێ نێوخۆییو نێودەوڵەتییەکان لێکدەداتەوە، بۆ ئەوەش دوورایییە هەرێمییو جیهانییەکان لەمەڕ ناوچە کوردییەکە وەك ناوچەیەکی خودحوکمڕانی باکووری عێراق وەرگیراوە. ئەو گۆڕانە قووڵەی بەسەر فەزای سیاسیی نێودەوڵەتییدا هاتووە لە سالانی ١٩٩٠کاندا وەرگیراوە، لە هەڵویستو وەلامی ولاتانی دراوسێو هێزە جیهانییەکان وەك یەك سەبارەت بە پەرەسەندنی رووداوەکانی کوردستانی عێراق دەکۆڵێتەوە، ئەو وەلامانەی کە بەشێوەیەکی بەرفراوان تایبەتمەند بوو بە هەولگەلێك بۆ بەدیهێنانی هاوسەنگیی لەنێوان بەرژەوەندییو دروشمەکان هەریەکە دژ بەوی تر.

کاتێك لە رۆڵی ولاتانی دراوسێ هەر لەساڵی ١٩٩١ەوە دەکۆڵرێتەوە، زیاترین تیشك خراوەتە سەر تێوەگلانی ئێران لەکوردستانی عێراق. یەکێك لەو هۆکارە گرنگو

بایەخدارانەی وایکردووە زیاتر قامك بخرێتە سەر ئاکاری کۆماری ئیسلامیی لەو راستییەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئێران وەك رۆلگێرێکی هەرێمیی، هیچ کات هەڵوێستو پەیوەندیی بەکوردانی عێراقەوە هەر لەدەورانی جەنگی ئێران-عێراقەوە بەدرێژیی لێی نەکۆڵراوەتەوە. سروشتییە کە مرۆ ناتوانێت ئێران بەتەنیا وەربگرێت، هەروەها دەبێت تورکیاو ولاتانی عەرەبیش لەبەرچاوبگیرێن. وێڕای ئەوەی کە تورکیاو هەڵسوڕانی بەو سەنگە گەورەیەی خۆی لەناوچەکە، لەچەندین رووەوە ئاماژەو لێکدانەوەی بۆ کراوە،[١٠] لەکاتێکدا سەبارەت بەئێران لەم چێوەیەدا زۆر کەم نووسراوە.

لەبەشی (د) دا، ئەنجامگیرییەکان جارێکی دیکە بابەتە سەرەکییەکانی تێزەکە دێننەوە کایە. ئەو بەلگەو ئارگومێنتە سەرەکییانەی کە لەتێزەکەدا پێشکەشکراون لەرێگەی شرۆڤەکاری ئەو پرسیارە سەرەکییانەی لەکۆڵینەوەکە هەڵهێنجیراون، پێشدەخرێنو تەواودەکرێن: بەتایبەت ئەوەی داخۆ نەتەوەیەك بۆئەوەی بژیو گەشەبکات پێویستی بە دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆیە. وێڕای ئەمەش، ئەنجامە تیۆرییەکانی ئەم کۆڵینەوەیە سەبارەت بە ئایندەی عێراق وەك دەوڵەت، هەڵسەنگێنراوە ( دیارە لەدیدگای کوردیی عێراقەوە )، مشتومڕ لەو بارەیەوە کراوە کەچۆن " پرنسیپە نەتەوەییەکان" لەگەڵ "پرنسیپەکانی دەوڵەت" دا لە مۆدێلێکی نوێبنیادی پاش سەدام دا گرێدەدرێن. دوا پێشنیاز کە ئەنجامگیریی کراوە ئەوەیە کە گونجاوترین شێواز بۆ بەدیهێنانی چارەسەرێکی هەمیشەیی بۆ گرفتی بەرچاوی عێراقو کوردانی دامەزراندنی فیدراسیۆنێکە لە کوردو عەرەب.

---

١٠ جگە لە شرۆڤەکاریی رووخسارە نێوخۆییەکانی کێشەی کورد لەتورکیا، کاری دادێ سەبارەت بە رۆڵی تورکیا لە باکووری عێراقە:

Kemal Kirisci and Gareth Winrow (1997), The Kurdish question and Turkey: an example of a trans-state ethnic conflict, London: Frank Cass; Michael Gunter (1997), The Kurds and the future of Turkey, Basingstoke: Macmillan; Henri Barkey and Graham Fuller (1998), Turkey's Kurdish Question, Lanham, Md: Rowman & Littlefield; Paul White (2000), Primitive rebels or revolutionary modernizers?: The Kurdish national movement in Turkey, London: Zed Books.

# باسی یەکەم: مێژووی سیاسیی کوردستانی عێراق

## ١:١ جیۆپۆلیتیك

جیۆپۆلتیك بەگشتی بریتیە لە موتالآکردنی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان لەچێوەی بابەتی جیۆگرافیای سیاسییەوە،[١] بەڵام هەروەها دەتوانرێت وەك لێکدانەوەی سیاسیی لەڕێگای دوورایبە جیۆگرافییەکانەوە بخرێتەبەرچاو.[٢] سیاسەت، یان زیاتر بڕیارە سیاسییە دیارییکراوەکان دەشێت کاریگەریی جیۆگرافیان لێبکەوێتەوە، بەپێچەوانەشەوە، جیۆگرافییا خولیای کارکردنە سەر سیاسەتی لە ڕەوشگەلێکی دیارییکراودا هەیە. بەمانایەکی تر، سیاسەتو جیۆگرافیا بواری سەربەخۆی خۆیان لەژیاندا هەیە کە کارلێکدەکەن.[٣] ئەوەش کە لەواقیعدا ڕەنگدەداتەوە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕاشکاوانە پێشانیدەدات، لەویێ بەتایبەت کە پێگەی جیۆگرافیای تاڕادەیەك سەختی کوردستان لە تێکۆشانی نەتەوەیی کورداندا بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی سەربەخۆ کەڵکێکی نەبووە.

### ١:١:١ کوردستان لەدیدگای جیۆپۆلیتیکەوە

لەڕاستییدا، پێگەی جیۆپۆلیتکی کوردستان فرە درکیپێکراوە وەك یەك لەو هۆکارە سەرەکییەکانەی بۆچی گەلی کورد تائیستا نەتەوەیەکی بێ دەوڵەتن. خاکی کوردان کە بایەخێکی ستراتیژیکی هەیە، بۆماوەی چەندین سەدە مەیدانی جەنگو ململانێی نێوان هێزە رکابەرە هەرێمییەکان بووە، هەروەها ململانێی

---

1 Painter (1995), p. 139.
2 b Tuathail (1996), p. 15.
3  Painter (1995), p. 20.

عوسمانییەکانو سەفەوییەکان لەناوچەکە لەماوەی سەدەی شازدەهەمو حەڤدەهەمدا تاکو ئەمڕۆ بەهەموو مەبەستو شێوەکانییەوە بەردەوامیی هەیە. لەگەڵ کاتدا ئەکتەرەکان بەشێوەی تورکو فارسو عەرەب دەرکەوتوون، بەڵام گرنگیی ژیانیی جیۆپۆلیتیکی کوردستان بەشێوەیەکی چەسپاو زێدەبووە.

ناوچەیەك نزیکەی بە قەبارەی فەرنسا ( بڕوانە نەخشەی ١. ١. ١ ) کەوتۆتە سنوورە شاخاوییەکانی باکوور لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، خاکی کوردستان نزیکەی ٢٠٠,٠٠٠ مایل چوارگۆشەیە.[٤] دەتوانرێت وەك "shatterbelt/ پشتێنبەند" لەقەڵەمبدرێت، ئەو دیاردەیەی کە بەگوێرەی دەربڕینی ساول کوهین : "هەرێمێکی گەورەی ستراتیژیکە لەلایەن چەند ولاتێکی رکابەرەوە داگیرکراوەو کەوتۆتە نێو گێژاوی بەرژەوەندی دژبەیەکی زلهێزەکانی دەوروبەرەوە."[٥]

پێدەچێت ئەو پشتێنبەندە بەهۆکاری جیاوازییە فیزیکیو ژینگەییو مێژووییو کەلتوورییو سیاسییەکانەوە نەتوانێت یەکێتی سیاسیو ئابووریی خۆی بێنێتەدی.[٦] تایبەتمەندییەکانی ئەم پشتێنبەندەی کوردستان بێجیاوازیی هانی وڵاتە دراوسێکانی داوە کە وەك " buffer zone / ناوچەی جیاکەرەوە" بەکاریبێننو هەروەها فراوانی خاکەکەیو بوونی بڕێکی گەورەی سامانی سروشتی دەرنەهێنراو وایکردووە هەمیشە وەك یەك جێی بایەخی سیاسەتوانانی هەرێمیو نێونەتەوەیی بێت.[٧]

لەقۆناغی هاوچەرخدا، کوردستان لەلایەن پێنج دەوڵەتەوە حوکمکراوە کە سیانیان لەپاش یەکەمین جەنگی جیهانییەوە پەیدابوون، ئەوانیش تورکیاو عێراقو سوریان. بەشی باکووری نیشتیمانی کورد سوچی باشووری رۆژهەڵاتی کۆماری تورکیای ئەمرۆ پێکدەهێنێت، لەکاتێکدا دووەمین گەورەترین بەشی لەگەڵ سنوورەکانی ئێراندا

---

4 Izady (1992), p. 1.
5 Cohen (1963), P. 83.
6 Ibid. p. 85.
7 See Maria O'Shea (ed.) (1992), Kurdistan: Political and Economic Potential, SOAS:
Geopolitics Research Centre.

کۆتاییان دێت. بەشێکی بەرچاوی خاکی کوردیش کە ویلایەتی موسڵە راستەوخۆ خرایە ژێر چاودێریی ماندێتی بریتانیی لەعێراقو سوریای دراوسێ، ماندێتی فرەنساش رێژەیەکی کەمی خاکی کوردستانی بەرکەوت، هەروەك ئەرمینیا (یاخود یەکێتی سۆڤێتی پێشوو ). ئەم دابەشبوونە جیۆگرافییە زەمینەی دەرکەوتنی رەنگدانەوەی بەرژەوەندییەکان خۆشدەکات بەوەی کۆمەڵی کوردان وەك گروپێکی ئیتنیی-نەتەوەیی لەراستییدا بەشێکە لە گەورەترین هاوپەیمانییو پێکهاتەی جیۆپۆلیتکی لەسەر شانۆی سیاسیی نێونەتەوەیی، بەدیارییکراوی: ناتۆ (تورکیا)، تاوەکو سەرەتای سالآنی ١٩٩٠کانیش بلۆکی سۆڤێتیی (ئەرمینیا)، میحوەری ئاسیایی ئەوروپای ناوەندیی (ئێران)، هەروەها جیهانی عەرەبیی (سوریاو عێراق).[٨]




---

8 Izady (1992), p.201.

نەخشەی ١. ١. ١ : قەبارەی بەراوردکاری ئەوروپای رۆژئاوا، رۆژهەڵاتی وڵاتە یەکگرتووەکانو کوردستانی یەکپارچە. [٩]

لەکاتێکدا رۆڵی کوردان لەسەدەی بیستەمدا هەڵدەسەنگێنین، تێگەیشتنی سیاسەتی هێزەکانو ئەوەی کەچۆن بەژەوەندییە هەرێمییو نێودەوڵەتییەکان دەچن بەنێویەکدا مەسەلەیەکی بنەڕەتیی پێویستە. ئەم بیرۆکەیە لەلایەن میهردادی ئەزدییەوە دەربڕراوە بەوەی " کوردان قوربانی پێگە ستراتیژییەکەی خۆیانو بایەخی جیۆپۆلتیکی جیهانین". [١٠]

وێڕای ئەم پێگە ناجێگیرە جیۆپۆلیتیکیە، بوونی دوو گیرفانی کوردیی جیالەیەك لەهەریەکە لە ئێرانو تورکیای ئەمڕۆدا ( لەسەدەی شازدەهەمدا لەبنەڕەتدا وەك دوورخستنەوەو راگوێزانی زۆرە ملە دامەزراوە ) [١١]، رەوشە جیۆپۆلیتیکییەکەی لەتێکڕای کوردستاندا ئاڵۆزتر کردووە. یەك لەو گیرفانانە کەوتۆتە ئەنەدۆڵی ناوەندییەوە، ئەوەکەی دیکەشیان کەوتۆتە باکووری رۆژهەڵاتی ئێرانەوە لەپارێزگای خۆراسان ( بڕوانە نەخشەی ٢ .١. ١ و ٣ .١. ١ ). هەرچەندە ئەم دوو گیرفانە سەرەکییە چ هەڕەشەیەکی راستیینە بۆ کۆمارەکانی ئێرانو تورکیا پێکناهێنن، بەڵام هێشتا فاکتەرگەلێکی گرنگ بۆ سیاسەتدارێژان پێکدێنن کاتێك بیانەوێت سیاسەتی نیشتیمانیان سەبارەت بەو مەسەلانە دارێژن کە بەکوردەوە پەیوەستە.

---

9 Izady (1992), p. 2.
10 Ibid. p. 202.
11 Ibid. pp. 1-2.

## ٢ . ١ . ١ رووخساره جیۆگرافییه تایبەتمەندەکانی کوردستانی عێراق

بەگوێرەی ئەو سەرچاوانەی پشتیان پێبەستراوە، بەشە کوردییەکەی عێـراق زۆرجـار بـە کوردسـتانی باشـوور یـان ناوەنـدەیی نـاوزەد دەکرێـت. لـەم کـارەی بەردەسـتدا ناوەکـەی دواییـان بـەکاردەهێنرێت. کوردسـتانی عێـراق کـە زیـاتر لـەڕووی زاراوەی جیۆگرافیـاوە وەك ناوەنـد لەقەڵەمـدەدرێت بـەڵام هـەروەها لـەو سەرنجەشـەوە کـە ناوەندی سیاسیی کوردییـە. ( بڕوانـە نەخشـەی ٣.١.١ ) ئـەوەی تایبەتمەنـدی ئـەم ناوچـەیەیە لـەڕووی سـیمای دیـاریکراوی جیۆگرافیـەوە بریتیـە لـە گواسـتنەوە لـە ناوچـەیەکی شـاخاوی سـەختی بـاکوورەوە بـەرەو ناوچـەیەکی نزمـی خـاوەن دەشـتی بـەپیت لەباشـوورەوە. سروشـتی شـاخاویی و سـەختیی ناوچـەکە بەرجەسـتەی سـیمایەکی بـەهێز و یەکلاکەرەوەیـە لـەجیۆگرافیای سـەربازییدا، ئـەوەی کـە لەگـەڵ چـالاکییە سیاسـییەکاندا لێکـدەئاڵێن و کاراکتـەری جـەنگاوەریی سیاسـەتی نـەریتی کوردیی دەخاتەڕوو.

خاکی کشتوکاڵی بەپیتی باشووری کوردستانی ناوەندیی بۆ ماوەیـەکی درێـژ ژیـانێکی وەرزێریـی چـالاکی گرتۆتـەخۆ، زۆرجـار کـوردانی ناکۆچـەریی نیشـتەجێ کـە شێوەژیانێکی جیاوازی خۆیان هەیە لەگەڵ خەڵکی کوردیی خێڵەکیی نایەنـەوە. ئـەم شـوێن و پێگـە جیۆگرافیـە جیـاوازەی کوردسـتانی ناوەنـدیی، دەشـێت ئاسـانکاریی بـۆ پەرەسەندن بەرەو کۆمەڵگایەکی مۆدێرنتر بڕەخسێنێت.




**نەخشەی ٢ .١. ١: کوردستان لەچوارچێوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا**[١٢]




**نەخشەی ٣. ١. ١: حەوت دابەشیبوونە سەرەکییە نێوخۆییەکەی کوردستان**[١٣]

12 Ibid. p. 4.
13 Ibid.

## ١. ٢ ریشەی گرفتەکانی نێوان کوردستانی عێراق‌و بەغدا

گرفتەکانی نێوان بەغداو کوردی عێراق ریشەگەلێکی قوولی هەیەو لەبنەڕەتدا لەوکاتەوە سەرچاوە دەگرێت کە سیستمی دەوڵەت لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دامەزرا، ئەوەی وردە وردە لە رێگەی گەشەکردنی نەتەوایەتیی ناوچەییەوە پێی خۆی چەسپاند. جیاوازییە توندە بەرچاوەکان بەدرێژایی هێڵە ئیتنی‌و مەزهەبیی‌و خێڵەکییەکان لەعێراق سروشتی ئاڵۆزی ئەو مل بەملەو لەمپەرانە پێشاندەدات کە رووبەڕووی بەغدا بوونەتەوە، بەلەبەرچاوگرتنێکی تایبەتی باکوورە کوردییەکەش، هەر لەدامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە لەساڵی ١٩٢١دا.

### ١. ٢. ١ جێگیربوونی رەوشەکەی پاش یەکەمین جەنگی جیهانیی

لەکۆتایی یەکەمین جەنگی جیهانیی، هاوپەیمانەکان هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنییاندا شانبەشانی دەوڵەتێکی عەرەبی لەسەر داروپەردوی ئیمپراتۆری عوسمانی. کوردان ئەوەیان هەڵبژارد کە لەگەڵ ئەمەرنییەکاندا هاوکاریی بکەن، ئەوەی بووە هۆی پێشکەشکردنی بیرەوەرییەکی هاوبەش لە کۆنفرانسی ئاشتییدا لەساڵی ١٩١٩. پەیماننامەی سیڤەر دوو ساڵ پاشتر دانی بەمافی ئەو دوو گەلەدا نا کە دەوڵەتی خاوەن سەرەوەریی خۆیان دابمەزرێنن.[١٤] ئەم پەیماننامەیە سەرکەوتنێکی کوردیی ئاشکرا بوو، بەڵام وەك شەرمەزارییەك بۆ گەلی تورك تەماشاکرا، مستەفا کەمال ئەتاتورك رێك لەم کاتەدا دەرکەوت‌و ئەوەی توانی لەخاکی ئیمپراتۆری عوسمانی رزگاریکردو کۆماری تورکیای دامەزراند، لەم پرۆسەیەدا پەیماننامەی سیڤەر رەتکرایەوە.[١٥]

---

14 14.Vanly (1993), p. 145.

١٥ وانلی سەبارەت پەیماننامەی سیڤەر نووسیویەتی:" لەوانەیە تەنیا پەیماننامە بێت کەمافی سەربەخۆیی‌و خۆدیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەیەکی ناتورکی ئیمپراتۆرییەکەی مسۆگەر کردبێت، بەڵام هەروەها سەبارەت

سەرکەوتنی کەمالیستەکان بووەهۆی ئەنجامدانی کۆنفرانسێکی دیکەی ئاشتیی کە بەپێچەوانەی ئەوەکەی سیڤەری دووساڵ لەوەپێش، هیچ بەشدارییەکی کوردیی، ئەرمەنیی یاخود عەرەبیی تێدا نەبوو. ئەم کۆنفرانسە بووەهۆی بەستنی پەیماننامەی لۆزان کە لەساڵی ١٩٢٣دا مۆرکرا، ئەو پەیماننامەیەی کە بەهیچ شێوەیەك ئاماژەیەکی بۆ کوردان‌و مافی نەتەوەییان نەدابوو، ئەو مەرجە کەمەشی بۆ کەمینەکان دانرابوو تەنیا بەسەر ناموسڵمانەکاندا جێبەجێدەکرا. پەیماننامەی لۆزان بەهەموو شێوەیەك کۆتایی بەخولیا کوردییەکان هێنا بۆ سەربەرخۆیی، ئەو پەرەسەندنەی کە پێناچێت پەیوەندیی نەبێت بە پێویستییە سیاسییەکانی بریتانیا لەهەرێمەکە. هەروەك عوسمان عەلی دەنووسێت، بریتانییەکان هەستیان بەپێویستییەکی خێرا کرد بۆ باشکردنی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ تورکیا بۆئەوەی رێگری لە روسە بۆلشەفییەکان بگرن بەرەو باشوور پێشڕەویی بکەن بەئاراستەی کەنداوی فارس‌و هەڕەشە لە بەرژەوەندییەکانی بریتانیا لەو ناوچەیەدا بکەن. لەکۆنفرانسی لۆزاندا دەبوو تورکیا سازش بکات بۆئەوەی بەرژەوەندیی لەندەن لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بپارێزێت، هەروەها بریتانیا لەرێگەی جەختکردنەوە سەر سەربەخۆیی کوردان کە لە پەیماننامەی سیڤەردا فشاری بۆ دەکرا، هاوکاریی تورکانی دژی روسە بۆلشەفییەکان مسۆگەرکرد. بەمانایەکی دیکە، "چارەنووسی کوردان لە لۆزاندا ملکەچی ململانێی ئەنگلۆ-روسی بوو لەپێناو بەدەستهێنانی نفوز لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا." [16]

دەوڵەتی کوردیی سەربەخۆ وەك ئەوەی لە پەیماننامەی سیڤەردا وێناکرابوو، تەنیا بەناوچەیەکی بچووکی کوردستانەوە پەیوەست بوو، ویلایەتی گرنگی موسڵ‌و کوردستانی ئێرانی نەگرتبۆوە.[17] لە لۆزاندا رکابەری لەسەر ویلایەتی موسڵ یەکلا

بەتورکی تورکیاش نادادپەروەر بوو چونکە وڵاتەکەی لەسایەی داگیرکاریی بریتانی، فەرەنسی، ئیتالی‌و یۆنانییەکاندا دابەزاندبووە ئاستی کۆلۆنی. بڕوانە: هەمان سەرچاوە ، ل١٤٦.

16 Othman All (1997), p. 524.

17 Kendal (1993a), p. 35.

نـەکرابۆوە، بـەڵکو ئاراسـتەی ئەنجومـەنی کۆمەڵـەی گـەلان کرابـوو، ئـەوەی دواجـار بڕیاریدا کە حوکمی ویلایەتەکە لەچێوەی دەوڵەتی عێراقی نوێبنیادەوە بێت.

## ٢. ٢. ١ دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق

دەوڵەتی تازە سەربەخۆی عێراق ، بەپێی وتەی غریب، " میراتی رژێمی عوسمانی بۆ مایـەوە لەگـەڵ ئـەو کێشـانەش کـە زادەی سـەرهەڵدانی هەسـتی نەتـەوەیی لـەنێو عەرەبو کورد، ناتەبایی نێوخۆ، نائارامیی کۆمەلایەتییو ئابووریی و هەروەها فشاری بیـانیی و دەسـتێوەردانیان بـوو.[١٨] زێـدە جەختکردنـەوە لەسـەر سـۆزی نەتـەوەیی عەرەبیی لەپاش یەکەمین جەنگی جیهانیی، هەروەك ئەوەی کە هەر زوو لەسەرەتای دەستپێکی دەوڵەتی عێراقەوە هەبوو، کەمی کرد تاکو هانی جۆرە فەزایەك بدات کـە پێویست بوو بۆ هەولگەلێکی متمانەسازیی سـەبارەت بـە پەیوەندییـەکانی کـوردیی-عەرەبیی عێراقیی.

بریتانیـا ناوەنـدو باشـووری عێراقـی نزیکـەی هـەر لەسـاڵی ١٩١٤ەوە داگیرکـرد، واتـە ویلایەتـەکانی بەغـدادو بەسـرە، ئـەویش لـەپێناو پاراسـتنی رێگـای هنـدو هـەروەها بەرژەوەندییـەکانی بریتانیـا لەناوچـەی کەنـداودا. چـوار سـاڵ پاشـتر، ویلایـەتی موسـڵیش بـە بـڕە نەوتـە دەرنـەهێنراوە زۆرەکەیـەوە خرایـە ژێردەسـتی بریتانیـا، هەروەها لەساڵی ١٩٢٠دا، بریتانیا بەفەرمی وەك مانـدات بەسـەر عێراقـدا دیـارییکرا، کـە لەسـێ ویلایـەتی کـۆنی عوسمـانیی پێکـدەهاتو ئـەمیر فەیسـەڵ وەك پاشـایەکی عــەرەب لەلایـەن بریتانییەکانــەوە کـرا بەفـەرمانڕەوای وڵاتەکـە.[١٩] لەسـاڵی ١٩٢٦دا، رێکەوتننامەیـەك لـەنێوان عێـراقو بـریتانیـاو تورکیـادا مـۆرکرا، موسـڵ خرایەسـەر دەوڵـەتی عێـراق، بەمــەرجێك کـە مافگـەلێکی کـەلتووریی دیـارییکراو بـدرێت بـە دانیشتووانی کوردی ویلایەتەکە.[٢٠]

---

18 Ghareeb (1981), p. 1.
19Vanly (1993), pp. 144-45.
20 Kendal (1 993b), pp. 50-51.

هێندەی پەیوەندی بە ویلایەتی موسڵەوە هەیە، لەندەن خوازیاربوو هەرێمێکی ئۆتۆنۆم یان نیمچە ئۆتۆنۆمی کوردیی پێکبهێنێت کە بەشێوەیەکی لاواز بە کارگێڕیی عێراقی ناوەندییەوە ببەسترێتەوە. هەرچەندە، بریتانیا کۆنترۆڵی تەواوی بەسەر ناوچە کوردییەکاندا نەبوو، چونکە شێخ مەحموود، کە لەلایەن بریتانیەکانەوە کرابووە حاکمی لیوای سلێمانی، بۆخۆشی ناوی "پاشای کوردستان" لەخۆی نابوو، چەندین جار راپەڕیو هەوڵیدا دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی لەباکووری عێراق رابگەیەنێت.[٢١]

لەکاتی کۆتاییهاتنی ماندێتی بریتانیی بەسەر عێراق لەساڵی ١٩٣٠، پەیوەندییەکانی کوردی عێراقو حکومەتی عێراق بەخێرایی تێکچوو، چونکە بەغدا دەسەڵاتێکی زیادی پەیداکرد بۆ زیانگەیاندن بە کوردان لە باکوور. شێخ مەحموود راپەڕینێکی تری هەڵگیرساند بۆ داواکردنی دەوڵەتێکی کوردیی، لەکاتێکدا سەرکردە کوردەکانی دیکە روویان لە جنێف نا تاکو داوای سەرپەرشتیی کۆمەڵەی گەلان بۆ کارگێڕییەکی کوردیی بکەن.[٢٢] دواجار گرفتەکان لەساڵی ١٩٣٠دا بووەهۆی یەکەمین کودەتای سەربازیی عێراقیی، ئەوەی بەشێکی بەهۆی بێزاریی بوو لەو سیاسەتەی سەبارەت بەکوردستانی عێراق بەرێوەدەبرا. بەرۆیشتنی بریتانییەکان ئاشکرابوو کە حکومەتی عێراقیی مەبەستێکی نییە رێز لەو بەڵێنو پابەندییە بگرێت کە لەلایەن کۆمەڵەی گەلانەوە لەساڵی ١٩٢٦ەوە سەبارەت بە کوردانی باکووری وڵاتەکە داوای لێکرابوو، هەروەها هەستێکی بەهێز لەکارەکتەری نەتەوەیی بووەهۆی رووداني هەژان لەنێو ئەو کوردانەی کاریگەرییان بەسەرەوە بوو، ئەوەی سەلماندی سروشتێکی بەردەوامی خودی هەیە.

21 Ghareeb (1981), pp. 29-30
22 . Ibid. pp. 30-31.

## ٣ .١ ڕووداوگەلی ساڵانی ١٩٧٠كان

جووڵانەوەی نەتەوەیی كورد لەساڵی ١٩٧٠دا لە لوتكەی هێزو توانای خۆیدا بوو. ئەو جووڵانەوەیە كەم تا زۆر لەژێر دەسەڵاتی مەلامستەفا بارزانی سەرۆكی پارتی دیموكراتی كوردستان(پدك)دا یەكخرابوو، هەروەها لەرێگەی خەباتێكی تاڕادەیەك سەركەوتووانەی چەكدارییەوە، حكومەتی عێراقی هێنایە سەر مێزی گفتوگۆو دانوسانو ناچاریكرد وەڵامی داواكارییەكانی كورد بداتەوە. وێڕای بەهێزی ڕێژەیی جووڵانەوەی كوردییو كاریگەریی لەسەر بڕیارسازیی سیاسیی دەوڵەت، كوردستانی ناوەندیی لەساڵانی ١٩٧٠كاندا ڕووبەڕووی دیاردەیەكی تایبەتمەند بووەوە كە شەپۆلی هەڵمەتی بەعەرەبكردن بوو بەشێكی گەورەی خاكەكەی گرتەوە.ئەمەش ئەو سیاسەتە بوو كەلەلایەن عێراقییەكانەوە هێنرایەئارا بۆئەوەی ڕووخساری دانیشتیوانی ناوچەكە لەزۆربەی ناوچە بایەخدارە كوردییەكاندا بگۆڕێت. سەرەتا لەدوای ڕێكەوتننامەی ١١ ی مارت بەئاستێكی كەم دەستیپێكردو دواجار بەشێوەیەك پەرەیسەند كە بووە یەكێك لە هەرە ئەو ئامرازو شێوازە گرنگە ناسەربازییانەی عێراقییەكان كە كوردیان پێ كردە ئامانج.

### ١ .٣ .١ حوكمی بەعسو خولیا نەتەوەییەكانی كورد

كەوتنی ژێنراڵ قاسم لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٣دا لەلایەن دەستەیەك ئەفسەری نێو سوپا ئەنجامدرا.[23] هەرچەندە، لایەنگرانی بەعس لەنێو حوكمدارانی نوێدا كەنارخران، ئەوان تاوەكو چوار ساڵی تر ئنجا توانیان لە كودەتای ژوئیەی ١٩٦٨دا وەك فەرمانڕەوای بێ ركابەر دەركەونو حوكمی چەسپاوی بەعس لەتەواوی عێراقدا دابمەزرێنن.[24]

---

23 Vanly (1993), P. 153.
24 Kutschera (1979), p. 264.

بۆئــەوەی باشــتر لــە پێگــەو هەڵویســتی عێــراق ســەبارەت بــە مامەڵــەکردن لەگــەڵ کوردانـدا تێبگەین، دەبێت تیشك بخرێتە سەر ئایدیۆلۆجی حیزبـی بەعسـی عـەرەبی سوشیالیستی،[٢٥] هەروەك جاسـم عەبدولغـەنی دەڵێـت: کرۆکـی بنـەڕەتی ئایـدیۆلۆجی بـەعس بریتیـە لـە خـەبات بـۆ نەتەوایـەتیو یـەکێتی عـەرەب،[٢٦] ئـەوەش بەئاشـکرا لەگـەڵ بەرژەوەنـدییو ئامانجـەکانی خـەباتی کوردانـدا دژو نـاکۆك بـوو، لەکاتێکـدا لایەنگرانی یەکێتی عەرەب هیچ سۆزێکی قووڵیان لەهەمبەر هۆشو خولیای سیاسیی کەمینە ناوچەییەکان نـەبوو کـە کەوتوونەتـە نێـو خـاکی عەرەبـەوە. لەڕاسـتییدا، " نیشتیمانی عەرەب وەك یەکەیەکی سیاسیی چاوی لێـدەکرا کـە شـایەنی دابەشـبوون نەبوو."[٢٧]

ئەو بەشە بەرچاوەی کوردستانی عێـراق، وەك لەلایـەن کوردانـەوە درك دەکـرا، وەك خاکی کورد لەلایەن بەغداوە دانی پێدا نـەدەنرا بـەڵکو وەك خـاکی عـەرەب، ئـەوەش سەرچاوەی دیدە پێکدژو ناکۆکەکانی هەریەکە لە نەتەوەییە کوردو عەرەبەکان بـوو، دیـدێك کـە نەیـدەتوانی هـەروا بەئاسـانیی وا لـەکوردو عـەرەب بکـات پێکـەوە بـە هاوسازیی بژین. لەوەش زیاتر، ئایدیۆلۆجی رادیکاڵی عەرەبچییەکان کـە حیزبەکـەی لەسـەر دامـەزرابوو دژ بـە کـوردانی غـەیرە عـەرەب بـوو، ئەوانـەی لـەڕووی زمـانو تەنانــەت تارادەیــەکی دیــارییکراویش لــەڕووی کەلتوورییــەوە، لەگــەڵ فارســییدا پەیوەستبوو.

هەرچـەندە، ئەوەنـدەی پەیوەنـدیی بـە مشـتومڕەکەوە بێـت پێکدژییـەکانی نێـوان تیۆرو کرداری حیزبی بەعسی عێـراق بـەکورتی قـامکی خراوەتەسـەر. پـاش ئـەوەی

---

٢٥ ئەمە ناوی ئەو جووڵانەوەیە بوو کـە لەسـەرەتای ١٩٤٠کانـدا لەسوریا لەلایـەن رۆشـنبیرانی سـوری میشـێل عەفلــەقو ســەلاحەدین ئــەلبیتارەوە دامــەزرا، یەکــەمیان کریســتیانییەکی ئــارتۆدۆکسو ئــەوی تریشــیان موسوڵمانێکی سونی بوو، ( جووڵانەوەی بەعسی عەرەبی ) بڕوانە:
Ghareeb (1981), p. 45) An ideological and political struggle came later to develop between Syrian and Iraqi Baathists.
26 Abdulghani (1984), p. 30.
27Ibid. p. 32.

سەدام حسێن چووە ریزەکانی پێشەوەو  خۆی گەیاندە بەرزترین پێگەی فرە دیارو بەرزی حیزب، فیکرە بنەڕەتییە چەسپاوەکانی ئایدیۆلۆجی حیزبی بەعسیش وردە وردە پێویستی بە لێکدانەوەو مانای جیاوازبوو. یەك لەو چەمکانە بریتیبوو لە یەکسانیی، ئەوەی کە وەك سەرەتاییترین بنەماکانی بەعس جەختی لێدەکرا، ئەوەی هەرزوو مانا ریشەیی و رەسەنەکەی خۆی لەدەستدا. زوهێر ئەلجەزائیری وای لێکدەداتەوە:

" چ یەکسانییەکی رەها لەنێو بەعسییەکاندا نییە، لەبەر ئەوەی لەڕاستییدا تەنیا تاکە لوتکەیەکی جیا هەیە کە ئەویش سەدام حسێنە، ئەوانی دیکە قەدپاڵن، یەکسانیی لەقەدپاڵدا رێی تێدەچێت، بەڵام نەك لەنێوان ئەوانو لوتکەی جیاکەدا."[٢٨]

ئەمەش بەروونی پێشانیدەدات کە " ئایدیۆلۆجیا ملکەچی تەرزی سەرکردایەتیی کراوە."[٢٩] لەڕاستییدا، هەرزوو دەرکەوت کە سەدام حسێن کە نزیکەی لەکۆتایی ١٩٦٠کاندا ببووە سیاسییەکی بەرچاو، کەوتە ئەوەی شێوازێکی تایبەت بەخۆی پێشبخات. پێش ئەوەی سیاسەتە نوێکانی لەسەر بنەما ئیدیۆلۆجییەکانی حیزبی بەعس باربکات، ئەوەی کە رەوایەتی پێدانو هەروەها بەردەوامبوو بۆ رەوایەتیپێدانی فەرمانڕەوایەتییەکەی، ئایدیۆلۆجیای بەعس بەباڵای فەرمانڕەوایەتیەکەی سەدام حسێن بڕراو رێکخرایەوە.

پێدەچێت هزری سیاسیی حیزبی بەعس لەسەرەتادا جۆرە پەرتو بڵاوییەکی پێوەدیاربێت. نموونەیەك ئەوەیە کە چۆن مرۆ بتوانێت پێناسەی " گەل " بکات، پرسێکی وا گرنگ، لەکاتێکدا دەسەڵات لە گەلەوە سەرچاوەی دەگرت. چەمکەکەی سەدام حسێن " تێکڕای گەلی عێراق" کە لەساڵی ١٩٧٣دا رایگەیاند، کورد و عەرەبی وەك یەك لەخۆ دەگرت، بەڵام تا ئەو کاتەی ئەوانە لەژێر سەرکردایەتی ئەودا کۆببنەوە. ئەوانە گەر ببنە نەیاریو بچنە ژێر سایەی کەسێکی سیاسیی دیکەوە

28 al-Jaza'iri. (1994), p. 42.
29 Morad (1992), p. 125.

چیدی بەشێك لە گەلی عێراق نامێننەوە.[30] ئەمە ئەو پیوانەیەی سەدام حسێن بوو کە لای بەعسییەکانی عێراق بۆ "ئوممە/نەتەوە" دەکرا.

ئەمە بونیادی سیاسیی‌و ئایدیۆلۆجی ئەو کارگێڕییە بوو کە دەبوو کوردان دەستەو پەنجەی لەگەڵدا نەرم بکەن. فەرمانڕەوایانی نوێ و کوردان هەریەك بەگومان‌و بێمتمانییەوە لەوی دیکەیان دەڕوانی. بەعسییەکان، کە ئەندامانی حیزبەکەیان لەلایەن هێزەکانی بارزانییەوە وەك هاوکارییەك بۆ قاسم‌و لێدانی نەیارەکانی لەدوای کودەتای ساڵی ١٩٥٨ەوە کوژرابوون، لەو سەرکردە کوردە دەسڵمینەوە. بەهەمان شێوە، مەلامستەفاش لەحکومەت‌و دانوسانەکانی لەگەڵ کۆمارە عەرەبییە یەکگرتووەکەی ناسر بەگومان بوو، هەروەها سەبارەت بەوەی کە چۆن ئەم دانیشتن‌و گفتوگۆیانە لەو ئاستە بەرزە کاردەکاتە سەر خولیاکانی کورد لەباکووری عێراق.[31] وێڕای نەبوونی متمانەی هاوبەش، بارزانی دوو نوێنەری دامەزراندبوون تاکو لە حکومەتە نوێیەکەدا بە بەرژەوەندیی کوردییدا رابگەن. هەرچەندە، زۆری نەخایاند ئەوانە وازیان لە پۆستەکانیان هێنا لەبەغدا،[32] ئەوەی ئاماژەیەکی باش نەبوو بۆ ئایندەی پەیوەندییەکانی نێوان کوردو بەعسییەکان.

نەیارە شەخسیی‌و سیاسییەکەی بارزانی واتە جەلال تاڵەبانی‌و تاقمە شارەکییەکەی کە بەمەکتەب سیاسیی پارتی ناسرابوون، هاوشێوەی حیزبی بەعس سیاسەتێکی چەپ پەیڕەودەکرد، ئەمانە لەگەڵ بەعسدا هاوکارییان دەکرد،[33] ئەوەی زیاتر ببووە هۆی رێگریی لەبەردەم باشبوونی پەیوەندییەکانی نێوان بەغداو سەرکردایەتییە دیفاکتۆکەی کورد. بارزانی لە پێگەی نوێنەرایەتیی فەرمی کوردان بەهرەمەند بوو. جگە لە پێگە مێژووییەکەی ( ئەوەی لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە ٢٥ساڵێك پێشتر

---

30Makiya (1998), P. 133.
31 McDowall (1989), p. 20.
32 Ghareeb (1981), p. 74.

٣٣ تاڵەبانی هەڵوێستێکی ئەرێی لەهەمبەر بەعس هەبوو :" ئەوە یەکەمین حیزبی سیاسیی فەرمانڕەوای عەرەبی بوو ... دان بەمافە رەواکانی کە بەگیانێکی برایانەوە هەموو هەوڵێکی خۆی داوە لەپێناو چارەسەرکردنی کێشەکە بەئاشتی". هەمان سەرچاوە، ل٧٥.

**یەکێك بووە لەو کەسایەتییە سەرەکییانەی کۆماری کەم تەمەنی مەهاباد ) ئەو دەسەڵاتی بەسەر هێزێکی گەورەدا هەبوو کەلەسەر بنەمای لایەنگریی خێڵەکیی دامەزرابوون، ئەوەی ئەو کاتە فاکتەرێکی فرە گرنگ بوون لە سیاسەتی کوردییدا. هەروەها هاوکارییە مادییەکانی دەرەوەش، بەتایبەت کە لەئێران و ئەمەریکاوە دەهات، خزمەتی بارزانی کرد تاوەك یاریزانێکی بەهێز پێگەی خۆی بچەسپێنێت.**

**وێڕای ئارەزووی راگەیانراوی بەرایی رژێمی بەعس بۆ چارەسەرکردنی گرفتی کوردیی بەشێوەیەکی ئاشتییانە لەپاش هاتنەسەر دەسەڵاتی لەساڵی ١٩٦٨دا، لەئەپرڵی ١٩٦٩دا بەفەرمیی لەنێوان هەردوو دەستە کوردییەکەدا شەڕ هەڵگیرسا،[٣٤]. هەرچەندە، بارزانی بەکردار شەڕی لەگەڵ حکومەتی عێراقییدا دەکرد، لەکاتێکدا ئەوەی دواییان پاڵپشتی هێزەکانی تاڵەبانی دەکردو شانبەشانی ئەو هێزانە دەجەنگا. ئەوەی پێی دەوترا راگەیاندنەکەی بەزاز ( پلانێکی پێشنیازکراوی ئاشتیی لەلایەن حکومەتی پێشووەوە لەساڵی ١٩٦٦دا [٣٥]) کە لەلایەن بەغداوە پێشکەشکرابوو چ خواستێکی کوردانی تێدا نەبوو، ئەوانیش پێشنیازەکەیان رەتکردەوە. ئەم رەتکردنەوەیە بووەهۆی قورسترین هێرشی سەربازیی کە لەلایەن سوپای عێراقییەوە ئەنجامدرا، تاوەکو نزیکەی ساڵێك پاشتر، کاتێك لایەنەکان دەستیان بە دانوسان کردەوە، ئەوەی کە دواجار رێکەوتنی ئاشتیی لێکەوتەوە.[٣٦]**

**ئێدوارد غەریب ئاماژەی بەو بەرەوپێشەوەچوونە داوە کە لەهزری بەعسییەکاندا سەبارەت بە مەسەلەی کەمینەکان هاتۆتەئاراو پێدەچێت ئەمە بەشێوەیەکی بەهێز**

---

34 Abdulghani (1984), P. 135.

٣٥ خاڵە گرنگەکانی ئەم رێکەوتننامەیە بریتیبوو لە: داننان بەنەتەوایەتیی کوردیی، کوردیی بکرێت بەزمانی فەرمی لەکوردستانی عێراق شانبەشانی زمانی عەرەبیی، کوردان وەك کارمەند لەوناوچەیە دابنرێنو هەروەها کورد رێژەیەکی گونجاوی نوێنەرایەتی هەبێت ئەنجومەنێکی نیشتیمانیدا، لێخۆشبوونی گشتیش رابگەیەنرێت، حکومەت راگوێزراوەکان بگێڕێتەوەو قەرەبووی زیانەکانیان بکاتەوە.

Penrose (1978), p. 340.

36O'Ballance (1996), pp. 86-87.

بەشداریی لەو کرانەوە سیاسییەدا بەڕووی کێشەی کورددا کردبێت. لەساڵانی ١٩٦٠کاندا، لەکۆنگرەی ساڵانەی حیزبی بەعسدا پێداچوونەوە بەسیاسەتی ئەو حیزبە لەهەمبەر کورددا کراو گۆڕان بەسەر ئەو سیاسەتەدا هات،[٣٧] ئەوەش کاریگەریی لەسەر ئەو کارو هەنگاوانە هەبوو کە پاش هاتنەوە سەر تەختی دەسەڵات لەساڵی ١٩٦٨دا گرتیانەبەر. هەرچەندە، وێڕای ئەمەش، واپێدەچێت کە رژێمی بەعس کەمێك یان هەر هیچ لەئامانجەکانی لە مەیدانی رووبەڕووبوونەوەی سەربازییدا لەبەرامبەر میلیشیاکانی کورد بەدەستهێنابێت، بۆیە هەستی بە پێویستی گەیشتن بە جۆرە رێکەوتنێك کرد لەگەڵ باکووری یاخییدا.[٣٨] بەعسی عێراق لەهەمبەر هاوسەنگیی ستراتیژیی هەرێمیی خۆی لە پێگەیەکی کەمتردا بینییەوە- لەوکاتەدا ئێران هێزی سەرەکیی ناوچەی کەنداو بوو- هەروەها ئەزموونی زێدەکردنی داواکاریی گرتەبەر بۆ ئەوەی هەناسەیەکی سیاسیی بدات لەپێناو بنیاتنانەوەی سیاسەتی نیشتیمانییو خۆگورجکردنەوە بۆ بزاوتی داهاتوو.

## ٢. ٣. ١ رێکەوتننامەی ئاشتی ساڵی ١٩٧٠و جێبەجێکردنی

رێکەوتننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ مافی ئۆتۆنۆمی کوردیی لەچوارچێوەی یەکێتی عێراقدا دەستەبەرکرد کە لەماوەی چوار ساڵدا جێبەجێبکرێت.رێکەوتننامەکە زیاتر لە هەر مافێك کەحکومەتەکانی پێشوو بەکوردیان دابوو، جیاوكو ئازادیی تێدا هاتبوو. رێکەوتننامەکەی لە ١٥ بەند پێکهاتبوو لەلایەن پارتییەکەی بارزانیو ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی حیزبی بەعس لەسەری پێکهاتبوون. ئەم مانیفێستۆیە بە بەردی بناغەی گرنگی سیاسەتی کوردیی عێراق لەقەڵەم دەدرێت،

37 Ghareeb (1981), p. 80.
38 Ibid.

هـەروەها كـوردان هەميشـە ئامـاژە بـۆ ئـەم رێكەوتنـە دەكـەن لەكاتێكـدا ململانـێ سەربازييەكان لەنێوان باكوورو حكومەتی ناوەندييدا روو لەدانوسان بكات. هەربۆيە، بۆئــەوەی بناغەيــەك بــۆ مشــتومڕ بخــولقێنين، پوختەيــەك لــەم رێكەوتننامەيــە دەخەينە بەردەست.[٣٩]

بەندی يەكەم باس لەدانپێدانان بە زمانی كوردیی دەكات وەك زمانی فـەرميی لـەپاڵ زمانی عەرەبيی، لەوناچانەی كورد تێيدا زۆرينەيە. بەنـدی دووەم داوای بەشـداريی كـورد دەكـات لـە حكومـەتی ناوەنديـيدا، لەوانـە چـوونە پۆسـتە باڵاكـان لـە كابينـەو هەروەها سوپای نيشتيمانی عێراقييـدا. "دواكـەوتوويی" فەرهـەنگيیو پـەروەردەيی كورديی لە بەندی سێيەمدا قسەی لەبارەوە كراوە، ئەوەی داوای چـاككردنی ئـەو دوو بوارە بەگشتيیو خوێندن بە كورديی بەتايبەتيی كراوە.

بەندی چوارەم ئەوە مەرجەی تێدا هاتووە كـە لەهـەموو ئـەو ناوچـانەی كـە كـوردان زۆرينە پێكدێنن، پێويستە هەموو بەرپرسانو كارمەندەكانی كورد بن يان كوردزمان بن، دابينكردنی ژمارەيـەكی پێويسـت لـەوان. لەبەنـدی پێنجەمـدا، مـافی گـەلی كـورد زامنكـراوە كـە رێكخـراوی خوينـدكارانو لاوانو ژنـانو مامۆسـتايانی خـۆی هـەبێت. بەندی شەشەم باس لە گەڕانەوەی هەموو ئەو كارمەندو كرێكارو كەسانە دەكـات كـە پێشـتر موچـەخۆری حكومـەت بـوونو لەجووڵانـەوە چـەكدارييەكەدا تێوەگلابـوون، لەكاتێكــدا بەنــدی حەوتــەم بــاس لــەدابينكردنی بودجەيــەكی تايبــەت دەكــات بەمەبەستی بەرزكردنەوەی ئاستی رەوشی ئابووريی ناوچە كوردييەكان.

بەگوێرەی بەنـدی هەشـتەم، عـەرەبو كـوردە راگوێزراوەكـان دەبـوو بگەڕێنـەوە ئـەو شوێنەی لێوەی هاتبوون، ئەوەش لەڕووی تيۆرييەوە مانای ئەوەبوو كە ئەوانەی وەك

---

٣٩ بۆ ناوەرۆكی رێكەوتنەكە سوود لەم سەرچاوانە وەرگيراوە:

Ghareeb (1981), McDowall (1992), and Vanly (1993). Words and sequences within inverted commas are quotations taken from the original statement, provided by the Iraqi Ministry of Culture and Information, translated and featured in Short and McDermott (1975).

بەشێك لەبەرنامەی تەعریبی حكومەت هێنرابوون دەبوو بەقازانجی گەڕاوەكانی كورد ناوچەكە جێبهێڵن.
بەندی نۆیەم باس لە بەرنامەی ریفۆرمی زەوی دەكاتو هانی "هەنگاوی خێرا" دەدات بۆئەوەی لەكوردستاندا جێبەجێبكرێت. وێڕای ئەوە عێراق وەك نیشتیمانێكی هاوبەش دەبێت ئاكامی پێداچوونەوەی دەستوربێت، بەگوێرەی بەندی دەیەم، دەبێت یەكسانیی نێوان كوردو عەرەب دانی پێدابنرێت.[٤٠] بەندی یازدە، داوای لەكوردان كردووە دەزگای جیهازی رادیۆ ( مەبەست لێی دەزگای رادیۆ كوردییە نهێنییەكە بوو )و چەكە قورسەكان رادەستی حكومەت بكرێتەوە، لەكاتێكدا بەندی دوازدە جەختی لەسەر ئەوە دەكردەوە كە یەك لە جێگرەكانی سەرۆك دەبێت كورد بێت.
بەندی سیازدە، باس لەپێویستی پێداچوونەوەی یاسای پارێزگاكان دەكات بۆئەوەی لەگەڵ دەقی بەیانەكەدا بگونجێت. " سامانە نیشتیمانییەكان" ی كوردستان لەمادەی چواردەیەمدا ئاماژەی بۆ كراوە. ئەوەندەی پەیوەندی بەكوردەوەیە " بەهرەوەرگرتن لە خودموختاری" شتێكی سروشتی بوو كە لەچوارچێوەی عێراقدا بێتەدی. دواجار لەبەندی پازدەیەمدا، بەڵێنی دەسەڵاتێكی دادوەریی بەكورد درابوو بەشێوەیەك كەلەگەڵ پشكی خۆی لەرێژەی دانیشتووانی عێراقدا بگونجێت.
دوای مۆركردنی رێكەوتننامەكە، كۆمیتەیەكی هاوبەش لەنوێنەرانی هەریەكە لە حیزبی بەعسو پارتی دیموكراتی كوردستان ئەركی سەرپەرشتیكردنی جێبەجێكردنیان گرتەئەستۆ. ئەم ئەركە دەركەوت كە زۆر گران بوو، چونكە بەغداد شەریكێكی متمانەپێنەكراو بوو ( هەرچەندە بارزانیش پەیوەندییەكانی خۆی لەگەڵ شای ئێراندا پاراستو لەگەڵ ئەمریكاو ئیسرائیلیش پەیوەندییەكانی

---

٤٠ هەرچەندە، سەدام حسێن جەختیكردۆتەوە كە پێویستە بایەخێكی كەمتر بەمە بدرێت كاتێك كە نەتەوایەتیی عێراقیی دەكرێتە مەبەست:" هەریەكە لەئێمە دەبێت دیدی خۆی بگۆڕێت كە تەنیا خۆی بەكورد یان عەرەب دانەنێت، بەڵكو بەعێراقیی."
Hussein (1977), p. 23.

بـەكراوەیی هێشـتەوە.)[41] فـەرمانڕەوا بەعسـییەكان بـەكردار نـاوەرۆكی زۆربـەی بەنـدەكانیان پشتگوێخسـت، تـەنیا هێنـدێك گۆڕانكـاریی سـادەو بچـووك نـەبێت كـە لـەماوەی چـوار سـاڵەكەدا لەلایـەن حكومەتـەوە ئەنجامـدرا. یـەك لەهـەرە ئـەو پێشێلكارییانەی ڕێكەوتنەكە ئەوە بوو كە لـەمادەی یەكەمـدا هـاتبوو: لەكاتێكـدا كـە زمـانی دامـەزراوەكان لەناوچـە كوردییـەكان دەبـوو زمـانی كـوردیی بێـت بـەگوێرەی لێكدانەوەی بەعسییەكان بچووك كرابووەوە بۆ ئاستێكی زۆر سنووردار لە قوتابخانـە سـەرەتاییەكاندا، بەتـەواوی جێبەجێنـەكراو قوتابخانـە ناوەنـدییو ئامادەییـەكانی نەگرتبۆوە.[42]

سەبارەت بەتێكستی ڕێكەوتنە ئاشتییەكە، چەندین جار ئاماژە بـە " ئـەو ناوچـانەی زۆرینەی دانیشتووانەكەی كوردن" دراوە، وەك ئاماژەیەك بەو ناوچـانەی كـە دەبێـت هـەنگاوو كـاری نـوێی تێـدا جێیـەجێبكرێت. پێناسـەیەكی روونـی ئـەو ناوچـانەی زۆرینەی دانیشتووانی كـوردن، بەمانایـەكی دیكـە، كـام ناوچـانەن كـە دەبنـە بەشـێك لەناوچـە ئۆتۆنۆمەكـە، دیارینـەكراوە. بـەوەش مەسـەلەی پێویسـتی ئەنجامـدانی سـەرژمێرێك بـۆ دانیشـتووان لـە ناوچـەگەلێكی گرنگـی سـتراتیژیی كـە لەلایـەن هەردوولاوە ئیدیعا دەكرا وەك ناوچەی پڕنەوتی كەركوك خۆی سەپاند. هەرچەندە، بەعسـییەكان ئەنجامـدانی راپرسـیی گشـتییان دواخسـت لەكاتێكـدا هەوڵـەكانی راگواستنیان لەئاستێكی بەرفراواندا بەردەوامبوو. سیاسـەتی حكومـەت بـۆ تـەعریبی ناوچـە كوردییـەكان لـەماوەی سـاڵە كەمـەكانی بەراییـدا رووخسـاری دیمـۆگرافی بەشـێوەیەكی بەرچـاو بـەقازانجی بـژاردەی دەسـەڵاتدار لەبەغـداو بـەزیانی كـوردان گۆڕی. لەئاكامدا، چیدی نەدەتوانرا ژمارەیەكی راستەقینەی بوونی كـوردان لەناوچـە پڕنەوتییەكاندا بدرێت بەدەستەوە. گرفتی سەرەكی بەیاننامەی مارت هەروەك نـادر

41McDowall (1996), p. 330.
42 Vanly (1993), p. 156.

ئینتیسار دەڵێت ئـەوە بـوو :" شکسـتی ئـەو بەیاننامەیـە بـوو لـە ناسـاندنی وردی سـنوری ئـەو ناوچـەیە بـوو کـە دەبـوو بەنـدەکانی ڕێکەوتننامـەی ئۆتۆنـۆمی بیگرتبایەتەوە."[٤٣]

لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٤دا، چەند وەزیرێکی کورد لە حکومەتی ناوەندیی، پۆستەکانیان جێهێشـت وەك ناڕەزایەتییـەك دژ بـە حیزبـی بـەعسو هەلسـوکەوتی حکومـەت سـەبارەت بـە کاروبـاری کـوردیی. دەسـەڵاتدارانی عێـراق وەڵامـی ئەمـەیان بـە شوێنگرتنەوەی وەزیرەکانی لایەنگری بـارزانی بەنـەیارانێکی سیاسـیی مەلامستەفا ( ئەوانەی بەچوونە پاڵ بەعسییەکان ڕەوایـەتییان لـەلای زۆربـەی کـوردان لەدەسـتدا) ئەوەش ئاڵۆزبوونی پەیوەندییەکانی سەرکردایەتیی کوردو بەغدای زێدەتر کرد.[٤٤]

حکومـەت سـەلماندی کـە لـەماوەی ئـەو چوارسـاڵەی دانرابـوو ناتوانێـت بەتـەواوی ڕێکەوتننامەکەی ١٩٧٠ جێبەجێبکات، هەربۆیە پلانێکی نـوێ بـۆ ئۆتۆنـۆمی کـوردان ڕاگەیـەنرا بـەناوی یاسـای ئۆتۆنـۆمی ١١ی مـارتی ١٩٧٤. ئـەوەش بەداڕشـتنەوەو پێداچوونەوەی ڕێکەوتننامەکـەی پێشـوو، بـەڵام ئـەو ناوچـەیەی کـە حـوکمی زاتـی دەیگرتـەوە هـەمان ئەوەکـەی پێشـوو بـوو. بەغـدا ١٥ ڕۆژی بـۆ کـورد دانـا تـاکو پێشـنیازەکەی پەسـەند بکـەن، ئـەوەی وەك چاوەڕواندەکرا، نـە کـەرکوك و نـەهیچ ناوچەیەکی نەوتی دیکەی کوردستانی لەخۆنـەدەگرت.[٤٥] لەکاتێکدا پلانەکـە لـەرووی بانگەشەی کوردانەوە بۆ کەرکوك کورتی هێنا، نەك تەنیا بەوەی کـە نەخرێتـە سـەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی، بەڵکو وەك ئەوەشـی کـە وەك پایتـەختیش ئامـاژەی بـۆ بکرێـت، هەربۆیە یاسای ئۆتۆنۆمی ڕەتکرایەوە. لەم نێوەندەدا، کوردان بەوە تۆمەتبارکران کە پـەنا دەبەنـە بـەر مێـژوو کاتێـك بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن کـە کـوردان لـەرووی مێژووییـەوە لەوناچـانەدا نیشـتەجێبوون کـە وەك بەشـێك لەوناوچـەی ئۆتۆنۆمیـە دانەنراون کە حکومەتی عێراق پێشنیازی کردووە. دیدی سەدام حسێن ئـەوەبوو کـە

43 Entessar (1992), p. 92.
44 Ibid. p. 73.
45 McDowall (1996), pp. 335-336

ئامـاژەدان بەمێـژوو شـتێکی پەسـەندە، بـەڵام نـەك بـۆ " دیـارییکردنی هەرێمـە ئۆتۆنۆمەکە" لەم بارەیەوە ئەم بەراورکارییەی خوارەوە کراوە، " عەرەبەکان ناتوانن داوای ئیسـپانیا بکـەن تـەنیا لەبـەر ئـەوە لـەرابردوودا بۆماوەیـەك لـەوێ بـوون" [٤٦] ئەوەش خراپ لێکدانەوەیەکی ئاشکرای واقیعی ئەو راگوێزانە بەکۆمەڵەی خەڵکەکە بوو کە وەك بەشێك لەسیاسەتی دەوڵەت لەلایەن حکومەتەوە جێبەجێکرابوو.

## ٣ .٣,١ دەستپێکردنەوەی شەڕ بووەهۆی رێکەوتننامەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥

لـەکۆتایی بـەهاری ١٩٧٤دا، شـەڕێکی کـراوە لـەنێوان کـوردو حکومەتـدا هەڵگیرسـا. مەلامستەفا هاوکاریی سەربازیی لەشای ئێران وەردەگرت، ئەو شایەی هەروەك دێڤید ماکـدۆواڵ ئامـاژەی بـۆ کـردووە، دەشـێت هیـوای بـە لەدەسەڵاتخسـتنی بەعسییەکان بووبێـت، هــەروەك لەسـاڵی ١٩٦٣دا روویــدا.[٤٧] لەکاتێکـدا پشـتگیریی ئێرانییــەکان لەسـنوورەکانەوە بەشـێوەیەك بـەردەوام بـوو پێگـەی عێـراق بەشـێوەیەکی بەرچـاو لاوازدەبـوو. تـا ئـەو کاتـەی نـەتوانرێت ئێـران رازی بکرێـت کـە ئۆپەراسـیۆنە سەربازییەکانی خۆی شانبەشانی هێزەکانی پێشمەرگەی[٤٨] کورد لـەباکووری عێـراق

46Hussein (1977), p. 31.
47McDowall (1996), pp. 33
٤٨ مانا کوردییەکەی جەنگاوەری کورد واتە " ئەو کەسەی رووبەڕووی مەرگ دەبێتەوە". وشەی پێشمەرگە بـۆ یەکەم جار لە کۆماردا داهێنراو بەکارهێنرا،ئەم وشەیە ریشەشی لەزمانی فارسییدا هەیـەو وەکـو "پـیش مـیر"و "پـیش مـرگ" بـەکارهاتووە کـەمانای خـۆ بەقوربانیکردنـە.. "ئـەنوەر دڵسـۆز" لـە ژمـارە ٦٥ی رۆژنامـەی "کوردستان"ی زمانحاڵی حیزبی دیموکراتی کوردستان لـە ٣ی ژوئیـەی ١٩٤٦داو لـە ژێـر ناونیشـانی"لەشـکری کوردستان" دا باس لە دوو شێوازی دامەزراندنی لەشکر دەکات، یەکەمیان بۆ پەلامارو داگیرکردنی وڵاتانی دیکە وەك لەشـکری وڵاتـانی ئیسـتیعماریی، دووەمیشـیان بـۆ پارێزگـاریی وڵاتو وەك سـوپەرێکی میللیـی. نـاوبراو دەڵێت:"لەشکری میللیی لەو وڵاتە دەبێ کە هەمیشە پارێزگاریی ئـازادیی نێـو وڵاتـی خـۆی بکـات یـان ئـازادیی وڵاتی خۆیو حەقی خۆی داوا بکات. ئێمە کە ئەمەمان زانی بۆمان ئاسان دەبێ بزانین لەشکری کوردستان لە چ

**بوەستێنێت، ئەوا سوپای عێراق دەرفەتێکی کەم یان هەر هیچ دەرفەتێکیان نابێت بۆ بردنەوەی جەنگەکە- زیاتر، دەگونجا دوژمنایەتییەکەش بۆ شەڕێکی بەرفراوان لەگەڵ ئێراندا وەرچەرخایە.**

**هاوکاریی ئەمریکاییەکان بۆ کوردانی عێراق فاکتەرێکی بەرچاوی پشت پاڵپشتی ئێرانەوە بوو لەهەمان رووەوە، ئەم چەشنە کارەی ئەمریکییەکان بەشێوەیەکی نهێنی دەستیپێکردو نزیکەی بۆ ساڵی ١٩٦٩ ( لەوانەیە زووتریش) بگەڕێتەوە. هەرچەندە، ئەوە تەنیا سێ ساڵ دواتر بوو کە قۆناغی دۆکیومێنتاری وەك (CIA / سی ئای ئەی ) بەرنامەکانی خۆی دەستپێکردو بایی ١٦ ملیۆن دۆلار لەماوەی سێ ساڵدا بەشێوەی چەك‌و پارە درا بە چەکدارە یاخییەکانی باکوور. کوردەکان پێشتریش هەوڵی گرێنتی ئەمەریکییەکانیان دابوو، بەوەی کە متمانەیان بەتاران نەبوو، بەلاَم تەنانەت قورسایی سیاسی واشنگتۆن بەو رۆڵە سیمبولیکە ئابوورییە مەزنەیەوە ( دەوترێت یارمەتی ئەمەریکی بەشێکی کەمی ئەو پارەیەی پێکدەهێنا کە بارزانی لەشای ئێرانی وەردەگرت ) سەلماندی کە پشتگیرییەکی لاوازی کوردان**

---

پایەیەکیدا دابنێین وە بەتایبەتی چۆنێتی حکومەتمان بزانین، حکومەتمان حکومەتێکی میللییەو لە میلەتەوە دەرچووە...بەرامبەر بە قانون حکومەتمان هەموو کەسێك یەك پایەیەو هیچ کەس تەفاوتی لەگەڵ هیچ کەسدا نیە لەبەرئەوە لەشکرمان لە ژێر سێبەرو رەهبەری ئەم حکومەتە دەبێ ببێتە لەشکرێکی میللی، هەروەها هەروەکو دەبینین لەشکرمان لە خودی میللەت دەرچووە، کارگەرو رەنجبەرو ئاغاو تجار هەموو بۆ ئامانجێك لە ژێر بەیداغی مقدس کورددا بە هەمو ئیتاعەتێك کار دەکەن‌و داوایێکی عادلانەو حقوق‌و ئازادی‌و سەربەستی میللەتی کورد دەکەن...لەشکری کوردستانی ئازاد کە عبارەتە لە ٥٠٠٠٠ پێشمەرگە بناغەی لەشکری کوردستانی گەورە بە هەڵگری بەیداغی ئازادیی، ئەم لەشکرە وەك زۆر لەشکرانی دنیا زەحمەت‌و سەرباری میللەتی خۆیان نین." بەم شێوەیە نووسەرەکەی "کوردستان" پێشمەرگە بە هێزێکی میللی ئازادییخواز لە سایەی رێبەرایەتیی حکومەتێکی میللی ئازاد لە قەڵەمدەدات، کە گیانفیدایی لە پێناو ئازادیی گەل‌و مافەکانی میللەتدا دەکات‌و داردەستی هیچ هێزو لایەنێکی لۆکاڵیی تایبەت نیە. ئەمەش زیاتر وەك هێزێکی خۆبەخشی پرۆفیشناڵ دەردەکەوێت کە لەسایەی حکومەتێکی وەك کۆمارەکەی مەهاباددا دامەزراوەو بۆچونێکی ریالیستانەیەو ئازادیی گەل‌و حکومەتێکی دادپەروەر دەکاتە مەرجی کاری پێشمەرگە، هەربۆیە لە تەواوی ساڵێکی تەمەنی کۆماری کوردستاندا پێشمەرگە نەك هەر سوپەری راستیینەی میللەت بوو، بەڵکو ئازاری بە تاکە مرۆڤێکی کورد نەگەیاند(و).

بووە. CIA سی ئای ئەی وازی لە ئۆپەراسیۆنەکە هێنا کاتێك شا چیدی کوردانی عێراقی وەك ئامرازێك نەبینی تا دژی بەغدا بەکاریان بهێنێت.[49] ئەگەری ئەوە هەبوو کە ئەمریکییەکان ئارەزووی بەردەوامی ڕەوشە هەنوکەییەکەیان کردبێت، بەمانایەکی دیکە، ئەوەی کوردان بەشێوەیەکی نادیارییکراو بەرەو جەنگ بڕۆن، لەڕاستییدا چ سەرکەوتنێك بەدیناهێنن. دۆکیۆمێنتێکی CIA سی ئای ئەی ساڵی ١٩٧٤ کە لەساڵی ١٩٧٦دا بەفەرمی بڵاوکرایەوە دەڵێت:

" ئێرانو وڵاتە یەکگرتووەکان خوازیاربوون سوود لەو هەلومەرجە وەربگرن کە تێیدا عێراق لەنێوخۆیداو بەهۆی وازنەهێنانی کوردانەوە لە نیمچە ئۆتۆنۆمیی خۆیان لاوازبکرێت. نە ئێرانو نە وڵاتە یەکگرتووەکان حەزیان بەوە نەبوو بەهیچ شێوەیەك ڕەوشەکە چارەسەر بکرێت."[50]

لە٦ی مارتی ١٩٧٥دا، سەدام حسێنو ڕەزا پەهلەوی لەجەزائیر یەکتریان بینی (لەئاکامی ئەو ناوەندگیرییەی لەرێگەی شاحسێنی پاشای ئەردەنو ناسری سەرۆکی میسرەوە بوو ) تاکو ناکۆکییەکانیان وەلابنێن. عێراق داواکارییەکانی ئێرانی پەسەندکرد سەبارەت بە دەسەڵاتی بەسەر رووباری شەتولعەرەبدا بەو مەرجەی شا دەستبەجێ واز لەهەموو پشتگیرییەکانی خۆی بۆ کوردی عێراق بێنێت.[51] لەڕاستییدا، هۆکارەکانی شا بۆ ئاکامگیریی مامەڵەکردن لەگەڵ عێراق لەبەر ڕێگرتن بوو لە پشکووتنی کوردستانێکی ئۆتۆنۆمو هەروەها خولیای لەمپەرخستنە بەردەم پەیوەندییەکانی عێراقو یەکێتی سۆڤێت، بۆ ئێرانیش تاکو ڕۆڵی زلهێزێك لە کەنداو بگێڕێت.[52] ئەوەی واپێدەچێت لەوکاتەدا لەگەڵ ئامانجەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانیش

---

49 Ghareeb (1981), 138-140.
50 Hermansson A rbetet, 10 February, 1991, originating from the Pike Commission Report to the House of Representatives (19 January 1976), also quoted by McDowall (1996), P. 331.
51 Ghareeb (1981), p. 171.
52 Vanly (1993), p. 171.

**هاوجووت بووبێت. لێرەشەوە، CIA سی ئای ئەی ئەکتەری وەرچەخێنەری لەپڕی بەختی کوردان بوو.**

**هەر زوو پاش رێکەوتننامەی جەزائیر، جووڵانەوەی نەتەوەیی کورد هەرەسیهێناو مەلامستەفاش لەسەر شانۆی سیاسیی کورد دیارنەما. دوو کوڕەکەی، ئیدریس و مەسعود، سەرکردایەتی پارتیان گرتەدەست ( ئەوەی دواتریان دواتر بووە سەرکردەی نوێی پارتی )، ئەو پارتییەی کە چەند جیابوونەوەیەکی ئەزمونکرد بەوەی چەند گروپێکی بچووکی لێ جیابۆوە کە قەوارەی سیاسیی سەربەخۆیان پێکهێنا. جەلال تاڵەبانیو هاوکارانی کە پەنایان بردبووە سوریا، کەوتنە دروستکردنی یەك لەهەرە گروپە گرنگە جیابۆوەکان. لەژێر دەسەڵاتی ئەودا پارتێکی سیاسیی لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٥دا دامەزرا، کەناوی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان (ینك)• لێنرا.** [٥٣]

---

• سنانسفیلّید لە تێزی دکتۆراکەیدا دەڵێت:" دەتوانرێت ریشەی ی ن ك بۆ چەند فاکتەرێکی پێکەوە گرێدراو بگەڕێنرێتەوە. دابەشبوونی بنەڕەتیی لەنێو پارتیدا لەنێوان باڵی بارزانیو دەستەکەی ئەحمەد–تاڵەبانیدا بەئاشکرا هاوکارێکی بەهێزە. بەڵام ئەم دابەشبوونە زیاتر رەنگدانەوەی ئەو دابەشبوونەی نێو کۆمەڵگای کوردییە وەك لەوەی جیابوونەوەیەکی بەرنامە بۆ داڕێژراوبێ . لەکاتێکدا فرە گرنگە کە مرۆ لە هەر لایەکی دیکەوە بەدوای رەگەزە پێکهێنەرەکانیدا بگەڕێت، بەتایبەت تەنانەت لەخودی جیابوونەوەکەی ساڵی ١٩٦٤و ١٩٦٦دا، کە زۆربەی ئەو کادرانەی کە دواتر ی ن ك یان پێکهێنا، هێشتا دەرنەکەوتبوون. گەشەکانی بیری سیاسیی چەپو شکۆفەکردنی لە دامەزراندنی کۆمەڵەدا کە فاکتەرێکی فرە بایەخدار بوو. لەم رێکخراوەوەبوو کە زۆرینەی سەرکردەکانی ئەمڕۆی ی ن ك چرۆیانکرد. کە ستراکتۆری یەکێتی دیارییکرا، بیری چەپ بنەمای پەروەردەو برەودانی هزریی ئەم رێکخراوە بوو. ی ن ك پشتی بە رێکخستنەکانی کۆمەڵە دەبەست، چونکە تەنیا گروپێکی سیاسیی بوو کە لە کوردستانی عێراقدا لەسەر بنەمایەکی هزریی بەرفراوان هەڵدەسوڕا. کۆمەڵە نوێنەرایەتیی لاوانی رادیکاڵی کوردی دەکرد کە زۆربەیان لەوکاتەدا خوێندکاربوون. بەهەمانشێوە، یەکێتی پشتی بە بزووتنەوە دەبەست بۆ بەدەستهێنانی پشتگیریی ئەوە کۆنە ساکارەکە کە کەمتر دەربەستی سۆشیالیزم بوون، بەوەش سەرنجی ئەو کوردانەی بۆ خۆی رادەکێشا کە زیاتر سروشتێکی کۆنەخوازانەیان هەبوو. ئەم فاکتەرە لە هەرێمی هەڵسوڕانی ئەو دەستانەدا رەنگی دەدایەوە. بزووتنەوە ئازادانەتر لە بادینانو لە دەرەوەی هەرێمی برادۆست (ناوچەرگەی ترادسیۆنی خێڵەکیی) هەڵدەسوڕاو کۆمەڵەش لە دەرەوەی سلێمانی، هەرچەندە، پەیوەندییەکانی نێوان بزووتنەوەو کۆمەڵە بەهێز مایەوە. کاریگەری کۆمەڵە لەسەر پەرەسەندنی سیاسیی لە کوردستانی عێراقدا بایەخدارە، زۆرینەی بڕیارسازانی یەکێتیی لە بنەڕەتدا ئەندامانی

**پێگەی پشتگیریی یەکێتی نیشتیمانی بەتەواویی لەوەکەی پارتی دیموکرات جیاواز بوو. جیاوازیی پێگەی کۆمەڵایەتی شوناسی کوردیی[٥٤] بەشێوەیەکی بەرفراوان ئەوەی دیاریدەکرد کە مرۆ پشتگیریی لەکام لەم دوو گروپە دەکات، لەکاتێکدا کە پارتی بەوە دەناسرا کە لەسایەی سەرکردایەتی بنەماڵەی بارزانییدا سیمایەکی نەریتیی هەبوو کە ڕێحەزی خێڵەکیو ئاینیان هەبوو، یەکێتی نیشتیمانی شوێنکەوتووانی خۆی لەنێو چینەباڵاکانی کۆمەڵگادا بەدەستدەهێنا، ئەوانەی کە کەمتر جەختیان لەسەر فاکتەری خێڵەکییو ئاینیی دەکردەوە. جیاوازیی لەسیاسەتی ئەو دوو پارتە ڕەنگدانەوەی پێکهاتەی پێگەی پشتگیرییان بوو.**

**ئەو ڕێکەوتنەی کە لەنێوان تارانو بەغدا لە جەزائیر بەسترا گورزێکی توند بوو لەجووڵانەوەی نەتەوەیی کورد، بەڵام ناتوانرێت وەك تەنیا هۆکارێکی شکستی بارزانی لەقەڵەمبدرێت. ڕژێمی بەعس چەند دەستکەوتێکی سیاسییو سەربازیی بەدەستهێنا: لەڕووی سیاسییەوە، دوژمنایەتیی درێژخایەنی بنەماڵەی بارزانیو خێڵەکانی تر بەباشیی لەلایەن حکومەتی عێراقەوە بەڕێوەبرا، هەروەها ڕاکێشانی دەستەی ڕۆشنبیرە چەپەکان لەنێو کوردانـدا، ئەوانەی ڕقیان لە ڕێبەرایەتییە نەریتییەکە دەبۆوە.**

**دوای دارمانی جووڵانەوە کوردییەکە، حکومەتی عێراق سیاسەتی تەعریبی**

---

کۆمەڵە بوون. هەرچەندە، هەستی توندی چەپگەرایی کە هەر لەسەرەتاوە هەڵسورانی ئەوانی جیادەکردەوە، تێکەڵ بە ڕەتکردنەوەیان بوو سەبارەت بەوەی ڕێبەرایەتیی جووڵانەوەی نەتەوایەتیی کورد تەنیا مافێکی تایبەت بە بنەماڵەی بارزانی بێت، ئەوەی ئەو دابەشبوونەی گەورەکرد کە لەنێوان ناوچەی شارو گوندەکاندا هەبوون، بەتایبەتیش لەنێوان دەڤەری سۆرانییو بادینییدا. ئەوەش دابەشبوونی کوردستانی عێراقی تۆکمەتر کرد کە لە ئەمڕۆدا دیارە، ئەوەی لەمپەری سەرەکیی یەکگرتنەوەی هەرێمەکەو ئیدارەکەیە. بڕوانە:

گەراس ئار.ڤی. ستانسفیلد، کوردستانی عێراق . پەرەسەندنی سیاسیو پشکووتنی دیموکراسی، وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە: پرۆفیسۆر.ی. د.یاسین سەردەشتیی، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٢٠٣–٢٠٤.

53 McDowall (1996), P. 343.

٥٤ ئەمە بەدرێژیی لەباسی چوارەمدا قسەی لەبارەوە دەکرێت.

شانبەشانی سیاسەتی راگوازتنی کوردان پەرەپێدا. هەمان کات، پرۆسەی ناسەربازی سەبارەت بە بنیاتنانەوەی ناوچە کوردییەکان لەڕووی کۆمەڵایەتیو ئابوورییەوە لەلایەن سەرکردایەتی بەعسەوە ئەنجامدرا.[55] بەوهیوایەی پشتگیریی جەماوەری کورد بۆ حکومەت بەدەستبێنێت. هەرچەندە، مرۆ دەتوانێت گریمانەی ئەوە بکات کە ئەم مەبەستەی گرێدانی کۆمەڵایەتیو ئابووری کوردان بە "ئوممە"ی عێراقییەوە لەسەرەوەی ئەجێنداکانی بەغدا نەبووە سەبارەت بە بڕیارسازیی لەمەڕ هەرێمە کوردییەکە.

لەئوتی ١٩٧٧دا، لەلایەن حکومەتی ناوەندییەوە لێخۆشبوونێك بۆ چەکدارە کوردەکانی تاراوگە راگەیەندرا، ئەوەش بووەهۆی گەڕانەوەی ژمارەیەکی زۆری کوردان بۆ عێراق، لەپایزی ساڵی ١٩٧٩دا، شەش کەسایەتیی ناسراوی کورد پێگەی سیاسییان لە بەغدا وەرگرت کە راوێژیان لەبارەوی کاروباری کوردییەوە پێدەکرا،[56] واپێدەچێت کە دیدو بۆچوونی ئەم راوێژکارانە چ سەنگێکی لە کاروباری تایبەت بەکوردانــدا نەبوو، بوونی ئەوانە تەنیا شتێکی سیمبولیك بوو. بەڵام ئەوەی بۆ سەدام حسێن گرنگ بوو کە نوێنەرانێك بۆ کورد لەحکومەتدا پێشانبدات، لەو دەیەیەدا کە تێیدا سەرکەوتووانە توانی کۆتایی بە چەسپاندنی فەرمانڕەوایەتی خۆی بێنێت.

## ٤.١ دەیەی نائارامییە هەرێمییە سەرەکییەکان

لەسێپتەمبەری ١٩٨٠دا، کۆماری ئیسلامی ئێرانی خاوەن خولیا پان ئیسلامییەکان لەلایەن عێراقی دراوسێوە پەلاماردرا. رژێمی بەعسی سێکیولار کە فرە دژی بەسیاسییکردنی ئیسلام بوو، هەستی بە مەترسییکرد لەبەرامبەر رێحەزە ئایدیا شۆڕشگێڕییەکانی خومەینی کە پێگەیەکی بەهێزی لەنێو شیعە عێراقییەکاندا

55 Ghareeb (1981), p. 189.
56 Ibid. pp. 190-191.

هـەبوو. خوليـا هەژمونگـەراكانى سـەدام حسـێن بـۆ بەدەسـتهێنانى بالآدەسـتى لـە كەنداوو دەستبەسەرداگرتنى ناوچەى نەوتى پـڕ عەرەبنشـينى هـەرێمى خوزسـتان ( لەئێران بە عەرەبستان ئاماژەى بۆ دەكرێـت ) دەشـێت بـە گـرنگترين ئـەو هاندەرانـە دابنرێن بۆ ئەو دوژمنكارييەى عێـراق، ئـەوەى جارێكى تـر كوردى هاويشـتەوە نێـو دەيەيەكى نوێى دژواريى‌و ئالۆزيى هاوپەيمانى‌و بەڵێنشكێنيى.

لەماوەى جەنگى ئێـران-عێـراق، ئێرانييـەكان زۆر لـەبوارى بـەكارهێنانى كـوردان بـۆ قــازانجى خۆيــان ســەركەوتووبوون،[٥٧] بــە چــەند نموونەيــەك، ئــەوان لــەوەدا ســەركەوتووبوون كـە پـارتى ديمـوكراتى كوردسـتان(پـدك)و حيزبـى ديمـوكراتى كوردسـتانى ئێـران (حـدكا) بەگـژ يـەكتردا بكـەن، بەشـێوەيەك كـە كـوردى عێـراق لـەجياتى تـاران شـەڕى كـوردى ئێرانـى دەكـرد. لەهـەمان كاتـدا، كـوردى عێـراق كەوتبوونـە بـەر سـەركوتكارييەكى تونـدى بەغـدا، ئـەوەى لەهەڵمەتـەكانى ئەنفالـدا گەيشتە لوتكە، كە ئامانجى قەلآچۆكردنى دانيشتووانى كورد بوو لە عێراق.

## ١. ٤. ١ چالاكييە ئێرانييە-كوردييەكان لەماوەى جەنگى ئێران-عێراقدا

بەدرێـژايى جـەنگى هەشـت سـاڵە، ئێـران ئـەو ياريزانـە هەرێمييـە بـوو كـە كوردانى عێراق مامەڵەى خۆيان لەگەڵ دەكردو لەلايەن ئەويشەوە بـەكاردەهێنران. هـەر لـەو كاتەى كە مەلاكان دانيشتووانى كورديان لەباكوورى عێراق هاندەدا، بەعسييەكانيش هــەر دەرفــەتێكيان دەقۆزتــەوە بۆئــەوەى رژێمــى شۆڕشــگێڕى ئێــران لاوازبكــەن بەيارييكردن بە كارتى كوردانى ئێران. ئەو مەسەلەيەى كە دواتـر لەلايـەن سـەرۆكى ئێرانـى دوورخـراوە ئەبولحەسـەن بـەنى سـەدر پشتڕاسـتكرايەوە. ئـەو وتويـەتى كـە راپەڕينى كوردان‌و جەنگى دواترى كوردستانى ئێران پەيوەندى بەهێرش‌و پەلامارى عێراقەوە بوو. [٥٨]

---

57 Entessar (1992) p. 151.

٥٨ بڕوانە:

کشانەوەی ژمارەیەکی بەرچاوی سەربازانی سوپای عێراقی لەباکووری عێراق لەسەرەتای سالانی ١٩٨٠کاندا، بووەهۆی داواکاری زێدەتری ئامادەگیی سەربازیی لەبەرەی ئێرانەوە. ئەوەش وایکرد کوردان خەباتی چەکدارانەی خۆیان دژی رژێمەکەی سەدام حسێن پەرەپێبدەن، ئەم خەباتەش بەگەڕانەوەی ئەو پێشمەرگە جەنگاوەرانەی بەهۆی شکستەکەی ١٩٧٥ لەتاراوگەبوون، بەهێزتربوو، خەلکێکی زۆری لادێیش بەمانەوەی پەیوەستبوون، ئەوانەی لەلایەن حکومەتەوە ناچارکرابوون دەست لە زەوییەکانیان هەلگرن‌و لەو جێگایانەدا نیشتەجێبن کە لە "گوندی هاوچەرخ" ناودەبرا، ئەوەی وەك بەشێك لەپلانی بەعس بۆ تەعریبکردن‌و راگواستن لە کوردستان دروستکرابوون.[59]

ئەمەش وەك دەرفەتێکی باش هاتەپێش بۆ هێرشێکی بەهێزی کوردیی دژی عێراقییەکان کەلەبەر ئەو دابەشبوونە ئاشکرایەی نێو ریزەکانی جوولانەوە کوردییەکە لێی بێبەشبوو. یەکێتی نیشتیمانی کۆنترۆلی بەشی باشوورو رۆژهەلاتی کوردستانی عێراقی کردبوو، کەناوچەی سۆرانە، لەکاتێکدا پارتی دیموکرات لەبادینان بالادەست بوو کە لەباکوورو رۆژئاوایە. ململانێی ئەم هێزانە پێدەچوو لەپاش دامەزراندنی بەرەی نیشتیمانی دیموکراتی هێور بووبێتەوە، وەك رێکخراوێکی چەتری گروپە ئۆپۆزسیۆنە عێراقییەکان، کە ١٩ پارت‌و جوولانەوەی عێراقیی لەخۆگرتبوو. هەرچەندە، ئەو رێکەوتننامەیەی کە لەفێبرایەری سالی ١٩٨٣دا لە تەرابلوس بەستراو هانی یەکێتی دەدا دژی بەعسییەکان لەبەغدا، هەر زوو لەلایەن هاوبەشە نارازییەکانەوە پێشێلکرا، ئەوانەی جگە لەپارتە کوردییەکان، عەرەبە نەتەوەیی‌و شیعەو کۆمۆنیستەکانیشی لەخۆگرتبوو.ئەم لەبەریەکهەلوەشاندنەوەیەی جوولانەوەی ئۆپۆزسیۆنی عێراقیی، کاریگەرییەکی

---

My Turn to Speak: Iran, the Revolution and Secret Deals with the U.S. (1991), London: Brassey's.

59 Karadaghi (1993), P. 220.

ئاشكرای كرده سەر چالاكییە سیاسیەكان لەكوردستان، لەوێ شەڕی نێوان هەر دوو دوژمنە سەرەكییەكە لەبەهاری ١٩٨٣دا هەڵگیرسایەوە.[٦٠]

وێڕای جەنگی نێوخۆی كورد، فشار لەسەر سوپای عێراق توند ببۆوە، لەكاتێكدا پێشمەرگە بەشێوەیەك بەرگرییان لەسنووری كوردستان دەكردو دەیانپاراست. ئەوان سەركەوتووانە ئەمەیان ئەنجامدا بەشێوەیەك دەتوانرێت بەڕاستی ناوچەكەیان بە "ناوچەی رزگاركراو" بناسرێت. هەرچەندە، لەم كاتەدا، یەكێتی نیشتیمانی كوردستان وەك گروپێك دەردەكەوت كە فشاری زیاتری بەسەرەوە بێت، چونكە وێڕای پارتی، لەگەڵ دوو هێزی هەرێمیدا لەجەنگدا بوو. وەرگرتنی وچانێكی سەربازیی بۆ سەركردایەتی یەكێتی زۆر پێویست بوو. ئەوەی كە بەشێوەی دانوسانێكی نهێنی لەگەڵ حكومەتی عێراقییدا دەستیپێكردو لە دیسەمبەری ١٩٨٣دا لەگەڵ یەك كەوتنە دانیشتنو تێگەیشتن.[٦١]

یەكێتی نیشتیمانی كوردستان داواكارییەكانی خۆی پێشكەشكرد، لەوانە داوایكرد ناوچە كوردییە ئۆتۆنۆمە پێشنیازكراوەكە بەچەشنێك فراوان بكرێت،لەهەمووی گرنگتر، شاری كەركوكی پڕنەوت بگرێتەخۆ. وێڕای ئەوەش، ٣٠٪ی داهاتی نەوتەكەشی داواكرا بەمەبەستی گەشەپێدانی كوردستان. هەروەها دەسەڵاتدارانی بەعس كۆتایی بە سیاسەتی تەعریبو راگواستنی ناوچە كوردییەكان بێنن، هەروەها دەسەڵاتێكی ئۆتۆنۆمی دیارییكراو بدرێتە كوردانو هێزی میلیشیای پێشمەرگە وەك هێزێكی بەرگریی نیشتیمانی بۆ قەوارە ئۆتۆنۆمەكە پەسەند بكرێت.[٦٢]

هەرچەندە، لەڕاستییدا وەك پاشتر دەركەوت، هەموو شتەكان بەڵگەی ئەوەیان بەدەستەوەدەدا كە رێكەوتنە كاتییەكە تەنیا شێوازێك بوو بۆ كات بەدەستهێنان

60 Ibid. pp. 220-221.
61 Ibid. p. 202.
62 McDowall (1992), P. 104.

لەپێناو بنیاتنانەوەی ڕێکخستنەکانتی خۆیاندا، بەتایبەت ئەو ڕێکەوتنە هەرگیز بەئاشکرا ڕانەگەیەنرا.[٦٣] زۆری نەخایاند لایەنە دانوسانکارەکان ناکۆکییان تێکەوتەوەو لەسەروبەندی پایزی ١٩٨٤دا لەکاری سەربازیی گلانەوە.

دانوسانی ڕاستەوخۆ لەگەڵ سەدام حسێن بەشێوەیەکی بەرچاو بووەهۆی بێمتمانەیی جەلال تاڵەبانی لەنێو کورداندا، ئەم ناڕەزایەتیە جەماوەرییە لەیەکێتی نیشتیمانی بەقازانجی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو، بەخێراییش نفوزی لەوناچانەدا پەیداکرد کە بەناوچەی نفوزی نەریتی یەکێتی دادەنرا. پارتی بەسەرکردایەتی مەسعود بارزانی لەناوەڕاستی ١٩٨٠کاندا هاوپەیمانی کۆماری ئیسلامی ئێران بوون هەردوولاش پێکەوە لەچالاکیە سەربازییەکانی دژبە عێراقدا هەماهەنگییان دەکرد. هەروەها پارتی پەیوەندی نزیکی خۆی لەگەڵ پارتی کرێکاران PKK (پارتێکی ڕادیکاڵ و بنکەی لەکوردستانی تورکیا بوو ) پەرەپێدا، ئەو هاوپەیمانییەی کە بەرجەستەی " هاوپەیمانێتییەکی سەیری نەریتییەکانو ئایدیۆلۆجیستی چەپگەرا توندڕەوەکانی پێکدەهێنا." [٦٤]

ئەم هاوپەیمانێتییەو هەموو هەماهەنگییە سیاسیو سەربازییەکانی تری گروپە کوردییەکان لەگەڵ بوونی "جاش[٦٥]/ ئامـاژە بوو بەجۆرێك لەبەکرێگیراوی لەخزمەتی حکومەت، ئەوانەی زیاتر چەکداری خێڵە کوردییەکان بوون کە خولیایەکی سیاسییان نەبوو "دا کارێکی ئەستەم بوو، ئەمانە پێش ساڵانی ١٩٨٠کان لەناوچە کوردییەکان دەرکەوتبوون، هەرچەندە بەژمارەیەکی کەم، بەڵام لەکاتی جەنگەکە لەگەڵ ئێران ، حکومەتی عێراق بە گەلە جاشی دروستکرد، ئەمانە بۆ شوێنپێهەلگرتنی پێشمەرگە لەشاخەکان و پەلاماردانیان بەکاردەهێنران، ئەوەی کە

63 Entessar (1992), p. 132.
64 McDowall (1989), p. 25.
٦٥ ناوە کوردییەکە مانای بەچکەکەرە، عەرەبییەکەشی کە "فورسان" ە مانای شۆڕەسوارە.

پارەو چەك‌و جیاوکی خستبوونە بەردەست.[66] ئەم جاشە نانیزامییانە لەلایەن پێشمەرگەوە وەك رەگەزێکی مەترسیدار لەقەڵەمدەدران، چونکە ئەوان بەپێچەوانەی سوپای نیزامییەوە بەژیانی شاخ‌و کێوەکان‌و جەنگی چەتەگەریی ئاشنابوون.

لەمایۆی ۱۹۸۷دا، دامەزراندنی بەرەی کوردستانی راگەیەندرا.[67] ئەم پێکهاتە نوێیە شەش پارتی کوردیی عێراقی لەخۆگرتبوو، لەلایەن تارانیشەوە بەتوندیی پشتگیریی دەکرا، بەوهیوایەی کە یەکێتی نێوان کوردان پێویست بە بوونی سوپایەکی مەزنتری عێراقیی لەباکوور دەکات‌و ئەوەش فشارو توندیی سەر بەرەکان کەمتر دەکاتەوە. لەڕاستییدا، ئەوە مایەی رەزامەندی ئێران بوو کە لەساڵی ۱۹۸۷دا، دوو فەیلەق لە حەوت فەیلەقی سوپای عێراق بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ مەترسییە کوردییەکە تەرخانکرابوو.[68] ئەوەش فشارو دژوارییە سەربازییەکانی لەسەر سنووری ئێران کەمکردبۆوە.

لەپاش ئاگربەستی نێوان ئێران-عێراق لەئوتی ۱۹۸۸دا، سەدام حسێن بڕیاریدا سوودێکی زیاتر لە گەنجینەی چەکە کۆکوژەکانی بکات، ئەو هێرشێکی بەرفراوانی دەستپێکرد بەو مەبەستەی بەتەواوی چۆك بەکوردان دابدات، بەچەشنێك هەر ئەگەرێکی سەرپێخستنەوەی بەرگرییەکی کوردیی بەتەواوی لەنێوبەرێت، ئەم جۆرە نوێیە لەشەڕو پەلامار دەریخست کە تەنانەت تاقە هاوڕێکەی کوردانیش کە شاخەکانە چیدی ناتوانێت کوردان لەپەلاماری دوژمن بپارێزێت."[69]

66 Karadaghi (1993), P. 222.
67 Ibid. p. 224.
68 McDowall (1989), p. 27.
٦٩ ئەمە ئاماژەیەکە بۆئەو پەندە کوردییەی کە دەڵێت " کوردان دۆستیان نییە تەنیا چیا نەبێت"

## ٢. ٤. ١ ڕاگواستن و جێنۆساید لەکوردستانی عێراق

چـەمکی جێنۆسـاید[٧٠] لەسـاڵی ١٩٤٤دا داهێنـراوە، کاتێـك قەڵاچـۆکردنی جـووە ئەوروپییەکان بەهیچ یەك لە زاراوەکانی دیکە نەدەتوانرا پێناسە بکرێت. هـەروەك یـاڤۆس تێرنـۆن تێبینیکـردووە، وشـەی جێنۆسـاید لـەڕووی مێـژوویی و ئیتیمۆلۆجییەوە، بەئایدیۆلۆجیای نازییەکان و تیۆرەکانیان سەبارەت بە ڕقلێبوونەوە لە ڕەگەزەکانەوە گرێدرابوو.[٧١] وێـڕای ئـەوەش، هۆلۆکۆسـت تـەنیا نەتـەوەکوژیی یـان

٧٠ ئەمە پێکهاتووە لە وشـەی گریکـی "جێنـۆ" کـەمانای ڕەگـەز یـان خێڵـە، "سـاید" واتـە کوشـتن بڕوانـە: Kuper (1982), p. 2. چەمکی "جینۆساید" بۆ یەکەمجار لەلایەن زانای یاساناسـیی پۆڵەنـدیی "ڕەفائیـل لیمکین"ەوە بەکارهێنراوە، هەروەها ئەم چەمکە لە تاوانبـارکردنی تاوانبـارانی جـەنگی نازییـدا لـە نۆرەمبێرگ لەساڵی ١٩٤٤دا دەرکەوت. لیمکین نووسەری سەرەکیی ڕێکەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکانی سـاڵی ١٩٤٨بـوو بۆ قەدەغەکردن و سزادانی جینۆساید. ئەنجومەنی گشتیی نەتەوە یەکگرتووەکان، لـە بەرامبـەر کارەسـاتەکانی جەنگی دووەمی جیهانییدا، لەو بەیاننامەیەدا کە لە ١١ی دیسـەمبەری ١٩٤٦دا بڵاویکردۆتـەوە، ڕایگەیانـدووە " جینۆساید لە یاسای نێودەوڵەتییدا تاوانـە، بەپێچـەوانەی پشـتگیریی و پێداگرییـەکانی نەتـەوە یـەکگرتووەکان، هەروەها لەلایەن جیهانی شارستانییەوە ڕیسواکراوە". جینۆساید لەلایەن ئەنجومـەنی ئـابووریی و کۆمەڵایـەتیی نەتـەوە یەکگرتووەکانـەوە شـرۆڤەی زیـاتری لـەبارەوە کـراوە، ئـەوەی کۆمیتەیـەکی تایبـەتی دامەزرانـد، ئـەو کۆمیتەیەی کە ڕێکەوتننامەی ٩ی دیسـەمبەری ١٩٤٨ی دژی جینۆسـاید سـەلماند. بـەگوێرەی بەنـدی دووەمـی ڕێکەوتننامەکە:

جینۆساید مانای ئەوەیە کە ئەم کارانەی خوارەوە بەئەنقەست بکرێت بۆ تێکـدان و وێرانکردنـی، تـەواوی یـان بەشێکی : نەتەوەیەك، ئیتنێك، ڕەگەزێك، یان گروپێکی ئاینیی، هەر وەك:

١- کوشتنی ئەندامانی گروپەکە.

٢- گەیاندنی زیانێکی جدیی جەستەیی یان عەقڵیی بە ئەندامانی گروپەکە.

٣- بە مەبەست گورز لە هەلومەرجی ژیانی گروپێك بدرێت بە حیسابی ئەوەی تووشی تێکشکاندنی فیزیکیی، تەواو یاخود بەشێکیان، بێن.

٤- ئەو هەنگاوانە بسەپێنرێت کە مەبەست لێی ڕێگرتنە لە لەدایکبوون لە گروپەکەدا.

٥- بەزۆر منداڵی گروپێك بۆ گروپێکی تر بگوێزرێتەوە.(و) بڕوانە:

Yearbook of the United Nations 1947-48, 595-599; Yearbook of the United Nations 1948-49, 958-959.

71 71.Tenon (1989), p. 132.

رەگـەزكوژیی مەبەسـتداری خـەڵكانێك نییـە كـە بەدرێـژایی مێـژوو روویـدابێت. جێنۆساید بەم شێوەیە ناسرا:

" بەرنامەیەكی وردو ئاڵۆز، پەلامارێكی هەماهەنگ دژی هەر رووخسارێكی گروپێكی نەتەوەیی كـە ببێتـە هۆی لاوازكـردنو قەڵاچۆكردنو هـەروەها سـەپاندنی مۆدێلی نەتەوەی سەركوتكەر بەسەر قوتاربووەكاندا"[72]

بەندی دووەمی رێكەوتننامەی نەتـەوە یـەكگرتووەكان سـەبارەت بـە جێنۆسـاید ئـەم كارانـە دەستنیشـان دەكـات كـە ئەنجامـدەدرێن بەمەبەسـتی لـەناوبردنی، تـەواو یـان بەشێكی، گروپێكی نەتەوەیی، رەگـەزیی یـان ئـایینیی."[73] ئـەم جـۆرە كـارە وەحشـیانە دەبێت لەسایەی یاسای نێودەوڵەتیدا بەتاوان لەقەڵەمبدرێتو لەلایەن دادگای تـاوانی نێودەوڵەتییـەوە ریسـوا بكرێـتو سـزا بـدرێت. هەرچـەندە، دەرهاویشـتنی گروپـە سیاسییەكان لەرێكەوتنەكە شـتێكی بەرچاوە، ئەمـەش وایكـرد، رژێمـی عێـراق بـۆی بلوێت كـە لەهـەر ئیدعایـەك سـەبارەت بەجێنۆسـایدكردنی دانیشـتووانە كوردەكـەی لەلایەن كۆمـەڵگای نێودەوڵەتییـەوە بـەدووربگرێت، ئیدعایـەك كەلەسـەر بنـەماكانی رێكەوتننامەی نەتەوە یەكگرتووەكان وەستابێت، لەجەختكردنەوە لەوەی كە كوردان گروپێكـی سیاسـیو كۆمەڵایـەتی ناپەیوەسـت پێكـدەهێنن. كـوردان " گرفتێكـی بایەلۆجی" نین وەك ئەوەی جووەكان لەسایەی نازییەكانـدا بـوون، بـەڵكو گرفتێكـی تـەواو سیاسـیین، هـەروەها رەگەزگـەلێكی نـامۆن بەهـەر هەوڵگـەلی بەعسـییە عێراقییەكان لەپێناو ئەفراندنی شوناسێكی نیشتیمانی عێراقیی بەرجەستە.

زیگمۆنـت بـەومان جێنۆسـایدی "هاوچـەرخ" بـەوە لەقەڵەمـدەدات كـە لـەنێو چوارچـێوەی قەڵـەمڕەوی وڵاتێكدایـەو ببێتـە " رەگـەزێكی ئەندازەسـازیی كۆمەڵایـەتی." [74] ئەمـەش ئـەو گریمانەیـە بـوو كەچـۆن بەعسـییەكان دركیـان بـە سـتراتیژییەكان دەكـرد بـۆ وەرچـەرخانو گواسـتنەوەی دەوڵـەتی عێـراق. بـۆ

72 Ibid. p. 129.
73 Kuper (1982), p. 2.
74 Bauman (1989), p. 91

جێبەجێکردنی سیاسەتە تەعریبەکەی بەعس، کە هەر لەسەرەتای ساڵی ١٩٦٣وە بەئاستێکی بەرتەسك دەستیپێکربوو.[٧٥] حکومەتی عێراقیی بەهەمان شێوازی دەسەڵاتە کۆنە کۆڵۆنیالییەکانی پێشوو هەڵدەسوڕا. گەلی کورد لەزێدی خۆیان ریشەکێشکرانو برانە هەرشوێنێکی تر نیشتەجێکران، وەك بیابانەکانی باشوور، هەروەها رەگەزی عەرەب هێنرانو لە زێدی کوردانەدا نیشتەجێکران. ئامانجی حکومەتی عێراق ئەوە بوو کە دانیشتووانی کورد لەنێو شارە گەورەکاندا لەباکوور خڕبکاتەوە یاخود بیانخاتە شارۆکە نوێیەکانەوە کە لەژێر چاودێری سوپادا بوون. ئەمە بیرکردنەوەیەی بەغدابوو سەبارەت بەوەی کە چۆن کورد کۆنترۆڵ بکات-لەڕاستییدا بەعسییەکان رەوشێکی مەترسیداریان خولقاندبوو کە لەلێواری تەقینەوەدا بوو.

چۆڵکردنو راگواستنی ناوچە کوردییەکان بۆ رژێمی بەغدا پرۆژەیەکی بێبایەخ نەبوو. هەروەك لەزۆربەی راپۆرتەکاندا سەبارەت بە بابەتەکە دەرکەوتووە، ئەوەی باس لەتەختکردنی نزیکەی ٤٠٠٠ گوندو شارۆکەی کوردیی دەکات.[٧٦] تراژیدییە مرۆڤایەتییەکە بەلایەك، لەڕووی ئابووری سیاسیەوە ئەم سیاسەتە بەتەواوی ناعەقڵانی بوو، مەزنترین زیانی ئەوە بوو کە ئەو وڵاتە سەرچاوە سەرەکییەکانی بەروبومە خۆراکییەکانی وێرانبوو، کە وایکرد عێراقی پێشووی خودکەفاو خۆژێن ناچاربکات بڕە خۆراکێکی زۆر لەدەرەوە هاوردە بکات.[٧٧]

چۆڵکردنی کوردستان بڕبڕەی پشتی سیاسەتی بەعسی سەبارەت بەکێشەی کورد پێکدەهێنا، سیاسەتێك کە دواتر بەچەکی کیمیایی تەواوکرا، ئەوەی پێشێلکردنی پرۆتۆکۆڵی ساڵی ١٩٢٥ی جنێف بوو، کە بەکارهێنانی هەموو جۆرە گازێکی ژەهراوی

75 Human Rights Watch/Middle East (1995), p. 24.
76 ForsstrOm DN, 23 March, 1990, (This specific article named 3,968 ruined villages, with other sources providing similar numbers, i.e. between 3,900 and 4,000.).
77 David McDowall notes that the Kurdish parts of Iraq 'produced approximately half Iraq's wheat crop and one third of its barley', (1996), p. 390.

قەدەغـەكردبوو. [78] سەرچـاوە كوردييـەكان بانگەشـەی ئـەوەيانكرد كەپەلامارگـەلێكی كيميـايی بـەرفراوان لەلايـەن دەسـەڵاتدارانی عێراقييـەوە لەسـەرەتای سـاڵی ١٩٨٤دا دەستپێكردووە. [79] بەيانـنامەگەلێك كە لەلايەن لێكۆڵەرانی نەتەوە يەكگرتووەكانەوە مۆركرابوو باسيان لە بەكارهێنانی گازی ئەعسابو خەردەل دەكرد لەهەمان ساڵدا. [80] ناوچە گوندنشينەكانی كوردستان لـەڕووی ديمۆگرافیو ژينگەييـەوە وێرانبـوون، ئـەو وێرانكارييـە مرۆيـیو ژينگەييـەی لەبەشـێكی زۆری بـاكووری عێراقـدا روويانـدا. دەســەڵاتدارانی عێــراق ئۆپەراســيۆنی پاكتاوكارييــەكانی خۆيــان تــەنيا لــەو ١٠كيلۆمـەترەی نزيـك سنووری ئێـران قـەتيس نـەكردبوو وەك ئـەوەی سـەبارەت بـە دابينكرنـی ڕاڕەوێكـی پـارێزراو رايانگەيانـدبوو، بـەڵكو هـەروەها پـەلاماری ناوچـە كوردييەكانی ديكەشياندا. (بڕوانە نەخشەی ١. ٤. ١ ).

لەنێو ئەو هەموو وەحشيكارييەی ساڵانی ١٩٨٠كان لەكوردستانی عێراقدا ئەنجامدران، تـاوانی دەوڵـەت ئاشـكرابوو كـە لەلايـەن حكومەتـەوە ئەنجامـدرابوو، واپێدەچـێت بەبـەكارهێنانی زاراوەسـازيی ليـۆ كوپـەر، گونجاوبێـت كـە عێـراق وەك دەوڵـەتێكی ئيتنۆكراتيكی جێنۆسايدكار پێناسـەبكرێت. لـەم دەوڵەتانـەدا، گروپـە قوربانييـەكان دەبنـە يـاريزانێكی چـالاك لەكاتێكـدا هـەوڵی رزگـاركردنی خۆيـان لـەو شـێوازگەلی هەڵاواردنە دەدەن كەبەسەرياندا سەپێنراوە، داوای مافی سياسیو تەنانەت داوای مـافی ئۆتۆنۆمی دەكەن. [81]

دەوڵەتە جێنۆسايدكارەكەی سەدام حسێن بـە ئـەنفال دەناسـرێتەوە، كـە هەڵمـەتێكی بـاش رێكخـراوی قەڵاچـۆكاری گشـتگيربوو ئاراسـتەی كـوردانی وڵاتەكـەكرا. ئـەو هەڵمەتـەی كـە بەگشـتی پـێش جێبـەجێكردنی چـەند سـاڵێك پێشـتر پلانـی بـۆ داڕێژرابوو. وێڕای بوونی پرۆسەيەكی بەڕێوەبردنی باشی پلان بۆداڕێـژراو كـە كـارو

78 Ibid. p. 361.
79 The Kurdish Program, March 1989.
80 Simons (1996), p. 316.
81 Kuper (1990), p.33.

هـەنگاوی جێبـەجێکردنی سیسـتماتیکی لەچـەند هـەنگاوێکی سـەرکەوتووانەدا گرتەخۆ، عێراقییەکان لەگەڵ چەند "گرفتێکی کاریگەردا" تێوەگلان، هەروەك راوڵ هیلبێرگ دەریبڕیوە:

" رێگاگەلێکی زۆر نین تاکو کۆمەڵگایەکی هاوچەرخ بتوانێت ژمارەیـەکی مـەزن لـەو خەڵکە بکوژێت کە لەنێوجەرگەی خۆیدا دەژین. ئەمـەش گرفتێکی کاریگـەرە کـە مـەزنترین رەهەنـدی هەیـە، ئـەوەی ژمارەیـەکی نادیـار ئاسـتەنگو لەمپـەر دەگرێتەخۆ."[82]

سێ پێودانگـە سـەرەکییەکە بـۆ دیـاریکردنی کەیسێك بەجێنۆسـاید لەلایـەن کـورت جۆناسـۆنەوە پێشکەشـکراوە، کـە بەدڵنیاییـەوە لەگـەڵ هەڵمـەتی ئـەنفالی بەغـدا یەکدەگرنەوە، ئەویش:

١- پێویستە بەڵگە هەبێت بۆ...مەبەستی ئەنجامدەر.

٢- پێویستە گروپێك هـەبێت کـە قوربانیبوونەکـەی هەڕەشـە بێت لەسـەر مانـەوەی وەك گروپ.

٣- قوربانیبوونەکە دەبێت تاك لایەنە بێت.[83]

پێودانگی دووەمو سێیەم لەسەرەوە قسەیان لێکـراوە، بـەڵام لەوانەیـە پرسـی بەڵگـەو مەبەست پێویستی بـە قسـەکردنێکی زیـاتر هـەبێت. بەڵگەی ئاشـکرای فیزیکـی کـە زادەی پـەلاماری کیمیـایی بـوو بـە جەسـتەو رووی قورتاربووانـەوە بـوو- هـەزارەها کوردی ئاوارەی پەنابەر لەتورکیا، ئەوانـەی ئاژەڵـە برینـدارەکانیشیان لەگـەڵ خۆیـان بەسنووردا هێنابوو کە بـەر چـەکی کیمیـایی کـەوتبوون."[84] وێـڕای ئـەم بەڵگـە فـرە قانعکـەرە، داتـا نووسـراوە ئۆرجینالـە بڕواپێکراوەکـان لەکۆمیتـەی ئـەنفالی تایبـەت بەحکومـەت کەلـەماوەی راپەڕینـە چـەکدارییە کوردییەکـەی مـارتی ١٩٩١دا دەسـتی بەسەرداگیرا، کاتێك چەکداران بەشێوەیەك کەوتبوون بەسەر بڕێکی گـەورە لەبەڵگـە

---

82 Hilberg (1961), p. 4.
83 Jonassohn (1992). P. 19.
84 McDowall (1992), p. 128.

عێراقییەکان سەبارەت بەهەڵمەتەکە- ١٨ ملیۆن باون لەدۆکیۆمێنت یان ٤,٥ ملیۆن لاپەڕە، کەهەرگیز مەبەست ئەوەنەبوو رۆژێك بێت ئەمانە خۆر ببینن. ئەم هەموو ماتریاڵە رەسەنەی دەستی یەکەم هیچ گومانێکی نەهێشت سەبارەت بەمەبەستی خەتەرناکی رژێمەکەی سەدام حسێن لەمامەڵەکردنیدا لەگەڵ گرفتی کوردییدا. [85]
گەوهەرو ناوەرۆکی مەسەلەکە ئەوەبوو کە کورد کرابوونە ئامانج تەنیا لەبەرئەوەی کورد بوون، هەروەها پێدەچێت کە تێکۆشانیشیان لەپێناو قورتاربوون وەك گروپێکی ئیتنی جیاواز ناهاوسەنگ بوو، کاتێك ئامانجەکانی ئەنفال ئاشکرابوون: سەدام حسێن بڕیاریدابوو کە مەسەلەی خۆی لەگەڵ کوردانـدا یەکلابکاتەوە- ئەوانەی چارەکێکی دانیشتووانی عێراقیان پێکدەهێنا، وەك کۆمەڵ، وەك خەڵك.
ئەم نەخشەیە هێرشی کیمیایی عێراقییەکان دژی کوردانی سڤیڵ روونـدەکاتەوە لەماوەی هەڵمەتی سێیەمو چوارەمی ئەنفالدا، بۆ نموونە: لەئوتی ١٩٨٨دا، سێگۆشەی دهۆك ، زاخۆ وئامێدی. شایەنی باسە، ئەم ناوچەیە لێرەدا جێگای بایەخە، راستەوخۆ لەنزیك رێگای گشتیو رێگای ئاسنی کە عێراق لەڕێگەی تورکیاوە بە ئەوروپاوە دەبەستێتەوە، هەروەهل هێڵی بۆری نەوتی پڕبایەخی عێراق-تورکیادا. [86]




نەخشەی ١. ٤. ١ : سێگۆشەی مەرگ

85 Human Rights Watch/Middle East, (1995), pp. xix-xx
86 The Kurdish Program, March 1989.

ئەم هەڵمەتە سەربازییە بەناوی سورەتی هەشتەمی قورئانەوە ( ئەلئەنفال ) بوو، کە بەمانای "تالآن" دێت، تالآنی دەستبەسەرداگیراوی شەڕە، " ئەوەی فەرمانێکی قورئانی بوو دژی کافران"،[87] لەکاتێکدا رژێمی بەعس رژێمێکی بەسروشتی خۆی سێکیولار بوو، زۆر کەم بەوە ناسرابوون کە خۆپارێزیی ئاینییان هەبێت، وێڕای ئەوەش گرنگە ئاماژە بەوەبکرێت کە جێنۆسایدەکە بە بەکارهێنانی وتارێکی ئاینی رەوایەتی پێدرا، ئەوەی ئەنفال وەك ئامرازێکی پاگەندەی گرنگی جەنگەکە بوو، بەرجەستەکردنی هەڵمەتی دژەیاخییبوون لەهەمبەر جووڵانەوەی کورد لەچوار قۆناغدا جێبەجێکرا، کە هەریەکەیان دەستپێك و کۆتایی تایبەت و جیاوازی خۆی هەبوو، ئەوەی لەفێبرایەرەوە تاکو سێپتەمبەری ١٩٨٨ بەردەوامبوو، شێوەی پەلاماردانێکی بەکۆمەڵ و بێ جیاوازیی ئاسمانی گرتەخۆ کە هێرشێکی زەمینی بەدواداهات.[88] هەرچەندە، بڕوا وایە ئەم هەڵمەتە قەلاچۆکارییە ماوەیەکی درێژتری خایاندبێت. چونکە ئەو سزا دەوڵەتی و وەحشیکارییە رێکخراوە تەنیا لە حەوت مانگی ساڵی ١٩٨٨دا سنووردار نەکرابوو. رێکخراوی چاودێری مافی مرۆڤ کە بەڵگەیەکی زۆری لەبەردەستدا بوو، باسی لەوە کردووە گوایە ئۆپەراسیۆنەکان لەمارتی ١٩٨٧ەوە تاکو ئەپرڵی ١٩٨٩ی خایاندووە.[89]

یەکەمین قۆناغ هێرشە بەدناوە بەرفراوانەکەی سەر هەڵەبجە بوو لە ١١ی مارتی ١٩٨٨دا. فڕۆکە میراجە F1 عێراقییەکان بڕێکی زۆر بۆمبی کیمیاییان لە گازی بکوژی سیانیدو خەردەل و ئەعساب بەسەر شارێکدا بەردایەوە کە ٧٠,٠٠٠ کەسی تێدا دەژیا، ئەو هێرشەی کە نزیکەی ٥٠٠٠ کەسی کوشت کە زۆربەی قوربانییەکان خەڵکی سڤیلْ بوون.[90] ژاربارانکردنی هەڵەبجە لەبنەڕەتدا تۆڵەسەندنەوە بوو لەبەرامبەر بەشداریی کورد لەداگیرکارییە جدییەکانی ئێرانییەکان لەکوردستانی

87 McDowall (1996), P. 357.
88 Karadaghi (1993), P. 225.
89 Human Rights Watch \Middle East, (1995), p. 1.
90 Ibid. pp. 70-71.

عێراقدا.• "پاسدارانی ئیسلام" واتە سوپای ئێرانی، ڕۆژێك پێشتر ڕایانگەیاندبوو کە" خەڵکی موسوڵمانی هەڵەبجەیان لەدەسەڵاتو زوڵمی بەعسی ستەمکار ڕزگارکردووە."[91] پێدەچێت ئەو پەلامارە تۆقێنەرە لەبنەڕەتدا پێشاندانی توانای

---

• هەڵمەتەکانی ئەنفال بریتیبوون لە زنجیرەیەك هێرشو پەلامار دژی پێگە کوردییە–ئێرانییەکان لە کوردستانی عێراقدا کە تەواوی دانیشتووانی لەناوچەیەکی دیارییکراوی گوندنشیندا کردبووە ئامانج بە بەکارهێنانی چەکی سوننەتییو چەکی کیمیایی. لە شوباتی ١٩٨٨دا نزیکەی ١,٥ ملیۆن خەڵك ڕاگواسترانو زیاتر لە ٣٠٠٠گوند تەختکران. لە هەمووی بەدناوتر، لە ١٧ی مارتی ١٩٨٨دا (١٦ی مارت ڕاستە/سەردەشتیی) زیاتر لە ٥٠٠٠ هاوڵاتی سیڤیل لە هەڵەبجە بە چەکی کیمیاییو بۆمبای هێشوویی کوژران. لە کۆتایی ئۆپەراسیۆنەکەدا وا هەڵسەنگێندراوە کە ١٥٠–٢٠٠٠٠٠ کەس کوژرابن. ٤٠٠٠ گوندو شارۆچکە وێرانبووبێت، لانیکەم ١,٥ ملیۆن خەڵك بێلانەو بانە بووبنو لەشوێنێکی تر نیشتەجێکرابنەوە، هەروەها لە ژوونی ١٩٨٨دا ٤٥٠٠٠ لە ٧٥٠٠٠کم دووجا لە کوردستان پاککرایەوە.

ئامانجی وێرانکردنی بنکەکانی پێشمەرگە بەهێرشکردنە سەر ناوچە گوندنشینەکان بووەهۆی ئەوەی گوندەکان کەسی تێدا نەمێنێت، چ بەهۆی ڕاگواستنەوە یاخود بەهۆی چۆڵکردنەوە. ئەوەش وایکرد ڕێژەیەکی زۆری زەوییە کشتوکاڵییان بەکەڵکی کێڵان نەیەن بەهۆی بوونی مادەی ژەهراویی کیمیایی، یاخود بوونی بۆمبی نەتەقیوو ماین لەو زەوییانەدا. بۆ ڕێگرتن لە داگیرکردنەوە، حکومەتی عێراق بەتەواویی گوندەکانی تەختکرد. دارەکانی بڕینەوەو کانیاوو کارێزو بیرەکانی کوێرکردەوە. کاریگەریی ئەم حاڵەتە لەسەر کشتوکاڵ کاولکەر بوو، هەروەها میراتێکی شوومی بۆ سەدەی داهاتوو جێهێڵا. ژێرخانی گوندنشینان وێران بوو، ئۆردوگا پڕخەڵکە گەورەکان کە لەسایەی یاسای سەربازییدا بوون خاکی ناچەکەیان دەنەخشاند، دانیشتووانەکەش بۆ گوزەرانیان بەتەواوی پشتیان بە حکومەتی عێراقو سیستمی دابەشکردنی خۆراك دەبەست. ناوچە گوندنشینەکان چۆڵکرانو حیزبە سیاسییەکان لاوازبوون. ئامانجی سیاسیی پەیمانی جەزائرو هەڵمەتەکانی ئەنفال بە باشیی دیاریکراون، بەڵام هەروەها هەڵمەتەکان هێرشی ئابووریی بوون بۆسەر کۆمەڵگای کوردیی، کە ئامانجی لاوازکردنی ستراکتۆرەکە بوو کە بنەمای بۆ شێوەژیانو سیاسەتە کوردییەکە فەراهەمکرد. وێرانکردنی ئابووریی سوننەتیی کوردان کارێکی گشتگیر بوو، تێکەڵ بوو بە ئاستێکی بێوێنە لەو نەهامەتییە مرۆییەی بەهۆی ڕاگواستن، بێزارکردن، تیرەبارانکردنی سەرپێیو بەئامانجگرتنی خەڵکی سیڤیل بە چەکی ئاساییو چەکی کیمیایی هاتبووەئارا، لەسەروبەندی داگیرکردنی کوێتو دەستپێکردنی جەنگی دووەمی کەنداودا، کوردستانی عێراق خاکێکی وێرانی بێکاریگەربوو، کۆمەڵگاکەی فرە ڕێشەکێشکرابوو، حیزبە سیاسییەکانی لاوازوبێ ورە بوون، کوردانیش ببوونە گەلێکی بریندارو ماندوو. بڕوانە :

D. Menichini, Evaluation Report on Humanitarian Operations in Northern Iraq, report prepared on the request of the European Community Humanitarian Office (ECHO), January 1996, pp. 8–9.

91 Quoted from page three in the Teheran War Information Headquarters propaganda-style leaflet The Bloody Friday: Chemical Massacre of the

سەربازیی بێت. سەدام حسێن بەئاشکرا ویستی ئەوە پێشانبدات کەتەنیا بژارەی کوردان ملکەچبوون یان لەناوچوونە. لەپاش بۆمبارانەکە، دەسەڵاتدارانی ئێرانی بانگی رۆژنامەنووسانی بیانی کرد سەردانی شانۆی تاوانەکە بکەن تاکو بەچاوی خۆیان ئەو تاوانە درندانەیە ببینن کە لەلایەن عێراقییەکانەوە کراوە. هەروەها ئەگەر مەبەستی پاگەندەی ئێرانیەکان نەبووایە، تراژیدیای هەڵەبجە- هێرۆشیمای کوردیی- هەرگیز نەدەبووە جێگای بایەخی نێودەوڵەتی.

ئەمنستی ئەنتەرناشناڵ / رێکخراوی لێخۆشبوونی نێودەوڵەتیو حکومەتی ئێران پێکەوە کەوتنەکار بۆ ئەنجامدانی" هاوارێکی بەرفراوان دژی بەکارهێنانی گازی ژاراوی لەلایەن عێراقەوە"[٩٢] ئەمە بێزارییەکی نێودەوڵەتی لێکەوتەوە، هەرچەندە، نەیتوانی جگە لەوتارو هاوار شتێکی دیکەی لێ شین بێت، بەشێوەیەکی سروشتیی ئەمە ئاکامی واقیعیەتی سیاسی بوو، لەکاتێکدا کۆتایی جەنگی ئێران-عێراق خەریکبوو لەئاسۆ دەردەکەوت، حکومەتە رۆژئاواییەکان کەوتنە پێشبڕکێ بۆ بەدەستهێنانی ئەو تەندەرە قازانجهێنەرانەی تایبەتبوون بە بنیاتنانەوەی پاش جەنگ، بەتایبەتی بنیاتنانەوە ژێرخانی عێراق.[٩٣] لەو هەلومەرجەدا، ریسواکردنی شێوازی مامەڵەی بەغدا لەگەڵ کوردان بەئاشکرا ئایندەی مامەڵە دارایيەکانی لەگەڵ عێراقی فرەگرنگ لەڕووی ئابوورییەوە، دەخستە مەترسییەوە، بەوەش بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن رژێمەوە پشتگوێخرا.

دوای ئەو ئاگربەستەی بەهۆی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لەناوەڕاستی ژوئیەی ١٩٨٨دا هاتەئارا، ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان لەباکووری عێراق توندبوونەوە لەکاتێکدا ئەنفال بەرەو قۆناغی سێیەمو چوارەم دەڕۆیی، وەك هەوڵێکی تۆڵەسێنانەی سەدام

---

People of Halabja by the Iraqi Regime, (1988 Teheran). Also other, somewhat more independent sources confirm that the Iranian army seized Halabja in the days preceeding the Iraqi gas attacks: e.g. McDowall (1996), p. 357. 

92 Ezell (1992), p. 97.

93 McDowall (1996), p. 362.

حسێن دژی کورد کە لەماوەی جەنگەکەدا نەیاری بوون. ئەم پەلامارە ئەوەندە توندو دژواربوو کە سەرکردایەتی کورد نەیتوانی چیدی لەبەریا خۆی راگرێت، بەڵکو ئەو دوو ساڵەی لەو دوو دەیەی مابوو بەرەو تاراوگە ملبنێت.[٩٤] لەبەرامبەر ئەم پەلامارە بێرەحمانەیەی عێراقییەکاندا، سەرکردایەتی کورد کۆبوونەوەو هاوپەیمانییەکیان پێکهێنا بەناوی بەرەی کوردستانی یەکگرتوو، بەگوێرەی مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی لەچاوپێکەوتنێکی ساڵی ١٩٨٩دا: " ئەمە کاتێکی نموونەییە بۆئەوەی یەکگرتن لەڕووی کردارییەوە بێتەدی."[٩٥]

جەنگی کیمیایی لەلایەن هێزەکانی عێراقەوە وایکرد زیاتر لە ١٠٠,٠٠٠ ( ئامارێکی رێکخراوی پزیشکی کوردستانە لەسوید کە راپۆرتی خۆی سەبارەت بە پرسەکە داوە) خەڵکی سڤیل لە بەشی باکووری کوردستانی ناوەندیی ماڵوحاڵی خۆیان جێبهێڵنو لەپێناو ئەگەری ئایندەیەکی سەلامەتر پەنا بۆ تورکیا بەرن. هەرچەندە، لەسەر خاکی تورکیا، خەڵکی سڤیل بە بیاوو ژنو منداڵەوە بە پێشمەرگە ئاماژەیان بۆ دەکرا. وێڕای ئەو راستییەی کە ئەم خەڵکە چووبوونە حاڵەتی ریزبەندی پەنابەری راستیینەوە، بەڵام لەلایەن حکومەتی تورکیاوە حاڵەتی پەنابەریان پێنەدرا.[٩٦] دەسەڵاتداران لەئەنکەرە ئەمانەیان تەنیا بە "میوانی کاتیی لەتورکیا"[٩٧] ناودەبرد. میوانگەلێك کە خزێنرابوونە نێو چەند کەمپێکەوە کە لەلایەن سەربازانەوە پاسەوانی دەکرانو پێویستی تەواویان لەخۆراكو خێوەتو جلوبەرگ بۆ دابین نەکرابوو. ئەمە رەوشێك بوو کە بێهیوایی تێدا باڵادەست بوو، کاتێك دەیەی نائارامییە هەرێمییە سەرەکییەکان لەوەیدابوو رێگە بۆ قۆناغێکی نوێ لەسیاسەتی کوردییدا چۆڵ بکات.

---

94 Karadaghi (1993), p. 226.
95 Laizer (1991), p. 132.
٩٦ جێگای سەرنجە، تورکیا کە لەپاش دووەمین جەنگی جیهانییەوە واژۆی لەسەر رێکەوتننامەی نێودەوڵەتی بۆ پێدانی ماڤی پەنابەرێتی سیاسی کردووە، لەڕووی کردارییەوە ئەوپەنابەرانەی لەسنوورەکانی باشوورو رۆژهەڵاتییەوە ئەو مافەیان نەدەدرایە.

Randal (1998), p. 65.
97 Ahmad (1989), p. 4.

## ٥. ١ وەرچەخانەکان لەمێژووی کورددا

لەماوەی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، وردە وردە ئاشکرابوو کە سەرکوتکردنی کوردان مەترسییەکی جدیی بۆ ئاسایش‌و جێگیریی تەواوی ناوچەکە پێکدەهێنا.[98] لەوانەیە ئەم واقیعە هەرگیز وەك سەرەتای ساڵانی ١٩٩٠کان زێدە دەرنەکەوتبێت، کاتێك عێراق پاش بەزینی لەکوێت پەلامارە دوژمنکارییەکانی خۆی دژی کوردانی خۆی ئەنجامدا، ئەوەی قەیرانێکی گشتی هەرێمی لێکەوتەوە. پاش دانی باجێکی زۆر قورس، کوردانی بێناو، بەخۆیان‌و نەهامەتییەکانیانەوە لەسایەی حوکمی سەدام حسێندا، هاتنە نێو ناوان، زیاتر لەناکاودا، خەڵکە سەرکوتکراوەکە خۆیان لەبەردەم بایەخێکی جیهانیدا بینیەوە، دەرفەتێکیان هاتەپێش کە بەدرێژایی تەمەنیان چاوەڕێی بوون: ئەویش قەوارەیەکی ئۆتۆنۆمی کوردیی بوو لەکوردستانی ناوەندیی کەلەلایەن رۆژئاواوە دانیپێدانراو پشتگیریشکرا.

### ١. ٥. ١ راپەڕینی کوردیی‌و دامەزراندی کوردستانی ئازاد[99]

بەزینی سوپای عێراق لەکوێت لەفێبرایەری ١٩٩١ بەدەستی هێزە هاوپەیمانەکان بووەهۆی هەڵگیرسانی یاخیبوونێکی چەکداریی لەباشوورو باکووری عێراق. دانیشتووانی پارێزگا کوردییەکان هەمان نموونەیان گرتەبەر کە دانیشتووانی شیعە لە بەسرەو کەربەلا بەتوندی راپەڕین، ئەوانە بەئاشکرا لەلایەن بۆشی سەرۆکی ئەمەریکاوە هاندران کە بەردەوام داوای لە خەڵکی عێراق دەکرد کە" شتەکان بگرنە دەستی خۆیان، بۆئەوەی سەدام حسێن ناچاربکەن وازبێنێت."[100] بەپێچەوانەی

---

٩٨ سامی زوبەیدە بەدرێژی باس لەم کەیسە دەکات، بڕوانە پێشەکشییەکەی:
Stefan Sperl and Philip Kreyenbroek (eds.) (1992), The Kurds. A Contemporaly Overview, London: Routledge,p1-9.
99 1f-9. .Figure 1.5.1 — The De Facto Autonomous Kurdish Region - for the area specifically designated as the Kurdish safe haven.
100 Bulloch and Morris (1992), pp. 11-12.

بـڕوای گشـتیی‌و چـاوەڕوانی چـەکدارە یاخییبووەکانــەوە، هــیچ دەسـتێوەردانێکی سـەربازیی لەلایــەن هێــزە فرەنەتەوەکانــەوە دابــین نــەکرا بــۆ پشــتگیرییکردنی هەوڵــەکانیان لــەپێناو لەدەسەڵاتخســتنی ســەرۆکی عێــراق. بڕیــاری نەتــەوە یەکگرتووەکان، کە لەسایەیدا هاوپـەیمانی بەرابـەری ئەمـەریکا هەڵدەسوڕا تـەنیا بـۆ رزگـارکردنی کوێـت بـوو نـەك سـەبارەت بـەوەی کـە چـۆن عێـراق فەمانڕەوایـەتی بکرێـت.[101] ئـەوەش ئـەو لێکدانـەوە فەرمییـە بـوو کـە بۆچـی دەسـتی کراوەبـوو کـە مامەڵـە لەگـەڵ خەڵکـە یاخییبووەکەیـدا بکـات بەوشـێوەیەی خـۆی پێـی باشـبوو. هەرچــەندە، ئــەم رووداوانــەی هــاتن زیــاتر ئــەو مشــتومڕەیان هانــدا کــە داخــۆ پێشـێلکردنی بەکۆمـەڵی مـافی مـرۆڤ دەبێـت وەك مەسـەلەیەکی نێوخـۆیی مامەڵـەی لەگەڵ بکرێت.

دوای تێکشکاندنی راپەڕینەکە لەباشوور، هێزە هەوادارەکەی بەغدا روویان لـەباکوور کرد بۆئـەوەی دەسـەڵاتی حکومـەت بەناوچـە کوردییـەکان بگێڕنـەوە. لەوکاتـەدا کـە کۆتـایی مـارت بـوو، چـەکدارە راپـەڕیوەکان دەسـتیان بەسـەر تـەواوی کوردسـتانی عێراقــدا گرتبــوو، لەوانــەش شــاری گرنگــی ســتراتیژیی کــەرکوك‌و دامودەزگــا نەوتییەکـەی.[102] ئامـانجی درێژخایـەنی چـەکدارە راپـەڕیوەکان ئـەوەبوو مەسـەلەی تــەواوی جێبــەجێکردنی رێکەوتننامــەی ئۆتۆنــۆمی ســاڵی ١٩٧٠ ببوژێننــەوە. دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی لایـەنگریی لـێ نـەدەکرا، دەیـانزانی کـە حاڵــەتێکی بــەم چەشــنە نارەزایەتییــەکی توونــدی لەلایــەن تورکیــاو ئێرانــەوە لێدەکەوێتەوە، هەرچەندە، سەرکردەی گروپە عێراقییەکان کـە نـەیاری رژێـم بـوون لەبەغـدا، پەیوەنـدیان کـردو مشـتومڕ سـەبارەت بـە پێکهێنـانی جووڵانەوەیـەکی دژەحکومەت دەستپێکرد. لەئاکامی ئەمەدا، لەناوەڕاستی مارتدا، بەرەی کوردستانی

101 Cf. UN Resolution 678, November 1990. For the full text of all UNSC Resolutions, see the UN Documentation Centre at http://www.un.org/documents/.
102 Laizer (1996), pp. 4-5.

یــەکگرتوو، پێکــەوە لەگــەڵ گروپــە ئۆپۆزســیۆنەکانی دیکــەی عێراقیــی لەوانــە شیعەکان‌و کۆمۆنیستەکان و چەند دانەیەکی دیکە، لەبەیروت بەمەبەستی گرتنی کۆنفرانســێك کۆبوونــەوە، کەتێیــدا جــەختی گــەورە لەســەر گرنگیــی یــەکێتی‌و هەماهەنگیی هێــزە ئۆپۆزســیۆنەکانی کرایــەوە. کۆنفرانســەکە لەســەر دامەزرانــدنی دەوڵەتێکی دیموکراتی‌و فیدراڵی رێکەوتن، رژێمی سەدام حسێن بڕووخێنن، هەروەها بۆ کردنی ئەمەش، حیزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی لەدەسەڵات بخەن .[١٠٣]

هەر لەسەرەتاوە دەرکەوت کە راپەڕینە کوردییەکە لەڕووی رێکخستنەوە تەواو لاوازبــوو بۆئــەوەی بتوانێــت ســەرکەوتووبێت. ســەرەتا لەلایــەن خــودی خەڵکــەوە دەســتیپێکرد زیــاتر لەهــەر گروپێکــی سیاســی تــر، ئــەوەی دوایــیان رووبــەڕووی زەحمەتێکی زۆر بوونەوە سەبارەت بە رێکخستنی راپــەڕینێکی رەمــەکی کــە نزیکــەی دەســتیپێکردبوو. لەگــەڵ ئــەو رەتکردنەوەیــەی هێزەکــانی هاوپــەیمانی کــە لــەکوێت بڵاوکرابوونــەوە بــۆ یارمــەتی ســەربازیی بــۆ راپەڕینەکــە رووبــەڕووبوون. کــوردان نــەیانتوانی جگــە لــە ســێ هەفتــە بــۆ ماوەیــەکی درێــژ ناوچــەکەیان بــەرزگارکراویی بپــارێزن. رەهەنــدێکی دیکــە لەراپەڕینەکــەی ســاڵی ١٩٩١دا هــەبوو. راپەڕینەکــەی ١٩٩١ لەبنەڕەتــدا لەلایــەن ئەوانــەوە پشــتگیرییکرا کەپێشــتر لایــەنگری سیســتمەکە بــوون. ســەربازان لەهــەموو پلــەو پۆســتێك‌و هــەروەها کارمەنــدانی دەزگــای کــارگێڕیی بەراپەڕینەکــەوە پەیوەســتبوون، بــەڵام کــوردان کــە کەوتنــە تۆڵەســەندنەوە لــە شوینکەوتەکانی سەدام، راپەرینەکە بەرەو شکست ملی نــا. هــەڵاتن لەسوپای عێــراق وەســتا، ئــەوەش دەرفــەتی دایــەوە بەســەدام حسێن هێزەکــانی خــۆی رێکخســتەوەو بەوپەڕی دڕندایەتییەوە یاخیبووەکانی بێدەنگ کرد.

هێزە چەکدارە عێراقییەکان لەپەلامارێکدا لەسەرەتای ئەپڕێلدا کــەرکوك‌و هــەولێرو دهۆك‌و زاخۆیان گرتەوە، ئەوەی وەك باسدەکرا بووەهۆی کوشتنی دەیان هەزار کورد بە چەکدارو خەڵکی سڤیلەوە.[١٠٤] هەروەك هەڵمەتەکەی ئــەنفال کــە ســێ ســاڵ پێشــتر

103 Gestrin, Huvudstadsbladet, 6 April 1991
104 Ibid. p. 373.

لەکۆتایی جەنگی ئێران-عێراقدا ئەنجامدرا لەپێناو سزادانو قەڵاچۆکردنی کوردان، بەغدا ئاشکرایکرد کە ئەو شێوەپەلامارانە هێشتا لەبەرنامەیدایە.[١٠٥] هەربۆیە خەڵکەکە لەسۆنگەی ئەزموونەکانی پێشووەوە ترسێکی گەورەی لە دووبارە جینۆسایدکردنەوە هەبوو، هەربۆیە زۆربەی ئەو کوردانەی لەعێراق دەژیان هەڵاتن پێش ئەوەی سوپا ڕێگەی شاخەکان بەرەو ئێرانو تورکیا ببڕێت.

ئەم گرفتە مەزنەی پەنابەرانو تراژیدیا مرۆڤایەتییە سەختەکان حاڵەتێکی سەیری هێنابووەئارا کە لەشوێنێکی دیکە نموونەی نەبوو. هەروەك( UNHCR / کۆمسیۆنی باڵای نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پەنابەران ) تێبینیکردووە، هەرگیز پێشتر جیهان ئەزمونی ژمارەیەکی زۆر خەڵکی بەو چەشنە نەکردووە کە لەماوەیەکی ئەوەندە کورتدا زێدی خۆیان بەجێبێڵن. ڕاپۆتەکان هەواڵی ئەوەیان دەگەیاند کە ژمارەی




نەخشەی ١ .٥ .١ : هەرێمە ئۆتۆنۆمە دیفاکتۆکە[١٠٦]

١٠٥ لەکۆتایی پایزی ١٩٩٠دا، کاتێك هاوپەیمانەکان خەریکی خۆئامادەکردن بوون لەکەنداو، جێگرێکی باڵای خۆی لەبەغداوە نارد کەئەم پەیامەی هەڵگرتبوو:" ئەگەر ئێوە هەڵەبجەتان لەبیرچۆتەوە، ئەمەویّ بیرتان بخەمەوە کە ئامادەین ئەم ئۆپەراسیۆنە دووبارە بکەینەوە."

Bulloch and Morris (1992), p. 9.

106 McDowall (1996), p. 374.

کوردانی عێراق لەئێران بەشێوەیەکی سەیر لەنێوان حەوتەم و هەشتەمی ئەپڕڵدا لە ٥٦٣,٠٠٠ بۆ ٧٧١,٠٠٠ لەماوەی کەمتر لە ٢٤ ساتدا زیادیکرد.[١٠٧] تورکیاو ئێران لەژێر فشاری ناجێگیریی ڕەوشەکە لەسەر سنوورەکانیان هەوڵی بەدەستهێنانی هاوکاریی نێودەوڵەتییان کردو هانی نەتەوە یەکگرتووەکانیاندا چارەسەرێك بۆ ئەو قەیرانە مرۆییە بدۆزێتەوە.

ئەنجومەنی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٥ی ئەپڕڵدا بڕیاری ٦٨٨ی پەسەندکرد، کە سەرکوتکردنی خەڵکی سڤیلی عێراق ڕسوا دەکاتو داوا لەبەغدا دەکات زامنی ڕێکخراوە مرۆڤایەتییە نێونەتەوەییەکان بکات کەتوانای خۆیان بخەنەگەڕ بۆ بەهاناچوونی ئەو خەڵکەی پێویستیان بەیارمەتییە. هەرزوو پاش ئەوە ئۆپەراسیۆنەکانی فریاکەوتن دەستپێکرد..[١٠٨] وایکرد کوردانی پەنابەر بتوانن بەسەلامەتی بۆ عێراق بگەڕێنەوەو لەپەلاماری زیاتری سوپای عێراق بپارێزرێن. ئەو لێخۆشبوونە گشتییەی لەلایەن سەدام حسێنەوە بۆ هەموو کوردان دەرچوو بەجدیی وەرنەگیرا- دوای هەموو ئەمانە، چ کەسێك دەتوانێت ئەوە دیارییبکات کە کێ بە " ڕەگەزێکی تاوانکار" لەقەڵەم دەدرێت، ئەوەی لێخۆشبوونەکە نەیدەگرتەوە کەلەلایەن سەرۆکی عێراقییەوە ڕاگەیەندرابوو..[١٠٩]

ئەو هەلومەرجە تاڵەی کە زیاتر لە ملیۆنێك کوردی تێدا دەژیا بەرۆکی هەموو توێژەکانی کۆمەڵگای گرتبۆوە، هەموو ئەمانە کە لەپڕێکدا بوونە پەنابەرانی تۆقیوو هەڵاتوو، کاردانەوەیەکی بەهێزی ڕای گشتی لە جیهانی ڕۆژئاوا لێکەوتەوە، بەتایبەت لەئەوروپا، ئەوەی داوای کاری دەستبەجێی نێودەوڵەتی کرد بەقازانجی خەڵکە هەڵاتووەکە. ڕۆڵی میدیا لەم بارەیەوە زۆر بایەخداربوو، بەتایبەت رووماڵی ئەو کەناڵە تەلەفیزیۆنە فرەبینەرانە کە لەهێنانەئاراو توندکردنی ئەو فشارەدا زۆر

107 von Hall, SvD, 1 April 1991.
108 Frelick (1993). p. 235.
109 Chua-Eoan, Time, 15 April 1991.

کاریگـەربوو کـە کەوتەسـەر سیاسـەتکارو بڕیارسـازە ئـەوروپیو ئەمەریکییـەکان. هەروەك جۆناتان راندأڵ ئاماژەی پێداوە:" کوردان سەبارەت بە قورتـاربوونی خۆیـان یەکـەم جـارو دواجـار فـەرزاری تەلـەفیزۆنن، ئـەو ئـامرازەی بـەخێرایی رای گشـتی بۆخۆی راکێشا." [110] لەڕاستیدا ئەوە هێـزی رای گشـتی بـوو بووەهـۆی ئـەوەی جـێمس بیکەری وەزیری دەرەوەی وڵاتە یکگرتووەکان دوای کۆتـایی جـەنگ سـەردانی تورکیـا بکـات بۆئـەوەی کـەمپی ئاوارەکـان لەناوچـە سـنوورییەکە ببینێـت. وێـڕای کـورتیی سەردانەکە، دیمەنەکان کاریگەرییـەکی قووڵیـان کردەسـەر بیکـەر، ئـەوەی پێدەچـێت درکـی بـەوە کردبێـت کـە هـەوڵی گـرنگو کـۆنکرێتیی نێودەوڵـەتی پێویسـتە بۆچارەسـەرکردنی قەیرانـەکان. [111] هـەمان کـات، ئەوروپییـەکان بیریـان لـە بیرۆکـەی دامەزراندنی"پەناگـەی ئـارام" بۆکـوردان کـردەوە. لەکۆبوونەوەیـەکی لوتکـەی دیکـە لەسـەرەتای ئـەپرلی ١٩٩١دا، بریتانیـا بەرێبـەری جـۆن مێجـۆری سـەرۆك وەزیـران، پێشـنیازێکی پێشـکەش بـە " EC/ کۆمـەڵی ئـەوروپی" کـرد بـاس لەدامەزرانـدنی ناوچـەیەك دەکـات بـۆ ئـاوارە کوردەکـان لـەباکووری عێـراق کەلەلایـەن نەتـەوە یەکگرتووەکانەوە چاودێریی بکرێـت، ئـەو بیرۆکەیـەی کـە لەبنەڕەتـدا هـی تورگـوت ئۆزالی سەرۆکی تورکیا بوو. [112]

دەوڵەتانی ئەندام لەکۆمـەڵی ئـەوروپی پشـتگیریی پێشـنیازەکەی بریتانیایـان کردبـۆ دامەزرانـدنی پەناگەیـەکی ئـارامی کـوردیی لـەباکووری عێـراقو نەتەوەیـەکگرتووەکانیان هانـدا ئـەو دەستپێشـکەرییە بگرێتەئەسـتۆ. [113] هەفتەیـەك دواتـر، واشـنگتۆن رێچـکەی ئـەوروپای گرتەبـەرو هێـزی بـۆ پاراسـتنی کـوردان رەوانـەکرد. لەکاردانەوەیـەکی دەسـتبەجێ بـۆ کۆمـەڵی ئـەوروپی، عێـراق بەتونـدی ئـەوەی رەتکـردەوە کـە بـە پیلانگێڕیـی دانـابوو، هـەروەها ناڕەزایـەتیی دەربـڕیو

110 Randal (1998), p. 59.
111 Ibid. p.67-68.
112 Entessar (1992), p. 153.
113 Petzell, SvD, 9 April 1991.

بەدەستێوەردانی کاروباری نێوخۆی وڵاتەکەی لەقەڵەمدا. سەعدون حەمادی سەرۆك وەزیرانی عێراقی رایگەیاند:" ئەفراندنو گەورەکردنی ئەم گرفتە دروستکراوەو بەشێکە لەو زنجیرە پیلانگێڕییەی دژبە سەرەوەریی عێراقە." [١١٤] وەڵامێکی ئەرێیی زیاتر لەهەمبەر پلانەکەی کۆمەڵی ئەورووپی لەلایەن مەسعود بارزانیەوە بوو کە بە " دەستپێشکەرییەکی مرۆڤایەتی مەزن" و " هەنگاوێکی گەورەیە بۆ پێشەوە"، هەرچەندە، هۆشیارییدا کە پەناگەی ئارام تەنیا دەتوانێت وەك هەنگاوێکی کاتیی تاکو لەدەسەلاتخستنی سەدام حسێن خزمەت بکات. [١١٥]

لەگەڵ زەقبوونەوەی قەیرانە کوردییەکە، هاوپەیمانی جەنگی کەنداو هێزی رەوانەکرد بۆ بنیاتنانی کەمپی پەنابەران لەباکووری عێراق بۆ ئەو کوردانەی لەسنوورەکانی ئێرانوتورکیادا بەدوای پەنابەریدا وێڵن. [١١٦] دواتر بەغداش ئاگادارکرایەوە کە دەبێت چاوەڕوانی پەلاماری تۆڵەسەندنەوە بکرێت ئەگەر عێراقییەکان بەهەرشێوەیەك دەستوەردەنە ئەو ئۆپەراسیۆنە فریاگوزارییەی کە لەباکووری هێڵی ٣٦ی پانییەوە ئەنجامدەدرێت، هەروەها لەکۆتایی ئەپرڕڵدا پەنابەرانی کورد بەژمارەیەکی گەورە گەڕانەوە بۆعێراق. بەوەش، چەندین رێکخراوی ناحکومیی لەگەڵ چەند ئاژانسێکی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەرکی دابینکردنی خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکانیان لەناوچەکەدا گرتەئەستۆ. [١١٧]

بۆئەوەی کۆمەڵی نێودەوڵەتی کاریگەرانە سەرپەرشتی ناوچەکە بکات، لەوانەش دابینکردنی هاوکارییە مرۆڤایەتییەکان، هەروەها ناوچەی داخراوی ئاسمانی عێراقیش لەباکووری هێڵی ٣٦ بسەپێنێت، سیستمێکی چاودێری دامەزرێنرا. لەچوارچێوەی ناتۆدا، فڕۆکەکانی فرەنساو بریتانیاو تورکیاو وڵاتە یەکگرتووەکان لە بنکەی ئینجەرلیکەوە لە باشووری تورکیا کەوتنەکار، لەگەڵ ناوەندێکی هەماهەنگی

---

114 Ibrahim, /HT, 10 April 1991 (quoted by INA — the official Iraqi press agency).
115 I bid.
116 Ullenius, SvD, 18 April 1991.
117 McDowall (1996), pp. 375-376.

سەربازی کەدەکەوتە باکووری رۆژئاوای شاری زاخۆوە، لەسایەی رێپێدانێکدا کە هەر شەش مانگ جارێك لەپارلەمانی تورکیاوە درێژدەکرایەوە.[118]

لەمشتومڕێکدا لە نەتەوە یەکگرتووەکان کە چۆن هەلومەرجێکی ئارام بۆ کوردان لەنێو عێراقدا بهێنرێتەئاراو بچەسپێنرێت، سەدام حسێن هەواڵی ئەوەی گەیاند کە وەفدی کوردانی بانگێشتی بەغدا کردووە تاکو سەبارەت بە دۆخی ئایندەیی کوردستانی عێراق دانوسان بکەن.[119] پارتی دیموکراتو یەکێتی نیشتیمانی سەبارەت بە پرسە ناوەندییەکان سەرنجی جیاوازیان هەبوو، داخۆ رێکەوتننامەیەکی ئۆتۆنۆمی سنووردار لەگەڵ بەغدا مۆربکەن، ئەوەی مەسعود بارزانی لایەنگریی لێدەکرد، یان داوای خاکیو سازشی سیاسی زیاتر لەبەغدا بکەن، کە تاڵەبانی بانگەشەی بۆ دەکرد،[120] دواجار ئەم گفتوگۆیانە شکستیانهێنا کە بگەنە هیچ ئەنجامێك.

## ٢. ٥. ١ یەکەمین هەڵبژاردنی ئازادی کوردیی

لەکاتی دامەزراندنی پەناگەی ئارام، سەرکردایەتی دابەشبووی بەرەی کوردستانی کاروباری باکوری عێراقیان بەڕێوەدەبرد. بەهۆی ململانێی بەردەوامی سیاسییو دەسەڵاتی ڤیتۆی هەریەك لەو هەشت پارتەی بەرەیان پێکهێنابوو،[121] دەسەڵاتێکی ناوەندیی پێویست لەئارادا نەبوو. لەگەڵ راگەیاندنی هەڵبژاردنی گشتی کوردیی کەدەبوو لە مایۆی ١٩٩٢دا بکرێت، خەڵکی چاوەڕوانی کۆتاییهێنانی ئەو پشێوییە ئابووریو سیاسییە بوون کە لەئاکامی نەبوونی رێکەوتننامەیەکی ئۆتۆنۆمی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا کەتبووەوە. ئەنجومەنێکی نیشتیمانی ١٠٥ ئەندامی، (

118 Kutschera, The Middle East, November 1995.
119 Mallet, FT, 26 April 1991.
120 Hitchens (1992).
121 McDowall (1996), p. 380.

که پێنج کورسی بۆ ئاسورییه کریستیانیەکان تەرخانکرابوو ) دەبوو دیاریبکرێت، لەگەڵ رابەری باڵای کوردیی بۆ ناوچەکه. [122]

تێکڕای ئەو هەشت پارتەی بەرەی کوردستانیان پێکدەهێنا لەپرۆسەی هەڵبژاردنەکەدا بەشدارییان کرد، هەرچەندە هیچ لەپارتە بچووکەکان نەیانتوانی هیچ کورسییەك لەئەنجومەنەکەدا بەدەستبێنن بەوهۆیەوە کە لەبەدەستهێنانی رێژی حەوت لەسەدی دەنگەکان شکستیانهێنا کەپێویستبوو بۆ چوونە پارلەمان. بەوەش پارتیو یەکێتی بەتەواوی دەستیان بەسەر هەڵبژاردنەکەدا گرتبوو، لەگەڵ بارزانیو تاڵەبانی کە رکابەری سەرۆکایەتییان دەکرد، دوو کاندیدی سیمبولیکی دیکەش هەبوون کە یەکێکیان لە حیزبی سۆشیالیستو ئەوی تریان رابەرێکی ئیسلامی سیاسیی بوو. [123]

بەغدا کاردانەوەیەکی ورووژاوی لەهەمبەر ئەو هەڵبژاردنە پارلەمانییە پێشنیازکراوە لەباکوور پێشاندا، هەروەها هەڕەشەی تۆڵەسەندنەوەی دژ بەوشتانەکرد کە بەعسییەکان بەچالاکی ناشەرعی ناساندوویانە، هەروەها سوریاو ئێرانیش وایان کرد، بەڵام کوردان بەتوندی نکۆڵیان لەهەر پێشنیازێك کرد کە ببێتە بەردی بناغەی سەربەخۆیی کوردییو راگەیاندنی دەوڵەت. لەبری ئەوە، کوردان جەختیان لەوە دەکردەوە کەچۆن هەڵبژاردن خزمەت بەو پێویستییە گەورەیە دەکات بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی کارگێڕیی لەباکوور کە ئاکامی جەنگی کەنداوو پاشەکشەی کارمەندە کارگێڕییە عێراقییەکانە. هەروەها پێدەچێت لەنێو سەرکردە کوردەکان ترسێکی راستیینە لەهەمبەر راگەیاندنی دەوڵەتی کوردیی هەبووبێت بەشێوەیەك هانی تورکیاو ئێران بدات سنوورەکانی خۆیان دابخەن، ئەوەی شارێگەی سەرەکی ژیانی کوردی عێراقی پێوە بەندبوو. [124]

لەرۆژی هەڵبژاردن، لە ١٩ی مایۆی ١٩٩٢ ( ٤٨ سات دواکەوت بەهۆی شکستی

---

122 SvD, 5 June 1992, (author unknown).
123 BostrOm, DN, 15 May 1992.
124 Hedges, IHT, 7 February 1992.

کارگێڕییەوە ) گرووپێك لە چاودێرانی نێودەوڵەتی کە لە پارلەمانتاری ئەورووپای ڕۆژئاواو چالاکانی ماڤی مرۆڤو ڕۆژنامەنووسان پێکهاتبوون‌و لەبنکەکانی دەنگدان ئامادەبوون. ئەوانە لەلایەن کوردانەوە بانگێشتکرابوون تاکو چاودێری یەکەمین هەنگاوی کورد بەرەو دیموکراتی بکەن.[125] راپۆرتەکان باسیان لەوەدەکرد کە هەڵبژاردنەکان دادپەروەربوون، ئەوەی کە بایەخی زۆر لەهەڵبژاردنەکەی ساڵی سێپتەمبەری ١٩٨٩ زیاتر بوو. ئەو ئەنجومەنە کوردییەی پێشوو لەساڵی ١٩٨٠دا لەهەولێر دامەزرێنرا، ئەوەی پەنجا ئەندامی هەڵبژێردراوی هەبوو، ئەرکی بەڕێوەبردنی کاروباری نێوخۆی هەرێمی کوردستانیان گرتبووە ئەستۆ، کە لەراستییدا لەبن کۆنترۆڵی توندی بەغدادا بوون.[126]هەرچەندە، لەساڵی ١٩٩٢دا، دەستێوەردانێکی عێراقی ئەوتۆ نەبوو، بەگوێرەی ئەو چاودێرە سەربەخۆیانەی ئامادەبوون هەڵبژاردنە کوردییەکە بەشێوەیەکی دڵخوازانە بەڕێوەچوو.

لەبەرئەوەی یەکەمین هەڵبژاردنی ئازاد بوو لەمێژووی کورددا، لەڕاستییدا هەرکەس پەرۆشی ئەوەبوو دەنگی خۆی بدات کە ببووە هۆی کۆبوونەوەیەکی زۆری دەنگدەران لەبەردەم بنکەکانی دەنگداندا. هیچ یەك لەپارتە بچووکەکان نەیانتوانی سەرکەوتووبن، ئەوە تەنیا پارتی‌و یەکێتی بوون کە نوێنەرایەتییان لەئەنجوومەندا بەدەستهێنا. ( بڕوانە خشتەی ٢. ٥. ١ ئاکامی هەڵبژاردنەکەی مایۆی ١٩٩٢ ) دوو رکابەرە سیاسییەکە نزیکەی ژمارەیەك کورسی وەك یەکیان هێنا، بەڵام دابەشکردنی ٥٠ بە ٥٠ی دەسەڵات لەنێوان دوو پارتەکە دژواری لێکەوتەوە، ئەوەی کە بێکەڵکی خۆی سەلماند. ئەو هەڵبژاردنەی بۆ رابەری گشتیش کرا پەردەی بەسەردا دادرا.

بەپێی راپۆرتەکان ٤٨سەد لەدەنگدەران مەسعود بارزانیان لەبەرزترین پێگە بەلاوە باشبوو، لەکاتێکدا جەلال تاڵەبانی پلەیەکی نزمتری بەدەستهێنا کە٤٥ لەسەد بوو.[127] (

125Mktensson, GP, 6 June 1992.
126 Lundeghd, DN, 11 September 1989
127 McDowall, (1996), p. 381.

بڕوانــه خشــتەی ٣. ١.٥ : ئاكـامی هەڵبـژاردنیی مـایۆی ١٩٩٢ی رابـەری جوڵانــەوەی ڕزگاری كوردستان ) هەڵبژاردنی كۆتایی بـۆ دیـاریيكردنێكی ئاشـكرای یـەك لـەو دوو كاندیدە دواخرا، بەڵام هەرگیز جێبەجێنەكرا.[128]

خشتەی ٢. ١.٥ : ئەنجامی هەڵبژاردنەكەی پارلەمان لە مایۆی ١٩٩٢دا

| پارتە بەشداربووەكان | دەنگی بەدەستهاتوو بەژمارە | دەنگی بەدەستهاتوو (لەسەدا) |
| --- | --- | --- |
| پارتی دیموكراتی كوردستان (پدك) | ٤٣٧,٨٧٩ | ٤٥,٢٧ |
| یەكێتی نیشتیمانی كوردستان (ینك) | ٤٢٣,٨٣٣ | ٤٣,٨١ |
| هاوپەیمانی ئیسلامی كوردستان | ٤٩,١٠٨ | ٥,١ |
| هاوپەیمانی سۆشیالیست (حسك + پاسۆك) | ٢٤,٨٨٢ | ٢,٥٤ |
| حیزبی شیوعی كوردستان (حشع) | ٢١,١٢٣ | ٢,١٨ |
| پارتی گەلی دیموكراتی كوردستان (پگدك) | ٩,٩٠٣ | ١ |
| دیموكراتە سەربەخۆكان | ٥٠١ | ٠,١ |

تێكڕای ژمارەی دەنگەكان ٩٧١,٩٥٣ بوون كە ٤,٧٢٤ دەنگی پوچەڵكرایەوە

خشتەی ٣. ١.٥ : ئاكامی هەڵبژاردنیی مایۆی ١٩٩٢ی رابەری جوڵانەوەی رزگاری كوردستان )

| پاڵێوراوەكان | دەنگی بەدەستهاتوو بەژمارە | رێژەی سەدی دەنگەكان |
| --- | --- | --- |
| مەسعود بارزانی(پارتی) | ٤٦٦,٨١٩ | ٤٨,٥ |
| جەلال تاڵەبانی(یەكێتی) | ٤٤١,٠٥٧ | ٤٥,٥ |
| عوسمان عبدالعزیز(بزوتنەوە) | ٣٨,٨٦٥ | ٢,٥ |
| مەحمود عوسمان | ٢٣,٣٠٩ | ٢,٥ |

ژمارەی گشتی دەنگەكان ٩٨٢,٦٤٩ بوو كە ١٢,٥٩٩ یان پوچەڵكرایەوە[129]

128 Kakai (1994), p. 127.
129 Statistics for the two tables found in Institut Kurde de Paris' Information and liaison bulletin,
No 86, May 1992, pp, 2-3.

لەسەرەتای ئۆکتۆبەری ١٩٩٢دا، کوردانی عێراق دامەزراندنی دەوڵەتێکی فیدراڵی کوردییان راگەیەند بەوئامانجەی دوای بلکێنرێتەوە بە دەوڵەتی فیدراڵیی ئایندەیی عێراقەوە. ئەم راگەیاندنە لەهەمان ساڵدا بەتەواوی لەلایەن ( INC / کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی) وە دانیپێدانرا.[130] دیدی کوردان سەبارەت بە فیدراليزم لەعێراق، هەروەك راگەیاندنەکەی ئۆکۆتۆبەر بەرجەستەی دەکرد، بایەخی ئەوەیە " دیدێکە لەبنەڕەتدا پەیوەندی بەخاکەوەیە...کە مافی کوردان بەشێوەیەك وێنادەکات لەڕووی دەستوورییەوە پارێزراوبێت"[131] بەوەی کە یەکێتی خاکی عێراق مەترسی بێتەسەر. وێڕای دڵنیاکردنەوەی بەردەوام لەلایەن سەرکردەکانی کوردەوە لەباکووری عێراق کە دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی مەبەست نییەو کاری بۆ ناکرێت، تورکیاو ئێرانو سوریای دراوسێ بەئاشکرا لەم پەرەسەندنانە بێزاربوون.[132]

## ٣. ٥. ١ هەڵگیرساندنی جەنگی نێوخۆ

لەدیسەمبەری ١٩٩٣دا ململانێیەکی چەکداریی لەنێوان یەکێتی نیشتیمانیو بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان قەوما، لەکاتێکدا ئەوەی دواییان خەریکی پەرەپێدانی نفوزی خۆی بوو لەو ناوچانەی یەکێتی تێیدا بالادەستبوو. تاڵەبانی لەدژی بزووتنەوەی ئیسلامی لاواز لەرووی سەربازییەوە سەرکەوتووبوو، بەلام ئەو نێوەندگیرییەی پەسەند کرد کەلەلایەن پارتییەوە پێشکەشکرا، ئەوەی لایەنە شەڕکەرەکانی راکێشایە سەرمێزی گفتوگۆو رێکەوتنی ئاشتیان واژۆکرد.[133]هەرچەندە، "کوردستانی ئازاد" دەبوو دژواریی جدییتر ئەزمونبکات، کاتێك دوژمنایەتی نێوان پارتیو یەکێتی لەمایۆی ١٩٩٤دا تەقییەوە، ئەوەی

130 Sheikhmous (1993).
131 Allawi (1994), p. 214.
١٣٢ هەوڵەکانی ئەم وڵاتە هەرێمییانە بۆ رێگریی لە باسی شەشەمدا هاتووە.
133 McDowall (1996), p. 387.

**هەرێمەکەی بۆ دوو زۆن دابەشکرد. ناکۆکییەکی ساکار لەسەر موڵکایەتی زەوی بۆ شەڕێکی بەرفراوان پەرەیسەند، کە دابەشبوون و ناکۆکیی درێژخایەنی لایەنەکان و شکستی چارەسەرکردنی بوونە پرسی سەرەکی.[١٣٤] سەرچاوەی نارەزایەتی سەرەکی بۆماوەیەکی درێژ بریتیبوو لە کۆنترۆڵکردنی خاڵەکانی گومرگ لەناوچە مەرزییەکانی باکوور لەگەڵ تورکیا، ئەوەی دەکەوتە نێو ناوچەی نفوزی پارتیو لەلایەن ئەوانیشەوە بەرێوەدەبرا، رەخنەی ئەوە لە بارزانی دەگیرا کە داهاتەکان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دابەش ناکات. باس لەوەدەکرا کە داهاتەکان بەقازانجی رێکخراوی پارتەکەی خۆی خەرجدەکات زیاتر لەوەی لە بەرێوەبردنی کاروباری کوردان بەگشتی. ئەم خاڵە مەرزیە گومرگییانەی باکوور زۆر قازانجبەخشتر بوون•**

134 Hirst, The Guardian, 14 May 1994.

• خاڵی گومرگی ئیبراهیم خەلیل کە باشووری کوردستان بە تورکیاوە دەبەستێتەوە یەکێکە لەهەرە خاڵە پڕداهاتەکان کە کەوتبۆ ناوچەی نفوزو بندەستی سەکردایەتی پارتییەوە، ئەوەش یەکێك بوو لەهۆکارە بەرچاوەکانی هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ. ئەوەی داهاتەکەی بەم شێوەیەی ئەم خشتەیەی خوراەوە بوو:

| سەرچاوەی داهات | بار | ئاراستە | ژمارە | باجی دراو |
|---|---|---|---|---|
| شاحینە(١) | مەوادی ئینشائی | تورکیا–ك ع | ١,٠٠٠ رۆژانە | ٣٥٠–٤٠٠ دینار |
| شاحینە | گازۆلین | ك ع–تورکیا | ١,٠٠٠ رۆژانە | ٤٠٠فلس بۆ لیترێك |
| شاحینە(٢) | کارەباریی/ جگەرە | تورکیا–ك ع | ٥٠ رۆژانە | ١٧٠٠٠–١٧٥٠٠ دۆلار |
| تەنکەر(٣) | نەوتی خاو | عێراق–تورکیا | ٢٥٠ رۆژانە | ٥دۆلار، لەگەڵ ٨٠٠دینار |
| ترومبێل/گەشت (٤) | ---- | تورکیا–ك ع | ١٢٠ رۆژانە | ٥دۆلار،لەگەڵ ١٠٠دینار |
| ترومبێل/هاوردە (٥) | بارهەڵگر | تورکیا–ك ع | ١٠٠٠مـــانگی ژوون و ژووئیە ١٩٩٩ | ٤٠٠–٧٥٠ دۆلار |
| جانتاو کەلوپەل (٦) | ---- | هەردوو ئاراستە | ١٠ رۆژانە | ٦٠٠ دینار |
| چێشتخانە | ---- | ئیبراهیم خەلیل | ٤ لە ئیبراهیم خەلیل | ٣٥٠٠٠٠ دینار مانگانە |
| پارك(٧) | ---- | ئیبراهیم خەلیل | ١٠٠٠ لەخۆدەگرێ | هەر ترومبێلێك ٢٥دینار |

**لەوانەی بەشەکانی باشووری رۆژهەلاتی ناوچەکە خودحوکمڕانەکە کە یەکێتی کۆنترۆڵی ئەو خاڵە گومرگییانەی دەکرد کە بازرگانیان لەگەڵ ئێراندا تێدا دەکراو قازانجیان کەمتربوو. لەلایەکی ترەوە، رێکخراوەکەی تاڵەبانیش بەوە تۆمەتباردەکرا کە پارەیەکی زۆری وەزارەتە هاوبەشەکەی داراییان ئیختلاس کردووەو لەگەڵ حکومەتی بەغداش هاوکاریی دەکەن.[135]**

**بەوەش، وێڕای گەشەکردنێکی چاوەڕوانکراو کە بەدوای راپەڕینە کوردییەکەو کۆڕەوەکەی ساڵی ١٩٩١دا هات، رەوشی هەرێمە ئۆتۆنۆمە کوردییەکە بەرەو تێکچوونێکی دژوار رۆیی دوای نزیکەی دووساڵ لە دامەزراوە هەڵبژێردراوە دیموکراتییەکان. وێڕای هەوڵگەلێکی بەردەوام لەلایەن INC یەوە بەدرێژایی ساڵی ١٩٩٤ دەکرا بۆ وەستاندنی شەڕەکان، حاڵەتێکی بێهیوایی باڵی بەسەر دۆخەکەدا کێشا، بەوەش هەرێمەکە بەخێرایی بەرەو ئەوە دەرۆیشت کە " لەلایەن کەسانێکەوە حوکمبکرێت کە شازی چەکیان بەدەستەوە بوو." [136]**

**لەکۆتایی فێبرایەری ١٩٩٥دا، ئۆتۆمبێلێکی بۆمبڕێژکراو لەشاری زاخۆ کەشارێکی ژێر**

---

تێبینی :

(١) شاحینەکان مەوادی ئینشائی دەهێنن‌وتەنکەری نەوت بە ٦٠٠٠لیتر گازۆلینەوە باردەکەن بۆ تورکیا

(٢) لەنێوان مایۆ بۆ ژوونی ساڵی ١٩٩٩ ، ١٤٠ شاحنە بە باری جگەرەوە هاتوونەتە کوردستانی عێراق کە هەریەکەیان ١٧,٥٠٠دۆلاری لێوەرگیراوە.

(٣) گرێبەست لەنێوان عێراقو کۆمپانیای تورکیدا هەیە. بۆنموونە لە نێوان کۆمپانیای تورکیی غازی عەنتاب بۆ گواستنەوەی ٥,٧٠٠,٠٠٠تەن لە نەوتی خاو. کۆمپانیای ئاسیا رۆژانە ٦,٠٠٠,٠٠٠ گازۆلین دەباتە تورکیاو لیتری بە ١٢ سەنت دەفرۆشێت.

(٤) هەرکەسێك سەردانی کوردستانی عێراق بکات دەبێت ٥٠دۆلار بدات.

(٥) گومرگەکە بەگوێرەی مۆدێلی ترومبێلەکە جیاوازە، بەڵام دواتر ٥٠دۆلاری زێدەی دەخرێتەسەر.

(٦) داهاتی ئەم سەرچاوەیە لەو کرێیەدایە کە بەڵێندەری چێشتخانەکە دەیدات، دەبێت بەڵێندەر لەسەر شتە زێدەکانی دیکەو زەوییە بەکارهێنراوەکە پارە بدات.

(٧) پارکەکە ساڵی ١٩٩٣ دروستکراوە. بڕوانە، ستانسفیلد، سەرچاوەی پێشوو ، ل١٣٦-١٣٧.

135 Waller, Time, 27 March 1995.

136 Kutschera, The Middle East, November 1995.

دەسەڵاتی پارتی بوو تەقییەوەو نزیک بە٨٠ کوژراوی لێکەوتەوە. بارزانی یەکسەر رایەگەیاند کە یەکێتی نیشتیمانی بۆمبەکەی چاندووە، ئەو تۆمەتەی بەتوندیی لەلایەن تاڵەبانییەوە ڕەتکرایەوە.[١٣٧] هەرچەندە، زۆر دوورنییە کە ئاژانسێکی بیانی بەداوای تاران، بەغدا یان ئەنکەرە لەو کارە تیرۆرستییە بەرپرسیاربێت، وەك هەوڵێك بۆ شێواندنی زیاتری ناوچە خود حوکمڕانە کوردییەکە. هەرچەندە یەکێتی نیشتیمانی هەر بەرپرسیارێتییەکی خۆی لەو پەلامارە نکۆڵی لێکرد، پەیوەندییەکانی نێوان ئەو دوو دژبەرە وەك ئاکامێکی ئەو رووداوە ئاڵۆزتربوو.

شەڕی توندی نێوان پارتیو یەکێتی وایکرد ئامادەگیی خۆی لەدیوی سنووره کوردیەکەی عێراقەوە بەشێوەیەکی بایەخدار زێدەبکات. ئەوەش پاڵی بەتورکیاوە نا لەبەهاری ساڵی ١٩٩٥دا داگیرکاریی بەرفراوانی خۆی لەباکووری عێراق بۆ راوەدونانی جەنگاوەرانی پەکەکەو وێرانکردنی پێگەو بنکەکانیان ئەنجامبدات. ئەوەش شکستێکی مەزن بوو ( سوپای تورك لەساڵانی دواتردا چەند جارێك گەڕایەوەو داگیرکاری ئەنجامدایەوە )، ئەوەی شتێکی نەکرد بۆ وەستاندنی شەڕە کوردییەکە کە لەڕووی بوارو توندوتیژییەوە زێدەتربوو. لەکاتێکدا یەکێتیو پارتی پێکدادانە چەکدارییەکانیان لەهاوینی ١٩٩٥ دا دەستپێکردەوە، ئێستاکە سەرەی ئێران هات بۆئەوەی نێوەندگیریی حکومەتی ئیسلامی لەنێوان لایەنەکاندا پێشنیازبکات. ئەم هەوڵەی لەلایەن دراوسێکەی رۆژهەڵاتەوە بۆ نێوەندگیریی نێوان لایەنە شەڕکەرەکانەوە درا هانی دیپلۆماتە ئەمەریکییەکانیدا بێنە نێو مەسەلەکەوە، چونکە هەست بەوە دەکرا کەنفوزی ئێرانی لەناوچەکە خزمەت بە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵی نێودەوڵەتی لە هەرێمە بەرفراوانەکە ناکات.[١٣٨] یەك لە ئەو پرسە زۆر بەپەلانەی دەبوو چارەسەربکرێت برتیبوو لە چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ پەکەکە، بۆ نموونە، هەڵوێستێکی هاوبەش لەهەمبەر پەکەکە ببیننەوە، ئەو

---

137 Iran News, 1 April 1995 (author unknown).

١٣٨ ئەم پرسە هەرێمیانە لە بەشی ( ج) داهاتووە.

پارتـەی کـە لەگـەڵ پـارتی دیموکراتـدا لەپێکـدادانی سـەربازییدا بـوون،و یـەکێتی نیشتیمانیش پشتگیریی لێدەکرد، لەوەش زیاتر، دابەشکردنی داهاتی گومرگـەکان کـە لـەخاڵی مـەرزی هاتوچـۆی تورکیـاوە سەرچـاوەیدەگرت پێویسـتی بـە گفتوگـۆو مشـتومڕێکی زێـدەتر بـوو، جگـە لـە پرسـی چـەکداماڵینی هـەولێری پایتـەخت کـە بۆماوەی چەند مانگێك لەژێر داگیرکاری هێزەکانی تاڵەبانیدا بوو.[139]

لەو سۆنگەیەشەوە، واشینگتۆن دەستپێشخەری کردو کۆنفرانسێکی ئاشتی ئـوتی ١٩٩٥ لـە ئێرلەنـدا ڕێکخسـت، کـە لـە سـێپتەمبەردا خـولی دووەمـی دانیشـتنەکانی خـۆی ئەنجامبدات. هەرچەندە، ئەو دانوسانەی ئەمریکییەکان پشتگیرییان دەکرد سەبارەت بە پرسە گرنگەکان پێشکەوتنێکی کەمیان بەخۆوەبینی، جگە لە ئاگربەستێکی نـوێ، کە چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرا کورتخایەن بێت، چ ڕێکـەوتنێکی گشـتی لـە گفتوگۆکـانی سـێپتەمبەردا ڕووینـەدا.[140] پێدەچێت ئاگاهییـەك هـەبووبێت سـەبارەت بـە گرنگـی فراوانکردنـی ئەنجومـەنو دانـانی چـاودێری سـەربەخۆو هـەروەها نوێنـەری پارتـە سیاسـییەکانی دیکـە لـە ڕێکخـراوە پارلەمانییـەکان، کـە بتـوانن ئـەرکی دانـانی نەخشەڕێگایەك بگرنەئەستۆ لـەپێناو شـکاندنی بەسـتەڵەکی دانیشـتنەکانی ئاشـتی ، بەڵام چۆنێتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم پرسانە پێدەچوو لـەتوانای هـەردوو پارتەکـە بەدەربووبێت.•

139Jarrah, MEI, No 506, 4 August 1995.
140 Id. 22 September 1995.

• ئۆفرا بینیگیۆ نووسـیویەتی:" لەلایـەك پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان، تورکیـا، عێـراقو حیزبـی دیمـوکراتی کوردستانی ئێران، لەلایەکی تر، یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، ئێران، کۆنگرەی نیشـتیمانی عێـراقو پەکەکـە، لەهەموو کاتەکاندا سوریا وەك بێلایەن مایەوەو لەکاتێکدا هەڵوێسـتی ئـەمریکا پڕبـوو لـەدوودڵی...هاوپـەیمانی لەیەکترگەیشـتنی نێـوان تورکیـاو پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان، کـە لەگـەڵ ئـەوەش هۆکـارێکی بـەردەوامی بەریەککەوتن بـوو، بەنـدبوو بەسـنوورێکی جوگرافیـای هاوبـەش، بەرژەوەنـدی ئـابووری، تێپـەڕینی کەلوپـەلو دوژمنایەتی هاوبەش لەگەڵ پەکەکە. ئەوەی کە کەم جێگـەی تێگەیشـتن بـوو بـڕێتی بـوو لـە پەیوەنـدی نێـوان پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانو ڕژێمـی بـەعس...لەکاتێکـدا بـارزانی بەشـێوەیەکی مـەفهومی بـەرەوپیری ڕێکەوتننامەیەك، یان بگرە هاوپەیمانییەك لەگەڵ عێراقدا دەچوو، تاڵـەبانی لـەئێران نێـزیکتر دەبـووەوە. بـەڵام

**هەمان كات، بارزانی لەوەرگرتنی پشتگیریی لەتوركیاوە بەردەوامبوو بۆئەوەی شەڕی چالاكییەكانی پەكەكە بكات كە لەناوچەكانی بندەستی پارتییدابوون، هەروەها بەهۆی راوەدونانی گەریلا كوردییەكانی توركیا، پێكدادانی چەكداریی توند لەنێوان ئەو دوو پارتە كوردییەدا قەوما. هەمان كات، یەكێتی نیشتیمانی لەئێران نزیكبووەو پشتگیریی هاوشێوەی لەتارانەوە وەرگرت هەروەك پارتی لەئەنكەرە وەریدەگرت، تەنیا جیاوازیی ئەوەبوو كە كە لەگەڵ ئێرانییەكاندا رەهەندی شۆڕشگێڕی ئیسلامی دەهات، ئەوەی بەشێك نەبوو لە هەگبەی توركیی.**

**پاش كورتە خۆخزانێكی ئێرانی بۆ باكووری عێراق لە هاوینی ١٩٩٦دا، ئەمریكا**

---

بەشێوەیەكی كرتر. هەروەك رابردوو ئێران بەدوای ئەوە بوو دەسڕۆیینی خۆی لەكوردستان بەهێزبكات لەڕێگەی نێوانگریكردن لەنێوان هەردوو پارتەكەدا... لەهەمان كاتدا، ئێران دەستی بە وەشاندنی چەند بەرنامەیەكی كوردی كرد لەباكووری عێراق بۆ برەودان بە بنەماكانی ئیسلام...و رووبەڕووبوونەوەی ئەجێندایەكی دەرەكی. كارەكانی ئێران نیگەرانی لەلایە واشنتۆن دروست كرد...بەتەماشاكردن لەدوورەوە، دەكرا بارودۆخی كوردستانی عێراق ...وەك سێ بازنەی هاوناوەند ببینرێ. لەناوەڕاستدا دەسەڵاتە ناوخۆییەكان هەبوون، پارتی دیموكراتی كوردستانو یەكێتی نیشتیمانی كوردستان، كە هەریەكەیان دەیویست لەرێگەی دەسەڵاتە هەرێمییە بەهێزترەكانەوە ناوچەی دەستڕۆیینی خۆی زیاد بكات، پارتی لەگەڵ توركیاو عێراق، یەكێتیش لەگەڵ ئێرانو سوریادا. هێزەكانی ناو بازنە گەورەترەكە برێتی بوون لەو دەسەڵاتە هەرێمییانەی هەوڵیان دەدا ئەو بۆشاییە پڕبكەنەوە كە بەهۆی شەڕی لایەنە كوردییەكانەوە دروست ببوو، چ بۆ شەڕ لەگەڵ كەمینە كوردییەكانی خۆیاندا، چ لەهێشتنەوەی ئەوانی لەژێر كۆنترۆڵی خۆیان. توركیا هەوڵی دەدا پارتی دیموكراتی كوردستان بەكاربهێنێت بۆ فراوانكردنی دەستڕۆیینی خۆی لەكوردستانی عێراق، بۆ شەرڤش لەگەڵ دوژمنەكەی كە پەكەكە بوو، ئێرانیش لەرێگەی هاوپەیمانی لەگەڵ یەكێتی نیشتیمانی كوردستان، دەیویست شەڕ لەگەڵ حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێراندا بكات، مەودای دەستڕۆیینی خۆی لەكوردستانی عێراق بەرفراوان بكات. بگرە دەستڕۆیینی ئەمریكاش لەكوردستاندا سنووردار بكات. بەغدا لەلایەكی تر، لەرێگەی هاوپەیمانی لەگەڵ پارتی دیموكراتی كوردستاندا هەوڵی دەدا دووبارە كۆنترۆڵی كوردستان بكاتەوە، رێ لەئێران و یەكێتی نیشتیمانی كە لەناو خولگەی ئێراندا بوو بگرێت، رووبەڕووی ئەمریكاش بێتەوە. لەكۆتای لەبازنەی دەرەوە ئەمەریكا دەوەستا(بەڕادەیەكی كەمیش بەریتانیا) كەبەرژەوەندی سەرەكی برێتی بوو لەرێگرتن لەدەسەڵاتە ناوەخۆییو هەرێمییەكان تاكو شەڕی تازە دەست پێ نەكاتەوە، چونكە دەكرا ئەمریكا كیش بكاتە ناو ململانێیەكی نەخوازراوەوە بەتایبەتی لەبەرایی هەڵبژاردنەكانی سەرۆكایەتیدا. بڕوانە: كوردی عێراق. بنیاتنانی دەوڵەتێك لەناو دەوڵەتدا، و: سۆران مستەفا كوردی، هەولێر. ٢٠١٣، ل ٣٦٠-٣٦٢.

هەنگاوێکی دیکەی نا بۆ ئاشتەوایی گروپە رکابەرەکان. کۆنفرانسێکی ئاشتی لە لەندەن رێکخرا، بەڵام لەئاکامی داگیرکاری عێراقیی بۆ ناوچە خودحوکڕانە کوردییەکە لە ٣١ی ئوتدا هەڵوەشایەوە.[١٤١] لەوەڵامی داوایەکی فەرمی لەبارزانییەوە،[١٤٢] ئەوەی هەستی بەفشار دەکرد بەهۆی هەڕەشەی سەربازی لەتارانەوە، کە توانای سەربازی سنووورداری پارتی نەیدەتوانی وەڵامدەرێکی بەهێز بێت، سەدام حسێن خۆشحاڵ بوو کە خزمەتی هێزە چەکدارەکانی پێشکەشکات.[١٤٣] ئەو دەرفەتە زێڕنەی قۆزتەوە، هەروەها حکومەتی عێراقی خواستی خۆی راگەیاند تاکو سەروەریی عێراقی بۆ هەرێمە ئۆتۆنۆمە کوردییەکە بگێڕێتەوە، کە هەروەها لەگەڵیدا کردنەوەی رێگای هاتوچۆو بازرگانی لەگەڵ بەشەکانی باکووری وڵات دەگرتەخۆ. هەولێر بەخێرایی گیراو سوپایەك کە بە نزیکەی ٤٠,٠٠٠ مەزەندە دەکرا —کەلەدوای جەنگی کوێتەوە مەزنترین ئۆپەراسیۆنی سەربازیی عێراقی بوو- بەرەو سلێمانی پێشڕەویکرد. کاتێك بەغدا لەلایەن هێزە نێونەتەوەییەکانەوە ناچارکرا لە ٢ی سێپتەمبەردا هێزەکانی بکێشێتەوە، کۆنترۆڵی ناوچە دووبارە دەستبەسەرداگیراوەکان کەوتەوە دەست پارتی.[١٤٤]

پاش ئەوەی سوپای عێراق ناوچە کوردییە ئارامەکەی جێهێشت، شەڕێکی توند لەنێوان یەکێتیو پارتی قەوما. لەکاتێکدا ئەوەی دواییان ئامادەکاریی بۆ داگیرکردنی سلێمانی دەکرد، شەپۆلێکی هەڵاتنی پەنابەران دەستیپێکرد، دەیان هەزار کورد روویان لەئێران کرد. هەرچەندە، هاوسەنگی دەسەڵات لە هەرێمە ئۆتۆنۆمەکە گەڕایەوە سەر هەمان باری هەنوکەیی پێشووی، چونکە یەکێتی لەناوەڕاستی ئۆکتۆبەردا زۆربەی ناوچە لەدەستچووەکانی گێڕایەوە، بەڵام لەترسی

١٤١ ئەم رووداوانە بەتوندی بەشداریی لەوەداکرد OPC کۆتایی پێ بهێنرێت. بڕوانە باسی حەوتەم.
142See for instance Hugh Pope, ME!, No 533, 6 September 1996,
143 Lundegard, SvD, 22 September 1996.
144 Id. 3 September 1996.

دووبارەبوونــەوەی دەســتێوەردانی بەغــدا تاڵــەبانی خــۆی لەپــەلاماردانی هــەولێر پاراست.[145]

لــەکۆتایی ئۆکتۆبــەردا، یــەکێتی‌و پــارتی جــارێکی تــر بانگشــێتی دانوســانی ئاشــتی لەئەنکەرە کرانەوە، کەلەلایەن ئەمرکییەکانەوە رێکخراوبوو، هەردوو هێزە نەیارەکە رازیبــوون خۆیــان لــە هەوڵــدان بــۆ بەدەســتهێنانی یارمــەتی لایەنــە دەرەکییــەکان بپــارێزن‌و بەجــدیی کــار بــۆ ئاگربەســتێکی هەمیشــەیی بکــەن. هــەروەها هــەواڵی پەســەندکردنی بلاّوکردنــەوەی هێــزی چــاودێریی‌و پارێزگــاری ئاشــتی بکــەن کــە لەتورکمانەکانی باکووری عێراق‌و ئاسورییەکان پێکدەهاتن، هــەروەها کارگێڕییــەکی هاوبەشی کوردیی دابمەزرێنن.[146] لێرەبەدوا، هەریەك لەو دوولایەنە بــەردەوام ئــەوی دیکــەیان بــە پێشــێلکردنی رێکەوتننامــەکانی پێشــوو تۆمــەتبار دەکــرد، لەکاتێکــدا ژێربەژێر هەوڵی بەستنی پەیوەنــدیان لەگــەڵ ئێــران‌و تورکیــا‌و عێــراق دەکــرد. ئــەم هەلومەرجە بەمشێوەیە کــەم یــا زۆر بــەردەوامبوون، تــاکو گەیشــتنە رێکەوتننامــەی هەمیشەیی واشینگتۆن لە سێپتەمبەری ١٩٩٨دا.

## ٤. ٥. ١ پەرەسەندنەکانی دوای ١٩٨٩

لەسێپتەمبەری ١٩٩٨دا، پارتی‌و یەکێتی بەرێنمایی ئەمەریکا رازیبــوون دەســتبەرداری ململانێ چەکدارییەکانیان بن. ئەوەش بەرێکەوتننامەی واشــینگتۆن دەناســرێت، کــە واباســی لێــدەکرا وەك ئــەوەی رێکــەوتنێکی دیکــەبێت لــەکاروانی درێــژی رێکەوتنــە ئاشــتییەکانی پێشــوو کەلەلایــەن لایەنــە شــەڕکەرەکانەوە مۆرکرابــوو.[147] هەرچــەندە، ئــەم رێکەوتنــە تەحــەدای هــەموو چاوەڕوانییەکانی کــرد، بڕیــارە هاوبەشــەکە بــۆ کۆتاییهێنــان بــەو جەنگــە نێوخۆییــە وێرانکــەرە کــە لــەگفتوگۆکانی واشــینگتۆن

145 Nuttall, The Guardian, 15 October 1996.
146 Cockburn, The Independent, 2 November 1996.
147 Dabrowska, ME!, No 584, 2 October 1998.

لەسـێپتەمبەردا لەسـەری رازیببـوون تەحەدایـەکی جـدیی نـەبینی، هەرچـەندە، جێبەجێکردنی کرداری راستیینەی رێکەوتنەکە خێرا ئەنجام نەدرا، هەروەك میشێل گوینتەر نووسیویەتی:

" رێکەوتننامەکـە لەڕاسـتییدا رێکەوتننامەیـەکی پڕخولیـابوو بـۆ رازیبـوون. خشتەیەکی کـاتیی بـۆ دامەزراندنـەوەی کارگێڕییـەکی هـەرێمیی یـەکگرتوو هـەبوو، چـەند بەنـدێکی سـەبارەت بـە هەڵبـژاردنی هـەرێمی لـە هـاوێنی ١٩٩٩و هـەروەها دابەشکردنی داهات لەسەر بنەمای پێویستییەکانی خەڵك، هـەروەها وەك ئاماژەیـەك بـۆ ترسـی تورکیـا سـەبارەت بـە پەکەکـە، باسـی لـەدابینکردنی ئاسایشـی سـنوورە کوردییەکانی عێراق کردبوو. [١٤٨]

رەگەزێکی بەو دواییەی سەرنجڕاکێش برتیبوو لـە گەشـەکردنی رەهەنـدی ئیسلامی لەسیاسـەتی کوردسـتانی عێراقـدا. هـەروەك لـە خشـتەی ٢. ٥. ١ ئـەنجامی هەڵبژاردنـەکانی مـایۆی ١٩٩٢دا تێبینیکـراوە. بزوتنـەوەی ئیسـلامی کوردسـتان سێیەمین گروپی گەورەی سیاسی بوو لەباکووری عێراق. بنکەی ئەم گروپە لە بەشی باشـووری رۆژهـەڵاتی هەرێمـە خودحوکمڕانـە کوردییەکـە بـوو، ئـەم گروپـە چەندجارێك لەگەڵ یەکێتیدا پێکیاندادا.

لەسـێپتەمبەری ٢٠٠١دا، گروپێکـی چـەکداری ئیسـلامی لەهەرێمـە ئۆتۆنۆمەکـەدا دامەزرا کە ئاکامی یـەکگرتنی نێـوان گروپگەلێکی تونـدڕەو بـوون کـە لەبزوتنـەوەی ئیسلامی دابڕابوون، ئەوانەی لەلایەن پارتیو یەکێتییەوە پێکەوە قەدەغەکرابوون، ( جوندولئیسـلام/ سـەربازانی ئیسـلام ) کـە بانگێشـتی پەیوەنـدیان بـە تاڵیبـانی ئەفغانسـتانو رێکخـراوی ئەلقاعیـدەی ئوسـامە بـن لادنەوەیـە هەڵەبجـەیان کـردە ناوچەی دەسەڵاتی خۆیان. [١٤٩]

لەرۆژانی بـەرایی هەوڵەکانی بنیاتنـانی هاوپـەیمانی لـەدوای وێرانکردنـی سـەنتەری بازرگـانی جیهـانی، کـوردانی عێـراق دەسـتیانکرد بـە هانـدانی دەسـتێوەردانی

148 Gunter (1999), p. 108.
149 Hiwa Osman, BBC, 2 October 2001.

نێودەوڵەتی لەعێراق. [150] هەروەها لەنێوەندی چالاكییەكانی دواتری جوندولئیسلام لەناوچەكانیان، هەردوولا بەتوندی كەوتنە بەرتەسككردنەوەی جوڵەی ئیسلامیستە رادیكاڵەكان، هەرچەندە، ئەوە یەكێتی بوو كە گورزی توندی بەركەوت بەهۆی تێوەگلانی راستەوخۆیان لەشەڕی ئیسلامییەكان. هەروەها هەواڵەكان باسیان لەوەدەكرد كە سەدام حسێن پشتگیری گروپە ئیسلامیستەكانی وەك جوندولئیسلام دەكردو هانیدەدان. [151]

ئەم پرسی گەشەكردنی رەهەندی ئیسلامییە لە سیاسەتی كوردییدا لەباسی چوارەمدا دەگەڕینەوە سەری. لەبەرامبەر ئەم باكگراوندەی كۆڵینەوە لەجووڵانەوەی نەتەوەیی كوردو ئەو ناوچەیەی تێیدا هەڵدەسوڕێت، مشتومڕەكە ئێستاكە بەرەو بەدواداچونی چەمكی نەتەوەو دەوڵەتو تیۆرەكانی نەتەوایەتی دەگوزەرێت

150 Pope, N., MEI, No 660, 12 October 2001.
151 E.g. Michael Rubin, 'The Islamist Threat in Iraqi Kurdistan', Middle East Intelligence
Bulletin, December 2001.

# باسی دووەم: بیرۆکەی نەتەوە، دەوڵەت و نەتەوایەتیی

## ٢.١ نەتەوە، دەوڵەت، دەوڵەت-نەتەوە

"نەتەوە" پەیوەستگەلێکە تاك و کۆمەڵ، رابردووو ئێستاپێکەوە دەبەستێت، هەستێکی گەرمی پێکەوەیی دۆستانە بە باڵای بونیادە ناشەخسییە ساردەکاندا دەبرێت. بەمانایەکی دیکە، نەتەوەبوون بە ئەستەم پێناسەدەکرێت نە لەبەرئەوەی شێواوو ئاڵۆزو نالۆژیکە، بەڵکو چونکە فرە تەمومژاوییو لەوەش زیاتر بەوهۆیەی...رەگەزێکی لەئەفسانە پێویستە.[١]

### ٢.١.١ نەتەوە دیاردەیەکی فرە روو

دەکرێت بەدوو شێوەی پەیوەست پێکەوە لە نەتەوە بگەین، لەوسۆنگەیەوە کە نەتەوە مانای دەوڵەت- نەتەوەو هەروەها ئەو گەلەش هەڵدەگرێت کە لەنێو دەوڵەتەکەدا دەژی. پەیوەستیی نیوان ئەو دوو مانایە، ئایدیۆلۆجیای گشتی نەتەوایەتی پێشاندەدات، ئەوەی لەسەر ئەو پرەنسیپە فرە دەستپێوەگیراوە راوەستاوە، کە " هەر گەلێکی خۆ بە نەتەوەزان دەبێت دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی هەبێت.[٢] ئەم بنەمایە گریمانەی بوونی یەکەگەلێك لەچەشنی گەلانێکی نەتەوەیی یان نەتەوەگەلێك دەکات. سەرنجێکی خێرا لەئەدەبیاتی بەرفراوانی ئەم بابەتە بەتەواوی روونیدەکاتەوە کە هەوڵێك بەئامانجی دۆزینەوەی پێناسەیەکی وردی زانستی بۆ نەتەوە کارێکی ئەستەمە، پێناسەیەکیش کە پسپۆڕانی لەسەر کۆکبن هەر وازی لێ بێنە.

بەگوێرەی ئەنتۆنی سمس، خەڵکی نەتەوەیی یان نەتەوە :" ناونانی کۆمەڵێکی

1 Canovan (1996b), p. 76.
2 Billig (1995), p. 24.

مرۆییــه کــه مێــژوو، خــاك، یــادەوەری مێــژوویی‌و ئەفســانەی هاوبەشــیان هــەبێت، کۆمەڵێك کــەلتووری گشــتی‌و ئــابووری هاوبــەش‌و مــافو ئــەرکی ڕەوای هاوبەشــی بــۆ تێکڕای ئەندامەکانی هەبێت."[3] بۆ هەمووانیش وەك شــتێکی مــاقووڵ ئاشــکرایە، کــه نەتەوە ئەو سیما خودجیاوازییانــەی پێناســەکەی والکــەر کۆنــار دەگرێتــەخۆ، ئــەوەی خودهۆشــی بەتایبەتمەنــدی بایەخــداری نەتــەوە ناســاندووە، ئــەو دەڵێــت، کرۆکــی نەتەوە، مەسەلەی هەڵوێسته، بەرجەستەبوونی کەلتووریی تــاکو ئــەو رادەیــه گرنگــه کــه ئــەوان لەهەســتکردن بــه تاقانەییــدا بەشــداربن."[4] ئــەم ئەگــەرە ئایدیالیســتانه لەپێناسەکانی دیکەدا زاڵ نییە. بۆ نموونە، دویچ نەتەوە بەشێوەیەك پێناسە دەکات کە ئەو خەڵکەیە کە دەوڵەت پێکدەهێنێت، دیدەکەی ئەو سەبارەت بــەوەی "نەتــەوە خەڵکانێك بن کە دەوڵــەت دادەمــەزرێنن"،[5] لەلایــەن گیــدینزەوە تــەواوکراوە، ئــەوەی پێشانیداوە کە نەتەوە " تەنیا ئەو کاتە هەیە کە دەوڵەت کارگێڕییەکی یــەکگرتووی بەسەر ئەوخاکەدا دامەزراندووە کە بانگەشەی ســەروەرێتی بەســەردا دەکــات."[6] ئــەو نەتەوەی بۆ تــەنیا فۆرمێکی دامەزراوەیی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی بچووك کردۆتــەوە، هــەروەها بیرۆکــەی گــەلی خــۆ بەنەتــەوەزانی ســڕیوەتەوە، ئەمــەش دوورە لــه پابەندبوونەوە، بەتایبەتی لەچوارچێوەیەکدا کە نەتەوە ( گەلی خۆ بەنەتــەوەزان ) بەئاشکرا هەیە، بەڵام هێشتاکە دەوڵەتێکی بەنسیب نەبووە.

شــێوازگەلە گونجاوەکــان بــۆ لێکدانــەوەی ئــەم چــەمکە پێدەچــێت بێکۆتــایی بێــت، هەروەها پێناسەی نەتەوە گرفتێکــی زیــاتر لــەو پێکهەڵپێژانانــەی هەیــە کــە لــەئاکامی پێناسەکردنی چەمکی تاڕادەیەك ڕوونی دەوڵەتــەوە دێتەکایــەوە. لــەجیاتی هەوڵــدان بۆ چەسپاندنی ئەوەی کە لەوانەیە پێناسەیەکی ناتەواوی نەتــەوە بێــت وا دانــاییترە، هــەروەك ئــەوەی مارگرێــت کــانۆن کردوویــەتی، زیــاتر میتــۆدێکی دیالێکتیکانــه

3 Smith (1991), p. 14 (italics original).
4 Connor (1994), p.43.
5 Deutsch (1969), p. 19.
6 Giddens (1985), p. 119.

بـەکاربهێنرێت، هـەوڵی دەسـتکەوتنی تێگەیشـتنێك لـەو دیاردەیـە بـدەین و لـەپێنج گۆشەوە رووی تێبکەین.[7]

یەکەمیان هەروەك دیۆچو گیدینز جەختیان لێکردۆتـەوە، لەوانەیـە نەتـەوە فـۆرمی دەوڵەت وەربگرێت. هەرچـەندە، پێناسـەکردنەکەیان لـەڕووی وردکردنـەوەدا کـورتی پێوەدیارە لەکاتێکدا تێڕوانینی یەکێکیان هاوشێوەی ئەوەی تریانە. لەکاتێکدا سیتۆن واتسۆن ئاماژە بـەوە دەدات کـە " دەوڵـەتان بەماوەیـەکی درێـژیش پـێش نەتـەوەکان هـەن، هـەروەها هێنـدێك نەتەوەگـەلیش هـەن زۆر کـۆنترن لەزۆربـەی ئـەو دەوڵەتـە نەتەوەییانەی ئەمڕۆکە هەن."[8] بەمانایەکی دیکە، بەدەر لەهـەموو ئـەو دەوڵەتانـەی هـەبوون دەوڵـەتی نەتـەوەیی هەیـە، بەهەمانشـێوەش، چـەندین نەتـەوەش هـەن بێئەوەی لەقاڵبی دەوڵەتێکدا بێت، بەوەش رەهەندە سیاسییەکە بـەجۆرێك بەشـێکە لـە چـەمکەکە، هەرچـەندە، لەلایـەن ئـەنتۆنی سمسـەوە بـەروونی دەربـڕراوە کـە وتوویەتی :" هەرچیەکی تر ئەبێت ، ئەوەی ئێمە لەمانای شوناسی "نەتەوەیی" ئەو هێندە هەستەی کۆمەڵێکی سیاسییە، هەرچەندە لاوازیش بێت.[9]

دووەم، ئـەو دیـدەی کـە نەتـەوەکان وەك کۆمـەڵێکی کـەلتووریی دەبینێـت هـەروەك لـەدەربڕینێکی فیچتسـدا هـاتووە:" لەهـەرکوێ زمـانێکی جیـا هـەبێت، نەتەوەیـەکی جیاش هەیە."[10] هەرچەندە، گریمانـەی پەیوەندییـەکی نزیکـی نێـوان زمـانو رۆحـی گەلان، لێکدەرەوەی ئەوە نییە کە بۆچـی نەتەوەییـەکان لەشـوێنە جیاوازەکـانی وەك ئێرلەنـداو هندسـتان ئـارەزووی بـەکارهێنانی زمـانی ئینگلیزیـی دەکـەن لەقسـەی رۆژانەیاندا. ئەم پێکدژییـە هـانی بـەکارهێنانی پێناسـەیەکی بـەرفراوانتری کـەلتوور

7 Canovan (1996a), p. 51-60.

8 Seton-Watson (1977), p. 1.

٩ Smith (1991), p. 9. بۆزیاتر سەبارەت بە "شوناسی نەتەوەیی" بڕوانە باسی چوارەم : پێکهاتەی شوناسی کوردیی.

10 Fichte (1922), Addresses to the German Nation, Chicago: Open Court, p. 215, as quoted in Canovan (1996a), p. 52.

دەدات، وێناكردنێك كە ڕەهەندێكی ئەنترۆپۆلۆجیی هەیە.[11]

سێیەم، دەتوانرێت نەتەوەگەلێك لەڕووی شوناسی خودیی تاكەكانەوە وێنابكرێت. بەوپێیەش دەشێت هۆشیارییەك یان " لایەنگرییەكی ئارەزوومەندانە"[12] بێت، زیاتر لەوەی تایبەتمەندیگەلێكی بابەتی ڕواڵەتی بێت، ئەوەی لای ئەنتۆنی سمس لەسەروو هەموو ئەوانە پێشاندراوە كە وادەكەن گەلێك نەتەوە بێت.دواتر، بەڕوونی، بانگەشەی نەتەوەبوون چەندین پرس سەبارەت بە پێناسە خودیی‌و بابەتییەكان دێنێتەپێش. ئایدۆلۆجیا نەتەوایەتییەكان لەبەر هۆكاری لۆژیكی تایبەتمەندییە بابەتییەكانی نەتەوەكانیان هەڵدەهێنجن، بەڵام پێناسەكانیان ئەمانە ناگرێتەخۆ " لەكاتێكدا هیچ یەك لەم تایبەتمەندییانە بۆ یەكێتی نەتەوەیی بنەڕەتی نیین، هەروەها هەموو ئەوانە لەكاتی جیاوازدا ڕۆڵی جیاواز دەبینن." [13] پێدەچێت نەتەوەكان مەحاڵبێت هەرگیز ببنە "كۆمەڵێكی بابەتیی"، لەكاتێكدا نە بنیاتنراون‌و نەدەتوانرێت لەدەوری پێودانگی ڕوون‌و بابەتیی بنیاتبنرێن كە هەموو ئەندامانی نەتەوەیی پابەندی بن. زێدە گونجاوتر، لەوانەیە ئەوانە بە "كۆمەڵگای وێناكراو" بدرێنە قەڵەم، لەڕۆحی ئەنترۆپۆلۆجی بینەدیكت ئەندەرسۆندا، ئەوەی كتێبە بایەخدارەكەی وەك شوناسێكی وێناكراوی بونیادی مامەڵە لەگەڵ نەتەوەكان دەكات. ئەوەی كۆمەڵێكی سیاسیی وێناكراوە "• چونكە تەنانەت ئەندامانی

---

١١ ئەوەی كەبۆچی دیدی ئەنترۆپۆلۆجی بنەڕەتییە بۆ تەواو تێگەیشتن لەنەتەوایەتی‌و چەمكە سەرەكییەكانی بڕوانە:

ch. 6 of Thomas Hyl land Eriksen's Ethnicity and Nationalism. Anthropological Perspectives, London: Pluto Press (1993). 

12 Gellner (1983a), p. 53.

13 Vogler (1985), p. 62.

• ئەم كتێبە فرە بایەخدارەی ئەندەرسۆن لەلایەن دەزگای "هینرخ بل" ئۆفیسی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە لەساڵی ٢٠٠٩ وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبیی‌و لە لوبنان لە ٢٦٩ لاپەڕەی قەبارە بچووكدا بڵاكراوەتەوە. شایەنی باسە، د.عەزمی بشارە كێبەكەی بەعەرەبیی پێشكەشكردووە. ڕێبازی نووسینی ئەم كتێبە كە بۆزیاتر ٣٠ زمانی جیهانیی وەرگێڕاوە، لەوە لیبراڵیترە كە ماركسیی بێت‌و لەوەش ماركسییترە كە لیبراڵی بێت. نێوەرۆكەكەی بۆشاییەكی گەورەی لە تیۆریزەكردنی نەتەوایەییدا پڕكردۆتەوە، نەتەوایەتیی لای ئەندەرسۆن نە

**بچووكترین نەتەوەش هەموو ئەندامە خۆولاٌتییەكانی خۆیان ناناسن‌و نەیانبینیون یاخود هەر هیچیان لەبارەیانەوە نەبیستووە، ئەوەی هەیە لەمێشكی هەر یەكەیاندا وێنای كۆمەڵێكیان بۆ خۆیان پێكهێناوە."[14] دەتوانرێت لەبنەڕەتدا هەمان هەست لەكارێكی پێشووی پێوانەیی ببینرێتەوە كە لەسەر نەتەوەو نەتەوایەتیی كراوە. هۆگ سیتۆن واتسۆن لەساڵی ١٩٧٧دا نووسیویەتی :" نەتەوەیەك هەیە كاتێك ژمارەیەكی بەرچاو خەڵك لەنێو كۆمەڵێكدا واخۆیان لەقەڵەمدەدەن كە نەتەوەیەك پێكبهێنن، یاخود وا هەڵدەسوڕێن وەك ئەوەی نەتەوەیەكیان پێكهێنابێت."[15] دەشێت " واخۆیان لەقەڵەمدەدەن" وەربگێڕرێت بۆ " واخۆیان دەنوێنن".**

**لەلای ئەندەرسۆن، نەتەوە هەم وێناكراوەو هەم سنووردار " چونكە گەورەترینیشیان**

---

ئیتنۆگەراییەكی نوێبووەوەیە وەك ئەنتۆنی سمس دەڵێت، نە ئایدیۆلۆجییەكی بۆرجوازییە وە ماركسییەكان دەڵێن، نە زادەی كۆمەڵگایەكی پیشەسازیشە وەك ئارنست گێڵنەر دەڵێت، نە ئەو قەیدو بەندە ئاسنینەشی پێشمەرجە كە ستالین بەسەر هەموو نەتەوایەتییەكاندا سەپاندوویەتیی، وەنە داهێنانێكی تێپەڕیشە وەك هۆبسباوم دەڵێت. بەڵكو گروپێكی سیاسیی وێناكراوی خاوەن سنوور(سیاسیی، جیۆگرافیی، زمانیی، كارگێڕیی)و ویستی سیاسییە، جگە لەوەی زادەی هەست‌و سۆزو خوشەویستیشە، بەشێوەیە زیاتر لە دیاردەكانی خێزان‌و ئاینەوە نزیكە وەك لەوەی ئایدۆلۆجییەكی سیاسیی یان چینایەتیی بێت. دەگونجێت مرۆڤ نەتوانێت موسوڵمانێكی كۆمۆنیست، یان كۆمۆنیستێكی لیبراڵ، یا لیبراڵێكی كۆمۆنیست بێت، بەڵام دەتوانێت: موسوڵمانێكی نەتەوەیی، كۆمۆنیستێكی نەتەوەیی، یان لیبراڵێكی نەتەوەیی بێت. ئەندەرسۆنیش وەك ماركس جیاوازییەكی گەورە لەنێوان نەتەوایەتیی نەتەوەی سەردەست‌و نەتەوایەتیی ئیتنۆ بندەستەكان دادەنێت. ئەندەرسۆن لەهەوڵەكەیدا بۆ دۆزینەوەی بنەماكانی پشكوتنی نەتەوایەتیی، گرنگیی‌و بایەخێكی مەزن بۆ دەستپێكی "print capitalism/ چاپەمەنیی سەرمایەدارییانە" لە ئەوروپاو ڕۆڵی "bilingual intellectuals/ ڕووناكبیرانی جووتزمانزان" لە خولقاندنی هۆشی نەتەوەییدا دادەنێت. ئەو باس لەوەدەكات كە چۆن هەندێك گروپ لە كۆمەلانی خەڵك بەهۆی خوێندنەوەی هاوبەشەوە وابیر لەخۆیان دەكەنەوە كە كۆمەڵگەیەك بن، هەروەها چۆن ڕووناكبیرانی جووتزمانزان لایەنگیریی لە هەستی هاوبەش‌و هاوبەستەگیی لەنێو كۆمەڵگەكەدا دەكەن.هەروەها ئەو ئاماژە بە هەندێك پەرەسەندنی مێژوویی دیكە دەدات كە پێدەچێت بۆ شێوەكانی دیكەی هۆشی نەتەوەیی بگەڕێتەوە كە وەك دەردەكەوێت زادەی ئیمپراتۆرییەكان، بەناوەندییكردن‌و هەروەها ناناوەندییكردنەوە بێت.

14 Anderson (1991), p. 6.
15 Seton-Watson (1977) p. 5.

دیارییکراوە، کە لەپشت سنورە لاستیکییەکانییەوە نەتەوەی تر بوونیان هەیە."
لەوەش زیاتر وەك خاوەن سەروەریی وێناکراوە چونکە ملبەملێی ئاینو پاشایەتیی دەکات. دوجار وەك کۆمەڵێك وێناکراوە چونکە "بەدەر لە یەکسانی راستیینە، نەتەوە وەك هاوبیرییەکی ئاسۆیی دوورمەودا وێنادەکرێت."[16] ئەم کۆمەڵگا وێناکراوە کە دانیشتووانی فەڵەمرەوێکی تایبەت لەباوەش دەگرێت بەنێو زەمەندا درێژدەبێتەوەو هەموو نایەکسانییەکانی رابردووو ئایندەی خۆی دەگرێتەخۆ، رەهەندێك پێداگریی نەتەوە سەبارەت بە هەستکردن بەمێژووی خۆی زامندەکات،جیا لە هەریەك لەوانەی دیکە.
لەوانەی ئەم جۆرە سروشتە وێناکراوییەی بیرۆکەکە لەلای والکەر کۆنور هەنگاوێکی بەرینتری هاوێشتبێت لەو کۆپلەیەی لەسەرەوە وەرگیراوە، کە هەڵوێست وەك گەوهەری نەتەوە جیادەکاتەوە. وێڕای ئەوەی، هەروەك کانۆڤان بەجوانی دەریبڕیوە:
" هەرچەندە دەگونجێت بوونی نەتەوەیەك کۆتاییپێبێت لەکاتێکدا ئەندامەکانی ئەو نەتەوەیە لەبیرکردنەوەی نەتەوەییانە بکەون، بوونی ئەو نەتەوەیە وەك بەشێك لە راستییە بابەتییەکان رووبەرووی هەر ئەندامێکی تایبەت دەبێتەوە. لەوانەیە ئەو نەتەوەیەی من سەربەوم هەمووی لەمێشکدا بێت، بەڵام نەك هەمووی لە"مێشکی مندا" بێت، بەڵام من ناتوانم بە کارێکی خۆویست رەوشەکە بگۆڕم."[17]
چوارەم، هەروەها دەتوانرێت نەتەوە وەك گروپێکی (ئیتنی/قەومی) ببینرێت یان درێژەوەبوویەکی گروپی بەوچەشنە. دەبێ ئاماژە بە ئەنتۆنی سمس بکرێت وەك بەجۆشترین لایەنگری ئەو بیرۆکەیەی کە نەتەوەکان ریشەی ئیتنییان هەیە، ئەو دەڵێت کە کرۆکی ئیتنی پێویستی قووڵی مێژوویی بۆ نەتەوە فەراهەم دەکات تاکو بتوانێت لەگەڵ سیاسەتی هاوچەرخدا سەروکار پەیداکات. ئیتنیەکە، هەروەك سمس ناوی کۆمەڵی ئیتنیی ناوە، ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییە کۆنەیە کە نەتەوە

16 Anderson (1991), p. 7 (italics added).
17 Canovan (1996a), p. 55.

مۆدێرنەکەی لێوە گەشەدەکات. بەوەش ریشەی کۆمەڵگای نەتەوەیی کە لەسۆزی ئیتنی پێش مۆدێرنەدا دەبینرێتەوە دەتوانرێت بە تێڕوانینە سەرەتاییەکانەوە پەیوەستبکرێت، ئەوەی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێت کە مۆدێرنیزەی سیاسیی بۆ نەتەوەسازیی زۆربەیجار هانی تۆکمەبوونی رایەڵە کەلتوورییە پێشگریمانەکان‌و بەهێزبوونی " پەیوەستەگییە سەرەتاییەکان" دەدات.[18] هەروەك سمس مشتومڕی لەبارەوە دەکات، پاشڤەڕۆیی ئەم جۆرە هۆش‌و ئیحساسە نابێ بەکەم بگیرێ، هەروەها ئەو لە دژی ئەو بڕوایە ئاگاداریی دەدات کە دەڵێت نەتەوەکان بەرهەمگەلێکی مۆدێرنن.[19] دواتر ئەم بیروڕایانە گەشەیانکرد، تێبینیکراوە کە نابێت بوترێ کە " پێویستە هەموو نەتەوەیەکی هاوچەرخ لەسەر پەیوەستە ئیتنییەکانی پێشوو دابمەزرێت...بەڵام چەندین نەتەوە هەن...کەلەسەر چەشنە پەیوەستەگییەك هاتونەتەئارا، لەوانە یەکەمین نەتەوەگەلەکان لەرۆژئاوا...هەروەها ئەوانە وەك مۆدێل‌و پێشەنگی بیری "نەتەوە: بۆ ئەوانی دیکە کاریانکردووە." [20] ئەم رێبازە بۆ تێگەیشتن لە گەشەکردنی نەتەوەکان بە "ئیتنۆ-سیمبولیك" ئاماژەی بۆکراوە.[21] پێنجەم، نەتەوەکان لەلایەن هێندێکەوە وەك بەرهەمی مۆدێرنیزە دەبینرێن. گومانی تێدانییە ئێرنست گێڵنەر لەنێو مۆدێرنستەکاندا مەرجەعی پێشەنگە، هەروەها شرۆڤەکارییە کاریگەرەکەی لەسەر ئەو گریمانەیە راوەستاوە کە نەتەوەکان

١٨. چەمکێکە زۆرجار لەلایەن کلیفۆرد گێرتزەوە پێناسەکراوە لەگەڵ مۆدێلە سەرەتاییەکەی ئیتنۆگەرایی.

بڕوانە بۆ نموونە:

The Interpretation of Cultures, (1973), New York: Basic Books. (This is also discussed, although briefly, in forthcoming chapter four: Kurdish Identity formation.)

19Smith (1986a): argument introduced and outlined in the first chapter .

20 Id. (1999), p. 40.

٢١ ئەی دی سمس تێگەیشتنێکی قووڵتر سەبارەت بەئیتنۆ–سیمبولیزم لە بەشی هەشتەمی کتیبەکەی پێشکەشدەکات بەناوی:

Nationalism and Modernistn. A critical survey of recent theories of nations and nationalism, London: Routledge (2000) [1998].

دادەهێنرێت زیاتر لەوەی پێکهاتەی رەسەن بن.[22] رێبازێکی نائاسایی کە بۆ (باوەر) دەگەڕێتەوە ئەوەیە کە پرسیار لەو گریمانە زۆر دەستپێوەگیراوە دەکات کە نەتەوە یەکەیەکە لەسروشتدا کەلتووریی و سیاسییە. ئەو لەبری ئەوە لەکلاورۆژنەی مێژوویی و مادییەوە شرۆڤە دەکات و مشتومڕ لەو رووەوە دەکات کە کارەکتەری کەلتووری نەتەوە بەشێوەیەکی مێژوویی گەشەدەکات و ئاکامی بەشدارییە لە هەلومەرجێکی هاوبەشی ژیانی مادیدا. لەو سۆنگەیەوە کە هەلومەرجەکانی ژیانی مادیی جیاوازە، تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانیش ملکەچی گۆڕانکارییەکانن- لێرەوە شیاو نییە کە نەتەوە وەك یەکەیەکی نەگۆڕ یان چەسپاو پێناسەبکرێت.[23] لەکاتێکدا ناکۆکییەك لەسەر سروشتە بزۆزو دینامیکیەتەکەی نەتەوە نییە، هەربۆیە خواستێك نییە بۆ وەستان لەسەر لێکدانەوەیەکی دیاریکراوی چەمکەکە، لەکاتێکدا دان بەوەدا نراوە کە شکڵ و بونیادی نەتەوە هەمیشە بۆ لێکدانەوە کراوەیە.

لەو پێنج رێبازەی لێرەدا هاتوون، هەریەکەیان بەشێك لە راستی لەخۆگرتووە بەلام دواجار دەگەنە کۆلانێکی داخراو،[24] کە رۆڵی ناوەندگیریی نەتەوە زەقدەکاتەوە. لەڕاستییدا، وادەردەکەوێت کە کلیلێك بۆ سروشتە ئالۆزەکەی لەو توانایەیدا خۆی دەبینێتەوە بۆ نێوەندگیریی لەنێوان رووخسارەکانی ژیانی کۆمەلایەتی و سیاسیی.[25] لەبەرئەوە، لەبری هەولدانێك بۆ نەخشکردنی پێناسەیەکی چەسپاو لەدەرەوەی ئەم لێکدانەوە ناکۆکانەی دیاردەکە کە لەڕاستییدا " تاك بەکۆمەڵ و هەروەها رابردووی کۆمەڵ بە ئێستایەوە دەبەستێتەوە"[26] گریمانەکە ئەوەیە کە لێکنزیکردنەوەی ئەم پێنج رەگەزگەلە جیاوازەیە کە بنەماکانی نەتەوە پێکدەهێنن.

22 See in particular his Thought and Change (1964).
23 Bauer (1978), pp. 106-17.
24 Canovan (1996a), p. 50.
25 Ibid.
26 Id. (1996b), p. 76.

## ٢ .١. ٢ بۆ گەشەکردنی نەتەوە بۆ دەوڵەت – بیرۆکەی دەوڵەت-نەتەوە

بەلەبەرچاوگرتنی ئـەو گرفتـە سـەرەکییانەی رووبـەڕووی بووینـەوە کاتێـك هـەوڵی دۆزینەوەی پێناسەیەکمان بۆ "نەتەوە" دا، پێناسەکردنی دەوڵەتیش گـرفتی زیـاتری خۆی هەیە. پێناسەی زاڵی دەوڵەت( بەشێوەیەکی سەرەکی بەچەمکی دەزگایی بـەڵام بە رەگەزی ئاشکرای وەزیفی ) پێناسەیەکە کە لەبنەڕەتەوە لەلایەن ماکس وێبەرەوە پێشکەشـکراوە. بـڕوا وایـە کـە دەوڵـەت کۆمەڵـە دەزگـاو دامـەزراوەو خـەڵکێکی جۆراوجۆرە کەلایەنگریی لە ناوەندگەرایی دەکەن تائـەو ڕادەیـەی ناوەنـد دەسـەڵاتی خۆی بەسەر خـاکی ناوچـە دیارییکراوەکـەدا دەسـەپێنێتو قـۆرخی فەرمانڕەوایـەتی لەوناوچـەیە دەکات.یـەکێکی دیکـە لەتایبەتمەندییـەکانی دەوڵـەت هـەروەك لەلایـەن وێبـەرەوە جـەختی لێکراوەتـەوە ئەوەیـە کـە هـەروەها قـۆرخی بـەکارهێنانی رەوای هێـزی فیزیکـی هەیـە.[٢٧] هـەروەك لەلایـەن کۆڵـەرێکی وێبەرییـەوە پوختکراوەتـەوە، پێناسـەی گشـتی دەوڵـەت ئەوەیـە کـە بەدەنەیـەکی سیاسـییە " کۆمەڵـە دەزگـاو دامەزراوەی جۆراوجۆرو ئۆتۆنۆم دەگرێتەخۆ کە لەرووی خاکەوە بەناوەنـدییکراوەو بانگەشـەی دەسـەڵاتی دادوەری دەکـات بەسـەر ئـەو خاکـەی وەرگـیراوە، لەوانـە قۆرخکردنی هێزی سەرکوتو ریشەکێشکردن".[٢٨] *

27 Weber (1968), p. 64.

* ناساندنی دەوڵەت لەڕووی تیۆرییەوە پەردە لەسەر زنجیرەیەك بۆچوونی جیاواز هەڵدەداتـەوە، بەشـێوەیەك هیچ پێناسایەکی تایبەت نیە کە هەموان کۆکبن لەسەری، بەڵام دەگونجێت لێکچوون لـەو پێناسـانەدا هـەبێت. هەروەها لە کۆڵینەوە سەبارەت بە دەوڵەت لەڕووی کرداریيشەوە هـەر هـەمان شـێوەیە، لەکاتێکـدا دەگونجێت نادەوڵەتبوون پێودانگی پێویستو تایبەتمەندیی بگرێتەخۆ، ئەوەی کـە هێشـتا حاڵـەتی دەوڵـەتبوونی بـەخۆوە نـەگرتووە. لەلایـەکی دیکـەوە، دووبـارە بـە دانپێـدانانی دەوڵـەتان، مـرۆ دەتوانێـت ئـەو بـڕە زۆرەی پێناسـە بەکاربێنێت. تەنانەت ئـەو کاتـەش کـە دەگوترێـت دەوڵـەتێك بـوونی هەیـە، دەشـێت تایبەتمەنـدییو پێودانگـە پێویسـتەکان نەگرێتـەخۆ. سـەبارەت بـەم پرسـە، "دێڤیـد کراسـنەر" تێبینییکـردووە کـە "دان بەهێنـدێك لـە قەوارەکاندا دەنرێت کە لەڕووی ئۆتۆنۆمییەکی دادوەریی فەرمییەوە یاخود زەمینیی هەرێمییەوە کورتیهێنـاوە، لەکاتێکدا ئەو دانپێدانانە بۆ هێندێك دەوڵەت رەوا نـابینرێن کـە خـاوەنی ئـەو سیفەتانەشـن". داڤیـد ئەسـتۆن، کاتێك تێبینیی چەمکی "دەوڵەت"ی کردووە کە ١٤٠جار زێدەتر پێناسەو بەکارهێنانی هەیە، کـە زادەی مـەیلی

ئایدۆلۆژیی جۆربەجۆرە، ئەو ئالۆزییە زێدەیە ئاکامی بەکارهێنانی فراوانی ئەو چەمکەیە، هەروەها سەختییەکانی کارکردنەکانی ئەو چەمکەیە بۆ کۆڵینەوە ئەزموونییەکان. پێناسەکردنی دەوڵەت لەساڵی ۱۹۳۳دا لە پەیمانی مۆنتیڤیدیۆدا سەبارەت بە مافو ئەرکەکانی دەوڵەت دەبینرێتەوە. پەیمانەکە دەوڵەتی بەم شێوەیەی خوارەوە ناساندووە کە خاوەنی" ا– دانیشتووانێکی هەمیشەیی ب– سەرزەمینێکی دیارییکراو ج– حکومەتو هەروەها د– توانای چوونە نێو پەیوەندییەکان لەگەڵ وڵاتانی دیکەدا. هەرچەندە ئەم پێناسەیە لەڕووی سەروەرییەوە کورتیهێناوە کە سیفەتێکی دەوڵەتبوونە. ئەوەی وادەکات مەسەلەی دامەزراندنی دەوڵەتی نوێ لەڕووی شەرعییەتەوە سەختبێت. زیاتر لەوەش، دەبێت درك بەوە بکەین کە جیاوازیی لەنێوان ئەوپێوانانەدا هەیە کە پێویستە کۆببنەوە پێش ئەوەی دەوڵەت بتوانێت بێتەئارا. هەروەها لەگەڵ ئەو پێوانانەی کە چاوەڕواندەکرێت ببێتە هۆکاری دروستبوونی دەوڵەتێك. "داڤید نایت" ناجێگیرییەکی بایەخداری لەنێوان ئەو پێوانانە ناساندووە کە پێویستن یەکانگیربن لەگەڵ ئەو هۆکارانەی بۆ بوونی دەوڵەت پێویستن، کاتێك دەڵێت:"پێویستە هێندێك پێوانەی باو هاوبەشو یەکانگیربن پێش ئەوەی بگوترێت دەوڵەتەکە پەیدابووە، هەرچەندە ئەو هۆکارگەلە تایبەتییانەی کەوادەکات بۆچی دەوڵەت هەبێت زۆر بەتەواویی جیاوازو ئاشکرایە. تیۆرەکانی دەوڵەت بە ڕەگەزگەلێکی ئاوێتە لە ڕێبازی جیاواز دەناسرێتەوە، وێڕای ئەو ئاکامەی کە پێناسەی دەوڵەت چەندین سیفەتیشی دەناسێنێت. وێڕای هێندەش ، دەشێت ژمارەیەکی بەرچاو لە دەوڵەتی دامەزراو بکەوێتە دەرەوەی تیۆری رووتەوە. "یالا فێرگوسنو ریچارد مانسباك" سەرزەنشتی ئەم گرفتە دەکەن سەبارەت بەو پێناسە تەمومژاوییە تێکەڵوپێکەڵەی ئەم دیاردەیە کە کۆڵینەوەی لێدەکرێتو بەرێژەیەکی خێرا دەگۆڕێت ، وادەکات باسەکە ببێتە شتێکی نابابەتییانە." میشیل مان، پێناسەیەکی تێکەڵی پێشکەشکردووە، بەڵام لە بنەڕەتەوە پێناسەیەکی دەزگاییە، ئەوەی لەگەڵ "ماکس وێبەر"دا پێکیهێناوە، لەم پێناسەیەدا کە زۆربەی رەگەزەکانی زۆرینەی تیۆرەکانی دەوڵەتی لەخۆگرتووە، دەوڵەت چوار رەگەزی سەرەکیی هەیە، ئەوانەش: ۱– دەستەیەکی بەرچاو لە دەزگاکانو کارمەندە بەرجەستەکان، ۲– ناوەندگەرایی ۳– ناوچەیەکی هەرێمیی سنووردار کە ئەو دەسەڵاتو پەیوەندییانەی لەسەر بەڕێوەبەرێت ٤– قۆرغکردنی پایەکانی دەسەڵاتدارێتیی بۆ پێکهێنانی فەرمانڕەوایەتیی ، کە بەهۆی قۆرغکردنی ئامرازە فیزیکییەکانی توندوتیژییەوە پشتگیریی بکرێت.

دەگونجێت بەرچاوترین تایبەتمەندیی دەوڵەت دەستبەسەرداگرتنی خاك بێت، هیچ دەوڵەتێك بێ بوونی ناوچەیەکی جوگرافیی دانپێدانراو نابێت کە لێیەوە فەرمانڕەوایەتیی، کارگێڕیی، بەرگریی، بەڕێوەبردنی بڕیارسازیی ئەنجامبداتو داوا بکات هاوڵاتییەکانی دڵسۆزییو وەفاداریی خۆیان بۆ ئەو فەرمانڕەوایەتییە دەربڕن. "باری بوزان" ئەمەی لە هزردا بووە کاتێك دەوڵەتی بەوە ناساندووە کە: " نوێنەرایەتیی کۆمەڵێك مرۆڤ دەکات کە تێیدا دەزگا فەرمانڕەوایەتییو کۆمەڵایەتییەکان لەسەر خاکێکی دیارییکراو ئاوێتەدەبن. هەرچەندە بۆ زۆربە، نەك بۆ هەموو، مەبەستە سەرەکییەکانی ئەم ئاوێتەبوونە لەنێو ئەم رەگەزە پەیوەستدارانەی وەك خاك، حکومەتو کۆمەڵگا، ئەوەیە کە دەوڵەت پێکدەهێنێت." دەگونجێت ئەم هەڵوێستە کە خاك بەبایەخ وەردەگرێت بە جیۆپۆلیتیکانە وەسفبکرێت، هەروەها پەیوەندیی نێوان دەوڵەتو خاك بەتوندیی لەلایەن بواری جوگرافیی سیاسییو جیۆپۆلیتیکەوە پشتگیرییکراوە. ئەوەی بانگەشەی ئەوە دەکات کە تواناو دەسەڵات زادەی سروشتی فیزیکیی خودی جیهانە، هەروەها، بەتایبەت لەم ناوچەیەدا کە زێدە

**هەرچەندە، نەبوونی گرفت لە پێناسەکردنی دەوڵەتدا وەختێك سەرهەڵدەدات کاتێك "نەتەوە"و "دەوڵەت" پێکەوە کۆدەکرێنەوەو چەمکی دەوڵەت-نەتەوە بئافرێنرێت – بەشێوەیەکی "سروشتی" وا لەقەڵەم دەدرێت هەردوو زاراوەکە پێکەوە کۆبکرێنەوە. ئەمە زۆربەی جار ئاڵۆزیی پێکدەهێنێت. هەروەك "تایبەتگەراییو چڕکردنەوەی فەرمانەکان"[29] دەوڵەت سنووری هەیە بەڵام زۆرجار ریشەو چەسپاندنی لاوازە لەکاتێکدا نەتەوە لەوانەی زۆرجار سنوورێکی لاوازی هەبێت بەڵام چالاكو هەراشە.[30] هەردووکیان پێکەوە بوشێوەیەکی ئایدیالی دەبنە دەوڵەت-نەتەوەیەکی سنووردارو چالاك.**

**ئەم ئایدیایەی کە دەوڵەت دەبێت خزمەتی نەتەوە بکات یەکەمجار لەلایەن کۆنگرەی ڤێناوە لەساڵی ١٨١٥دا هێنراوەتە بەرباسو گفتوگۆ،[31] هەروەها وەك گیدنز جەختی لێکردۆتەوە، جەنگ هات بۆئەوەی ناوەندی بێت بۆ پشکووتنو پەرەسەندنی ئەم**

---

لەلایەن هێزەکانی ئابووریی جیهانگەرایی کاری تێدەکرێت، هێشتا هێزو توانای دەوڵەتی مۆدێرن بەشێوەیەکی بنەڕەتیی پەیوەستە بە دەستبەسەرداگرتنی خاكو قەلەمڕەوەکە. سەبارەت بە دەوڵەتە دیفاکتۆکەی کوردستانی عێراق، کۆنترۆڵکردنەکەی ئەو خاکە دیارییکراوە، کە شانبەشانی پەرەسەندنی کارگێڕییەکی خێرا کارابوو، لەگەڵ کۆمەڵگایەکی مەدەنییدا، کە ببێتە ناوکی پێناسەکەی، لانیکەم وەك نیمچە قەوارەی دەوڵەتێك، ئەگەر زێدەتر نەبێت، ئەوەش گرنگ نیە کە ئەم خاکە چەندینجار تووشی سنووربەزاندنو تەجاوز دەبێتەوە.
بڕوانە:
D. Krasner, ‘Approaches to the State: Alternative Conceptions and Historical Dynamics’, Comparative Politics, Vol. 16, No. 2, 1984, pp. 223–46; D., D. Philpott, ‘Ideas and the Evolution of Sovereignty’, in S. Hashmi (ed.), State Sovereignty: Change and Persistence in International Relations, Pennsylvania: Pennsylvania State University Press, 1997, pp. 17–47. For a succinct appraisal of theories of international relations, see J.E. Dougherty and R.L. Pfaltzgraff, Contending Theories of International Relations, New York: Harper and Row, 1990; H. Hannum, Autonomy, Sovereignty, and Self-Determination: The Accommodation of Conflicting Rights,Philadelphia, PA: University of Pennsylvania Press, 199

28 Smith (1986b), p. 235.
29 Gellncr (1983a), p. 4.
30 Mann (1995), p. 46.
31 Navari (1981), p. 14.

تـەرزە نوێیـەی بەدەنـەی سیاسـی.[32] ئایـدیای بنـەڕەتی دەوڵـەت-نەتـەوە ئەوەیـە کـە بەرجەستەی هاوجووتییەکی بەهێز لەنێوان نەتەوەو دەوڵەتـدا دەکات: بـەوەی هـەر دەوڵەتێکی خاوەن سەروەریی دەبێت دەوڵەت —نەتەوەی ئەو گەلـە بێـت کەلەهـەموو تایبەتمەندییـەکانی نەتـەوەدا بەشـدارن. ئـەوەی ئـەم بیرۆکەیـە دەیکاتـە مـەرج، بـۆ نموونـە، بـۆ دەوڵـەتو نەتـەوە دەبێـت بەرجەسـتەی یـەك ئۆرگـانی سـاخڵەم بکـات، هەرچەندە، ئەمە سەلمێنراوە کە ئەستەمە لەکرداردا پشتگیریی لێبکرێت. کـەلێنێکی بەرین لەنێوان ئایدیالو واقیعدا هەیە. لەواقیعدا، زۆربـەی دەوڵـەتان لەپێکهاتەیانـدا فرە ئیتنینو هەربۆیە زاراوەی دەوڵەت —نەتـەوە بەتـەواوی گونجـاو نییـە. هـەروەك والکـەر کۆنـۆر پێشـانیداوە، کـەمتر لـە ١٠٪ی دەوڵـەتانی هاوچـەرخ دەتوانرێـت بـە هەماهـەنگ وەسـفبکرێت، دەوڵـەت نەتەوەیـەك ئەوەیـە کـە، سـنووری دەوڵەتەکـە هاوجووت بێت لەگەڵ سنووری کۆمەڵە ئیتنییەکە.[33]

لەڕاسـتییدا، کـەم نەتەوەگـەلێك هـەن سـنووری هاوجووتیـان لەگـەڵ ئەودەوڵەتانـە هەبێت کە ئێستاکە هەن. کاتێك ئەم رەوشـە روودەدات، دەوترێـت نەتەوەکـە بۆتـە ( state-reinforcing / دەوڵـــەت پتەوکـــەر) . هەرچـــەندە، لەئیمپراتۆرییـــە مەزنەکاندا، هەروەك عوسمانیو روسی، نەتەوەکان فرە بچووکتربوون لەسـنوورەکانی دەوڵەت، هەربۆیـە ئەوانـە بوونـە ( state-subverting / دەوڵـەت تێکـدەر )، حاڵەتێکی سێیەم دەردەکەوێت کاتێك نەتەوەکە لەهەر دەوڵەتێك کەهەیە گەورەترە، هەروەك ئەڵمانیای سەدەی حەڤدەیەمو بەشە ئیتاڵییەکەی ئەوروپا. ئەو دەمە رۆڵـی نەتەوە دەبێتە ( state-crating / دەوڵەت ئەفرێنەر). [34]

دەوڵـــەت-نەتـــەوە بەئاشـــکرا ئایـــدیا سیاســـیو کەلتوورییـــەکانی نەتـــەوە پێکـــەوە

---

32 Cf. Giddens (1985).

33 Connor (1972), p. 320.

هەرچەندە، هەڵسەنگاندنی کۆنۆر لەسەرەتای ساڵانی ١٩٧٠کانەوە کراوە(ژمارەی دەوڵەتەکان ١٣٢ بوون کە لەوانە ١٢یان نەتەوەیی رەسەن بوون) رێحەزە گشتییەکە بڕواناکرێت لەبنەڕەتدا گۆڕابێت.

34 Mann (1995), p. 46.

خرِدەکاتــەوەو ئــەو پێکهاتــە سیاســی-هەرێمییــە لەوانەیــە " بەرهــەمی هۆشــێکی هاوبەشبن کە زیاتر لە ژیانی هاوبەش و نموونەی باڵای هاوبـەش هـەڵهێنجراوە تـاکو هــەر میراتێکــی رەگــەزی، زمــانی و کــەلتووریی.[35] مێــژوو پێشــانیدەدات کــە نەتەوەسازییەکەی بەو چەشنە، کە بەرەو ئەفراندنی دەوڵەت-نەتەوە هەنگاو دەنێت، پرۆسەیەکی هاوسازیی نییـە، تێیـدا گـەلی خـۆ بەنەتـەوەزان بەشـێوەیەکی سروشـتی پێبگـات و هێـدی هێـدی بـەرەو رۆڵـە نوێیەکـەی خـۆی وەك دەوڵـەت –نەتــەوە گەشــەبکات. بەپێچــەوانەوە، دەوڵــەت-نەتــەوە زۆربــەیجار لــەدەرەوەی هــۆگریی و هەوادارییە کۆنەکان دەپشکوێت. هەروەك بیلێنگ دەریبڕیوە:" ئەو گەلانەی دەوڵەت-نەتەوەکانیان بانگەشەی نوێنەرایەتییکردنیان دەکەن زۆربەیجار لەسـەر هەسـتێکی ( peoplehood / گەلایەتی ) پەروەردەبوون پـێش قۆنـاغی نەتـەوەبوون، تەنانـەت ئەگـەر کـاڵای نەتـەوەبوون بـەباڵای گەلایەتییەکـەدا نـەبڕرێت، لەلایـەن دەوڵەتـەوە بانگەشـەی بـۆ دەکرێـت." [36] ئـەوە ئـەم پـەروەردەبوونی گەلایەتییەیـە کـە لەرێگـەی تایبەتمەنـدی ئیتنیکـی گەلـەوە دەردەبڕرێـت ( ئەوانـەی وەك زمـان، دابونـەریت و تەنانەت ئاینیش ) کـە یـەکێتی بەنەتـەوە دەبەخشـن. کاتێـك هەسـتی گەلایـەتی زۆر روون و ئاشکرایە یاخود هەر نییە، ( self-awareness / خودئاگـاهی )، هـەروەك پێشتر مشتومڕی لەبارەوەکراوە، رەگەزێکی گرنگـە لـە بنیاتنـانی نەتەوەیـەك توانـای (self-sustainable /خودبەردەوامی ) هەبێت، کە لەبایەخی زێدە دەکات. تیڤێی روونیدەکاتـەوە :" زۆربـەی گرفتـەکان وەك: نـەبوونی زمـانی هاوبـەش، یـان کـورتی مێـژوو، دەشـێت بەسـەریدا زاڵ بـن گـەر گـەلێك لەشـوێنێکی تایبـەت قەناعـەت بـە نەتـەوەبوونی خۆیـان بکـەن."[37] لەکاتێکـدا ئـەم چەشـنە نەتەوەبوونـە لەزۆربـەی وڵاتانی فرەنەتەوەدا دەبینرێت کـە زۆرجـار دەیسـەلمێنێت تـاك بونیـادە، هەڵسوڕانی سـەرەکیی بـۆ گواسـتنەوە هـەواداری سـەرەتاییە لاوەکییـەکانی پـێش دەوڵـەتی

35 Cobban (1969), pp. 121-22.
36 Billig (1995), p. 26.
37 Tivey (1981a), p. 6.

نەتەوەیی/ sub-state nation ) بۆ دەوڵەت، مەرجێكی پێویستی پێكەوەگرێدانی سەركەوتووانەیە، هەروەك والكەر كۆنۆر ئاماژەی بۆ كردووە:" ئامانجی راستیینە nation-destoying / نەتەوەسازیی نییە بەڵكو nation-building / نەتەوەشكێنییە." [38]

پرسێك كە مشتومڕێكی زۆری لەبارەوە دەكرێت ئەوەیە كە داخۆ كام لەم دووانە زووتر دەردەكەون: گەلی خۆ بەنەتەوەزان یان نەتەوە وەك دەوڵەت. لەكاتێكدا گیلنەر دانییپێدادەنێت كە بەدرێژایی مێژوو هەردوو لەدەوڵەتانو نەتەوەكان بەبێ پشتگیریی ئەم بۆ ئەوی دی سەریانهەڵداوە، ئەو زیاتر قسەی لێدەكات :" ئەوەی زۆر مشتومڕی لەبارەوە دەكرێت داخۆ ئایدیای پێودانگی نەتەوە، بە درككردنە هاوچەرخەكەی، پێشگریمانەی لەپێشینەبوونی دەوڵەت نییە."[39] لەبەدواداچوونی ئەم خەتەدا، وادەكا مرۆ لەسیاسەتەوە روو لەكەلتووری بكاو گریمانە بكات كە نەتەوە وەك دەوڵەت یەكەمجار هاتۆتەسەر شانۆكە. هێندێك نەتەوە-دەوڵەت بەدڵنیاییەوە كۆمەڵگای نەتەوەیی دڵخوازی خۆیان ئەفراندووە، بەڵام ئەوەش بەهەمان شێوە راستە كە شوناسە نەتەوەییەكان ماوەیەكی زۆر پێشتر لە هەر دەوڵەت-نەتەوەیەك پێكهاتووە كە لەرووی سیاسییەوە بەهێزیان دەكات.

زۆربەی دەوڵەتانی ئێستای رۆژهەلاتی ناوەڕاست دەخرێنە ریزبەندی یەكەمەوە. لەوانەیە بە پلەیەك هۆشیاریی كەمترەوە، بەلام لەناوەرۆكدا بەهەمان رۆحییەتی نەتەوەخوازی بەناوبانگی ئیتالی ماسیمۆ دئەزگیلۆ، ئەوەی پاش ریزۆرجیمێنتۆ رایگەیاند :" ئێمە ئیتالیامان دروستكرد، ئێستاكە دەبێت ئیتالییەكان دروستبكەین،"[40] هەروەك عێراق كاتێك كە پێكهێنرا، پێویستی بە ئەندازەگیرییەكی كۆمەلایەتیی بوو چونكە شوناسە نەتەوایەتییەكەی دەبوو دابهێنرێت. ئەم رەوشەش مانای ئەوە دەدات كە دەوڵەت-نەتەوە بونیادێكی ئایدیۆلۆجی هەیە، ئەوەی كە"

38 Connor (1972), p. 336.
39 Gellner (1983a), p. 6.
40 As quoted in Hobsbawm (1992), p. 44.

بەرجەستەی چڕبوونەوەی دەسەڵات لەنێو سنووری قەڵەمڕەوێك‌و سەپاندنی بەهای هاوبەش بەسەر کۆمەڵگادا دەکات."[41] لەوانەیە دەوڵەت –نەتەوەیەکی فرە رەسەنیش نەبێت زیاتر ئەوە بەگران بزانێت کە یەك لە ئەرکە گەوهەرییەکانی دەوڵەت جێبەجێکات، ئەویش ئەرکی تەواوکاریی‌و یەکپارچەییەتی، بەواتایەکی دیکە، پێکەوەبەستنی بەشە هەرێمی‌و کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانێتی لەیەکەیەکی کاریگەردا، ئەوەی راهێنانێکی ئاسۆییە بۆ گروپە هەرێمییەکان.[42]

لەکاتێکدا شرۆڤەکاری نەتەوایەتی لەخوارەوە دێت، یەك لەسیما گشتییەکانی بەکارهێنانی چەمکەکە کە لێرەدا پەیوەندیدارییەکی گەورەی هەیە بەو پێیە لێکدەدرێتەوە. دەتوانرێت نەتەوایەتی لەسایەی چەند رووپۆشێکی جیاوازدا ببینرێتەوە، هەروەها لەچەندین حاڵەتیشدا مانا رەسەنەکەی خۆی لەدەستداوە. بۆ نموونە، ئەوەی کە بەرجەستەی هەواداری بۆ دەوڵەت دەکات، هەروەها بەشێوەی وێنایەکی گونجاو نییە بۆ نەتەوە. ئەوە ئەم بەکارهێنانەی چەمکی نەتەوایەتییە کە پشێوییەکی وێناکاری لەنێوان نەتەوەو دەوڵەتدا دێنێتەئارا. بنەمای ئەم پشێوییە، هەروەك لەلایەن ئیلێ تامیرەوە مشتومڕی لەبارەوەکراوە کە " بەشێکە لە هەوڵێك بۆ شاردنەوەی جیاوازی نێوان ئەو بانگەشەیەی کە هەر نەتەوەیەك دەبێت دەوڵەتێکی هەبێت- یان زیاتر، هەر دەوڵەتێك دەبێت رەوایەتی خۆی لە نەتەوەیەکەوە هەڵبگۆزێت- لەگەڵ ئەو بانگەشەیەی کە نەتەوە بریتییە لە دەوڵەت."[43] هاندانی ئەوەی کەدەشێت زیاتر ئەو گریمانەیە پەرەپێبدرێت، ئێمە لەبری ئەوە دەچینە سەر پرسی تەتەڵەکردنی هەردوو چەمکە بەکارهێنراوەکە.

دەوڵەت دەبێت لەبنەڕەتدا لەنەتەوە جیابکرێتەوە چونکە یەکەیەکی سیاسییە کە دەسەڵاتێکی سەربەخۆی لەرووی دەرەکیی‌و دەسەڵاتێکی باڵاشی لەرووی نیوخۆییدا هەیە. هەروەك سیتۆن واتسۆن بەشێوەیەکی گونجاو جەختی لێکردۆتەوە " دەوڵەت

41 Keating (1988), p. 23.
42 Taylor (1985), p. 113.
43 Tamir (1993), p. 60.

ڕێکخراوێکی شەرعیو سیاسییە کەخاوەنی ئەو دەسەڵاتەیە تاکو داوای گوێڕایەڵیو هەواداری لە هاوڵاتییەکانی بکات"، لەکاتێکدا نەتەوە بریتیەلە"کۆمەڵە خەڵکێك کە ئەندامەکانی پێکەوە لەرێگەی هەستی هاوسۆزیو کەلتووری هاوبەشو هۆشی نەتەوەییەوە گرێدراون." [44] بەدەربڕینێکی دیکە، دەوڵەت یەکەیەکی سیاسیو هەرێمییە، لەکاتێکدا نەتەوە زنجیرەیەکی بەرفرە لە پێکهاتەی خودیی دەگرێتەخۆ، وەك ئەوەی "کۆمەڵگەیەکی وێناکراو بێت". بەگشتی مەحاڵە یەك لەو دووانە لەگەڵ ئەوی دیکە پێناسەبکرێت ( بەدەر لەهێندێك حاڵەتی جیاواز وەك ئەوەی والکەر کۆنۆر پێشانیداوە )، بەڵام ئەگەر ئەوەش کرا گرنگە تێبینی بکرێت، وەك ئەوەی کیتینگ رایتلی کردوێتی کە" هێندەی ئەوەی نەتەوە لەگەڵ دەوڵەتدا پێناسەبکرێت، هەر لاوازییەك لەوەی دواتریان وادەکات ئەوەی پێشووش لاوازبێت."[45] دەشێت وەفاداریی بۆ نەتەوە هاوجووتبێت لەگەڵ وەفاداریی بۆ دەوڵەت، بەڵام ئەمە تەنیا وەختێك رودەدات کاتێك ئەو قەوارەیەی باسی لێوەدەکرێت بریتیبێت لە دەوڵەت-نەتەوە. هەربۆیە کاتێك ئاڵۆزی سەرهەڵدەدات کە هاوپەیوەستی نێوان نەتەوەو دەوڵەت لەبەرچاوبگیرێن.

ئەوە لەچەمکەکانی خاکی هاوبەشو هاوڵاتیبووندایە کەدەوڵەتو نەتەوە بەشێوەیەکی وێنایی بەنێویەکدا دەچن، بەڵام هەروەك ئەنتۆنی سمس تێبینیکردووە :" نەتەوە کۆمەڵێکی سیاسییە تەنیا ئەوەندەی بەرجەستەی کەلتوورێکی هاوبەشو ویستێکی کۆمەڵایەتی هاوبەش دەکات." [46] بڕواکە ئەوەیە کە" دەتوانرێت چەمکی دەوڵەت بەشێویەکی سەربەخۆ لەنەتەوە پێناسەبکرێت، چەمکی نەتەوە ناتوانرێت سەربەخۆ لە چەمکی دەوڵەت پێناسەبکرێت." [47] پێشانیدەدات کە خەڵکانێك کە بەشێوەیەك بیر لە کۆمەڵەکەیان بکەنەوە وەك ئەوەی نەتەوەیەکی یەکگرتوو

44 44.Seton-Watson (1977), p. 1.
45 Keating (1988), p. 24.
46 A. D. Smith, (1992) p. 62.
47 Tamir (1996), p. 86.

پێکبهێـنن واش بـیری لێدەکەنـەوە وەك ئـەوەی دەوڵـەتێکی ئاینـدەیی بـن. ئـەم بیرکردنەوەیە لەلایەن ئایدیۆلۆجیای سیاسیی نەتەوایەتییەوە هاندەدرێتو زەمینەی بۆ خۆشدەکرێت.

## ٢ .٢ نەتەوایەتی

نەتـەوەکان وەك شـێوازێکی سروشـتیو خـوداداد بـۆ ریزبەنـدی مـرۆڤ، وەك چارەنووسێکی سیاسیی بۆماوە، هەرچەندە فرە درەنگ کەوتوو، بریتین لە ئەفسانە، کە هێندێکجار کەلتوورگـەلێك هەڵدەگرێت کـە پێشـتر هـەبوونو دەیانکاتـە نەتـەوە، هێندێکجار دایاندەهێنێت، زۆربەیجاریش کەلتوورگەلێکی پێشوو دەسڕێتەوە: ئەوەش واقیعە.[48]

### ٢ .٢ .١ بنەما نەتەوەییەکان

ئەفسـانەو واقیـع زیـاتر مشـتومڕیان لـەبارەوە دەکرێـت لـەکاتی توێژینـەوەی نەتەوایەتی، ئەوانەی وەك ئامرازێك راژە بە بنیاتنانی شێوەی سیاسـیو هاوچـەرخی نەتەوە دەکەن. بەوەش نەتەوایەتی بنەماو بڕوایەکە گەوهەرەکەی لەسـەر ئـەو بـیرە راوەستاوە کە هەموو نەتەوەیەك دەبێت دەوڵەتی خۆی هەبێت. ئـەم بـیرە لەسـەدەی هەژدەیەمـدا پشـکووت، لەسـەدەی نۆزدەیەمـدا گەشـەیکرد بـۆ هێزێکـی سیاسـیی سـەرەکییو لەسـەدەی بیستەمیشـدا بـووە فاکتـەرێکی زاڵ لەسیاسـەتدا. قـەوارە لەمێژینە دامەزراوە سیاسیو کەلتوورییەکانی فرەنساو ئینگلانـد لـەکاتی پشکووتنی ئەو بیرەدا دەمێکبوو دامەزرابوونو لەوانەیە ئەوانە وەك تەرزێکی بەرایی بۆ جـۆری قەوارەیەکی سیاسی لەلایەن بیرە نوێیەکەوە وێناکرابن. ئەم بڕوایەی کـە نەتـەوەکان

48 Gellner (1983a), pp. 48-49.

ببنه قەوارەی سروشتیی سیاسی، ئەو بناغەیەی کە دەوڵەتانو حکومەتەکان لەسەری بچەسپێنرێن، بووە نموونەیەکی باڵا، ئەوەی دەبێت لە سەدەی بیستەمدا لەسەراسەری جیهاندا جێبەجێبکرێت. ئەو بیرە ئەوەی کردە مەرج کە سەروەریی لەگەڵەوە سەرچاوە دەگرێت، دەسەڵاتی شەخسی پاشای بەسەر سەروەریی دەوڵەتدا رەتدەکردەوە. ئەم بیرەی سەروەریی گەل بەهۆی شۆڕشی فەرەنسییەوە هاتەئارا، هەروەها لەنێوەرۆکدا ئەو مانایەی هەڵگرتبوو کە ئەگەر واقیعی سیاسی بریتیبێت لە رەنگدانەوەی وێناکردنی نەتەوەیی جیهان، " نەخشەکە لەو دەوڵەتانە پێکدێت کەلەسەر بناغەی گروپە کەلتوورییە جیاوازەکان راوەستاونو هەرێمگەلێکی هەماهەنگی پتەوو نەتەوەیی تایبەتو هاوبەش دەگرێتەخۆ."[49]

بەپەسەندکردنی ئەوەی کە بنەمای نەتەوایەتی لەئەورووپای هاوچەرخەوە پشکووتبێت، شتێکی گونجاوە کە رۆشنگەری فەرەنسیو رۆمانتیکی ئەڵمانی وەك خاڵێکی دەستپێك و تەریب وەربگیرێت. رۆشنگەریی بڕوای وایە کە دەوڵەت نەتەوەی ئەفراندووە، لەکاتێکدا رۆمانتیکەکان مشتومڕیان لەوبارەیەوە دەکرد کە نەتەوە، گەلەکەی، دەوڵەتیان ئەفراندووە. جۆری ئەو نەتەوایەتییەی لەلایەن فەرەنسییەکانەوە نوێنەرایەتی دەکرا چەند تایبەتمەندییەکی هەبوو: ئازادیی تاك، یەکسانیو رەهەندەکانی کۆسمۆپۆلیتانیزم. ئەمەش شانبەشانی دەوڵەت-نەتەوەی فەرەنسیی لەساڵی ١٧٨٩دا پشکووت. دەوڵەت-نەتەوەی ئەڵمانی کە لەساڵی ١٨٧٠دا دامەزرا، لەسەر ئەو ئایدیۆلۆجییەو بنەما رۆمانتیکییەکانی وەستابوو کە لەدەیەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا پشکووتبوو، لە کارەکتەردا ئیتنیو کەلتووری بوو، لەگەڵ ئایدیا فەرەنسییەکەدا بەتوندی پێکدژبوو.

کرۆکی بڕوای نەتەوایەتی کە بە بنەمایەکی گشتی بۆ هەموو نەتەوایەتییەکان دادەنرێت، مشتومڕی ئەوەدەکات کە ژمارەیەکی زۆر نەتەوەگەلی تاکی جیاواز جیهان پێکدەهێنن. پێویستە ئەم مۆزایکە لەنەتەوەکان لە سیستمی نەتەوە-دەوڵەت

49 Orridge (1981), P . 45.

ڕێکبخرێت بۆئەوەی ئاشتیو ئاسایشو جێگیریی جیهان زامنبکرێت. لەوەش زیاتر، نەتەوەکان وەك یەکەگەلێکی سروشتی وێنادەکرێن، ئەوەی تایبەتمەندییەکی دیارییکراویان هەیەو هەماهەنگییەکی کەلتووریی بەرجەستەدەکەن کەلەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەشو ئەزمونی هاوبەش راوەستاوە. هەریەك لەم نەتەوانە بۆئەوەی بەشێوەیەکی رەسەن کەلتووری خۆیان دەربڕن پێویستیان بەبوونی دەوڵەتێکی خاوەن سەرەوەریی خۆیانە، ئەو بانگەشەیەی لەرێگەی ئەو راستییەوە بەهێزبوو کە هەموو نەتەوەکان مافی بێ ئەملاولای ئەوەیان هەیە قەڵەمڕەوێك بکەنە نیشتیمانی خۆیان. لەوەش زیاتر، نەتەوە سەرچاوە هەموو دەسەڵاتێکی سیاسییە، وەفاداریش بۆ نەتەوە پێش هەموو وەفادارییەکانی دیکەیە. بڕوای نەتەوەیی زیاتر جەخت لەوە دەکاتەوە کە هەر تاکێك (نێرو مێ) سەر بەنەتەوەیەکە، کە دەبێ وەفادارییە بنەڕتییەکەی بۆ ئەو نەتەوەیە بێت، هەروەها ئەوە تەنیا لەرێگەی نەتەوەوەیە کە تاکەکان دەتوانن ئازادی راستیینە ببیننەوەو دەریبڕن.[50] بەوەش رەگەزی ناوەندی نەتەوایەتی (گشتی) بریتیە لە" نەتەوە کە بۆخۆی یان دەبێت هێندێك پەیوەستەگیی بنەڕەتی لەنێوان لێکچوونی کەلتووریی بەرفراوانو رێکخراوی سیاسییدا هەبێت."[51] بەمانایەکی دی، پێویستیەك هەیە بۆ نەتەوەکانو دەوڵەتەکان کە هاوجووتبوونە، پێویستییەکی زۆر گرنگ بۆ ئازادیی تاك و کۆ و هەروەها ئاشتی بریتیە لە بەهێزکردنی دەوڵەت-نەتەوە.

زێدەباری ئەم بیرۆکە گشتیو بنەڕەتییە کە وێڕای کەموکورتییەکەشی داوایەکی زۆر بەرفراوانی لەسەرە، هەموو نەتەوایەتییەك تایبەتمەندی خۆی هەیە، رووخسارو سیمای خۆی هەیە کە بە تیۆرەکانی تایبەتمەندییە لاوەکییەکان ناوزەد دەکرێت.[52] ئەمانەش لەخوارەوە باسدەکرێنو بە ریزبەندییەکانی نەتەوایەتی ئاماژەی بۆ دەکرێت.

---

50 Tivey (1981a), pp. 5-6 and A. D. Smith (1973), p. 10.
51 Orridge (1981), pp. 39-40.
52 Smith (1982), p. 150.

لەراستییدا دەشێت ریشەکانی دیاردەی ئالۆزی نەتەوایەتی بۆ ماوەیەکی دوورتر بگەڕێتەوە پێش ئەوەی بگاتە فۆرمە هەنوکەییەکەی. باوەڕی "ئایدیۆلۆجی" نەتەوەکان بۆ سەردەمانی کۆن دەگەڕێتەوەو دەشێت بە ( retrospective nationalism / نەتەوایەتی رابردووخواز

ی ) ناوزەد بکرێت، یاخود لەدیدگایەکی جیاوازترەوە بە ( patriotism / نیشتیمانێتی ) سەرەتایی. [53] فۆرمە تایبەتمەندییە مۆدێرنەکانی، وەك ئایدیۆلۆجیا، لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمەوە وێناکراوە، هەروەك عەلی قەدوری دەڵێت:" نەتەوایەتی باوەڕێکە لەئەوروپا لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا داهێنرا. [54] هەروەها ئەنتۆنی سمس ( کە دیدێکی هەمیشەیی هەیەو نەتەوە هاوچەرکان لە پەیوەستەگییە ئیتنییە بنەڕەتییەکانەوە هەڵدەهێنجێت ) ئەوە پەسەند دەکات و دەڵێت :" نەتەوایەتی، وەك ئایدیۆلۆجیاو جووڵانەوە، بەتەواوی دیاردەیەکی هاوچەرخە." [55] دەتوانرێت بوترێت، هەر نەتەوەیەکی پێش سەدەی نۆزدەیەم دەبوو چاوەڕێ بکات تاکو پێ بنێتە جوغزی ژیانەوە، لەکاتێکدا گروپە ئیتنییەکان تایبەتمەندیی خۆیان هەبوو، بەڵام ، لەدەرەوە، لەگرنگترین تایبەتمەندیی جیاکەرەوە بێبەشبوون. دەشێت ئەمانە بە گروپە ( pre-national / پێش نەتەوەی )یەکان یان ( potential nations / نەتەوە پۆتانسێلەکان ) لەقەڵەمبدرێن. [56] بارکەر بانگەشەدەکات کە"پێویستە نەتەوە وێڕای راستیی، باوەڕ بێت، پێش ئەوەی بتوانێت ببێتە هێزێکی بزۆز." [57] بەڵام لەوانەیە ئەم نەتەوە پۆتانسێلانە گەشەبکەن و ببنە نەتەوە، لێرەدا ئەوەی پێویستە هۆش و ئیحساسە. هەربۆیە ئەوە گونجاو نییە کە

---

٥٣ ئەی دی سمس ئەوەی پێشوویانی داهێناوەو گیڵنەریش دانی بەوەی دواتریاندا ناوە. لەڕاستییدا، گیڵنەر نەتەوایەتی وەك بەشێکی هەمیشەیی ژیانی مرۆڤایەتی دەبینێت...کە تەنیا لەسایەی هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا بڵاودەبێتەو زاڵ دەبێت کە لەڕاستییدا لە جیهانی هاوچەرخدا دێتەئارا، نەك لەشوێنێکی تر.

Kedourie (1960), p. 9. 54

55 Smith, A. D. (1986a), p. 18 (italics added).

56 Connor (1978), p. 385.

57 Barker (1927) p. 173.

بەشـێوەی دەرەکەوتەیـەکی مـادیی لـەناکاوو خێـرا قسـە لەنەتـەوەکان بکـەین. وەرچەرخان لە گروپێکی ئیتنییـەوە بـۆ نەتـەوە پێویستی بـە خودهۆشـییەك هەیـە خولیای ئۆتۆنۆمی بێت.

هەرچەندە، ئێرنست گیلنەر، مشتومڕی ئەوەدەکات کە" نەتەوایەتی بریتی نییـە لـە رابـوونو بەئاگاهاتنـەوەی نەتـەوەکان سـەبارەت بـە خودهۆشـییان: ئـەو نەتـەوە لەشوێنێکدا دادەهێنێت کە بـوونی نییـە."[58] هـەروەها ئـەو بـاوەڕە بـەلاوەدەنێت کـە بنەماو بڕوا نەتەوەییەکان هانی بەئاگاهاتنەوەی نەتەوەکان بۆ خودهۆشییان دەدات. ئەو دەڵێت: "بەپێچەوانەوە، نەتەوایەتی بەرجەسـتەبوونی یەکەگـەلێکی نوێیـە، کـە بۆ ئەو دۆخە بالادەستە هەنووکەییە گونجاوە، وێـڕای ئـەوەی وەك کەرەسـەی خـاوی خۆی رێگە بەبەکارهێنانی کەلتوورو مێژووو کەلەپورەکانی جیهانی پێش نەتـەوەیی دەدات.[59] گیلنەر گەشەسەندنی نەتەوایەتی بە پرۆسەی مۆدێرنەو پیشەسازییبوونو پشـکووتنی دواتـری بۆرجـوای نەتـەوەیی دەبەسـتێتەوە. کۆمەڵگایـەك کـە زێـدە مـۆدێرنو بەپیشەسـازی بـووە گریمانـەی ئـەوەی هەیـە پێویسـتی بـە کـەلتوورێکی سـتاندەرو یـەکگرتوو، هـەروەها زمـانێکی هاوبـەش بـۆ زۆرینـەی خەڵکەکـە هەیـە. بەوەش، بـەگوێرەی گێلنـەر، لەتیۆرێکدا کـە قامـك دەخاتەسـەر ئـەو رێگایـەی تێیـدا رۆڵـی کـەلتوور لەکۆمـەڵگادا لەگـەڵ مۆدێرنـەدا دەگۆڕێـت، نەتەوایـەتی زادەی بەپیشەسـازییبوونە. هەرچـەندە، لەڕاسـتییدا ئەگـەر نەتەوایـەتی ئاکـامێکی بـێ قەیدوشەرتی بەپیشەسازییبوون بێت، ئەوا لەوانەیە چاوەڕێی ئەوە بکرێت کـە وردە وردە لەهێزەکـەی کەمبێتـەوەو پێگـەی خـۆی وەك هێزێکـی سیاسـی سـەرەکیی لەدەسـتبدات لـەقۆناغێکی پیشەسـازیبوونی زۆر پێشـکەوتوودا. ئـەو راسـتییەی کـە نەتەوایـەتی لـەم هـەزارە نوێیـەدا پێدەچـێت لەهـەر سـەردەمێکی پێشـووتر بەهێزتربێت وادەکات هێندێك پێداچوونەوە بە تیۆرەکەی گێلنەردا بکرێتەوە.

چەندە دەستبەسـەرداگرتنی گەوهـەری نەتـەوە ئەسـتەمە، ئەوەنـدەش بۆبینینـەوەی

---

58 Gellner (1964), p. 168.
59 Id. (1983), pp. 48-49.

ڕێبـازێکی راسـت بـۆ ئایدیۆلۆجییـە سیاسـییەکەی ، هـەروەها زنجیرەیـەك هـەوڵی لێکدانـەوەیی‌و پێناسـەکاریی لەبنەڕەتـدا جیـاواز هەیـە. پێناسـەیەکی نـەریتی بـۆ نەتەوایـەتی ئەوەکـەی کینیـت مینگۆیـە، ئـەوەی لەسـاڵی ١٩٦٧دا ئایدیاکـەی بـەوە جیاکردۆتـەوە کـە " جووڵانەوەیـەکی سیاسـییە هـەوڵی بەدەسـتهێنان‌و بـەرگری لەبابەتێك دەدات کە دەتوانین ناوی بنێین یەکپارچەیی نەتەوەیی."[٦٠] ئەو جەختێکی زۆری لەسەر نەتەوایەتی وەك بەرنامەیەکی سیاسی کردۆتەوە، بەرنامەیەك بۆ کاری سیاسـی. تیۆرەکـەی گیڵنـەر، وەك بینیمـان، جـەختێکی زۆر لەسـەر هەلومەرجـە مادییەکـە بـۆ پێکهێنـانی بیروبـڕوا سیاسـییەکەو گۆڕانـە کۆمەڵایەتییەکـە دەکاتـەوە، هەروەها پێشنیازی هۆکارێکی ئابووری گەوهەری بۆ دەرکەوتنی نەتەوایـەتی دەکـات. لەوەش زیاتر، ئەو پێدادەگرێت کە نەتەوایەتی بەشێوەیەکی بەرفراوان سەرکەوتووە بەوهۆیەی لەگەڵ پێویستییەکانی کاتدا هاتۆتەوە. میسێڵ مـان یـش هـەمان ڕێبـازی هەیـەو دەڵێـت کـە نەتەوایـەتی وەك وەڵامـدەرێك بەگەشەسـەندنی دەوڵـەت گەشەدەکات.[٦١] لەکاتێکدا مۆدێرنیستەکان بڕوایان بە مۆدێرنیتەی نەتەوایەتی هەیە، ئـەنتۆنی سمـس لـە دیـدی خۆیـەوە قامـك دەخاتەسـەر ئیتنۆگـەرایی وەك بـەردی بناغـەی نەتەوایـەتی، مشتومڕ لەوبارەیـەوە دەکـات کـە نێـوەرۆکی بـیروڕا نوێیـەکان زەمینـەی هۆشـی نەتـەوەیی‌و نەتەوایـەتی خۆشـدەکەن کاتێـك لەکۆمەڵـە پـێش نەتەوەییەکاندا بڵاوبکرێتەوە.

بەپێچەوانەی گێڵنەر، بێندکت ئەندەرسۆن جەخت لە کرۆکی سۆزەکیی نەتەوایـەتی دەکات، هەروەك هانس کۆهن کردوویەتی، نەتەوایەتی بەوە لەقەڵەمداوە کـە" کـاری هۆشە."[٦٢] لەڕاستییدا، بۆ گرتنەبەری ڕێبـازێکی وەزیفـی، وەك ئەوەکـەی گیڵنـەر، بـۆ لێکدانـەوەی نەتەوایـەتی، دەبـێ ئـەو سـۆزگەلە بنەڕەتییانـە جێبهێڵرێـت کـە بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو دێنەئارا. هەروەها ئـەنتۆنی گیـدینز بـەم بیروڕایـەوە پابەندە. بەپێچەوانەی پێناسە تەواو دەزگاییەکەیـەوە بـۆ نەتـەوە، ئـەو نەتەوایـەتی

60 Minogue (1967), p. 25.
61 Mann (1995).
62 Kohn (1944), p. 10.

بەشێوەیەك لەقەڵەمدەدات كە" بەشێكی بنەڕەتیی بێت لەدیاردەیەكی سایكۆلۆجی." كە، وەك بەردەوام دەبێت، " دەژی لەسەر، یاخود بەرجەستەی فۆرمێكی لاواز لەو " سۆزە سەرەتاییانە" دەكات كە گریتز لەكۆمەڵگا خێڵەكییەكان یان كۆمەڵە لادێنشینەكان قسەی لەبارەوەكردووە."[٦٣] لەسۆنگەی وێناكراوی نەتەوەوە ( هەرچەندە، پێدەچێت ئەمە بیرۆكەیەك بێت كە گیدینز بەشێوەیەكی سروشتی پاڵپشتی ناكات ) نەتەوایەتی بەم پێكهاتە سایكۆلۆجییەوە دەبەخشرێت كە بەچەشنێكی بەرفراوان دەیكاتە دیاردەیەكی نالۆژیكی. هەرچەندە، لەوانەیە تایبەتمەندییەكی بەم چەشنە لە نەتەوایەتی بەدەر نەبێت وەك دەربڕینی "groupness/ كۆمەڵبوون". هایس پێشانیداوە كە هەروەك "ئاژەڵە كۆمەڵایەتییەكان"، شتێكی سروشتییە بۆ مرۆڤیش كە لەكۆمەڵدا بژیو بەوكۆمەڵەش وەفادار بێت.. ئەو چەشنە قەوارانە شتێكی پێوست نییە كە نەتەوایەتی بن، بەپێچەوانەوە، بەدرێژایی مێژووی تۆماركراو، ئەم كۆمەڵانە شێوەی: خێڵەكان، عەشیرەتەكان، شارەكان، هەرێمەكان یان كۆمەڵە جۆراوجۆرەكانی گرتۆتەخۆ. بەو پێیەش، نەتەوایەتییەكەی گیدینز بریتیەلە:" تاكە دەربڕینێكی غەریزەیی مرۆڤە، هەروەها (وەك نموونەیەكی گونجاو)وەك ئەوەی لەخێڵگەرایی سروشتی ترو پێچراوەتر نییە.[٦٤]

جێمس مایاڵ سێ قۆناغی مەزنی نەتەوایەتی پێناسەكردووە: یەكەمیان، دامەزراندنی وڵاتەكانی ئەمریكای لاتین لەسەدەی نۆزدەیەم، دووەم، ئاكامە فراوانگەراییەكانی ڤێرسای، هەروەها سێیەمیش، فروانبوونە مەزنەكانی دوای رزگاربوونی كۆلۆنییەكان.[٦٥] جۆن هاڵ قۆناغێكی چوارەمیشی خستۆتەسەر ئەمە، بەواتای ئەوەی كە رووخانی ئیمپراتۆری روسی هێنایەئارا، لە شێوەی دامەزراندنی دەوڵەت-نەتەوەی نوێو بوژانەوەی نەتەوایەتی.[٦٦]

---

63 Giddens (1981b), p. 193
64 Hayes (1949), p. 292.
65 Mayall (1990), p. 64.
66 Hall (1993), p. 4.

لەگەشـــەکردنی گشـــتی ئایدیۆلۆجییەکـــە، دەتوانرێـــت ســـێ قۆنـــاغی ســـەرەکی جیابکرێتـــەوە. قۆنـــاغی یەکـــەم، وەك "رۆشـــنبیری" ئامـــاژەی بۆدەکرێـــت، کـــە گەشەسەندنی بنـەما کەلتوورییـەکان: تایبـەت بـەزمان، مێـژووی هاوبـەش، هـەروەها دابونەریت دەبینێتو لەلایەن رۆشنبیرانی چینی ناوەڕاستەوە بەڕێوەدەچێت. ئەوەی پـاش ئەمـە دێـت قۆنـاغی "ورووژاندنـە" ئـەو قۆناغـەی تێیـدا بەسیاسـییکردنو تەیارکردنی تێدا روودەدات، بـەقۆناغی سێیەم کۆتاییـدێت کـە جووڵانـەوەی سیاسـی جەماوەرییـە.[٦٧] لـەو کاتـەدا "جـەماوەر" راسـتەوخۆ لەسـەرهەڵدانی نەتەوایـەتی بەرپرس نییە، پێویستە سەرەتا بـەنێو دەسـتەی رۆشـبیراندا ملـی رێگـەی گرتبێـتو پاشتر هاندانی جدیی چینی ناوەندی بەدەستهێنابێت پێشئەوەی بگاتـە بـە جـەماوەر بگات. ئەوەی گرنگـە تێبـینی بکرێـت، بۆئـەوەی کاریگـەریی جـەماوەری بەدەسـتبێت تەنیا ئەوە نییە کە تـۆوێکی باشـت هـەبێت، دەبێـت هـەروەها ئـەو تـۆوە لەزەوییـەکی بەپیتدا بوەشێنرێت. بە وتەیەکی دیکە، بـۆ ئایدیایـەك ( کـە باشـتر لەلایـەن چـەند تاکێکـەوە چـنراوە کـە کاریگـەرییان لەسـەر خەڵکـە ) کـە خـەڵك بەبنـەما بگرێـت پێویستی بە هۆشیارییە بنەڕەتییەکانی نەتەوایەتی هەیە، ئەو هەستە بنەڕەتییـەش خۆگەڕاندنەوەیە بۆ کۆمەڵ یان " قەومایەتی".

نەتەوایەتی، لەهـەر چـوار قۆناغـە نەریتییەکەیـدا، لـە مرۆڤایـەتی سـەرەتاییەوە بـۆ گەشەیکردووە بەقۆناغەکانی جاکوبیانیزمو ترادسیونالیزمو لیبرالیزمدا بۆ فۆرمێکی پێکەوەگرێدراو کەدەتوانێت رووبـەڕووی چـەندین دەربـڕینی جیـاواز ببێتـەوە. وەك بەشـێکی بنـەڕەتی لـە رۆشـنگەریی، هیومانیتاریـانیزم وەك بنەمایـەکی نەتەوایـەتی جاکوبیانیزم راژەیکرد، کە ئامـانجی پاراسـتنو فراوانکردنـی سەربەسـتی، یەکسانیو

67 in Miroslav Hroch (1968), Die Vorkeimpfer der nationalen Bewegung bei den kleinen Veilkern Europas. Eine vergleichende Analyse zur gesellschaftlichen Schichtung der patriotischen Gruppen [The Champions for the national movements of Europe's smaller nations. A comparative analysis of the social strata in patriotic groups], Praha, quoted in Tagil (1995b),

برایــەتی بــوو کــە لــەماوەی قۆنــاغی نەتەوایــەتی هیومانیتاریــانی دیموکراتیکــدا پشکووت. ئەمە بەشێوەیەکی بەرفرە لەسەر بنەمای نووسینەکانی جان جاك رۆسۆ راوەستابوو کە بەرەو جۆرە نەتەوایەتییەك گەشەیکرد کەبەشێوەیەکی مەزن پشتی بە هێزو میلیتاریزم دەبەست کە مۆری فاناتیکی ئاینیو ناڵێبوردەیی قۆناغە پەرتبووەکەی لێدرا. بەشێوەیەکی سەرەکی بەکارە توندو دەمارگیرانەو هەستو سۆزەکانی شۆڕشی فرەنسییەوە پەیوەستبوو، هەروەها جاکوبییزم بەچەند دەستکەوتێکی بەرچاو دەناسرایەوە وەك : دەزگاو دامەزراوەی فێرکاری کە بۆ مەبەستی نیشتیمانێتی بەکاردەهێنرا. " میراتی چەسپاوی نەتەوایەتی جاکوبییەکان" ، هەروەك لەلایەن هایسەوە دەربڕراوە، " بریتیبوو لە سێکیولاریزەکردنی کریستیانیتی، کە لەماوەی سەدەکانی داهاتوودا بەبڕێکی گەورە بەشداری لەبەهێزکردنی نەتەوایەتیدا هەبوو.[68] بنەماکانی جاکوبیانیسمی شۆڕشگێڕانە، هۆکارو شۆڕش، بەهۆی مێژووو ترادسیۆنی "دژە شۆڕش" ەکەیەوە ئاراستەکراوە، نەریتگەرایی گەشەسەندووانە ، کە هەوڵدەدات ئاشتەوایی وەفاداری بۆ دەوڵەتی نەتەوەییو لەگەڵ وەفاداری هەمیشەی بۆ...لۆکاڵێتیو...کریستیانی نەریتی بکات." [69]

وەك هایس ئاماژەی بۆ کردووە:" نەتەوایەتی لیبراڵ بریتیە لە نیوەڕێی نێوان جاکوبیو نەتەوایەتی نەریتی." [70] ئینگلتەرا، بەو ریشەیەی خۆی لەسەدەی هەژدەیەمدا، هەوڵیدا تایبەتمەندییە نەتەوەییو لیبراڵییەکان لەگەڵ تایبەتمەندییە دیموکراتییەکان پێکەوە کۆبکاتەوە. خۆدیارییکردنی چارەنووسی نەتەوەیی بێ قەیدومەرج گەیشتە پلەیەکی باڵا، لەڕاستییدا، هەموو نەتەوەیەك دەبوو دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی هەبێت، ئەوەی بانگەشەی بۆ نەخشەکێشانەوەی گشتی نەخشەی سیاسی جیهان دەکرد. ئەم جیهانە لەراستییدا مانای " هەڵوەشاندنەوەی هەر

68 Hayes (1949), see chap 3 on Jacobin nationalism and pp. 75-76 for quote.
69 Ibid. p. 111.
70 Ibid. p. 120.

هـەرێمێکی ئیمپریـالی بـۆ رەگـەزە نەتەوەییـە پێکهاتەییەکـەی و لەهەمانکاتـدا یەکخسـتنی پارچـە لێکـدابڕاوەکانی نەتەوایەتیـەك لـە کۆمۆنوێلسـێکی (کۆمەڵـە دەوڵـەتێکی سـەربەخۆی پێکـەوە بەسـتراو) نـوێ.[71] گەشـەکردنێکی بـەم چەشـنە وا دەبینـرا کە خزمەتی بەرژەوەندی هەموو مرۆڤایەتی دەکات.

نەتەوایـەتی تـەواوکاری / Integral nationalis زۆربـەیجار بـە" دوا جـۆری نەریتی نەتەوایەتی" و " کاردانەوەی ڤێرسای" ناودەبرێت.[72] ئەوەی کە پێچەوانەی لیبرالیزمەو هەموو مەبەستو رێچـەزەکانی لەسـەر بنـەمای ئیتنۆگـەرای راوەسـتاوە، لەسـەرەتای سـەدەی بیسـتەمەوە لـە نەتەوایـەتی ئەڵمانیـدا بەرجەسـتەدەبێت. بەپێچـەوانەوەی هیومانیتێریانیزمـەوە، جاکوبییـەکان لەفۆرمـە سـەرەتاییەکەیدا، هەروەها نەتەوایەتی لیبراڵ- هەموو ئەمانە بایـەخ بـە نەتەوایەتییـە ئیسـتیغلالکراو یـان ملکەچـکراوەکان دەدەن- نەتەوایـەتی تـەواوکاری مامەڵـە لەگـەڵ نەتەوایەتییـە سیاسییە سەربەخۆو هـەروەها یـەکگرتووەکان دەکـاتو هـەروەها بەرژەوەندییـەکانی تاكو مرۆڤایەتی بەگشتی دەخاتە خـوار بەرژەوەنـدی نەتەوایەتییـەوە.[73] لـەم چـوار فۆرمە، نەتەوایەتی لیبراڵ گرنگترینیانـە بـۆ مەبەسـتی دیارییکردنی گەشـەکردنێکی ئـەرێی نەتەوایـەتی شانبەشـانی بۆژانـەوەی دیـاریکراوی زیـاتری تێکشـکێنەرترین فۆرمـەکانی ئایـدیۆلۆجی، ئـەوەی خـۆی لەخۆیـدا زیـاتر لـەخوارەوە دەردەکەوێتـەوە لەژێر ناونیشانی رێزبەندییەکانی نەتەوایەتی.

نەتەوایـــەتی دیاردەیـــەکی تێپـــەڕ نییـــە، لـــەنێو نەتـــەوە دامەزراوەکانـــدا کـــاژە ئایدیۆلۆجییـەکانیش بەشـێوەیەکی بـەردەوام خۆیـان بەرهەمدێننـەوە، هـەروەها نەتەوە رەنگڕێژی رۆژانەی خەڵکەکەیەتی.[74] بەوتەیەکی تـر، نەتەوایـەتی رەوشـێکی پەتاشـێوەی بـەربڵاوە. دەشـێت دەوڵەتـە مۆدێرنـەکان بـەرەو دارمـان بچـن (ئـەوەی

71 Ibid. p. 135.
72 Hall (1993), P. 12
73 Hayes (1949), p p . 165-166.
74 An expression borrowed from Billig: (1995), p. 6.

لەباسی داهاتوودا لێکدانەوەی بۆکراوە) بەلاٌم سەبارەت بەهێزی نەتەوایەتی چ داتەپینێك لەئاسۆ نابینرێت. زیاتر، ئەو راستییەی کە نەتەوایەتی پۆست مۆدێرن پێدەچێت کە لەگەلْ دابەزینی چەمکی دەولْەت-نەتەوە پێکەوە پشکووتبن مانای ئەوەیە کە کە ئەم دیاردەیە لەنێو چوارچێوەیەکی تەسکی دەولْەت —نەتەوەی هاوچەرخەوە سنووردار ناکرێت. نەتەوایەتی ناتوانێت لە تاکە شکلێکی جیای ئاساندا سنووردرابکرێت، بەلاٌم لەچەندین شێوەو لەژێر چەندین ناوی جیاوازی زۆردا دەردەکەون.

## ٢. ٢. ٢ ریزبەندییەکانی نەتەوایەتی Classification of nationalisms

نەتەوایەتی ئەلْمانیاو هەروەها فرەنسای یەکخست، فرەنسای پتەوکردو سەربەخۆیی سیاسی بۆ یۆنان‌و فینلاندو نەرویج گێڕایەوە. هەروەها هەمان هێز بەرپرسیارە لە هەلْوەشانەوەی ئیمپراتۆرییە مەزنەکانی وەك عوسمانی‌و روسی. ئەو رووداوە مێژووییانە رووخسار دەبەخشێتە فۆرمگەلێکی جیاوازی نەتەوایەتی، هەروەها ئاماژە بە "دەسەلاٌتی سیاسی نەتەوایەتی" دەکات، ئەوەی بیندکت ئەندەرسۆن سەبارەت بە" هەژاری فەلسەفی‌و تەنانەت پەرتەوازەیشیان" بەراوردکاری کردووە. هەروەك مشتومڕەکانی پێشوو دەسەلمێنن.[75]

نە ئەوەیە وەك ئایدیۆلۆجی پێناسەیەکی روونی هەبێت نە ئەوەیە پێناسەیەکیان بەتەواوی شایەنی ئەوە بێت لەشوێنێکەوە بۆ یەکێکی دی بگوازرێتەوە، " نەتەوایەتی وەردەگیرێت‌و هەروەها دەگونجێنرێت[76] لەمەودایەکی بەرفراوانی هەلومەرجەکاندا لەلایەن سەرکردە سیاسییەکانەوە ئەوانەی رەگەزگەلێکی فرە جیاواز لە مۆدێلە رەسەنە ناسێنراوە ناچەسپاوەکان هەلْبدەژێرن. هەربۆیە

75 Anderson (1991), p. 5.
76 Orridge (1981), p. 53 (italics added).

ئایـدیاکانی نەتەوایــەتی لەحاڵــەتێکی چەســپاودا کــە دەگونجێنرێــت، لەســایەی سەپاندنی ڕەوشگەلەکە هەڵوەشێنرێت و دواتر سەرلەنوێ بنیاتبنرێتـەوە بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ ڕەوشـگەلە نوێیەکـە لـە ژینگەگـەلی جیـاوازدا بگونجێـت. شـێوە گشـتییەکەی نەتەوایـەتی تێکـڕای ڕەوشـگەلەکان ناگرێتـەخۆ کـە تێیانـدا بیرۆکـەکانی نەتـەوە، نەتەوایەتیو هەروەها دەوڵەتو پەیوەندییەکانی نێوانیان گرنگی پەیدادەکات.

بـەوەش پێویسـتە دانیپێـدابنرێت کـە شـەبەنگی تـەواوی ئەگـەرەکانی نەتەوایـەتی ناکرێت لـەهیچ تاکـە پێناسـەیەك یـان لێکدانەوەیـەکی نەتەوایەتییـدا بپێچـرێتەوەو پێشـکەش بـەو فۆرمـە بکرێـت کـە لەکۆمەڵگاکـەدا گرتوێتیـە خـۆی. پێدەچـێت ئـەو شـرۆڤەکارانەی کـە نەتەوایـەتییان شـیکردۆتەوە جیاوازییـان لـەنێوان نەتەوایـەتی بەگشـتیو هـەروەها جووڵانەوەیـەکی نەتـەوەیی تایبـەت لەمێـژوودا کردبێـت. بـە ڕیزبەنـدیکردنو جیاکردنـەوەی فۆرمـە جیاوازەکـانی نەتەوایـەتی مـرۆ دەگاتـە ئـەو وێنەیــەی کــە چــۆن چــەمکەکانی نەتــەوە، دەوڵــەتو هــەروەها ئایــدیۆلۆجیای نەتەوایەتی لە کرداردا جێبەجێدەکرێت.

لــەپێناو ئــەم کۆڵینەوەیــەی بەردەســت، چــەند فــۆرمێکی جیــاوازی نەتەوایــەتی جیاکراوەتــەوە لەهەوڵێکـدا بـۆ هەڵسـەنگاندنی پێکهاتـەی بـەرفراوانی دەربڕینـە نەتەوایەتییە گونجاوەکان. ئەوانەی پێناسـەکراون بـریتین لـە: نەتەوایـەتی دەوڵـەت، نەتەوایــەتی یــەکگرتووخواز، نەتەوایــەتی جیــاخواز، نەتەوایــەتی ڕزگــاریخوازی دژەداگیرکــاری دژەئیمپریالیســتی، نەتەوایــەتی نۆژەنخــواز، نەتەوایــەتی ئیــتنی، نەتەوایەتی مەدەنی، نەتەوایەتی لیبراڵو نەتەوایەتی کەمینە.

### ٢. ٢. ٢. ١ نەتەوایەتی دەوڵەت State nationalism

نموونەی سەرەکی نەتەوایەتی دەوڵەت بریتیەلە ئینگلتەراو فەرەنسا. کاتێـك دەوڵـەت پێش نەتەوە کەوتووە یان تەنانەت هەر نەتەوەشی بەرهەمهێناوە. ئەمـە دەبێـت بـە یەکەم و بەدڵنیاییەوە کاریگەرترین جۆری نەتەوایەتی لەقەڵەمبدرێتو ئاکامی ئـەو

چـەمکەی ئۆریجـە کـە نموونـەی سـەرەتایی دەوڵـەت-نەتەوەیـە.[77] دەتوانرێـت ئـەم دەوڵەتانە بە کەلتووری تایبەت بناسێنرێن‌و هەروەها دەوڵەت‌و کەلتوورەکە هەمان ناویان هەلگرتووە. هەروەك تیڤێی هەلومەرجەکەی دەربڕیوە " دەوڵەت بەتەنیا رەنگدانەوەی جۆرایەتی نەتەوە نییە، بەڵکو لەقاڵبیشیان دەدات".[78] لەم خاڵەوە لەمێژوودا نەتەوایەتی وەك ئایدیۆلۆجیا بەتەواوی گەشەی نەکردووە، بەوەش دادپەروەرانەیە کە بڵێی لەم کەیسەدا نەتەوە پێش نەتەوایەتی دەکەوێت. لەم وڵاتانەدا وەفاداریی سەرەتایی سیاسی زۆرینەی دانیشتووانەکە بۆ دەوڵەتە، هەروەها ئەم یەکێتیە نێوخۆییە لەبنەڕەتدا رێگرن لەبەردەم هەر یاخیبوونێکی بەرفراوان یان رێحەزە جیاخوازییەکان. نەتەوەییە هاوچەرخەکان مشتومڕ لەوبارەیەوە دەکەن کە هەموو دەوڵەتەکان پێویستە بەهەمان ئاراستەی ئەم نموونە سەرەتاییەی دەوڵەت -نەتەوەدا گەشەبکەن، ئەوانە وەك دوا مۆدێل بۆ تێکۆشانی سەرکەوتووی دەوڵەت-پێکهێنان وێنابکەن.

## ۲. ۲. ۲. ۲ نەتەوایەتی یەکگرتووخواز Unification nationalism

ریشەی نەتەوایەتی یەکگرتووخواز لە جەنگەکانی پێش ناپلیۆنی ئەورووپاوە سەرچاوەدەگرێت کاتێك ئەڵمانیاو ئیتالیا مۆزائیکێك بوون لە دەوڵەتە بچکۆلە سەربەخۆکان، کەلەلایەن رێکەوتننامەی وێستیڤالیاوە لە ١٦٤٩دا دامەزرابوون. دوای ساڵی ١٨٠٠، نەتەوایەتی بووە پاساوێك بۆ یەکخستنەوەی زۆربەی قەوارە ئۆتۆنۆمە ئەڵمانییەکان لەسایەی رێبەرایەتی پروسییداو دەوڵەت —نەتەوەی دامەوراند کە تەواوی ئەڵمانیای گرتبووەخۆ، گەشەکردنێك کە هەروەها وەرچەرخانی قەوارە ئیتالییەکانی بۆ دەوڵە- نەتەوەی ئیتالی بەخۆوەدی.[79] ئەم نموونانە هەموو

77 Ibid. pp. 42-43.
78 Tivey (1981a), p. 5.
79 Orridge (1981), p. 44.

جۆرایەتییــە نموونەییــەکانی ئایــدیۆلۆجی نەتەوایــەتی یــەکگرتووخوازیان هەیــە، هەروەها ئەزمونی ئــەڵمانیو ئیتــالی وەك مۆدێلــە هــەرە فــرە گرنگــە ناوەندییــەکانی دەمێننەوە.

## ٢. ٢. ٢. ٣ نەتەوایەتی جیاخواز Separation nationalism

زۆربــەی زۆری نەتەوایەتییــە ســەرکەوتووەکان لەهەڵوەشــاندنەوەی دەوڵەتــە خــاوەن ســەروەرییەکانی ئەوســاوە تێوەگلابــوون. بەتایبــەت ئیمپراتۆرییــەکانی عوسمــانی، روسیو ئیمپراتۆری نەمسا-مەجەڕ کە بوونە قوربانی نەتەوایــەتی جیــاخواز، کاتێــك ژمارەیــەك دەوڵــەتی نــوێ لەمیانــەی ســەدەکانی نــۆزدەو بیســتدا پشــکووتن.[٨٠] بەلەبەرچــاوگرتنی پەرەســەندنە جۆربــەجۆرە نوێیــەکانی سەراســەری جیهــان روونــدەبێتــەوە کــە ئــەم تــەرزە نەتەوایتییــە دیاردەیــەك نییــە لــەرابردوودا. جووڵانەوەگــەلێکی جــدیی نەتەوایــەتی جیــاخواز لــە وڵاتــە ســەرەکییەکانی وەك بریتانیا (سکۆتلاند)و ئیسپانیا (وڵاتی باسك) هــەن، جووڵانــەوە نەتەوایەتییــە نــوێ یاخود ئەمڕۆییەکان کە لەبنەڕەتــدا لەوانــە ســەدەی نۆزدەیــەم جیــاوازن. تــۆم نــارین مشتومڕی لەوبارەیەوە کــردووە کــە لەدەستچوونی ئیمپراتــۆریو هــەروەها لەگەڵیــدا لەدەستچوونی پرســتیژو قازانجە ئابوورییــەکان، هۆکــارێکی گــرنگ بــوون کــە بۆچــی هەرێمە لێوارییەکانی پاشایەتی یــەکگرتووە/ UK هەســتیان بەپابەندییــەکی کــەمتر لەحاســت دەوڵــەتی ناوەندییــدا دەکــرد.[٨١] نــە ســکۆتلاندییەکانو نــە باســکەکانیش لەبــەدیهێنانی ســەربەخۆییدا ســەرکەوتووبوون، بــەڵام وێــڕای ئــەوە لەچوارچێوەی دەوڵەتە هەنوکەییەکاندا جیاوکی سیاسییان پێدراوە.

---

80 Ibid. pp. 45-46.

81 Tom Nairn (1977), The Break-up of Britain: Crisis and Neo-nationalism, London: New Left Books.

## ٤ .٢ .٢ .٢ نەتەوایەتی رزگاریخوازی دژە کۆڵۆنیالی دژە ئیمپریالیستی

Liberation/Anti-colonial/Anti-imperialist nationalism

لەوانەیە بەربڵاوترین شێوەی نەتەوایەتی ئەوەیان بێت کە نوێنەرایەتی هەڵوەشاندنی ئیمپراتۆرییە ئەوروپییەکانی پشت دەریا دەکات. لەڕاستییدا، هەموو چەشنە جووڵانەوەکان بۆ سەربەخۆیی وەك جووڵانەوەگەلێکی رزگارییخوازی نەتەوەیی پشکتوون لەدژی دەسەڵاتە کۆڵۆنیالییەکان.[82] ئەم جۆرە نەتەوایەتییە یەکێکە لەو فۆرمە سەرەکییانەی لەرووی ئایدیۆلۆجییەوە وەرگیراوە. ئەوەی لەراستییدا هەروەك بریلی دەڵێت:" لە بەشێکی بەرفراوانی کۆمەڵگاکاندا گەشەیکردو هەروەها سەرکەوتنی بووەهۆی گۆڕانی نەخشەی جیهان."[83] لە نەتەوایەتییە رزگاریخوازە دژەکۆڵۆنیالیزمەکان یان دژەئیمپریالیستەکاندا، دەتوانرێت رووخسارەکانی هەریەکە لە نەتەوایەتی کۆسمۆپۆلیتانی فەرەنسیو نەتەوایەتی دژەڕۆشنگەریی ئەڵمانی تێبینی بکرێت، هەروەها هەردوو مۆدێلەکە کاریگەرییان لەسەر کارەکتەری جووڵانەوە نەتەوایەتییەکانو پشکووتنی دەوڵەتە نەتەوەییەکان بووە لەهەموو شوێنێك. چاتەرجی وادەبینێت کە بەقووڵی پێکدژن لەکاتێکدا:

" ئەوەی هەردووکیان لاسایکەرەوەو نەیار بە لاساییکراوەکەن...لەوەدا لاسایکەرەوەن کە بەهای پێودانگەکانی کەلتووره بیانییە نامۆکەی پەسەندە. بەڵام هەروەها رەتکردنەوەش دەگرێتەخۆ...ئەوەی شێوازەکانی پێشینان کە وەك لەمپەرێك بۆ گەشەکردن دەبینرێتو هێشتا وەك مۆرکێکی شوناس لەباوەشگیراوە.[84]

نەتەوایەتییە رزگارییخوازە دژەکۆڵۆنیالیزمە دژەئیمپریالیزمە رەسەنەکان بەشێوەیەکی بەرفروان لەسەر بنەمای دژایەتییکردنی سەرکوتکاریی لەلایەن دەسەڵاتە بیانییەکانەوە راوەستاوە، کەمانای ئەوەیە کە نەتەوەییەکان تەنیا

82 Orridge (1981), pp. 48-49.
83 Breuilly (1993), p. 156
84 Chatterjee (1998), p. 2.

لــەخولیاو ئارەزووەکانیانــدا بــۆ دامــاڵینی فەرمانڕەوایەتیــە کۆلۆنیالییەکــەدا یـەکگرتوون. ئـەو دەوڵەتـەی کـە لەئـەنجامی ئەمـەدا دێتـەئارا زۆربـەی جـار پـێش نەتەوایـەتی دادەمـەزرێت کـە جگـە لـە دژەکۆلۆنیـالیزم شوناسـێکی هاوبەشـی دیکـە بوونی نییە.[85] لەوانەی ئەم جۆرە نەتەوایەتییە پاش سەربەخۆبوون لە دەسـەڵاتی کۆلۆنیـالی بـۆ دەوڵـەتی نەتەوایـەتی وەرچـەرخێت. بـەوەش دەشـێت گونجاوبێـت ئەنجامگیریی بکرێت کە نەتەوایـەتی رزگارییخوازی دژەکۆلۆنیـالی فـۆرمێکی کـاتیی بەرجەستەبوونی نەتەوایەتییە، نەك جووڵانەوەیەکی نەتەوایەتی رەسەن لەکاتێکدا " لەگــەڵ هاتنــەدی ئامانجەکــەیان کــە ســەربەخۆییە وزە نێوخۆییەکــەی لەدەستدەدات."[86]

## ٢. ٢. ٢. ٥ نەتەوایەتی نوێکارخواز Renewal nationalism

ناوچە دەرەکییە کەنارییەکان کە کـەلتووری کـۆنی خۆیـان هەیـەو هـەرگیز لەلایـەن ئیمپراتۆرییــە ئەوروپییەکانــەوە دەســتیان بەســەردا نــەگیراوە زۆربــەیجار بــەرەو لاســاییکردنەوەی نەتەوایــەتی دەوڵــەت دەرۆن لــەرووی میتــۆدە بنەڕەتییــە بەکارهێنانراوەکانی هاوشێوەی نەتەوایەتی یەکگرتووخوازە. ئەو وڵاتانە مێژوویەکی درێژیان وەك کۆمەڵێکی ئیـتنی و کـەلتوورێکی کـۆن هەیـە بـەجۆرێك ئاسـانە بۆیـان نەتەوایەتییــەکی نــوێ یــان نــوێکراوە پێکبهێــنن.[87] شــکۆمەندیی رابــردوو تایبەتمەندییـەکی ئـەم نەتەوایەتییـە نۆژەنخوازەیـە کـە خـۆی لەوەکـەی ئێرانـدا بەرجەســتەدەکات- نەتەوەیــەك خــاوەن باڵادەســتی سیاســیو ســەربازی کــە پــێش دەسـەڵاتە مەزنـە ئەوروپییـەکان هـەبووە- سـەرلەنوێ پـەی بـە کەلـەپووری فارسـیی دەباتەوە.

85 Cf. views of Hans Kohn (1944).
86 Smith, A. D. (1991), p. 108.
87 Orridge (1981), pp. 49-50.

## ٢. ٢. ٢. ٦ نەتەوایەتی ئیتنیکی Ethnic nationalism

**لەسەدەی بیستەمدا، کاتێك مۆدێرنەو بەپیشەسازییبوون دەستیانپێکردو تیۆری تاکگەرایی لەکۆمەڵگادا بنجی داکوتا، شتێکی ماقووڵ بوو بڕوا بەو بکرێت کە گرنگیی ئیتنیسیتی• بە تیکەڵبوون لەگەڵ بیروڕا نەتەوەییەکاندا بەشێوەیەکی**

---

• ئیتنیك (ethnic)و ڕەیس (race) هەردووکیان مانای نەژاد یان ڕەگەز دەگەیەنن، بەڵام هەریەکەیان ڕوویەکی جیایان هەیە، یەکەمیان ڕوویەکی کەلتووریی هەیەو واتای گروپێکی کەلتووریی تایبەت، بەڵام دووەمیان ڕوویەکی فیزیکیی دیارییکراوی هەیە وەك ڕەنگی پێستو ڕەنگو جۆری قژو جۆری چاوو لوت..هتد. لە زمانی فارسییدا وشەی "قوم" و "قومی" بەکاردێت بۆ "ئیتنیك"و "ئیتنیسیتی" کە لە زمانی عەرەبییئیتنسیت بریتییە لە سیمای درککردنو دانبەخۆدانانی کۆمەڵێك لەگەڵ سیمای درکپێکردنو دانپێدانانی ئەو کۆمەڵە لەلایەن خەڵکانێکی بێگانەوە. ئەو شارێیەیە کە تاکەکان بە کۆمەڵگاوە دەبەستێتەوە، بەمانایەکی دیکە، بە نۆرمە کۆمەڵایەتییو بەها کۆمەڵایەتییەکانەوە. ئەوەی دوو بنەمای هەیە کە ئامرازییو سۆزەکییە. گروپە ئیتنییەکان دەتوانن وەك گروپی بەرژەوەندیی لەنێوان کۆمەڵگادا هەڵسوڕێن، هەروەها دەتوانن لە پەیوەندیی بە ئەندامەتیی گروپەکەوە قازانجو بەرژەوەندییەکی (یان زیانێکی) ئابووریی‌و سیاسیی بن. دووەمین هۆکاری بایەخدار بریتییە لە لایەنە سۆزەکییو سیمبولییو مانادارییەکەی ئیتنسیتی، ئەوەی کە هەستی ئینتیماو پەیوەستبوون بە کۆمەڵگا دوورلەیەکو نێوکەسایەتییو جیهانیی دەبەخشێت. ئیتنسیتی بریتییە لە هۆشیارییەکی دەستەجەمعی کە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکیی دوای سەرچاوە سەرەتاییەکانی هۆشیاریی ئیتنیی وەك: زمانو مێژووی هاوبەش ناکەوێت، بەڵکو ئەوە پێویستییەکە بۆ بەئەزمونکردنی چارەنووسێکی مێژوویی هاوبەش، بنەچەو ئایندەیەکی هاوبەش، هەروەها هەستێك بە بوونی "ئێمە" لەگەڵ "ئەوان" دا.

جۆشوا ئەی.فیشمان، وادەبینێت کە ئیتنسیتی بریتییە لە سیمای درککردنو دانبەخۆدانانی کۆمەڵێك لەگەڵ سیمای درکپێکردنو دانپێدانانی ئەو کۆمەڵە لەلایەن خەڵکانێکی بێگانەوە. ئەو ئیتنسیتی بۆ سێ ڕەهەندی: paternity/باوکبۆماوەیی، patrimony/بۆماوەیی گشتیی، هەروەها phenomenology/ دیاردەناسیی، دابەشکردووە. باوکبۆماوەیی، مامەڵە لەگەڵ دانپێدانانە بنەچە بایۆلۆجییەکەدا دەکاتو شتێکی زگماکو بۆماوەییە. لەکاتێکدا بۆماوەیی گشتیی تایبەتمەندییەکە کە فێری دەبێت. ئەو بە ئاشکرا بەشێکی کەلتوورییە لە ئیتنسیتی. ئەو تەنیا حاڵەتێکی بوون نییە بەڵکو سیستمێکی ئاکارییو جێبەجێکارییە. ڕەهەندی بۆماوەیی گشتیی ئیتنسیتی بەو پرسانەوە بەستراوەتەوە کە چۆن کۆمەڵە ئیتنییەکان هەڵدەسوڕێنو ئەندامەکانیان چی دەکەن بۆئەوەی ئەندامێتییان دەربڕن. باوکبۆماوەییو بۆماوەیی گشتیی بەبەردەوامیی لە ئیتنسیتیدا کارلێکدەکەن، دەشێت ئە دووانە یەکتری پتەوبکەن یاخود ئاوێتەی یەکتری بن، یاخود هەریەکەو بەشێوەی جودا لەیەکتر درك بکرێن. ئەوانە دوو پایەن کە بەشێوەیەکی هاوجووت درێژ دەبنەوە، ئاراستەی

**رادیکـــاڵ کـــەمیکردووە. هەرچـــەندە، ئەمـــە دەبێتـــە گریمانەیـــەکی نادروســـت. بەپێچـــەوانەوە، ئیتنیســـیتی سیاســـییانە گوزارشـــتلێکراو بەشـــێوەیەکی بەرچـــاو لەسەراســـەری جیهانـــدا گەشـــەیکردووە، بەتایبـــەتی لـــەنیوەی دووەمـــی ســـەدەکەدا. پێدەچـێت ئـەم چەشـنە پەرەسـەندنە زۆر ناچـاەڕوانکراو نـەبووبێت لەکاتێکـدا دەتوانرێت بەئاسانی لەنەتەوایەتی بگەین وەك فراوانخوازییەکی سۆزی ئیتنیکی کە خولیای بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی سیاسی لەخۆدەگرێت، وابکات سنوورەکانی گروپە ئیتنێکـە لەگـەڵ سـنووری حوکمڕانێیەکـەی خۆیـدا هـاوجووت بێـت. لەکاتێکـدا فراوانبوونـەوەی ئیتنیسیتی، لەبنەڕەتـدا وابەسـتەی ئـەو خولیایەیـە بـۆ ئۆتۆنـۆمی سیاسیی بۆ تایبەتمەندییە هاوبەشـەکان. هـەروەك لەلایـەن ئێداردسـەوە مشتومڕی لەبارەوە کراوە، " هەموو نەتـەوەکان لەسـەر هەسـتگەلی کۆمـەڵێك دەچەسـپێن کـە دەتوانێت چەندین دەرکەوتەی جۆراوجۆری راستیینەی هەبێت." [٨٨]**

---

خۆیان دەگۆڕن یان یەکتری دەبڕن. رەهەندەکانی باوکبۆماوەیی کەمتر بێنەوبەرە هەڵدەگرن، بۆماوەیی گشتیی فرە گۆڕاوترە. سنووری نێوان باوکبۆماوەییو بۆماوەیی گشتیی دیارییکراوە، هەمان سیما هەنـدێك جـار وەك بۆماوەییەك دەبینرێتو جاروباریش وەك شتێك کە فێری دەبیت. زمان لە تێکڕای قۆناغەکاندا بە ئیتنسیتیەوە بەسـتراوەتەوە، بـەڵام هەنـدێکجار وەك بۆماوەییـەکی بـایۆلۆجیی دەبینرێـت، لەگـەڵ باوکبۆمـاوەیی ئیتنییـدا هـاوجووتو پەیوەسـتە، هەنـدێك جـاریش لەگـەڵ بۆمـاوەیی گشـتییدا. هەنـدێکجار دەتوانرێـت فێـرییبین یـان بگۆڕدرێت.

ئیتنسیتی تەنیا بە باوکبۆماوەییو بۆماوەیی گشتییەوە پەیوەست نییە، بەڵکو بایەخ بەو مانایانەش دەدات کـە کەسەکان بە بنەچەوباوانیانەوە پەیوەست دەکاتو هەروەها بە ئاکاریشیانەوە. فیشمان ئەمە بە دیاردەناسـیی ناودەنێت. ئەمە ئەوە شرۆڤە دەکات کە ئەندامانی گروپە ئیتنییەکانو خودی گروپەکان خۆیان، چـۆن سـەیری ئیتنسیتی دەکەن. بینینی ئاکتۆرەکان بۆ ئیتنسیتی بەشێکە لـە شوناسـی ئیتنییـان. دیاردەناسـیی بونیـاتێکی زانستیی سروشـتیی رێکوپێـك نیـە، زیـاتر لـەوەی بونیـاتێکی کـەلتووریی بابەتییـە کـە دڵو عەقڵـەکانو خولـە رۆژانەییەکانی مرۆڤو تێکڕای سیستمەکان پڕو ئاراستە دەکات وەرگیراوە. بڕوانە:

Hettne, Björn: 1990 Etniska konflikter och internationella relationer (Ethnic conflicts and international relations). Padrigu Textbooks, Gothenburg University, Peace and Development Research Institute, 1990., Fishman, Joshua A.: 1977 Language and Ethnicity, pp. 15-57 in: Language, Ethnicity and Intergroup Relations. Ed. Howard Giles. Academic Press, London 1977

88 Edwards (1985), p. 15.

ئیتنۆ-نەتەوایەتی، ئەو چەمکەی لەلایەن کۆنۆرەوە ناوی براوە،[٨٩] بیرۆکەیەکی بزۆزە کە" تیشک دەخاتە سەر خۆدیارییکردنی چارەنووسی کۆمەڵە کەلتوورییو خۆ بەپێشینەدا هەڵواسیوە مێژوودادەکان." [٩٠]لەسەر بنەمای ئیتنیکی خەڵك بانگێشت دەکات، زمانو لەهێندێك حاڵەتی دیارییکراودا هەروەها ئاینیش پێکەوە دەبەستێت. ئەو خەریکی گۆڕینی کۆمەڵێکی ئیتنکییە بۆ نەتەوەیەکی سیاسی.[٩١] بەگوێرەی بنەمای نەتەوایەتی ئیتنیکی، وابەستەیی قووڵی کەسێك، شتێکی میراتی بۆماوەییەو هەڵبژێردراو نییە (هەروەك نەتەوایەتی مەدەنی پابەندێتی-بڕوانە خوراەوە). لەوەش زیاتر، تاك بەهۆی کۆمەڵی نەتەوەییەوە پێناسەدەکرێت، نەك بەپێچەوانەوە، هەلومەرجێك دەخولقێنێت کە زیاتر هێز نەك پەسەندکردن دەبێتە بنەمای یەکێتیە هاوبەشەکە لەلایەن رژێمە نەتەوەییەکەوە کە سروشتێکی بەئاسانی دەسەڵاتخوازتری دەبێت تا دیموکراتیك.[٩٢]

جووڵانەیەکی ئیتنۆ-نەتەوەیی بەدڵنیاییەوە زۆرجار لەهەرێمێکەوە بنەمادەگرێت، هەروەها پێدەچێت جیاوازییکردن لەنێوان "نەتەوایەتی ئیتنیکی"و " نەتەوایەتی هەرێمی" هەروەك ئەنتۆنی سمس کردوویەتی، کارێکی جێی مشتومڕ بێت.[٩٣] هەموو نەتەوایەتییەکان، زۆرتر یان کەمتر، هەڵگری رەگەزگەلی ئیتنیکین، بەوەش پێدەچێت وردتربێت تاکو"جیاوازی لەنێوان نەتەوایەتییەکدا بکرێت کە بانگەشەی قەڵەمڕەوە هەرێمییەکەی لەسەر بنەمای ئینتیمای ئیتنیکی هاوبەش دەکات لەگەڵ ئەوانەی هەوڵی بنیاتنانی هاوبەشی ئیتنیکی لەسەر خاکێکی نزیکەی داگیرکراو دەدەن." [٩٤]

نەتەوایەتی ئیتنیکی تەرزە نەتەوایەتییەکە زیاتر لەژێر وردبینیدایە کە پێدەچێت

---

89Walker Connor (1973), 'The politics of Ethno-Nationalism', Journal of International Affairs, Vol. 27, pp. 1-21.
90 MacCormick (1999), P. 126.
91 Smith, A. D. (1999), p. 41.
92 Ignatieff (1994), p. 5.
93 As evident in his Theories of Nationalism (1971).
94 Jenkins (1997), p. 146.

شـــێوەی نەتەوایەتییـــەکی ئازاربـــەخش وەربگرێـــت. پێدەچـــێت وەك شـــەڕەنگێز لەسروشتو هەروەها تەواو وێرانکەر ریزبەندی بکرێت، بەڵام، لەدیدگای جیاوازەوە دەبینرێت، دەتوانرێـت ئتنۆنەتەوەییـەکان وەك داود لـەدژی جـالوت بدرێنـە قەڵـەم. شتێکی نامۆ نییە بۆ نەتەوایەتی ئیتنیکی کە لەشـێوەی جووڵانەوەیـەکی نەتـەوەیی کەمینەدا دەربکەوێت.

## ۲. ۲. ۲. ۷ نەتەوایەتی مەدەنی Civic matioalism

نەتەوایەتی مەدەنی یان هەرێمی هەروەها بـە " constitutional patriotism/ نیشـتیمانیی دەسـتوری" یـان " post-nationalism / پۆسـت نەتەوایـەتی " نادەبرێـت.[95] بانگەشـە بـۆ هەسـتگەلێکی ئینتیمـای هاوبـەش لـەنێو هاوڵاتیـانی کۆمەڵگایەکـدا دەکـاتو نەتـەوە وەك"کـراوە بـۆ هـەموو ئەوانـەی دێنـە ژێـر سـایەو پەسەندی دەسەڵاتی دادوەری دامەزراوەیەکی مەدەنی دەکەن." [96]
پێکهاتـــەی نەتەوەیـــەك لـــەرووی ئیتنکـــیو زمـــانو ڕەگـــەزو هـــەروەها ئـــاین چ پەیوەندییەکی لەم فۆرمەی نەتەوایەتییـدا نییـە، ئـەوەی جـەخت لەوەدەکاتـەوە کـە یەکێتی نەتەوە لەو وابەستەییە نیشتیمانییەی مافـە یەکسانەکانی هاوڵاتیانـەوە، بـۆ هاوبەشی لە بەستەیەك بـەهاوو کـرداری سیاسـی سەرچاوەدەگرێت. ئـەوە بریتیەلـە "نەتەوایەتی فەرمانو کۆنترۆڵ."[97] نەتەوایەتی دەوڵەتی خاوەن سەرەوەری، هەروەك لەسـەرەوە ئامـاژەی بـۆکراوە، دەتوانرێـت وەك بەهێزکـەری هەردەوڵـەتێکی خـاوەن سەروەری لێکدانـەوەی بـۆ بکـەین کـە چالاکانە ئیلهامی نەتەوایـەتی مـەدەنی یـەك- نەتەوە دەبەخشێتە هاوڵاتی.

---

95 Fine (1999), p. 149.
96 MacCormick (1999), p. 126.
97 Smith, A. D. (1999), p. 41.

## ٨ .٢ .٢ .٢  نەتەوایەتی لیبراڵ Liberal nationalism

بە نەوەو میراتگری پلورالیزمی کەلتووری هێردەر لەقەڵەمدەدرێت، نەتەوایەتی لیبراڵ بۆ سیاسەتە دوا-سەروەرییەکانی دەوڵەت-نەتەوەی نوێ دەگەڕێتەوە کاتیک پێویستی بۆ "بێلایەنکردن"ی تایبەتگەرایی نەتەوایەتییەکەی دێتەکایەوە بۆ پێناسەکردنەوەی بنەما نەتەوەییەکان بەشێوازێکی پەسەندکراوی جیهانی: ئەوەی کە " دیدێکی نەتەوەی بگرێتەبەر لەکاتێکدا لەحاست بیروبڕوا لیبراڵەکان وەفادار بمێنێتەوە." [98] هەروەك ئەو حاڵەتەی نەتەوایەتی لیبراڵ کە دوو سەدە پێشتر پشکوتووە، جەخت لەسەر سەروەریی ڕەهای دەوڵەتی نەتەوەیی دەکرێتەوە، بەڵام پابەندبوون بە بنەماکانییەوە دەبێت بە جەختکردنەوەیەکی بەهێزی یەکسان لەسەر سەربەستییەکانی تاك لەنێو هەر دەوڵەتێکی نەتەوەیی ڕێکبخرێت. هەرچەندە، یۆتۆپیاکانی نەتەوەییە لیبراڵەکانی سەدەی هەژدەیەم، پشتگیریی ئەو بۆچوونەی دەکرد کە هەر نەتەوەیەكو هەموو نەتەوایەتییەکان دەبێت بۆ یەکەیەکی سیاسی سەربەخۆ وەرچەرخێت کە خاوەن حکومەتی دەستووری خۆی بێت پشتگیرییەکی کەم یان هەر هیچی لەنێو کۆڵینەوە هاوچەرخەکاندا بەخۆوە بینیوە.

نەتەوەییە لیبراڵە مۆدێرنەکان خوازیاری ئاوێتەکردنی هزرەکانی لیبراڵیزمن، کە بانگەشە بۆ دیدێکی دانپێدانراوی بەرفراوان دەکەن لەبارەی مافەکانی تاك، لەگەڵ ئەو نەتەوایەتیانەی کە کە مافێکی تایبەت بۆ خەڵکەکەی دەستەبەر دەکات، بەوتەیەکی دیکە، "بۆ پێناسەکردنی نێوەرۆکی بنەما یان بنەماکانی نەتەوەیی بەرێگەیەکی قنیاتکەری گشتی جیهانگیر." [99] لەکاتێکدا نەتەوایەتی لیبراڵ ئەوە دەچەسپێنێت کە کەلتوورو هەروەها ئینتیما بۆ نەتەوە رووخسارگەلێکی هاوبەشن،

---

98 Tamir (1993), p. 5.
99 MacCormick (1999), p. 130.

تەواوی بەهاكانی تەنیا دەتوانرێت بەگونجاوی دانیپێدابنرێت، لەبەرئەوە لەكاتێكدا لیبرالّەكان دان بەم رووخسارە گرنگانەدا دەنێن كە لەلایەن نەتەوەییەكانەوە پاكیزە دەبینرێن، ئەوەی دواتریان دەتوانرێت چاوەڕوانی لێبكرێت كە دان بەگرنگیی مافەكانی تاكو سەربەخۆیی شەخسییدا بنێت.[100]

## ٢. ٢. ٢. ٩ نەتەوایەتی كەمینە Minority nationalism

نەتەوایەتی كەمینە بیرۆكەیەكی بەرفراوانەو وەك هەر نەتەوایەتییەكانی دیكە تایبەتمەندی بونیادی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەوەی لەلایەن كۆلین ولیامزەوە دیارییكراوە، رووخسارە گشتییەكانی جووڵانەوەی نەتەوایەتی كەمینەی بە دە دانە ئەژماركردووە، یەكەمیان بەشێوەیەكی سروشتی بەرگرییە لە نیشتیمان، ئەو تاقە هەرێمەی ململانێی بەردەوامی نێوان جووڵانەوەی سیاسیی كەمینەو دەوڵەتی زاڵی لەسەر دەگوزەرێت. لەبنەڕەتدا پەیوەستە بە بەرگرییكردن لە كەلتوورێكی تایبەتو شوناسی كەمینە: زمانو ئاین بەربلاوترین مۆركی جیاكەرەوەی نەتەوایەتین، كە بەڵگەی جیابوونیانن لە زۆرینەی دەوڵەت.

جووڵانەوەی نەتەوایەتی كەمینە بەتوندی دژایەتی هەر رێحەزێكی ناوەندگەرایانە دەكات كە ئامانجی بەستنەوەی نیشتیمانە نەتەوەییەكەیە بە ناوەندی دەوڵەتەوە، هەروەها بەشێوەیەكی رێژەیی لەرووی بڕیارسازییەوە بێدەسەلاتە. هەروەها ئەم نەتەوایەتییە دیاردەكانی ئیستیغلالی سیستماتیكو دواكەوتوویی دەگرێتەخۆ- ئەوەی ولیامز بە " structural discrimination / هەلاواردنی بونیادی " ناوی بردووە. تایبەتمەندییەكی دیكە بەرگریی توندوتیژانەی هاوكاتە لەحاست ئەو بیانیانەی لەشێوەی كۆچەر، نیشتەجێ یان داگیركارن، ئەوانەی هەمیشە وەك بەرجەستەكەری خولیا زاڵەكانی دەوڵەتو ئارەزووی بۆ بلاوكردنەوەو پتەوكردنی

100 Tam ir (1993), pp. 6-8.

کەلتووری زاڵ دەبینرێن. لەگەڵ ئەم چەشنە بەرگرییە ترسێك هەیە، ترس لە لەدەستچوونی ئەو زاڵییو نفوزە خۆماڵییەی هەیە، لەدەستچوونێك پێدەچێت بەهۆی داخورانی کەلتوورییەوە هانبدرێن.

نەتەوایەتی کەمینە زیاتر بە دووبەرەکی ئیتنی دەناسرێتەوە کەدەشێت شێوازێکی توندوتیژ یان ناتوندوتیژ لەخۆبگرێت. پێداگری لەسەر نایەکسانی نێوان نەتەوەی کەمینەو نەتەوەی زۆرینە شێوەکانی دەوڵەت پێکدەهێنن کە ئایدیۆلۆجی نەتەوەییەکانی کەمینە وێنادەکەنو پێناسەی شوناسە هەنووکەییەکەی دەکەن. خستنەژێر پرسیاری رەوایەتی سیاسی ئەو رژێمەی لەدەسەڵاتە زۆربەیجار لۆژیکی سیاسی بۆ جووڵانەوەی نەتەوەیی کەمینە پێکدەهێنن بۆ پشکووتنو پەرەسەندن، کارە سیاسییەکانیان بەئامانج دەگرن لە پێکهێنانی بنەمای نوێ بۆ رەوایەتیی.[١٠١]

## ٢ . ٣ هێزی پێکدژی نەتەوایەتی : ئارامبەخش و ئازاربەخش یان باشو خراپ

هەروەك ئەوەی ریزبەندی نەتەوایەتی بە شتێکی سوودبەخش لەقەڵەمدەدرێت، پێدەچێت گونجاویش بێت جیاکاری لەنێوان سیما جیاوازەکانی نەتەوایەتییدا بکەین، ئەوەی کە خۆی وەك دیاردەیەك پێشاندەدات کە زیاتر لەروویەکی هەیە. نەتەوایەتی دەشێت هێزێکی پێکەوەگرێدان بێت بەڵام هەروەها دەشێت تۆوگەلی ناکۆکییەکی قووڵی لەخۆگرتبێت. ئەم بنەما سیاسییە لەئەفراندنی کۆمەڵە نەتەوەییە هاوبەستەگییەکانو دەوڵەتە نەتەوەییە شەرعییەکان بەرپرسیارە، بەڵام هەروەها بەرجەستەی روویەکی تاریکی مرۆڤایەتیش دەکات، بەمانایەکی دیکە: ناکۆکی دوژمنکارانەو ئاکاری ئازاربەخشانەو جەنگ. پێویستە دەربڕینێکی جیاوازی بەم چەشنە بۆ هەمان دیاردە سەرسەڕهێنەر نەبێت بەوپێیەی ئەوە هەمان

101 Williams (1994), PP. 234-8.

پرۆسـەیە کـە دەبێتـەهۆی دامەزرانـدنی دەوڵـەت-نەتـەوەو هـاودژە دیالێکتیکەکـەی، چەمکی " statelessness / بێدەوڵەتی ".

ئەگـەر تیۆرەکـەی بێنـدکت ئەندەرسـۆنمان سـەبارەت بـە نەتـەوە پەسـەند بێـت کـە بنیـاتی شوناسـێکی وێنـاکراوە، ئیـدی دەتوانرێـت نەتەوایـەتی وەك میتۆدێـك بـۆ بەرجەستەکردنی مێژوو تەماشابکرێت. ئەگەر مێژوو بەشێوەیەك لێکبدرێتـەوە کـە لەگەڵ پێویستەییە گشتییە هەنوکەییەکانی کۆمەڵدا گونجاوبێت، نەتەوایەتی دەبێتە ئایدیۆلۆجیایـەکی فـرە دەسنیشـاکراوی تەتەڵـەکراوو شـێوێنەر، بـەوەش، دەبێتـە هێزێکـی ئازاربـەخش. کاتێـك بنیـاتێکی شوناسـی وێنـاکراو بنـەمای نەتەوایـەتی پێکبهێنێـت، ئـەوا دەبێتـە " شـێوازێکی بەرجەسـتەکردنی مێـژوو، مێژوویـەك کـە بۆخـۆی دەبێتـە دووبـارە لێکدانەوەیـەکی بـەردەوام لەبـەر تیشـکی پێکهاتـەکانی نەتەوایەتییـدا."[102] ئـەم ڕێبـازە جـەخت لەسـەر جۆرایـەتی "ئەفسـانەیی" ئایـدیای نەتەوە دەکاتەوە، لەسەر ئـەو ڕیشـەیەی بیروئایـدیاکانی ئەوانـەن کـە بـە ڕۆمـانتیکی ئەڵمانییەوە پەیوەستن. لەم قاڵبە ئیتنیکییـەدا، نەتەوایـەتی لـەڕێی پێناسـەکردنەوە دوورایییـەك بـۆ خەڵکەکـەی دیکـە دادمـەزرێنێت. ئـەوەی هـانی بـیری " us-and-them / ئێمـەو ئـەوان " دەدات کـە هـانی بـیری باڵادەسـتی خـودی گروپەکـە دەدات بەسەر تێکڕای نەتەوایەتییەکانی دیکە. بۆ نموونە، بۆئەوەی وەك کوردێك ئاماژە بۆ کەسـێك بکـات، سـنوورێکی سـایکۆلۆژی دەکێشـێت بـەدەوری ئـەو کەسـەو هـەروەها ئەوانەشـی بانگەشـەی هـەمان شـوناس دەکـەن. ئـەم کـرداری دەرکەداخسـتن بـەرووی خەڵکانی دیکە یەکێکە لە سیماگەلە کەمتر خوازراوەکـانی بنـەما نەتەوایەتییەکەیـە. ئەم ڕەگەزانەی ڕاکێشانو دوورخستنەوە بەشێکی بنەڕەتی نەتەوایەتییـە، لەکاتێکـدا ئایدیۆلۆجییەکە ڕەگەزێکی بەهێزی لەوچەشنەی پێناسەکردنی گروپی هەیە.

دەتوانرێت توانای کارەساتباری نەتەوەیی لەچەندین شوێندا ببینرێت، لەوانەیە فرە بـەدیارییکرداوی لـە مێـژووی هاوچـەرخی ئـەورووپادا.[103] نەتەوایـەتی ئیمپریالیسـتی

---

102 Smith, A. D. (1986b), pp. 240-241.

103 As convincingly argued by Keduorie (1961), pp. 138-139.

دەوڵەتـە خـاوەن هێزەكـان زۆربـەیجار كەمینـەكانی نێوخۆیـان هەراسـان كردبـوو، " دوژمنایەتییـەكی ئاشـكرا پاسـاودەری شـكۆمەندییو فراوانخـوازیی هـەرێمیی بێـتو هێـزو دەسـەڵاتی دەوڵـەت پتـەوبكات."[١٠٤] دیدگـەلێكی نێوخـۆییو پاشـڤەرۆ بـۆ نەتەوایەتی هەیە، كە رەخنـەكانی لەسـەر چڕدەبێتەوە: كـە بەكـەمگرتنو بەسـووك سەیركردنی گروپەكانی دیكەیە. جەختكردنەوەی لەسەر بەكۆمەڵبوونو قەومایەتی ( بـەمانای هـەواداری ) لەگـەڵ مافـەكانی تاكـدا سـەبارەت بـە دانپێـدانانی تـەواوو سەربەستی پێكدژە، لەم سۆنگەیەشەوە نەتەوایـەتی " مەترسییە بۆسـەر پارێزراوی تاكـەكان زیـاتر لـەوەی رەگـەزێكی تاكگـەراییان بێـت." [١٠٥] لەكاتێكـدا، نەتەوایـەتی، نەتــەوە دەخاتــە پــێش ئەندامــە تاكەكانییــەوە، لەپرۆســەكەدا ئــازادی تاكــەكان دادەپاچـێت. هـەر وەفادارییـەكی نەتەوەییانـەی دڵسـۆزانەو بەجۆشـی كەسـێك بـۆ كێشەكەی لەواقیعدا دابەشبوونو كەلێنی نێوان تـاك و كۆمـەڵ دەسـڕێتەوەو ئـەوەش بەئاسـانی دەبێتـە هـۆی بەدمامەڵـەكردنی تاكـەكانی كۆمەڵەكـە. ئـەم رێحـەزەی نەتەوایەتی بۆ جەختنەكردنەوە لەسەر مافو بەرژەوەندییەكانی تاكەكان لەوانەیـە وەك خوارەوە پوختەبكرێت :" دەشێت نەتـەوە هەرشـتێك بخوازێـت بیكات، دەشـێت تاكەكان ئەوە بكەن كە دەوڵەتی نەتەوەیی دیارییدەكات." [١٠٦] وێڕای ئەوە، لەهێنـدێك بـیروڕای نەتەوەییەكانـدا، بەرژەوەنـدی نەتـەوە دەخرێتـە پـێش بەرژەوەندییـەكانی تەواوی مرۆڤایەتی، ئەوەی دەیكاتە ئایدیۆلۆجییەكی فرە مەترسییدار.

دامەزرانـــدنی دەوڵـــەت-نەتـــەوە ( ســـەركەوتنی نەتەوایەتییـــەكی تایبـــەت ) [١٠٧] پێویستییەكی گرنگی بەقۆرخكاری ئامرازەكانی توندوتیژی هەیە، كـە لەپرۆسـەكەدا زۆرجـار بـۆ تێكشـكاندنی نەتەوایەتییـە ئەلتەرناتیڤـەكان بـەكاردەهێنرێت. بـەوەش توندوتیژی بەشێوەیەكی ئاڵۆز بە چالاكییە كرداریيەكانی نەتەوایەتییەوە پەیوەست

104 MacCormick (1996), p. 47.
105 Ibid. p. 34.
106 Hayes (1949), p. 69.
107 Billig (1995), p. 28.

دەبێت. لێکدانەوەیەکی بەم چەشنە لەلایەن ئێرنست رینانی بیرمەندی سەدەی نۆزدەیەمەوە بیری لێنەکراوەتەوە، ئەوەی جۆرێکی هەستیارو ماقووڵی لەنەتەوایەتی پێشکەشکردووە. دیدی فرە هاوسەنگی ئەو سەبارەت بەم دیاردەیە ئەوەیە کە " سیما جیاوازەکانی بەشێکی گەورە لەنەتەوە جۆربەجۆرەکان پشکووتنی مرۆڤایەتی بەگشتی دابینەدەکات" ئەمەش دەبێتە دوا بەشداری نەتەوەکان.[108] زۆربەی نەتەوەییەکان بەم دیدە جیهانییەوە پابەند نەبوون، بەڵام بەرجەستەی فۆرمێکی نەتەوایەتی دەکات کە دەتوانێت بۆ مرۆڤایەتی باش بێت.

لەرێحەزێکی هاوشێوەی ئەرێییدا، سمس لە " قازانجو نیعمەتی" نەتەوایەتی رادەمێنێت، کە ئەو وەك خولیاو هاندەری هەموو جۆرەکانی چالاکییە کەلتوورییەکانی دەبینێت کە دەرهاوێشتەی فرە بایەخداری لێدەکەوێتەوە. بەوەش ئەو ئەنجامگیری کردووە کە، ئەوە هەڵەیە کە پێمان وابێت نەتەوایەتی تەنیا خاوەنی سیما نەرێییەکانە.[109] لەڕاستییدان گەر لەرووی چەمکەوە نەتەوایەتی لە جووڵانەوەیەکی تەواو سیاسییدا سنووردرابکەین هەروەك چۆن برویلی[110] کردوویەتی ئەوا " پابەندییەکی بێپاساوە، لەکاتێکدا سیماگەلێك کە راستەوخۆو بێ ئەملاولا پەیوەستە بە چەمکەکەوە، وەك کەلتوورو هەروەها شوناس کە لەبنەڕەتەوە دەخرێتەسەر هێزو تواناکەی، بەحیسابنەکراوی دەمێنێتەوە. رەخنەگرێکی دیاری ئەم رێبازە جۆن هێچۆنسۆنە، ئەوەی جەختی لە گرنگی فۆرمی کەلتووری نەتەوایەتی کردۆتەوەو تێگەیشتنێکی قووڵو بایەخدار پێشکەش دەکات بۆ " نەتەوایەتییەکی کەلتووری کە کار بۆگێڕانەوەی ئەخلاقی کۆمەڵەکە دەکات."[111] لەڕاستییدا، نەتەوایەتی کەلتووری ( وەك ئەوەی لەنووسینەکانی هێردەردا هاتووە)خۆی لەخۆیدا هێزێکەو ئەو رێحەزە دەگرێت لەرووی تواناوە لەبری

---

108 See H. Psichari (ed.) (1947 org. 1882), Oeuvres completes de Ernest Renan, Paris: Calmann- UN'Y'
109 Smith, A. D. (1971) P. 14.
110
111 Hutchinson (1994), p. 41.

نەتەوایەتی سیاسی بێت ( پەیوەستە بەبنەما فێرکارییەکانی ڕۆسۆوە ) کە بەشێوەیەکی بەردەوام کاریگەریی تێدەکاتو خۆشی پێی کاریگەر دەبێت. ئەمەش دەتوانێت ئەو مانایە بەدەستەوە بدات کە نەتەوایەتی کەلتووریی وەختێك دەگیرێتەبەر کاتێك نەتەوایەتی سیاسی دەگاتە بنبەست، لەکردنی ئەمەشدا دەشێت ئەندامەکانی نەتەوەکە تەیاربکاتو ئەم سنوورەی بەهۆی ڕۆحی نەتەوەییەوە کاریگەری تێنەکرێت.[112] هەربۆیە فیکری نەتەوایەتی کەلتووریی، لەبنەڕەتدا هێندێك ڕەوایەتیو هەروەها بۆشاییەك بۆ خولیا نەتەوەییەکانی کارەکتەرێکی کەلتووری بەشێوەیەکی سەرەکی فەراهەمدەکات، جۆرێکی باشو ئارامبەخش لەنەتەوایەتی دێنێتەئارا کە ئەو بنەماگەلە سەرەکییانەی گرتوێتیەبەر کە زیاتر گشتگیرو جیهانین تاکو ئەوەی تایبەتی بن.

مشتومڕەکەی (کۆهن) ئەوەیە کە نەتەوایەتی کەلتووریی بە نەتەوایەتی سیاسی "عەقلانی" لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم دەرکەوتووە کاتێك چینی ناوەند لەسەر شانۆی سیاسی دەرکەوتن،[113] ناتوانرێت بێ پێداچونەوە بسەلمێنرێت. هەلومەرجەکان لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە بەدەگمەن هاوشێوەو هاوجووت دەبێت، بەلام بینینی نەتەوایەتی کەلتووری ئارامبەخشو نەتەوایەتی سیاسی ئازاربەخش وەك هێزگەلێکی ڕکابەر لەسەر شانۆ سیاسییەکە- ئەوەی پێشوو کۆمەلگاییەو ئەوەی دواتر ئاراستەی دەولەتییە، دەشێت ڕێبازێکی گونجاوتربێت. تەنانەت دەشێت ئەوانە لەچەند خولێکدا ئەلتەرناتیڤی یەکتربن، هەروەك هێچینسۆن پێشانیداوە.[114]

ئەو نەتەوایەتییە کە لەبنەڕەتدا دیاردەیەکی نەرێی نییە پێدەچێت لەرووی تیۆرییەوە ڕاست بێت. هەرچەندە، لەکرداردا، ئەو خودهۆشییەی کە مۆرکی تایبەتی

112 Such a development is in the Irish case scrutinized by Hutchinson in chapter four of his The Dynamics of Cultural Nationalism: The Gaelic Revival and the Creation of the Irish Nation Stale, (1987), London: Allen & Unwin.
113 Kohn (1944), chapter 7.
114 Hutchinson (1994), chapter 3.

نەتەوەییەکانە بەشێوەیەکی حەتمی بەرەو ئیستیغلالکردنی ئەوانی دیکە دەڕوات. فۆرمە نەتەوایەتییە کەلتوورییەکەی هێردەر، کە جیهانێك لە یەکەگەلە سیاسییەکان وێنادەکات کە لەنەتەوەکان پێکهاتووە، هاوشانی خولیایەکیش کە خەمی پاراستنی جیاوازییە کەلتوورییەکانە، دەتوانێت هێندەی هەر ئایدیایەکی بەهێزی دیکە باش‌و ماقووڵ بێت، هەرچەندە، کاتێك زۆربەیجار لەدرككردن‌و بەدیهێنانی نموونە باڵا نەتەوەییەکاندا لەپڕواوپڕی ئاست‌و چوارچێوەکەیدا شکستدێنین ئەو ئاشتییە دەکەوێتە مەترسییەوەو لەوانەشە ناجێگیری پەیدابێت.[115] گیلنەر دانی بەهەڵگرە ئەرییەکانی نەتەوایەتی ناوە بەڵام لەوباوەڕەدایە کە بەدیهێنانی ئاشتی بنەما نەتەوەییەکان زەحمەتە بەهۆی " سروشتی تایبەتی ئەو جیهانەی ئێمەی تێدا دەژین، کە دژی هەر نەتەوایەتییەکی بێگەردی گشتیی شیرینی ماقووڵ رادەوەستێت." [116]

لەکاتێکدا بنەماکانی ئینتیمای هاوبەش برتین لە پرنسیپە دەستوورییەکان زیاتر لە ئیتنۆگەرایی هاوبەش، هەربۆیە نەتەوایەتی مەدەنی زۆربەیجار بەپێکدژی ئەو نەتەوایەتییە ئیتنیکییە ئیستیغلالییە ریزبەدەرە لەقەڵەمدەدرێت. هەرچەندە ناتوانرێت وشەی مەدەنی بکرێتە هاوتای باش‌و ئارامبەخش بۆ نەتەوایەتییە بایەخدارەکان. میشێل ئیگناتیف لێکیدەداتەوە:" لەو کۆمەڵگایانەدا کە گروپە ئیتنییە زۆرینەکان، پێناسەی ناوەرۆکی سیمبوڵ‌و ترادسیۆنە نەتەوەییەکان دەکەن بۆ دوورخستنەوەی کەمینەکان، ئاسانە بۆ بەهاگەلە " مەدەنییەکان" کە ببنە ئامرازێکی زۆرداریی."[117] بەدانپێدانانی فرەڕەنگی دەوڵەت-نەتەوەی هاوچەرخ ، نەتەوایەتییەکی مەدەنیی لێبوردەی گشتیی سەرتاپاگیر لەوانەیە تاکە دژەژارێك بێت بۆ دوورکەوتنەوە لە نەتەوایەتیی نالێبوردەی ئیتنیکی. لەجیهانبینی نەتەوایەتی مەدەنییەوە دەوڵەت پێناسەی نەتەوە دەکات، لەکاتێکدا ئیتنۆ-نەتەوایەتی جەخت

115 Smith, A. D. (1981), p. 199.
116 Gellner (1983a), p. 2.
117 Ignatieff (1999), p. 144.

لەوەدەکاتەوە  کە نەتەوە پێناسەی دەوڵەت دەکات. هەروەك رۆبەرت فاین ئاماژەی پێداوە:" لەدوالیزمی نەتەوایەتی "مەدەنی" لەبەرامبەر "ئیتنیکی"دا، ئەوەی دواییان لەبەرامبەر ئەوەی یەکەمدا وەك پاشڤەڕۆیەك دەردەکەوێت، بەڵام ئەوەی پێشوو لەبەرامبەر ئەوەی یەکەمدا وەك هەڵگری "رۆژهەڵاتناسی"یەکی نوێ دەردەکەوێت."[118]

میشێل مان بڕوای وایە کە نەتەوایەتی "aggressive / شەڕنگێز" دەبێتە " فۆرمێکی گومڕا بۆ رۆیشتن بەئاراستەی دیموکراسیدا."[119] ئەمە ئەو بەراوردەیە کە میشێل لەگەڵ نەرمە نەتەوایەتی دیموکراتی بەدەستهاتوو کردوویەتی. بەوەش، مان، نەتەوایەتی " exclusionary / ئیقسائی یان تەنگەتیلە" بەشێوەیەکی گەورە بەرهەمی هەوڵگەلێکی ناسەرکەوتووە بۆ بەدامەزراوەیکردنی دیموکراسی، هەروەها بەدەستهێنانی دیموکراسییەکی فیدراڵی "inter-regional / نێوهەرێمی" خۆی لەفۆرمەکانی نەتەوایەتی پێشێلکارانەو هێرشبەرانە رزگاردەکات.[120] لەوانەیە ئەمە رووی خۆی ئاراستەی ئەو هەلومەرجە بکاتە کە نەتەوەییەکان، کە لەهەوڵی پێداچوونەوەی رەوشە نەتەوەییەکەیانن کە بەهۆی نادادپەرەری پێشووەوە سیمای نایەکسانیو شێواوی پێوەدیارە، لەهەوڵیاندا بۆ چاکردنی رەوشەکە زۆربەیجار زیاتر هەمان شێوە دەخولقێنن.

سەبارەت بە رەهەندە ئەرێیو نەرێییەکانی ئایدیۆلۆجییەکە، ئیگناتیف جیاکارییەکی سەرنجڕاکێش دەکات کە شایەنی تێبنیکردنە. ئەو جیاکاری لەنێوان " patriotism / نیشتیمانپەرەری" وەك جۆرێکی نەرمو ئارامبەخشی نەتەوایەتی کەبەرجەستەی خۆشەویستی وڵاتو هەماهەنگی نەتەوەیی دەکات، هەروەها "nationalism / نەتەوایەتی" کردووە، لەگەڵ تایبەتمەندییە ئازاربەخشەکانی وەك نالێبوردەییو توندوتیژیی. جیاوازی نێوان ئە دووانە بریتیە لە "

118 Fine (1999), p. 153.
119 Mann (1995), p. 44.
120  Ibid. pp. 62-63.

نیشتیمانپەروەر ئەو وڵاتەی خۆشدەوێت کە نزیکەی هەیە، لەکاتێکدا نەتەوەیی زۆربەیجار وڵاتێکی خۆشدەوێت کە نییە." بەوەش نیشتیمانێتی، ئەو بەردەوامدەبێت، "بریتیەلە جیاوگی ئەوان لەگەڵ دەوڵەتەکان." لەکاتێکدا نەتەوایەتی زمانی بێدەوڵەتانە." [121] بەم زارەوەسازییە، کوردێکی خاوەن هۆشی نەتەوەیی، بۆ نموونە، دەبێتە نەتەوەیی، ( لەم هەلومەرجەی ئێستادا) نەك نیشتیماییەك.

بۆ ئەنجامگیری سەبارەت بە سیما باش‌و خراپەکانی نەتەوایەتی، لەوانەیە دادپەروەرانە بێت کە بوترێت گەوهەری نەتەوایەتی نە باشەو نە بەدە، هەرچەندە، وەك میشێل ئیگناتیف تێبینیکردووە، بەڵگەی کاریگەرییە نەرێییەکانی ئایدیۆلۆجییەکە لەکاریگەرییە ئەرێییەکانی زیاترە.

ئەوە شتێك نییە لەچەندین شتی شاراوەو ناشوناسدا، بەڵکو چەند شتێکە لەچەندین شتی شاراوەو ناشوناس، پرنسیپەکانی نەتەوایەتی دەتوانێت لەشوێنێکدا ئاکامگەلێکی ترسناکیان لێبکەوێتەوەو لەشوێنێکی تریش ئاکامگەلێکی ئەرێی‌و بێ زیانی هەبێت. [122]

هەمیشە پرنسیپگەلێکی دیارییکراو هەن کە خەڵك لەجیهاندا پێوەی پابەندن، بەڵام ئەوەی چەسپاویشە ئەوەیە کە ئەو جیاوازییەی لەنێوان ئەو خەڵکەدا هەیە کە بەرهەمهێنەری ئەو تایبەتمەندییە سەرنجراکێشانەن بەردەوام دەبێت. ئەم واقیعیەتە ئەوە رووندەکاتەوە کە بۆچی نەتەوایەتی دەبێتە ئاوێتەکەرێکی بەردەوامی پەسەندکراوە گشتییە جیهانییەکان‌و رەتکراوە تایبەتەکان. هەروەها نەتەوایەتی بریتیەلە دەربڕینی شوناس، ئەوەی ئەمێستا دەرهاویشتەکانی پێناسەدەکرێت‌و لێکدەدرێتەوە.

---

121 Ignatieff (1999), p. 142.
122 Id. (1994), p. 9.

# باسی سێیەم: پێکهاتە کۆمەڵایەتی-سیاسییەکانی شوناسی کوردیی

## ٣ . ١ چین

چەمکی چین بەمانای دابەشبوونی کۆمەڵگایە، سیستمێکی پلەبەندی کۆمەڵایەتیو دابەشبوونی دەسەڵات. هەروەها پێدەچێت پێکهاتەی چینایەتی مانای ململانێش بدات، دەستبەسەرداگرتنو وابەستەییش پێشانبدات.[١] هەرچەندە، بایەخ و سەنگی سیاسی سیستەمەکەی چینی کوردیی دەشێت هێشتا تارادەیەك سنوورداربێت، وادەردەکەوێت کە کەمەندکێشکردنی ئەم رەگەزە بۆ مشتومڕکردن وادەکات بەشداری لە فۆرمەڵەمکردنی تێگەیشتنێکی پتەو سەبارەت بە سیماگەلە یەکلاکەرەوەکانی بونیادی کۆمەڵگای کوردی بکاتو خەرمانێك بخاتەسەر ئەو مشتومڕەی پێشوو سەبارەت بەنەتەوایەتیو هەروەها پەرەسەندنی لەکوردستاندا.

### ٣ . ١ . ١ پارادیمی چینایەتییەکان

لەکاتی تیۆریزەکردنو وێناکردنی چیندا، نووسینەکانی کارل مارکس دەستپێکێکی گونجاون.[٢] بەگوێرەی هزرە بنەڕەتییەکانی مارکس، چینەکان بەگوێرەی پەیوەندییان بە ئامرازەکانی بەرهەمهێنانەوە پێناسەدەکرێن. پەیوەندییە ئابوورییەکان پشت بە موڵکایەتی دەبەستێت: هەروەها چینێك دەستی بەسەر

---

1 Berld (1986), P. 9.

٢ گرنگییەکەی بەهۆی کاریگەریی فیکرییەوەیە بەسەر تیۆرەکانی دواترەوە سەبارەت بەچین هەروەها بەهۆی کاریگەریی سیاسییەوە بەسەر ئەو ئاراستە شۆڕشگێڕییانەی لەلایەن هێندێك کۆمەڵگاوە گیرایەبەر کە ئیلهامیان لە نووسنەکانی بەگشتی وەرگرت، هەروەها تیۆرە تەواونەکراوەکەی سەبارەت بەچین بەتایبەتی، بەوەش، شرۆڤەکاریی مارکس بەرجەستەی راهێنانێك دەکات لەکۆمەڵناسی تیۆرییو پراکتیکیدا. Edgell (1993), p. 2.

هۆكارەكــانی بەرهەمهێنانــدا گرتــووە- هــەروەك بۆرجوازییــەكان كردوویانــە- یــان ئەوانـەی بێبەشـن لـەهۆكارەكانی بەرهـەمهێنان- ئـەوەی لـەلای پرۆلیتاریـا بەرچـاوە. مــاركس بــڕوای وایــە كــە هــەژموونی ئــابووری‌و هــەژموونی سیاســی بەشــێوەیەكی چەســپاو پەیوەســتە بــەوەی تاچــەند كــۆنترۆڵكردنی ئامرازەكــانی بەرهــەمهێنان كۆنترۆڵكردنی سیاسـی لێدەكەوێتـەوە. بـەوەش دابەشـبوونی چینەكان بەرجەسـتەی دابەشـبوونی هەریەكـە لـە سـامان‌و دەسـەڵات دەكـات، ئـەوەی كـە لەپەیوەندییـەكانی نێوان (ئیستغلالكەرو ئیستیغلالكراو) و (زۆردارو زۆرلێكـراو) دا بەرجەسـتەدەبێت ( زاراوی تایبەت‌و چەندبارەوەبوون لە مانیفێستۆی كۆمۆنیزمـدا ) ئـەم هاوكێشـەیەی خوارەوە ئەم پەیوەندییە ڕووندەكاتەوە:

"بۆرجــوازی، لەهــەر كوێیــەك باڵادەســت بێــت، كۆتــایی بــە تێكــڕای پەیوەندییــە دەرەبەگایەتییــە باوكسـالارییە ئایدیالییــەكان دەهێنێـت. بەشـێوەیەكی بێڕەحمانــە پێكهاتەی ئەو پەیوەندییە دەرەبەگایەتییانە هەڵدەتەكێنێت كە پیاو بـە "باڵادەستە سروشــتییەكەیەوە" دەبەســتێتەوە، و جێیــدەهێڵێت دەیكاتــە پیاوێــك كــە هــیچ پەیوەسـتێك لـەنێوان پیـاو و پیـاوێكی دیكـە نییـە جگـە لـە بەرژەوەندیـە خودییـە ڕووتەكان..."[3]

ئـەم تیـۆرە رادیكاڵـە بەشـێوەیەك لەلایـەن مـاكس وێبـەرەوە تازەكراوەتـەوە، ئـەوەی پەرەی بە تیۆرەكەی ماركس داوە سەبارەت بە چین بۆ ئەوەی كە دواتر بەچەمكی " social stratification / چـینبەندی كۆمەڵایـەتی"نـاوبراوە. ئەمـەش مانـای دابەشــبوونی كۆمەڵگایــە بــۆ چــەندین چــین، كــە بەشــێوازێكی پلەبەنــدی خۆیــان ڕێكخسـتووە. بەپێچـەوانەی ماركسـەوە، كـە جـەختی لـەململانێی نێـوان چـینەكان‌و هەروەها جەمسەرگیرییان كردۆتەوە، دیدی وێبـەر بونیـادی چـین لـەڕووی سروشـتی گرفتاوی و خواستی بۆ پەرتەوازەبوون بەرجەستەدەكات. [٤]

3 Marx and Engels (1888/1998), P. 5.

٤ گیـدنز تێروانینێكـی چـڕوپڕو پڕزانیـاریی سـەبارەت بـە تیۆرەكـانی وێبـەر لەمـەڕ پلەبەنـدی كۆمەڵایـەتی فەراهەمدەكات لەكتیبەكەی:

گیـدینز زیـاتری لەسـەر ئەمـە هەڵچـنیوەو بونیـادێکی لـە سـێ چـینی سـەرەکیی خسـتۆتەروو:" چـینی بـاڵای سـاماندار، چـینی ناوەنـد کـە بـە زانیـاریو شـارەزایی دەناسـرێن، هـەروەها چـینی کرێکـار، بـەهێزی کـاری خۆیـەوە".[5] هەرچـەندە، ئـەم چـینانە دەشـێت لەنێوخۆیـدا دابەشـبێت، ژمـارەی ئـەو توێژانـەی کـە دەگونجێـت لەمانـەوە سـەرهەڵدەدەن وادەکـات مۆدێلەکـەی گیـدینز کـەمتر روون بێـت وەك لـە یەکەم سەرنجدا دەدردەکەوێت.

لە چوارچێوەیەکی بەرفراوانتر، مارکس باوەڕی وایە کە پەیوەندییە چینایەتییەکان لەلایەن نەتەوەو سنوورە نەتەوەییەکانەوە کاریگەرییان تێناکرێت، هـەروەها ئەمانـە هەموو بایەخێکیان لەگـەڵ گەشـەکردنی بـەردەوامی سـەرمایەدارییدا کەمدەبێتـەوە. دەوڵەتیش لەلای مارکس بەشێوەیەکە:

" بەهۆی هەردوو رۆڵە ناوەکییو دەرەکییەکەیەوە سەبارەت بـە زاڵبـوونی " inter-class /نێوچـــینایەتی"و ململانێـــی نێوچـــینایەتیەوە شـــکڵدەگرێت. لـــەرووی نێوخۆییـەوە...لەبنەڕەتـدا دەزگاگەلێکـە زامـنی هـەژموونی چـینە فـەرمانڕەواکانو هاوبەســـتەگی کۆمـــەڵگا دابەشـــبووە-چـــینایەتییەکان دەکـــات...لـــەرووی دەرەکیشـەوە...دەزگاگـەلێکی ململانێـی نێـوان چـینە فـەرمانڕەوا دیـارییکراوە هەرێمییەکانە.[6]

ئینتەرناسیۆنالیسـتە مارکسـییەکان وادەبیـنین کـە چـینی کرێکـار، یـان پرۆلیتاریـا، لەبنەڕەتـــدا چـــینێکی ئینتەرناســـیونالە، کـــە بیرۆکـــەی نەتـــەوەو نەتەوایـــەتی رەتکردۆتـەوەو وێـڕای ئەوانـەی تایبـەت بەچـینایەتیو سـەرمایەداریش.[7] هۆشـی چینایەتی پێکەوە لەگەڵ نەتەوایەتییدا پشکووتون، هەرچـەندە، بەرێگـەی جیـاوازو لەسـایەی هەلومەرجگـەلێکی نەتـەوەییو نێونەتەوەییـدا، ئـەو دوو چـەمکە پێکـەوە پەیوەسـتو پەیوەندیـدارن. نەتەوایـەتی، هـەروەك بریـولی جەختیکردۆتـەوە، "

---

The Class Structure of the Advanced Societies, (1973)

5 5.Giddens (1973), pp. 107-112.

6 Cochrane and Anderson (1986), pp. 211-212.

7 Outlined in The Communist Manifesto (1888/1998).

سروشـتی دەسـەڵاتی شـەرعی پێناسـەدەکاتەوە"[8] ئەمـەش ئەوەیەکـە نەتەوایـەتی زۆربەیجار هێزێکە کە لەرێگەی گۆڕینـەوە بـژاردەی سیاسـی نـوێ دێنێتـە ناوەنـدی دەسـەڵاتو لـە پرۆسـەکەدا شـوێنی چـینە فـەرمانڕەوا دامـەزرراوەکان دەگرێتـەوە. "nationalist politics / سیاسـەتی نەتـەوەیی" دەتوانێـت لەهێنـدێك رەوشـدا ئاماژەبێـت بـۆ "سیاسـەتی قـەیران".[9] هـەروەها ئـەم سیاسـەتی قەیرانـە دەتوانێـت وابکـات چـینە فـەرمانڕەواکان نەتەوایـەتی وەك ئایـدیۆلۆجیاو وەك جووڵانـەوە رەتبکاتـەوە، نارەزایەتییـەکی مـەزن دێنێتـەئارا کـە ئاسـان نییـە بـۆ لایـەنگرانی جووڵانەوە نەتەوەییەکە بەسەریدا زاڵ بن.

پەرەسـەندن لەسـەدەی نۆزدەیـەمی ئـەوروپادا پێشـانیدا کـە ململانێـی چـینایەتی جەنگێك بوو لەسەر ئاستی نەتەوەیی نەك نێونەتەوەیی، کە خۆی لەخۆیدا دەوڵەت-نەتـەوەی لـەڕووی سیاسـیو کـەلتووریو ئابووریـەوە وەك یەکەیـەکی خـاوەن سـەروەریی پتـەوکرد. لەمیانـەی ئـەم پرۆسـەیەدا، چـینەکان لـەنێو سـنوورەکانی دەوڵەتـدا یـەکیانگرتو لەزەوییـە بیانییـەکان لـە هاوچینەکانیان جیابوونـەوە. ئـەم پەرەسەندنە تەواو ئەوە نەبوو کە مارکس پێشبینیدەکرد، ئەوەی کـە دەوڵـە-نەتـەوە زیـاتر بـەهێزبوو تـاکو ئـەوەی نـەمێنێت-ئـەو پەرەسـەندنەی کـە رەنگدانـەوەی مشتومڕەکانی پێشووە لەبارەی بابەتەکەوە.

## ٣ . ١ . ٢ فۆرمەڵەبوونی چینەکان لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا

سروشتی پەیوەندیگەلی چینەکان لەنێو نەتەوەکانو هەرێمەکاندا جیاوازە، هـەروەها بۆئەوەی پێشینەیەك فەراهەمبکرێت کە شـرۆڤەکاری زێـدەتری لەسـەر بنیادبنرێـت دەبێـت پەرەسـەندنەکانی پەیوەندییـە چـینایەتییەکان لەسـەر ئاسـتی هـەرێمی بەکورتی دیارییبکرێت، ئـەوەی هەسـتی پێکـراوە کـە لـەرووی لۆکاڵیشـەوە کاریگـەری هەبێت.

8 Breuilly (1993), p. 25.
9 Ibid.

**چینە نەریتییەکان لەهزری مارکسیدا بریتیە لە بۆرجواو پرۆلیتار کە بەروونی لەکۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نەپشکوتووە.[10] کۆمەڵگای دەرەبەگی، ماوەیەکی زۆر لەبەشێکی ناوچەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست باڵادەستبووەو بە رێکخستنە پلەبەندییە تۆکمەکەی ناسراوە، کە بەپێی دابەشبوونی چینەکانی پێناسەدەکرێن. لەم چوارچێوەیەدا، خولیای پێکەوەگرێدانی سیاسی لە پێکەوەگرێدانی ئابووری بەهێزترە، لەکاتێکدا "چینەکان وەك ئەکتەرێکی کۆمەڵایەتی ئابووری بەرفراوان سەرهەڵنادەن."[11] کۆمەڵگای چینایەتی دەرەبەگایەتی لەئەوروپا شوێنی خۆی بۆ کۆمەڵگای چینایەتی سەرمایەداری جێهێشت، بەڵام رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دوای ئەو مۆدێلە نەکەوت.• نە پرادیگما مارکسییەکانو نە وێبەرییەکان بەتەواوی بۆ**

---

10 Ayubi (1995), for instance, concerns himself with the 'missing bourgeoisie': see pp. 158-162.
11 Vogler (1985), p. 181.

• لەڕاستیدا چینایەتی لەم بەشەی جیهاندا لەسەر بنەمای سیستمی ئابووری راوەستاوە کە شێوازێکی بەرهەمهێنانی نیمچە دەرەبەگایەتیو نیمچە سەرمایەداریو نیمچە بۆرجوازییە کە پێش سەرمایەداریو سەرمایەداری، خۆکەفایی رێژەییو وابەستەیی بەسیستمی ئابووری جیهانی، لەنێوان موڵکایەتی تایبەتو موڵکایەتی دەوڵەتو موڵکایەتی بنەماڵە حوکمڕانەکان، لەنێوان شێوازی بەرهەمهێنانی نەریتیو نوێ پێکەوە کۆەکاتەوە، هەربۆیە سیستمێکی فرە نەزمی راگوزەرە. لەم سۆنگەیەشەوە، چەند بنەمایەکی سەرەکی بۆ جیاکاری چینایەتی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەیە کە دەکرێت لە موڵکایەتی زەوی، موڵکایەتی سەرمایەو هەروەها بنەچەی خێزانیو پۆستدا کۆبکرێتەوە. موڵکایەتی زەوی بەتێپەڕینی کات لەموڵکایەتی گشتیو دەوڵەتەوە بەرەو موڵکایەتی تایبەتو دەرگەوتنی دەرەبەگایەتی پەرەیسەندووە، موڵکایەتی سەرمایەداریش بەتایبەتی لەکایەی بازرگانیو دارایی رۆڵی لەدەرکەوتنی چینی بۆرجوای کۆن و نوێدا لەشارەکاندا بینیوەو لەگەڵ بەستنەوە بەئابووری سەمایەداری جیهانییەوە گەشەیکردووە. بنەچەی خێزانو میراتی خێزانە خانەدانەکانو دەستڕۆیوەکان بۆ نەوەکانیان رۆڵی خۆی لەدیاریکردنی ریالیستی چینایەتیدا دەبینی، هەروەها سەربەخۆی پۆستیش گرنگی خۆی هەیە لەوبارەیەوە کە کەسێك بۆ خۆی کاردەکات یان وابەستەی کەسانێکی دیکەیە، ئایا خزمەت دەکات یان خزمەت دەکرێت؟ جگە لەو بنەمایانە ئاستی فەرهەنگیو داهاتو وەزیفەش دەتوانن فاکتەری یارمەتیدەربن. هەربۆیە لەسۆنکەی ئەو بنەمایانەوە دەتوانین ریزبەندی چینە کۆمەڵایەتییەکان لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست دابەشبکەین بۆ یەکەم: خانەدانە نەریتیەکان، گەورە موڵکدارەکانی زەوی، گەورە سەرمایەدارەکانو شێخو سەرۆك خێڵەکانو دەوڵەمەندە تازەپیاکەوتووەکان. دووەم: بۆرجوازیو

شرۆڤەكاری پێكهاتەی كۆمەڵگاكانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گونجاون، سروشتی بزواوو ناخۆگری ستراكچەری چینەكان ئاسانكاری بۆ جێبەجێكردنی ئەو مۆدێلە رۆژئاواییانە بەسەر ئەم هەرێمەدا ناكات.

موڵكدارەكان لەگەڵ بازرگانەكاندا تەنیا چینگەلی رەسەنی ئەم هەرێمەن، بەڵام ریشەیان تەنیا دەتوانرێت بگەڕێنرێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم. ئەو ریفۆرمە بەرفراوانەی زەوی كەلەلایەن حكومەتە هەرێمییەكانەوە ئەنجامدرا، هەروەك ئەوەی عێراق لەساڵی ١٩٥٨، موڵكدارە نەریتییەكانی لەزەویو موڵكەكانیان داماڵی، بەڵام ئەندامەكانیان لەسەر شانۆی سیاسی ئاوانەبوون، لەكاتێكدا ئەوانە روویان لە كەرتی بازرگانی یان پیشەسازی كرد. ریچاردو واتەربێری سێ دەستە ئەكتەریان ناساندووە كە پاش ریفۆرمی زەوی سەریانهەڵداوە، ئەوانەش بریتیبوون لە جووتیارە سەرمایەدارە "نوێ"كان، موڵكدارە ناوەنجییەكان، بەشێكی مەزن لە وردەموڵكدارەكان. دەستەی یەكەم زۆربەیجار لەلایەن دانیشتووە شارنشینەكانەوە نوێنەرایەتییان دەكرا، كە بەرژەوەندییە لادێییەكانیان لەسروشتدا بازرگانی بووە، توێژێكی دیكەی لادێیی دەستی بەسەر موڵكە بچووكەكاندا گرتبوو هەروەها بەشێوەیەكی بنەڕەتی بۆ ژیانی رۆژانەی خێزانی بەرهەمیدەهێنا، كەمانای كەمتر فرەجۆری بەرژەوەندییە ئابوورییەكانە. دوای گروپ بریتیبوون لەوانەی بۆ دابینكردنی ژیانی رۆژانەی خۆیان تێدەكۆشان، ئەم جووتیارانە لە جووتیارانی بێ زەوی و كرێكارانی لادێ بەوە جیادەكرانەوە كە خاوەنی زەوی بوون، لەبەرئەوەش پێگەی كۆمەڵایەتییان بەلای بەرزتردا دەڕۆیی.[12]

مرۆ لەم مشتومڕەوە دەتوانێت بگاتە ئەو ئەنجامگیرییەی كە ئەو بۆرجوا وەبەرهێنەی لەهزری نەریتیی ماركسییدا هاتووە لەكۆمەڵگاكانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەرچاوناكەوێت. نووسەرێكی دیكە دە دانی بەلاوازیی جەمسەرگریی

---

چینی ناوەڕاست(وردە بۆرجوازی كۆنو وردە بۆرجوازی نوێ)و ئەوانی دیكە. سێیەم: زەحمەتكێشان (جووتیارانو كرێكاران).

12 Richards and Waterbury (1990), pp. 403-404.

بۆرجوازیو پرۆلیتاریادا نـاوه، ئەیوبیـە، کـە ئاماژەی بـە نـەبوونی ئـەم " polar classes/ چینە جەمسەرگیرەکان" داوەو دانی بە گرنگی قەوارەگەلە کۆمەڵایەتییە نێوەنجییەکان داوە.[١٣]

ریچاردو واتەربێری ئاماژەیان بە وردە بۆرجوا داوە وەك گروپێکی کۆمەڵایـەتی کـە هێزێکی ئابووریو سیاسی پاڵنەرە. ئـەم قـەوارە کۆمەڵایەتییـە پێکدێت لـە "خـاوەن سامانەکان کـەکاری ئـازاد دەکـەنو لـەبواری، بازرگـانی، پیشـەگەری، خزمـەتگوزاری، کشـتوکاڵدا وەبـەرهێنان دەکـەنو بەدەگمـەن هێـزی کـار بـەکرێ دەگـرن." [١٤] لـەوەش زیـاتر ئەوانـە دەناسـرێنەوە بـە" وردە بازرگـانیو بەشـی پیشـەگەرییو ئاسـتەکانی خـوارەوەی چـینی نـوێی ناوەڕاسـت، هـەروەها ئەوانـەی لەلایـەن ئـەو دوو بەشـەوە راکێشراون بەڵام بەشێوەیەکی دیاریکراو لەریشەیەکی لادێیین."[١٥] هـەروەها ئـەو دوو کۆڵەرە جەخت لەوە دەکەنەوە کە وردە بۆرجوا دوورە لە دینامیزمی ستاتیك.

ئەگـەر چـینێك هـەبێت، نابێـت ئـارەزووی ئـەوە بکـات وەك خـۆی بمێنێتـەوە بـەڵکو خولیای هێندێك پێگەی دیکە بکـات...نابێـت بـەدوای ئـەوەدا بگـەڕێت کـەوەك چـین خـۆی بەرهەمبێنێتـەوە. رۆڵـی ئـەو...منداڵـەکانی خـۆی بـۆ بنێرێتـە خوێنـدنی باڵا...وردە بۆرجوا بەتەنیا هەر هەوڵی ئەوەنادات بەبەردەوامی کاژی خۆی فرێـدات، بەڵکو هەروەها لەرووی ئایدیۆلۆجیشەوە مایەی گۆڕانە، بەردەوامییەکەی بریتیەلەو مەیلەی بۆ "activisim / چالاکیگەرایی."[١٦]

بەوەش دەتوانرێت ئـەنجامگیریی بکرێـت کـە وردە بۆرجـوا لەرۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا دەکرێت بەدەگمەن وەك چین ببینرێـت، یـان ئەکتـەرێکی بـەهێزی بـزۆز بێـت. وەك هێزێکی سیاسی، وردە بۆرجوا بەوە دەناسرێت کە هێزێکی بایەخـدارە- نموونەیـەکی روون بۆ ئەوە بریتیە لە"بازاڕ" لـەئێران کـە بۆماوەیـەکی درێـژ ئەکتـەرێکی گرنگـی سەر شانۆی سیاسی نێوخۆیی بووە.

13 Ayubi (1995), pp. 177-178.
14 Richards and Waterbury (1990), p. 410
15 Ibid. p. 413.
16 Ibid. pp. 413-414.

### ٣ . ١ . ٣  كۆمەڵگای دابەشبووی چینایەتی کوردیی

هـــەروەك لەســـەرەوە پێشـــاندراوە، شـــرۆڤەکارییە نەریتییـــەکانی چـــینایەتی وادەرناکەوێت کە گونجاوترین ئامرازبێت بۆ لێکدانـەوەی ئـەو بونیـادە بنەڕەتییـەی ڕێکخستنی کۆمەڵگای کوردیی پاڵی پێوەداوە، بەوەش دەبێت تیۆرێك بناسێنرێت کـە ئەوەی گرتبێتەخۆ بەسەر کوردستاندا جێبەجێبکرێت.

دەتوانرێت کۆمەڵگای کوردیی هاوشێوەی ئەو چەمکە لەقەڵەمبدرێت کە ئـەنتۆنی گیدینز بە " class-divided / دابەشبوو لەرووی چینایەتییەوە" ناوی بردووە، ( لەبەرامبەر ئەو چینە کۆمەڵایەتییەیە کە سەرمایەداری هێناوێتیەئارا) ئەم چەمکە بایەخ بە شارستانیەتە ناسەرمایەدارییەکان دەدات و ئەو کۆمەڵگایانە وەسفدەکات کە بەدرێـــژایی هێڵگـــەلی چـــین دابەشـــبوون و چ بونیـــادو ڕێکخســـتنێك بـــەگوێرەی دابەشبوونی چینایەتی پێشان نادەن.[١٧] بەوەش، تەنانەت گەر ئەوەش پەسەند بکەین کە چینەکان ڕەگەزگەلێکی هەبوون لەکۆمەڵگای کوردییدا، ئەوەی جێگەی مشتومڕە کە دانیشتووانی کورد هۆشی چینایەتیان هەبووبێت.[١٨] دەشێت خودی خەڵکەکە سەبارەت بەو دابەشبوونە کۆمەڵایەتییە بەئاگا نەبن کە تیۆرسینەکان دەیڵێن بۆ دابەشبوونی کۆمەڵگاکەیان یان دەشێت هەست بەوەنەکەن کە سەربە پلەو پێگەیەکی کۆمەڵایەتی تایبەتن. بەوتەیەکی دیکە، " لەوانەیە لەئاکاری ئەندامانی چینێکدا هۆشی چینایەتی ڕەنگنەداتەوە، بەڵام وێڕای ئەوە ئاکاریان توانیویەتی چینبەندی بێت."[١٩] ئەم واقیعە کوردییە دەتوانێت بەباشی ببێتە بابەتێك بۆ گۆڕین لە ئایندەدا، پشت بەئاراستەی سیاسەت دەبەستێت، بەڵام هەروەها گەشەکردنە ئابوورییەکانیش.تەنانەت دەشێت ئەم هەستە بەهێزتربێت ئەگەر هەرێمە کوردییەکە سەربەخۆی بەدەستبێنێت، یان بەپێچەوانەوە سەرکوتبکرێت ئەگەر هەلومەرجە هەنوکەییەکە درێژبێتەوە. لەو کەیسەی پێشتردا، مرۆ دەتوانێت ئاماژە

17 For a discussion of this, see Giddens (1981a), pp. 105-108.
18 See Giddens (1982), pp. 163-16.
19 Batatu (1978), p. 7.

بەو فاکتە بکات کەلەلایەن سەمیر ئەمینەوە دانیپێدانراوە، بەدیاریکراوی، پێویستە بونیادێکی چەسپاوی چینێکی کۆمەڵایەتی لەنێو دەوڵەتدا دابمەزرێت، ئەوە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی مانای چوونە ناوی راستەوخۆی ئەو کۆمەڵگایەیە نییە بۆ قۆناغی سەرمایەداری ناوەندی (تەواو) یان لێواری (زاڵ).[٢٠] پێناچێت ئەم گەشەکردنە لەکوردستاندا بەزوویی بێتەدی، دەرکەوتنی کۆمەڵگایەکی کوردیی بونیاد داڕێژراو، لەوانەیە لەپەروارێزی کۆمەڵگایەکی سەرمایەداریی جیهانیی پێکەوەگرێدراو بۆماوەیەك بمێنێتەوە.

هێزی سیستمێکی باش گەشەسەندووی چینایەتی وەلانێ، کەلێنی کۆمەڵایەتی لەناوچەکانی کوردستانی عێراقدا هەیە، ئەم کەلێنە لەم ساڵانەی دواییدا فراوانبووەو ئەمێستاش لەشێوەی گروپگەلێکی پێکهاتوودا خۆی دەرخستووە، هەروەها لەنێوان چینە فەرمانڕەواکان (بەتایبەت پارتی و یەکێتی)و دانیشتووانە گشتییەکە. وێڕای ئەم کەلێنانە، دابەشبوونی کۆمەڵایەتی بەرچاو پەرەیسەندووە لەنێوان پەناهێندە نێوخۆییەکان، ئەو کوردانەی لەبەغداو ناوچە کۆنترۆڵکراوەکانی کەرکوك و خانەقین و موسڵ راگوێزرابوون،[٢١] لەگەڵ ئەو دانیشتووانەی لەهەرێمە ئۆتۆنۆکەدا دەژین.

براس تێبینیکردووە کە دەشێت چینێکی ئابووری زاڵ وەك رێگایەك بۆ پتەوکردنی هێز دەسەڵاتی خۆی بەرژەوەندی خۆی لەوەدا ببینێتەوە هاوکاریی دەسەڵاتێکی بێگانەبکات.[٢٢] ئەمەش بۆتە بابەتێکی چەندبارەوەبوو لەپەیوەندییە کوردییەکانی

---

20 Amin (1980), p. 46.

٢١ ناوچەکانی بەنەوت دەوڵەمەندی کەرکوك تووشی هەڵمەتێکی بەرفراوانی راگواستن بۆتەوە لەلایەن بەعسییەکانەوە، ئامانجی گۆڕینی دانیشتووانی ناوچەکەیە لەکوردەوە بۆ عەرەب کە بۆماوەیەکی درێژە وەك بەشێك لەکوردستان لەقەڵەمدراوە. هەزاران کوردی کەرکوکی لەشوێنی خۆیان هەڵکەنران و رەوانەی ناوچە ئۆتۆنۆمەکە کراون، بەتایبەتی ناوچەی سلێمانی، کەلەوێ دەسەڵاتدارانی کوردیی بەو بودجە کەمەی هەیانە ناچارن بچنەژێرباری ئەم شەپۆلە بەرفراوانەی پەنابەران. بۆزیاتر سەبارەت بەم پاکتاوکردنی رەگەزییە بڕوانە:
Talabany (1999).

22 22.Brass (1991), p. 26

عێراقدا[٢٣] لەگەڵ سەرکردە کوردە خاوەن دەسەڵاتەکان کە پرسی کوردیان بە عەرەبی عێـراق گۆڕیوەتـەوە لەبـەر ئـەوەی مـافێکی تایبـەتیان پێشکەشـبکرێت. ئـەم بەرژەوەندیخوازییـەی خـودی چـینی فـەرمانڕەوا، یـان زیـاتر بڵـێین، چـەند تاکێـك، بەئاشـکرا بۆتـە هۆکـاری لاوازی جووڵانـەوە نەتەوەییەکـە، بـەڵام دووبـارە، ئەمـە بەڵگەیەك نییە بۆ دابەشبوونی ڕێکخراوی دانیشتووانەکە بۆ چینگەلێك.

جەمسەرگیریی چینە جیاوازەکان لەنێو نەتەوەکانو کەمبوونەوەی جیـاوازیی نێـوان نەتـەوەکان هـەروەك مانیفێسـتۆی کۆمۆنیسـتەکەی مـارکس مشـتومڕی بـۆ کـردووە، لەکۆمەڵگای کوردییدا، یان لەپەیوەندییەکانی کـوردیی-عەرەبییـدا ڕەنگینەداوەتـەوە. لەسەر ئاستێکی بەرفرەتر، ململانێی چینایەتی لەسـەر ئاسـتی نێودەوڵـەتی هێنـدەی ئاسـتە نەتەوەییەکـە بەکارنـەبراوە، ئـەوەی پێشـانیدەدات کـە کۆمـەڵگای کـوردیی بەتێپـەڕینی کـات بەئاراسـتەیەکی چـینایەتیدا دەڕواتو هـەر ململانێیـەکی پەیوەندیـدار بەچـینەکانەوە لەوانـە نییـە جـەماوەری هەرێمەکـە کەمەندکێشکات، لەرووی نێودەوڵەتیشەوە هەر وازی لێبێنە. دەوڵەت-نەتەوە لەوانەیە زیاتر هێـز لـەم گەشەکردنەوە بەدەستبێنێتو فراوانبێت لەبەرامبەر کەمبوونەوەی لەرووی گرنگیو کاریگەرییـەوە. ئەمـە لەلایـەن کـارۆلاین ڤۆگلـەرەوە دانیپێـدانراوە کاتێـك دەڵێـت:" ململانێـی چـینایەتی پەیوەسـتە بـە بـەهێزبوونو فراوانبـوونی دەوڵـەت-نەتـەوەو جەمسەرگیری جیاوازییەکانی نێوان نەتەوەکان." [٢٤]

دەبێ هەرێمە ئۆتۆنۆمە کوردییەکە لەباکووری عێراق گەشـەبکات بـەرەو دەوڵـەتێکی

---

٢٣ لێکچوونێك لەگەڵ تورکیادا هەیە، لـەوێ هەرێمگـەلێکی کـوردیی دیـارییکراو پێکەوەبەسـتی ئابوورییـان بـە چوارچـێوەی نیشـتیمانییەوە ئـەزموونکردووە لەرێگـەی کـاری هـەرەوەزی (یـان ملکەچـبوون، بەپشتبەسـتن بەوێناکردنی یەکێك) کەسایەتییە کوردییە دەسەڵاتدارەکانەوە، ئەمە باسکراوە لەلایەن:

Kendal (1993),
'Kurdistan in Turkey' in Gerard Chaliand (ed.) A People without a country. The Kurds and Kurdistan, London: Zed, pp. 38-94.

24 Vogler (1985), P. 3.

سەربەخۆ، بەژەوەندی چینایەتی، بەهەموو ئەگەرەکانییەوە، ملکەچی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان دەمێنێتەوە، لەکاتێکدا بەژەوەندی گشتی لە بەهێزکردنی ئابووری نەتەوەییدا لەوانەیە پێش هەر سیماکانی دیکەی بەرژەوەندییەکانی چین بکەوێت. هەروەها پشکووتنی چینە کۆمەڵایەتییە بەرجەستەکان رەنگدانەوەی دەبێت لەسەر" ئاستی ئەو پشت بەیەکتربەستنەی کە بەهۆی چالاکییە ئابوورییەکانەوە دێتەئارا، ئەوەی (مەرج نییە زۆر لەرووی پێویستییەوە) هاوجووت دەبێت لەگەڵ دەوڵەتاندا وەك قەوارەگەلێکی سیاسیی."[25] ئەوە دروستە کە سەرەوەری نەتەوەیی هانی دەرکەوتنی ململانێی چینایەتی دەدات، بەڵام بوونی بەردەوامی دەوڵەت-نەتەوە، لەسەر ئەو پەیوەندییە چینایەتییانە وەستاوە کە رێکخراون یان لەنێو سنوورە نەتەوەییەکەدا هەن. دەشێت هەر یەك لەپەیوەندییە ئابووریو کەلتوورییەکان بەدرێژایی سنوورە سیاسییەکان بکشێن، هەربۆیە هەر دەرفەتگەلێك بۆ گەشەکردنو پتەوبوونی بونیادێکی چینایەتی هاوبەستە لەکوردستانێکی سەربەخۆ بۆ ناوچە کوردییەکەی باکووری عێراق دەبێت بەلاواز بدرێتە قەڵەم.

پێدەچێت نموونەکانی چینبەندی کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵگای کوردستاندا باشتر لەبەر تیشکی شرۆڤەکارییە هەرێمییەکانو هەروەها لێکدانەوەی لەرووی پەیوەندییەکانی دەسەڵاتەوە تێبگەین. هەروەك ئەیوبی تێبینیکردووە:" زۆرجار سیماکانی چینبەندییە ئاسۆییەکان (وەك چین، بژاردە..هتد)... لەگەڵ سیماگەلە شاقوڵییە جیاوازەکاندا (خێڵ، ئاینزا، ئیتنی) پێکدادەچن."[26] جیاوازییە شاقوڵییەکان بەتایبەت خێڵ لەم چوارچێوەیەی رێکخستنی کۆمەڵایەتی کوردییدا زۆر گرنگە، هەروەها لەم هۆیەوەیە کە بایەخێکی فرە بە خێڵەگەرایی دراوە وەك هێزێکی بزۆز لە کۆمەڵگای کوردییدا.

25 .Ibid.
26 Ayubi (1995), p. 175.

## ٣ . ١ . ٤ پوختە

وەك بنەمایــەکی گشــتی، پێدەچــێت ململانێــی نێــوان نەتــەوەکان لــەو ململانێــی چینایەتییە نێویـان لەپێشـتربێت،[٢٧] کوردسـتانیش لـەوە بەدەرنییـە. هەڵگیرسـاندنی ململانێیەکی چینایەتی شۆڕشگێڕانە، هەروەك ئەوەی مارکس وێنایکردووە، لەنێوان هێزی کاری پەراوێزخراوو بێبەش کە ژمارەیەکی گەورە پێکدێنن لەگەڵ گروپێکی بچووك لـەخاوەنکارە دەوڵەمەنـدەکان لـە کوردسـتانی عێـراق، پێناچـێت رووبـدات. بەهەمانشێوە، هـزرە لێنینییەکـەش سـەبارەت بـە کۆمـەڵگا بـۆ چینـەکان کـە تێیـدا نەتەوایـەتی دیارنامێنێـت بـەڵام هۆشـی ئیتنیکـی دەپارێزرێـت، بەتـەواوی لەگـەڵ هەلومەرجە کوردییەکەدا نایەتەوە.

کۆمــەڵگای کــوردیی یــەکرەنگ نییــە، بــەڵکو لــەڕووی کۆمەڵایەتییــەوە پلەبەنــدە. هەرچەندە، شیمانەکردنی ئـەوەی، کـە ئـەم پلەبەندییـە کۆمەڵایەتییـە، بەڵگەیـە بـۆ دابەشـبوونێکی ئاشـکرای چـینایەتی، بڕیـارێکی پێشـوەختو نابەکەمـە. دیاسـپۆرای مەزنی کوردیی لـەو بڕوایـەدا نییـە کـە ئـەم وێنەیـەیان بەهـەر شـێوازێکی بنـەڕەتی گۆڕیبێت. [٢٨]

دابەشــبوونی چــینایەتی لــەنێو ئــەو نەتەوانــەی خــەبات دەکــەن لەســەر ئاســتی نێونەتــەوەی خۆیــان دابمــەزرێنن (یــاخود تەنانــەت ئاســتی هــەرێمیش) بەئاشـکرا بایــەخی کــەمترە لــەجیاوازی نێــوان نەتــەوەکان. لــەبری ئــەوە، بەرژەوەندییــە نەتەوەییەکان گریمانەی بایـەخێکی زێـدەتری هەیـەو فاکتـەرێکی سـەرەکییە لەهـەر ململانێیەکی ئایندەیی چینایەتیدا. لەم دیدگایـەوە، وادەردەکـەوێت وەك ئـەوەی کـە خەباتی گشـتی نەتـەوەیی کـوردان باڵادەسـتی بەسـەر ململانێـی چینایەتیدا هـەبێت تەنانەت پاش پەرەسەندنەکانی سـەرەتای ساڵانی ١٩٩٠کـانیش. بـەڵام ئایـا پێدەچێت

---

٢٧ سەرکوتی هەر نیشانەیەکی ململانێی چینایەتی لەجووڵانەوەی فەلەستینییدا لەم چوارچێوەیەدا روونەو بەباشیش بەکەیسە کوردییەکەوە پەیوەستە.

٢٨ ئەنجامگیریکراوە لەرێگەی راوێژی بنەڕەتی لەسەراسەری کۆمەڵگەی چالاکی سیاسی تاراوگە لە سوید.

ئـەو کەلێنـە کۆمەڵایەتییـەی لـە دەیـەی پێشـوودا سـەریهەڵداوە خێڵـەکانو بونیـادی خێڵەکان سنوورداربکات؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە کارکردنی سیستمی خێڵایەتی شرۆڤەبکەین.

## ٢.٣ خێڵ

سیاسەتی کوردیی بۆماوەیەکی درێژخایەن بەو سادەییە پێناسەکراوە کە سروشـتێکی دەسەڵاتگەرایی خێڵەکیی بووە، هەروەها ئەو باوەڕەی کە چەند سەرۆکێکی خێڵەکیی بەهێزی خاوەن نفوز بەتەواوی بەسەر دیمەنی سیاسەتی نێوخۆییـدا زاڵبـوون زیـاتر لەهــەرکات مەســەلەیەکی چەســپاوە. ئەمــەش ڕەنگدانــەوەی دیــدێکی نــەریتی خێڵگەراییـە[٢٩] کـە لـەڕووی جیۆگرافییـەوە لێـی تێگەیشـتوون، بـۆ نموونـە، بیرۆکـەی ئایدیالی سەرکردەیەکی نەریتی خێڵەکی، کە بەسـەر ترۆپکی شـاخێکەوە یـان لـەنێو دۆڵێــداوە ڕاوەســتاوە، وەك ڕێبــەرێك لەهــەموو هەلومــەرجێکی چـاوەڕوانکراودا ئاراسـتەی پیـاوانی خێڵەکـەی دەکـات، وێـڕای سـادەکردنەوەیەکی زۆری بابەتەکـە، پێدەچـێت ئـەم تێگەیشـتنە وەك بنەمایـەك بەسـوودبێت بـۆ شـرۆڤەکردنی ئـەوەی کەچــۆن لــەماوەی رابــردوودا سیاســەتی کــوردیی بەڕێوەچــووە. هەرچــەندە، لەهەڵســەنگاندنێکی دیمەنــە سیاســییە بــزۆزە هەنوکەییەکــەو تایبەتمەندییــە ئەوڕۆییەکانی، ئەم تێڕوانینە پێویستە بەتەواوی پێداچوونەوەی بۆ بکرێت.

بــۆ تێگەیشــتن لــەئالۆزیی نفــوزی خێڵــەکی لەسیاســەتی کوردیــدا ، لەوانــە بەرچاوروونییەك بەسوودبێت لەوبارەیەوە کە چۆن خێڵەکان بەگشتی لەچوارچێوە سیاسییەکەدا هەڵدەسوڕێن. هەرچەندە، هەر شرۆڤەیەکی لەو جۆرە، تایبـەت دەبێـت بەوڵاتێکـەوە، بـەڵام هەسـت بـەوە دەکرێـت کـە پلەیـەکی دیـاریکراو لـە گشـتگیریی پێویســتە، گــەر بمانــەوێت خولیایــەك بــۆ ڕەگەزگــەلێکی بــەراوردکاری بــۆ

٢٩ هەروەها ئەم دیاردەیە بە تەنگەتیلەیی‌و ناوچەگەراییش ئاماژەی بۆ دەکرێت، بەڵام خێڵگـەرایی دەتوانرێت بەگونجاوترین زاراوە بزانرێت بۆ بەکارهێنان.

دەوڵەمەندکردنی تەواوی مشتومڕەکە بێتەدی. زۆربەی ئەو کۆڵینەوە بەراودکارییانە ئەو سەرنجانە لەخۆدەگرێت کە سەبارەت بەجیهانی عەرەبیی ئەنجامدراون، هەروەك هێندێکجار لەلایەن نووسەری جۆراوجۆریشەوە ئاماژەی بۆکراوە، دەشێت لەگەڵ ئەو کۆمەڵگایانەدا نەیەتەوە کە کەوتوونەتە کەناری هەرێمەکەوە، هەروەك خێڵە ئێرانییەکان، بەڵام گونجاوی‌و جێبەجێبوونی بەسەر کوردانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست، هەروەك پێشاندەدرێت، لەچەند نموونەیەکی دیارییکراودا روونە.

## ٣ . ٢ . ١ دیدێکی بەراوردکاری سەبارەت بەخێڵەگەرایی

دەتوانرێت چ وەك یەکەیەکی سیاسی‌و چ وەك کۆمەڵێکی کلتووریی لەچەمکی خێڵ تێبگەین.• بۆئەوەی خۆمان لەئالۆزییەکی وێناکاری بەدووربگرێن، لەم کۆڵینەوەیەدا

• رێکخراوە خێڵەکییەکان لەبنەڕەتدا لەسەراسەری کوردستاندا هاوشێوەن ، وێڕای ئەو جیاوازییەی لەبەکارهێنانی چەمکەکاندا هەیە ، بەگوێرەی بارس ، عەشیرەتی جاف بەسەر ژمارەیەك تیرەدا دابەش دەبێت کە هەریەك لەوانەش بەسەر ژمارەیەك هۆزدا دابەش دەبن . تیرە دەستەیەکی بنەڕەتیی رامیاریی و یەکەیەکی خاوەن زەوییە . وێڕای ئەوەی هۆزیش ، بەرجەستەی دەستەیەکی سەرەتایی نەوەکان دەکات کە تەواوی ئەندامەکانی خۆیان لە بەرەبابێکی هەمان باپیران دەزانن . بەوەش هەموو ئەندامەکانی دەستە خێڵەکییەکەی هۆزی کاکە حەمە بەرەی پیاوێکن کە ناوی کاکە حەمەیە . هەرچەند مەرج نیە هەموو بەرەبابێك ناوی هۆزی لێبنرێت. بارس گفتوگۆی لەسەر ئەو پرۆسەیە کردووە کە چۆن دەگونجێت لقێك لە تیرەیەك جیابێتەوە و دەستەیەکی نوێ پێکبهێنن . ئەو دەستە نوێیەش هەموویان دەبێت سەر بە بەرەبابێك بن . بەڵام جەخت لەسەر جیابوونەوە و سەربەخۆیی خۆی دەکاتەوە . هێندێك لەو دەستانە بۆ نموونە بنجووتن وەك لقێك لە تیرەی شێخ سمایلیی . وێڕای ئەوەی هێندێکیان خزمن وەك شاتریی . ئەمانە بەردەوامیی بە پەیوەندییەکانی خۆیان لەسەر بنەمای یەکسانیی و وەك یەکیی تەواو دەدەن . ئەو راستییەی کە جەخت لەوە دەکاتەوە یەك نەوەن و "کوڕی یەك باوکن". ئەم تیرانە چەشنە هاوکارییەکی رامیاریی دیارییکراویان لەنێواندا هەیە . کاتێك رووبەڕووی بڕیارێکی گرنگ وەك جەنگین دەبنەوە . سەرۆکی تیرە جۆربەجۆرەکان لە ئەنجومەنێکدا کۆدەبنەوە و بە گفتوگۆ و وتووێژ لەسەر بڕیارەکە رێکدەکەون ، بەڵام ئەنجومەنەکە وەك جەستەیەك خاوەن هێز و توانایەکی بەرجەستە نیە . خێڵ یەکەیەکە بەمەبەستی ئابووریی دادەمەزرێت ، تیرە مافی لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانی لە

**خـێڵ وەك ڕێکخراوێکـی سیاسـیی مامەڵـەی لەتـەك دەکرێـت، ئـەوەی لەگـەڵ ئـەو تێڕوانینو سەرنجانەدا دێتەوە کە گێڵنەر لەبارەی خێڵەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هەیەتی کە لەبنەڕەتدا خۆیان وەك یەکەگـەلێکی سیاسـیی بەرجەسـتەدەکەن لەگـەڵ**

---

پاوانەکاندا بە هاوبەشیی هەیە ، بەڵام هەمیشە وەك یەکەیەك هەوار ناخەن . زیاتر بۆ چەند هەوارگەیەك دابـەش دەبن کە هەریەکەیان پێیدەڵێن (خێـڵ) . خێـڵ بەشـێکن لـە بـەرەبابی هۆزێـك بـەهۆی پەیوەنـدیی ئـابووریی و خوێنــەوە پێکــەوە بەســتراون . لەلایــەن بەتەمەنترینیانــەوە بــەڕێوەدەبرێن ، ئــەوەی بەشــێوەیەکی نافــەرمیی دەستنیشان دەکرێت و بەهۆی چالاکیی و پایەکەی دەسەڵاتی دەدرێتێ . بەگوێرەی بارس ، زۆربەی جـار خێـڵ لەچەندین خێزان پێکدێت کە ژمارەیان لەنێوان بیستوسێ بۆ سی خێزانە . هەریەکەیان دەوارێکی جیایان هەیە ، ئاژەڵەکانیان بەشێوەی مێگەلە و نزیکەی پێنج سەد سەرە . هەر مێگەلێك شـوانی خـۆی هەیـە . مێگەلـەکان لەســەر بەنــەمای هێڵێکـی خزمایـەتیی پێکـدەهێنرێت ، لەگـەڵ باوکـان ، براکـان یـان لەگـەڵ خزمـانی دیکـەدا سەرەکانیان دەکەنە یەك . دەگونجێت شوانەکان ، ڕەنجبەرەکان ، هـەروەها کەسـی دیکـەش بەشـێك لـە خێـڵ پێکبهێنن بەبێ ئەوەی ئەندامی عەشیرەتەکە بن . خزمـە هـەژارەکان زۆر کـات بـۆ ئـەم مەبەسـتە بـەکاردەبرێن وادەردەکەوێت کە خێڵ لـە باشـووری کوردسـتاندا هاوشـێوەی (ئۆبـە) یـە لـە هێنـدێك لـە بەشـەکانی بـاکووری کوردستان . بەگوێرەی نیکیتین ، ژمارەی ئاژەڵەکانی ئۆبە جیاوازن و لەنێوان پێنج سەد بـۆ دەهـەزار سـەرە . ئەو لەسەری دەڕوات و دەڵێت کە ئۆبە لەنێوان هەشت تا پـەنجا ڕەشمـاڵ پێکدێت . لەباشـووری کوردسـتان ، ژمارەی ئەو ڕەشماڵانەی ئۆبە پێکدێنن جیاوازن و لە نێوان بیست بـۆ پـەنجا دانـەدان ، هـەروەها ژمـارەی ئـەو سەرمەڕانەی ئەم یەکانە دەیگرنە خۆ لەنێوان هەزار بۆ دووهەزار سەرە . هەر تیرەیـەك لەلایـەن ڕەئیسـێك یـان ئاغایەکەوە سەرۆکایەتیی دەکرێت و پایەکەشی بە میرات بۆ دەمێنێتەوە ، ئاغـا بەرجەسـتەی خانـەدانی تـیرە دەکات ، وێڕای ئەو پەیوەستە خزمایەتییەی سەرۆك بە ئەنـدامانی تیرەکەیـەوە دەبەسـتێتەوە . بەشـێوەیەکی ڕێژەیی چەند حاڵـەتێکی کـەمی ژنخوازیی لەگـەڵ خانـەدانی بـەرەبابی هۆزەکـانی دیکـەدا بەرچـاو دەکـەوێت . ژنومێردایەتیی نێوخۆیی کەلەسـەر بنـەمای خـزم خواسـتن رادەوەسـتێت لـەنێو بنەماڵـە خانەدانەکانـدا بـاوە . پێویست بە گوتن ناکات ، ئەو کردارە یارمەتیی بـەهێزبوونی پێگـەی سـەرۆك دەکـات لـەنێو تیرەکـەی خۆیـدا . ژنومێردایەتیی دەرەکی شتێکی ناوازەیە ، گەر ڕوویدات ، ئەوا لەنێوان سەرۆك و خێزانێکی ساماندارییی ئاسایی نێو هەمان تیرەی خۆی بـەڕێوە دەچـێت . کـوردە خێڵەکییـەکان کوێرانـە دوای سـەرۆکەکانیان دەکـەون و بـێ ئەملاولا ملکەچیی و گوێڕایەڵیی خۆیان پێشاندەدەن ، لەسەر داوای سەرۆکەکەیان بـێ سـێودوو ژیـانی خۆیـان دەخەنــە مەترســییەوە، ئــەو ســەرۆکانەی لەناوچــە چــۆڵ و دووردەســتەکاندان زیــاتر بەتــەنگ دەستوپێوەندەکانیانەوە دێن وەك لەوانەی کەوتوونەتە نزیك ناوەندەکانی حکومەتەوە بڕوانە:

پرۆفیسـۆر. دکتـۆر وەدیـع جوەیـدە، جوڵانــەوەی نەتــەوەیی کــورد . بنــەماو پەرەســەندنی، وەرگێڕانــی لەئینگلیزییەوە: پرۆفیسۆر.ی.د.یاسین سەردەشتی، سلێمانی، ٢٠٠٨. ل ٧١-٧٥.

رۆڵێکی لاوەکییدا.[30] هەرچەندە، گرنگە جەخت لەوە بکرێتەوە کە خێڵە کوردییەکان بەشێوەیەکی سەربەخۆ خۆیان رێکناخەن، بەڵکو هەولّی بەدەستهێنانی پێگەی سیاسیی لەنێو چوارچێوەی پارتە کوردییەکاندا دەدەن، بەوتەیەکی دیکە، خێڵەکان کەوتوونەتە ئەوەی پشت بە رێکخراوی هاوچەرخی پارتە سیاسییەکان ببەستن.

هۆکاری گشتی بۆ هەر مشتومڕێکی خێڵەکی ئەوەیە کە خێڵەکان بۆماوەی چەندین سەدەیە لەوجێگایانەن کە ئێستاکە تێیدا دەژین‌و ئەم راستییەش پرسیارێکی گونجاو دێنێتەئارا، ئەویش ئەوەیە خێڵەکان چ جۆرە قەوارەیەکی کۆمەڵایەتیین کە بۆماوەیەکی ئەوەندە درێژخایەن پڕ گۆڕانی دیمۆگرافی‌و سیاسیی توانیویانە مانەوەی خۆیان زامن بکەن.

پاتریسیا کرۆن، بەشێوەیەکی پوخت پێناسەی خێڵی کردووە کە " کۆمەڵگایەکە پشت دەکاتە بنەما بۆ یەکخستنی سیاسیی"[31] ئەمە دەتوانرێت بەو پیاوە خێڵەکییانە لێکبدرێتەوە کە یەك پشتیان هەیەو لەبەرەبابێکن، ئەوەی وادەکات ئەوانە هەموویان خۆیان بەبراو یەکەکی کۆمەڵایەتی هەماهەنگ بزانن. تێکڕای ئەندامانی خێڵ لەوەدا هاوبەشن کەباپیرەگەورەیەکیان هەیە- تاکە رابردوویەك‌و ئایندەیەکی پێکەوەیی، کە ژیانی پێکەوەیی هەنوکەییان پێکدەهێنێت. سنوورێکی ئاشکرا لەگۆڕێدا نییە. رژێمی خێلەکی بەچەشنێك لە "لۆژیکی ستراکتوری" ناسراوە. پاول درێش، کە بنەمای کارەکەی لەسەر خێڵەکانی یەمەنی سەروو ئەنجامداوە، ئەم تێبینییەی خوارەوەی کردووە:

" خودی خێڵەکان قەوارەگەلێکی هەرێمیین. زۆرجار هەرێمی هەر یەکەیان پێکەوەیە، هەرەیەك سنووری خۆی لەگەڵ هاوسێکەیدا دەزانێت، لەنێو زەوی‌و خاکی خێڵەکاندا چەند جێگەیەکی زۆر کەم هەیە بەئاشکرا مولّکی خێڵێك یان ئەوی تر نەبێت." [32]

---

30 Gellner (1983b), p. 436.
31 Crone (1986), p. 51
32  Dresch (1989), p. 75.

سیســتمێك كــە لەســەر بــەها خێڵــەكیو دابونەریتــەكان راوەســتابێت هــەڵگری رەگەزگەلێكی دیموكراتیكی شاراوەیە، لەكاتێكدا دیوەخان دەشێت وەك ئەنجومەنێكی راوێژكاریىو بڕیارسازیی راژەبكات،[33] هەرچەندە، گرنگە تێبینی بكرێت كە چەند شێوەیەكی خێڵگەرایی لەئارادایە: كە هێندێك زۆرو هێندێك كەم ئەم رەگەزە دیموكراتیكانە لەخۆدەگرن. هۆكارێكی گرنگ كە ئاستی دیموكراتییەكە دیاریدەكەن بریتیە لەژینگەكە داخۆ شاخاوییە، لادێی تەختانە، یان شارەكانە.

(درێش)، لەو مشتومڕەدا كەسەبارەت بە بەردەوامی خێڵەكان كراوە، تێبینیكردووە كە دەشێت خەڵكانێك لەنێوان خێڵەكاندا ئەمبەراوبەر بكەن، كاتێك ئەوەش روودەدات، واپێدەچێت سیستمێكی پێناسەكردنەوە هەبێت تێیدا یەكە جیۆگرافیو سیاسییەكان لەنموونەگەلێكی نوێدا كۆبكاتەوە."[34] نموونەیەكی وا سەبارەت بەم حاڵەتەوە دەشێت لەمێژووی خێڵی بەهێزی قاشقاییدا ببینرێتەوە لەباشووری رۆژهەڵاتی ئێران،[35] ئەو كەیسەی كە راستییەك بەرجەستەدەكات ئەویش ئەوەیە كە خێڵەكان بەگشتی لەرووی جیۆگرافییەوە چەسپاون، بەڵام پیاوانو خێزانەكان پێویست نییە بەو شێوەیە بن. لەوتەكانی درێشدا، "چەسپاوی هەرێمیی دیاریكەری شوناسی دەستەجەمعییە، لەكاتێكدا خێزانەكانو پیاوانێكی تایبەت دەتوانن بڕۆنو ناوەكانیشیان لەتەك خۆیان بەرن." [36] بەوەش خێڵەكان دەشێن لەگەڵ خێڵی دیكە بەگیانێكی برایانەدا تێكەڵبن كە لەئاكامی ئەم گۆڕانی شوناسەدا دێتەئارا- ئەو كردارەی پێدەچێت ماوەیەكی زۆر بمێنیتەوە. لێرەوە، روون دەبێتەوە كە پێویستە جیاكاری لەنێوان خێڵدا بكرێت وەك یەكەیەكی بەردەوامی كۆمەڵایەتیو سیاسی، هەروەها ئەو خەڵكەی كە لەهەركاتێكدا پێكیدێنن، لەكاتێكدا خێڵەكان زیاتر

---

٣٣ ئەمە بۆ نموونە تێبینیكراوە لەلایەن جۆزیف كۆستینەر لە گەنگەشەكەیدا سەبارەت بە خێڵو دەوڵەت لەسعودیە:

Khoury and Kostiner (1990), p. 245.

34 Dresch (1989), p. 328.

35 Beck (1980), p. 223.

36 Dresch (1989), p. 332.

لەئەندامەکانیان ژیان دەکەن، ئەو ئەندامانەی دەشێت جوولەو گواستنەوەیەکی دیارییکراو پێشانبدەن.

پێکهاتە جینالۆجییەکانی }زنجیرەی پشتاوپشت{خێڵەکان تاڕادەیەك نەچەسپاوو ناجێگیرە، تا ئەورادەیەی ئەو کەسەی کە وەفادارییەکی بێسنوور بۆ پیاوێکی خێڵەکی دەردەبڕێت دەشێت دواجار گریمانەی پێگەی خزمو خوێشی بۆ دابنرێت، لەکاتێکدا ئەوانەی بەخوێن خزمن کە ناپاکی خۆیان پێشانبدەن دەشێت پێگەی خزمایەتی نزیکی خۆیان لەدەستبدەن. داڤیس ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە کە پرنسیپی "خزم خزمایەتییە."[٣٧] ئەو سیمایەی بوونی لەکۆمەڵگای کوردستاندا لەلایەن ڤان بریونسنەوە پشتگیری کراوەو جەختی کردۆتەوە کە" وەفاداری سیاسی راستیینە بۆ بنەماڵەیەك دەشێت بەتێپەڕینی کات زۆر بایەخدارتربێت لە خزمایەتی راستیینە."[٣٨] هەرچەندە، ئەو پشتە رەسەنە یان دروستکراوە کە بانگەشەی بۆدەکرێت، نموونە گشتییەکەی لەلایەن حەتمیەتی پشەتەکەیە بالآدەستە، بەوتەیەکی تر، مۆدێلە نەوەییەکە " میراتگر"ی پابەندیو مافەکانە لە بابیرە گەورەی یەکێکەوە، هەروەها لەسەر نەوەکانە هەمان ئەو وەفادارییە بنوێنن. داڤیس دووبارە دەڵێت :" پابەندبوون بەپشتگیریی کەسانێکی دیکەی دیارییکراو، مردنیش لەگەڵیاندا ئەگەر پێویست بکات، کارێکە لەیەکتر جیانابێتەوە."[٣٩]

خێڵ یەکەیەکی یەکرەنگو هەماهەنگ نییە، بەڵکو هەر

یەکەو بۆچەند هۆزو تیرەیەك دابەشدەبێت. لەنێوان ئەم هۆزو تیرە دابەشبووانەدا ناکۆکی نێوخۆیی خێڵەکی هەیە کە بەگوێرەی فەزا سیاسییەکە جەخت یان نکۆڵی لێدەکرێ. لەکاتی ململانێدا سروشتی پەیوەندییەکانی نێو خێڵێك بەقووڵی گۆڕانی بەسەردادێت، ئەوەش بریتییە لەوەی کە تایبەتمەندی دابەشبوونی بونیادە خێڵەکییەکەی تێدا دەردەکەوێت. پەیوەندییە ئاساییەکەی نێوان هۆزو تیرە جیاوازەکان کە خۆی لەدژایەتی یەك بۆ ئەوی دی دەبینێتەوە، لەبری ئەوە دەگۆڕێت

37 Davis (1987), p. 61.
38 van Bruinessen (1992), p. 51.
39 Davis (1987), p. 61.

بۆ سەرلەنوێ یەکڕیزیی‌و یەکێتی تەواوی خێڵەکە.لەکاتی بەرووداوەستانی هەڕەشە دەرەکییەکان، شوناسی گشتی‌و دەستەجەمعی هۆزو تیرەکان، کە هەمیشە بایەخێکی کەمی بووە، لەناکاو بایەخ‌و گرنگییەکی زۆر پەیدا دەکات.[40] لەکاتی رووبەڕووبوونەوەی هێرش‌و مەترسییە دەرەکییەکان، کێشە نێوخۆییەکان "هەڵدەپەسێررێن"، هاوشێوەی ئەوەی چۆن ململانێی چینایەتی لەنێو نەتەوەیەکدا هەڵدەپەسێررێت لەکاتێکدا ئەو نەتەوەیە دەیەوێت لەسەر ئاستی نێونەتەوەیی خۆی دەرخات.

هۆکارێکی گشتی دیکەی یەکێتی خێڵەکی لەناوچە جیاوازەکاندا بریتیەلە پێگەی شێخەکان‌و گرنگیان بۆ خێڵەکە. ئەوانە خودی خۆیان دەسەڵاتێکی فەرمی نین، بەڵام ئەوان وە شێخێکی بەتەمەن‌و وەك خزمێکیش "دەتوانن بە نەرمی‌و پێداگری خۆیان وا لەخەڵکەکە بکەن بەشێوەیەك هەڵسوڕێن کەدواجار بە پتەوبوون یان زێدەبوونی بایەخ‌و پرستیژی گشتی ئەوان کۆتاییبێت."[41] توانا‌و شایستەیی بۆئاشتیپارێزی یەکێکە لە هەرە ئەرکە سەرەکییەکانی شێخ، هەروەها دەشێت مرۆ بڵێت کە " چارەسەرکردنی کێشەکان پشت بە هاوکارییە خودییەکان دەبەستێت."[42]

کاتێك رووبەڕووی هەڕەشەیەکی دەرەکی دەبنەوە، کە پێویست بەگرتنەبەری هەڵوێستێکی هەماهەنگ دەکات بۆ بەرگرییکردن لەزێدی گشتی خێڵەکە، شێخەکانی هۆزو تیرە جیاوازەکان لەگەڵ یەکدا راوێژدەکەن‌و هەموو دیدە ناکۆکەکانی خۆیان هاوسازدەکەن‌و بڕیار لەسەر باشترین کار دەدەن. ئەوکاتە شێخ وەك "رووی" خێڵ کاردەکات، هەروەك درێش، ئاماژەی بۆکردووەو پێگەی بەرچاوی شێخەکانی هەروەك لای خوارەوە پوختکردۆتەوە:

" کەسێکە پێویستە تفەنگ یان گا پێشەکشبکات، کەسێکە پێویستە پیاوانی خێڵ پێکەوە کۆبکاتەوە، کەسیکە پێویستە وەك تاکە گروپێك قسەیان بۆبکات، لایەنێك

---

40 Dresch (1989), p. 346.
41 Davis (1987), p. 96.
42 Crone (1986), p. 50.

بانگ بکات بۆ پشتگیریی دژی لایەنێکی سێیەم یان بۆ ناوبژیوانی. هیچ هەستێکی جێگیر نییە سەبارەت بەوەی چی روودەدات تاکەسێك دێتە پێشەوەو خاڵ دەخاتە سەر وشەکان،ئەوەش پشت بەوە دەبەستێت چۆن و بۆ کێ." [43]

ئەوەی خەڵکانێکی خێڵەکی لە ناخێڵەکی جیادەکاتەوە لەزۆربەی چاوی پیاوانی خێڵدا بریتیە لەگەڕانەوە بۆ قەوارەیەکی دیارییکراوو جۆرایەتی ئەو شەرەفەی لەگەڵ خۆی دەیهێنێت، هەروەك دووبارە لەلایەن درێشەوە لێکدراوەتەوە:

" شەرەفی خێڵو هۆزو تیرەکانی، پشت بە "پارێزراوی" خاكو قەڵەمڕەوەکەی دەبەستێت، ئەو وێناکردنەی کە زیاتر دەگرێتەخۆ، زیاتر لە بەرگرییەکی ساکار لەسنوورەکان...زەوییە کشتوکاڵییەکان مولکی تایبەتن، هیچ یەك لەوانە مولکێکی گشتی تیرە یان تەواوی خێڵەکە نییە، خاوەندارێتی زەوییە کشتوکاڵییەکان بۆ پێگەو مەقامی پیاوێکی خێڵەکیی مەسەلەیەکی گەوهەرییە...شەرەفی هاوبەشی یەکێك، کەدەبێت بپارێزرێتو بە پارێزراوی بمێنێتەوە، لەبنەڕەتدا بەهۆی سنووری هاوبەشێوەیەتی کە خێڵەکە یاخود تیرەکە دەناسێنێت." [44]

## ٣ . ٢ . ٢ خێڵەکان و دامەزراندنی دەوڵەت

خێڵەکان بەشێوەیەکی جیاواز پەیوەستن بە بونیاتی سیاسی تایبەتو جیای "نەتەوە"و "دەوڵەت"ەوە. پێدەچێت بەگشتی قەوارە خێڵەکییەکان بەپێکهاتەیەکی ئەرێی لەپرۆسەی نەتەوەسازیی لەقەڵەمبدرێن، بەڵام دەبنە لەمپەرێك لەبەردەم دەوڵەتسازییداو رەگەزگەلێکی ناجێگیرو ئاڵۆز پێکدەهێنن. تاقیکردنەوەی ئەمە لەچوارچێوە کوردییەکەدا لەوانەیە بەشێوەیەکی تایبەت رۆڵی خێڵە کوردییەکان لەم پرۆسە سیاسییانەدا روونبکاتەوە. کوردان نەتەوەیەك پێکدەهێنن کە تێدا نفوزو

43 Dresch (1989), p. 99.
44 Ibid. pp. 80-82.

بونیـادە خێڵەکییــەکان رووخســارو ســیما ســەرەکییەکانی پێکـدەهێنێت، ئەگــەری ئەوەشـی هەیـە کـە بەئاراسـتەی دامەزرانـدنی خـۆی بـڕوات وەك دەوڵـەتێك لـەنێو ئــەوانی دیکــەدا لەســەر شــانۆ نێونەتەوەییەکــە. لەســیناریۆیەکی بــەم چەشــنەی نەتەوەبوونــەوە کـە بـۆ دەوڵـەتبوون هـەنگاودەنێت، چـالاکیو هەڵویسـتی خێڵـەکان دەبێت لەبەرچاوبگیرێنو هەڵبسەنگێنرێن.

نەتەوەسـازان "Nation-builders" رووبــەڕووی ئــەرکێکی ســەخت بوونــەوە لــەکاتی هەوڵـدان بـۆ ئاراسـتەکردنەوەی وەفـاداری نــەریتی خێڵەکییــەکان کــە بــۆ خێڵەکانیانە بۆ خزمەتی نەتەوە. بەوەش ئامانجی ئایـدیۆلۆجی دەوڵەتسازان دەبێـت کەمەندکێشـکردنی سـەرکردە خێڵەکییــەکان بێـت بۆنێـو رێکخـراوی دەوڵـەت وەك هەوڵێك بۆ بەستنەوەی ئەو ئینتیمـا بەهێزانـە بەدەوڵەتەکـەوە، ئـەو سیسـتمەی کـە هێنـدێکجار بــە" political tribalism /خێڵگــەرایی سیاســی" ناودەبرێــت. [45]

کەیسێکی نموونەیی بۆ روونکردنەوەی ئەمە بریتیە لە پرۆسەی بنیاتنانی دەوڵـەتی هاوچەرخی عەرەبی سعودی، کاتێك لەواقیعـدا دەسـەڵاتی حکومـەت لەملکەچکردنی پلە بەپلەو خشکەیی سەرکردە خێڵەکییەکان درێـژبۆوە. کەسایەتییە رێبەرییـەکانی دەوڵەت خۆیـان لەگـەڵ سـەرکردەی دامـەزراوە خێڵایەتییەکانـدا رێکخست، هـەروەها ئەو هاوکارییەی هاتەئارا، کە سروشـتەکەی بەتایبەتمەنـدی خێڵـەکی جیادەکرایـەوە، رەگــەزی پێویســتی ئاشــنایەتی گرتــەخۆ کەپێویســتبوو بەهۆیــەوە خــەڵکی هەســت بەبەردەوامی لە کۆمەڵگاکەیاندا بکەنو گۆڕانی خێرا بەخۆوە ببینن. ئەمـە لەلایـەن جۆزیف کۆستنەرەوە روونکراوەتەوە:

" بــەها خێڵەکییــەکان شــوێنی کــارگێڕی دەوڵــەت ناگرنــەوە بــەڵکو خۆیــانی لەگــەڵ دەگونجێنن، وای لێدەکەن هەڵمـژینی نـەرمترو سـاناتر بێـت.بـەوەش، بەپێچـەوانەوە،

---

45 Or al-qabaliyya al-siyasiyya as coined by al-Naqib in his Al-Mujtama' wa al-dawla fi alkhalif wa al-jazira al-`arabiyya [Society and the State in the Gulf and the Arabian Peninsula], (1987) Beirut: CAUS, and elaborated on by Ayubi, N. (1995), pp. 240-253

ئەوانــە دەبنــە فاکتــەرێکی گــرنگ لــە بڵاوبوونــەوەی دەســەڵاتی دامــەزراوەکانی دەوڵەت."[46]

لەبارەی دەسەڵاتو سەرچاوەکانی دەسەڵاتەوە، دووبارە دەگەڕێنەوە سەر دەسەڵات بەسەر خێڵەکاندا، دێرش، ئاماژەی بەوەداوە کە ڕێحەزێك هەیە بۆ "هاوتاکردنی دەسەڵاتو شوناس"، هەروەك بۆنموونە، دەوڵەتو نەتەوە هەمان شتبن." [47] بەڵام کۆستنەر جەختی لەوە کردەوە ئەمە ئەوە نییە کە چۆن مرۆ بڕوانێتە خێڵەکان. ڕاستتر " دەسەڵات لەسەر بنەمای شوناسی خێڵەکی بەرفراوان دەکرێت، هەروەها ئەو شوناسە زێدەتر لەتەمەنی دەسەڵاتەکە ژیان دەکات، لەکاتی ڕۆیشتنی گەوهەری دەسەڵاتەکە ئەو یادەوەری‌و ناوبانگەش دەپارێزێت." [48] لێرەوە، مرۆ دەشێت ئەنجامگیری بکات کە خێڵەکان لەلایەن دەسەڵاتەوە هەڕەشەیان لەسەر نییە، هەروەك لەدەرەوە مامەڵەی لەتەکدا دەکرێت، بەهۆی بونیادگەلێکی باڵای وەك دەوڵەت. بەوتەیەکی تر، ئەوە ئەرکێکی بەدیهاتووی ئاسان نییە کە خێڵەکان وەك قەوارەگەلێکی سیاسی‌و کۆمەڵایەتی لەسەر خاکی دەوڵەت قەڵاچۆبکرێن‌و بسڕێنەوە، بەدەر لەوەی دەشێت ئەو دەوڵەتە چەندە بەهێزو دەسەڵاتداربێت.

بەڕۆیشتن لە نیمچە دوورگەی عەرەبییەوە بۆ باکووری ئەفریقا، ڕێکخراوی خێڵەکی لە لیبیا لەکلاورۆژنەی کارەکانی جۆن داڤیسەوە تەماشادەکرێن.هاوشێوەیی لەنێوان هەردوو هەرێمە عەرەبییەکەدا بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت ببینرێت، بەڵام چوارچێوەکەی لیبیا بەقووڵی جیاوازترە بەو مانایەی کە خێڵ دەبێتە ئەلتەرناتیڤێکی ڕادیکاڵ بۆ دەوڵەت...خێڵگەرایی لیبییەکان بوژانەوەیەکی ساکار نییە، ناتوانایيەك بۆ خۆگونجاندن، گۆڕان، بەڵام خود هۆشیارییەکی ڕکابەری لەگەڵ حکومەتو کارەکانیدا هەیە." [49]

---

46 Kostiner (1990), p. 246.
47 Dresch (1989), p. 354.
48 Ibid.
49 Davis (1987), p. 182.

خێڵـەکان لەناوچـە دووردەسـتـەکانی لیبیـا بـەبێ دەسـتـێوەردانێکی دەوڵـەت دەژیـان، هەروەها هەستی بێدەوڵەتیان لـەلا گەلاڵـە بـوو. چەسـپاندنی جـێگیری کۆمەڵایـەتیو ئاشـتی لەکۆمەڵەکانیانـدا پشـت دەبەسـتێت بەمانـەوە لـەنێو نموونەیـەکی تـەواوی ڕێکخراوی کۆمەڵایـەتی خـێڵ، کـە هەسـتێکی بـەهێز لـە هەماهـەنگی دێنێتـەئارا کـە لەگـەڵ "'impersonality / ناشەخسـانییەتی" دەوڵـەتان پێکـدژە. ئـەم هـزرە لیبییە بۆ " statelessness / بێدەوڵەتبوون" هەریەك لە ڕەگەزگـەلێکی ئـەرێیو نەرێیە بۆی، سروشتی ئەرێی بریتیە لەو ڕۆڵە ناوەندییەی خزمایـەتیو وەفادارییـە-ئەوان پشتیان بە پێکەوەییە نێوخۆییەی رابردووە کـە ناتوانرێـت بگۆڕێـت- ئـەوەش پشتگیریو ئاسایش بۆ هەریەك لەپیاوە خێڵەکییەکان فەراهەم دەکـات. هەرچـەندە، ئـەم پشـتگیرییە وادەکـات دەوڵـەتی پارێزکـار ناپێویسـت بێـتو هـەر حکومـەتێکی نەتەوەییش زێدەبێ. لەرزۆکیی ئەم هاوسەنگییە بەئاسـانی دەشـێوێتو فەزایـەك لـە ترس پێکدێنێت، هەروەك داڤیس ئاماژەی بـۆکردووە، " ڕژێمـی کۆمەڵایـەتی لەسـەر ڕەتکردنەوەی توند ڕاوەستاوە کە پێویستی بە وریاییەکی بەردەوام هەیـەو نـەرمڕەو نییـە." [50] تێبینییـەك کـە ڕەنگدانـەوەی ئـەو فەزایەیـە کـە لـەنێو ناوچـە خێڵەکییـە کوردییەکاندا بەربڵاوبووە.

کۆمەڵگایـەکی خێڵـەکی نـەریتی ( ئـەوەی کـە لەناوچـە کوردییـەکانو هـەروەها عەرەبییـەکانی عێراقـدا هەیـە ) بەئاسـانی دان بـە دەسـەڵاتی ئەوانـەدا نـانێن کـە دەوڵەت دایمەزراندوون. ئەمەش بایەخی گرنگی دامەزراندنی پلاتفۆرمێکی سیاسـیی بەرفراوان دەخاتەڕوو، کە دەتوانێت هەروەها بگونجێت لەگەڵ فۆرمـە نەریتییـەکانی ڕێکخراوە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان. لـەکاتی مشـتومڕکردن سـەبارەت بەدەوڵـەتێکی سەربەخۆی کوردیی واگونجاوە بگەڕێینەوە بۆ ئەو پرسیارەی کەپێشتر کراوە، ئەوەی کـە : گریمانـەی ئـەوەی کـە ئـەو خێڵانـە لەوانەیـە ئاسـانکاریی بـۆ نەتەوەسـازیی پێکبهێنن بەڵام بەتوندی دەبنـە لەمپـەر لەبـەردەم ئـەو هەوڵانـەی بـۆ دەوڵەتسازیی

---

50 Ibid. pp. 41-42.

دەدرێن. کۆمەڵگای خێڵایەتی کوردیی پێدەچێت هاوشێوەی ئەوەکەی یەمەن بێت، ئەوەی دێرش سەبارەت بەو خێڵانە تێبینیکردووە کە" خەمی سەرەکی سەربەخۆیی نێوخۆییە...پێشمەرجی بەدوورگرتنی ئەو خەڵکە ناخێڵەکییەیە بەلەدایکبوون پێناسەکرابوون، ئەو وێناو چەمکەی لەگەڵ زمانی سیاسی هاوچەرخدا پێکدژە."[51] ئەمەش مانای ئەوەمان پێدەدات کە ئەگەر خێڵگەلێکی دیارییکراو دژایەتی دەسەڵاتدارێتی عێراقییان کردووە لەوانەیە هەروەها نەیاری دەسەڵاتدارییەکی ناوەندیی کوردییش بن.

بۆئەوەی تەیارکردنی دەستەجەمعی دانیشتووانی لادێ بهێنرێتەدی، " communal partisanship / بەشداری گشتی، وەك شێوازێك بۆ کەمەندکێشکردنی گروپە جیاوازەکانی کۆمەڵگا کە زۆربەیان بەو بەرژەوەندییانە دەناسرێنەوە کە لەگەڵ بەهاگەلە نەریتییە گشتییەکانیاندا ناکۆك لەقەڵەم دەدرێن، لەلای زۆربەی جووڵانەوە نەتەوەییەکانەوە بینراوە. کوردستانیش لەمە بەدەرنییە. پابەندێتی بەو بەها نەریتییانەی کە زۆربەی کۆمەڵگا خێڵەکییەکانی لەسەر راوەستاوە بابەتێکی درککراوو دانپێدانراوی "pantribalism / پان خێڵگەرایی" نییە ( هەروەك لای خوارەوە پوختەکراوە )، بەڵام بەشداری گشتی وەك شێوازێك بۆ گەیشتن بەخێڵگەرایی بەشێوەیەکی چەندبارەوەبوو لەلایەن سیاسەتی کوردییەوە بەکارهێنراوە. جووڵانەوەی کوردیی لەدەورانی فەرمانڕەوایەتی مەلامستەفا بارزانیدا زیاتر لەڕووی رێکخستنو بونیادەوە قەرزاری خێڵگەرایی بوو وەك نەتەوایەتی، پارتی دیموکرات لەسایەی رێبەرایەتی مەلامستەفاوە لەسەر بنەمای بەشداری گشتی هەڵدەسوڕا.

لەو ناوچانەی کە نەریتگەرایی وەك بەهێزترین رەگەز ماوەتەوەو رێگە بۆ هەنگاونان بەرەو مۆدێرنەو هەروەها ئەو هەوڵانە نەدراوە بۆ پێشکەشکردنی پرۆسەگەلێك لەپێناو بەدیهێنانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بنەڕەتی، بەشداری گشتی

51 Dresch (1989), P. 395.

دەکرێـت وەك فۆرمێـك بـۆ جووڵانـەوەی خێڵـەکی لەقەڵەمبـدرێت کـە هاوشـێوەی پـارتێکی سیاسـییە. دەشـێت ئەندامـەکان پارتەکـە وەك درێژبوونـەوەی دامـەزراوە کۆمەڵایەتییەکـــەی خۆیـــان ببیـــنن، ئـــەو ســـیماگەلە کۆمەڵایەتییانـــەی کـــە تایبەتمەندییەکانی رێکخراوی خێڵەکی نەریتی تێکپێچاوو پەردەپۆشکردووەو خۆی لە وابەستەییە رۆحیو سۆزەکییەکاندا بەرجەستەدەکات. بـەوەش، پارتەکـە دەبێتـە ئەلتــەرناتیڤێك بــۆ دەربــڕینی رژێمــە کۆمەڵایەتییــە خێڵەکییــە نەریتییەکــەیان: پلاتفـۆرمێکی سیاسـی بـە رەهەنـدێکی زێـدەکراوی پێکەوەگرێـدان بـە سیسـتمێکی گشتگیری بەهاکانەوە، سیستمێك کەدەشێت بەها نەریتییەکانی رەگەزگەلی نەتـەوەی لەخۆبگرن.

هەرچــەندە، بەبــەراوردکردن لەگــەڵ پارتــە سیاســییەکاندا،[52] پێویســتە جــەخت بکرێتەوە کە لەرووی بوونی قەوارەگەلە چەسپاوو بەردەوامەکانـدا، هـیچ یـەك لـەو پێکهاتـە ئایدیۆلۆجییانـە نـاتوانن هاوشـێوەی رژێمـە خێڵەکییەکـە بـن. ئەنـدامانی خێڵەکان لەرێکخراوەکە وازناهێنن بەهۆکاری ناڕازیبوونیان لە فەلسەفە یان بیروڕای ســەرکردایەتی (هەرچــەندە دەشــێت بەهــەر هۆیــەکی دیکــە واز بێــنن یــان دووربخرێنــەوە) بەوتــەی جــۆن داڤــیس " ئــەم گروپانــە لەســەربنەمای بــیروڕا دانەمەزراون"[53]

هێزە خێڵەکییەکان لەسایەی ئـەو بەڕێوەبەرایەتییـەی تـاکو ناوەڕاسـتی ١٩٧٠کـان بـە بەشـداری گشـتی دەناسـرا بەسـەر شـانۆی سیاسـی کوردیـدا زاڵبـوون. هـەروەها لـەو ناوچـانەی هـەرە نەریتییـەکانی بـەکرمانجی قسـان دەکـەن لـە بەشـە لادێنشـینەکەی باکووری "کوردستانی ئازاد"، هێشـتا بەشـداری گشـتی وەك بنەمایـەکی سـوودبەخش دەردەکەوێت کە بەهۆیەوە بەشێکی گەورەی دانیشتووانەکە تەیاربکرێت.

---

٥٢ لێرەدا بەئاماژە بۆ "کۆبوونەوەی خۆبەخشانەی تاکەکان، کەلەپێناو کەبەستی سیاسی هاوبەشدا یەکدەگرن :"

Scruton (1996), pp. 405-406.
53 Davis (1987), p 61.

ئایدیۆلۆجییە نوێیەکانی وەك نەتەوایەتی لەسەدەی بیستەمدا خۆیان خستۆتە سەر شـانۆی سیاسـی کوردییـەوە، کاریگەرییەکـەیش بەشـێوەیەکی سـەرەکی لەناوچـە شارنشـینەکاندا هەسـتیپێکراوە. لـەم ناوچـانەدا لاوان دەیـانتوانی بـۆ پێشخسـتن‌و بەدیهێنانی خولیا ئەکادیمییەکانیان بچنە زانکۆکان، ئەوەی شیمانە نەدەکرا لەلایەن کۆمەڵگا خێڵەکییە نەریتییەکەوە زۆری جێگەی بایەخ بێت. واپێدەچێت لەوانـەبێت کە خوێندنی باڵا وا لـە خێڵەکییـەکان بکات بەتێپـەڕینی کات پلاتفـۆرمێکی جیـاواز بنیاتبنێن کە بتوانن لێیەوە راهێنان لەسەر فۆرمێکی نـوێی سـەرکردایەتی سیاسـی خـاوەن ئایـدیۆلۆجیا بکـەن- ئـەوەی پێچـەوانەی رێکخـراوی خێڵەکییـە. ئـەم چـینە خوێنـدەوارە پەروەردەکراوانـە دەبێتـە هەڕەشـەیەك بـۆ ئـەو پێگـەی دەسـەڵاتە بەردەوامـەی خێڵـەکان، بـەو مانایـەی کـە خێڵـەکان هەمیشـە تاکـە ئەنجامـدەری تەیارکردنی گروپەکان بوون.

لەئاکامی ئەم پشکووتنەی ئایدیۆلۆجیای نەتەوەیی، ئاگاهی‌و وشیاربوونەوەی خـەڵك سـەبارەت بـەوەی کەسـەر بـە گروپێکـی تایبـەتی خێڵـەکین‌و ئاراسـتەی جیاوازیـان لەرووی ئاینی‌و ئیتنی‌و زمانییەوە هەیە، لاوازبوو. سەرکردایەتی خوێنـدەواری کـورد کـە وەك دەسـتەیەکی شـارەکیی لـەکۆتایی ١٩٧٠کانـدا سـەریانهەڵدا، ئینتیمـا خێڵەکییەکانیان هەڵپەسارد (ئەوانەیان کە ئینتیمایـەکی وایـان هـەبووبێت)و هێـزی خێڵگـەراییان وەك دوژمنێکـی نێوخـۆ "سـەرکوتکەرانی نێوخـۆ"[54]ی نەتەوایـەتی کوردیی لەقەڵەمدا. ئەم دیدو تێڕوانینەیان رەنگدانەوەی ئـەو گریمانـە جەماوەرییـە بـوو کـە خێلگـەرایی لەگـەڵ گەشـەکردنی بونیـاتی نەتـەوەدا لـەرووی کۆمەڵایـەتی‌و سیاسییەوە ناکۆك‌و نەگونجاوە. ئەو کۆمەڵگایانە خاوەن بونیـادی خێڵەکیی‌و سیمای کۆنی نەریتیین‌و وەفادارییەکی چەسپاویان هەیە، جەختکردنەوە لەوەی کـە دەشـێت رێگربێت لەبەردەم پشکووتنی هەماهـەنگی نەتەوایـەتی. جووڵانەوەیـەکی خێڵەکیی کە لەسەر بنەمای وەفاداری بۆ گروپێکی ئیتنی وەستابێت، هەر بـەرەو ئـەوە دەڕوات

54 Hassanpour (1992), p. 61.

کە دەرکەوتنی وەفادارییەکی بەرفراوانترو بنەڕەتی سنووردرابکات کە بناغەی دەوڵەتی نەتەوەیی پێکدەهێنێت. لەچاوی زۆربەی نەتەوەییو ئەو کۆڵەرانەی لەم بابەتە هاوشێوانەدا کاردەکەن، ئەو تاکانەی خێڵەکییانە ڕێکخراون، لەپێشاندانی جۆشێك بۆ خستنەبری وەفادارییو شوناسە خێڵەکییەکەیان بە ئینتیمای نەتەوەیی بۆ ئەونەتەوانەی بەشێکن لێی، شکستدێنن، کاتێك کە ئەمەش دەکەن دەبنە هۆی لاوازی دەوڵەتو بەچاوی گۆمانەوە سەیردەکرێن. هەرچەندە، ئەم بۆچوونە لەلایەن ریچارد سکلارەوە لەکۆڵینەوەکەیدا لەبارەی نایجیریاوە بەرپەرچدراوەتەوە، ئەوەی تێیدا پەیوەندییەکانی نێوان هەڵسوڕانە خێڵەکییەکانو ئایدیا نەتەوەییەکان پێناسەکراونەتەوە، جەخت لەوە کراوەتەوە کە خێڵگەرایی بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە بەشداری لەنەتەوایەتییدا کردووە. کۆمەڵگای خێڵەکی ئەم وڵاتەی ئەفریقای ڕۆژئاوا هاوشێوەی ئەوەکەی کوردستانە، هەروەها نموونەیەکی مێژوویی پەیوەست بە قۆناغی هاوچەرخ فەراهەمدەکەن.

سکلار دەرهاویشتە ڕوونەکانی خێڵگەرایی دەخاتەبەرچاو، بەتایبەت، پان خێڵگەرایی، ئەوەی کە وەك ئەو مشتومڕی لەبارەوە کردووە، وەك هێزێکی ناچارکەر ڕاژەی بە پەرەسەندنی پارتە سیاسییە جەماوەرییەکانو هەروەها هاندەرو پتەوکەری سەربەخۆیی نەتەوەیی کردووە. هزری پان خێڵگەرایی، بەوەی کە سروشتێکی سێکیولاری هەیە، جەخت لە خوڵقاندنی پلاتفۆرمێکی گشتیو هاوبەش بۆ خەڵکانێك دەکات کە کەلتورێکی هاوشێوەیان هەیە بەلام سەر بەخێڵی جۆراوجۆرن. هەروەك سکلار نووسیویەتی:" ڕۆحی پان خێڵەکی لەدڵی ئەوانەدا جۆشیدەدا کە هەستیان بە پێویستییەکی زۆر بەپەلە دەکرد بۆ یەکێتی لەدەرەوەی ئەو ئینتیما بەرتەسكو داخراوەی نێو خێڵەکانیان."[55]

ئەم پان خێڵگەراییە خۆی لەپێکهێنانی ئەو پارتە سیاسییە بنکەفراوانانە بەرجەستە دەکات شانبەشانی ڕێکخراوە کەلتورییە پان خێڵەکییەکان، کۆمیتەیەك

55 Sklar (1960), p. 416.

لەسەرکردە باڵاکان، کە پشتگیرییکردنیان لەبڕیارەکانی حکومەت دەبووە هۆی پاڵپشتییەکی مەعنەوی گەورە لەسیاسەتەکانی حکومەت. هەروەها لەپێگەیەکی ئەوتۆدا بوو کە لەنێوان قەوارەگەلە خێڵەکییەکاندا نێوەندگیریی بکات، ئەوەی حکومەت نەیدەتوانی سەرکەوتووانە چارەسەری بکات. بەوەش پەیوەستێکی یەکلاکەرەوە بوو لەنێوان...حکومەت، سەرکردەکان، لەگەڵ پیاوانی خاوەن نفوز بۆ ئاسانکاری جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی حیزب...بە کەمترین گرفت یان دژوەستانەوە." ٥٦

هاوشێوەی نێجیریا، لەساڵانی ١٩٦٠کاندا، سەرکردە خێڵەکییەکان لەناوچە کوردییەکە زۆرجار کاریگەرترین "opinion-makers / ڕاساز" بوونو هاوکاریشیان بۆ پارتە سیاسییەکە زۆر بایەخداربوو لە بەدەستهێنانی پشتگیریی لە ناچەیەکدا کە لەسایەی کۆنترۆڵی خێڵێکی تایبەتدا بوو. وێڕای جیاوازییەکان، خێڵەکان لەسەر بنەمای بەرژەوەندیگەلێکی گشتی هەڵدەسوڕێنو بۆئەوەی زامنیانکەن دەشێت هەوڵی ئەوەبدەن کەمەندکێشی سەرکردە خێڵەکییەکان بکەنو پێکەوە لە پارتێکی سیاسییدا بە هەماهەنگییەکی پان خێڵەکییانەوە سەرکەوتنی خۆیان بەباشی بسەلمێنن. پشتگیری دەسەڵاتدارە نەریتییەکان واتای پشتگیری ژمارەیەکی گەورەی خەڵکە شوێنکەوتەکانیان. لەکاتێکدا، هێندێك لەسەرکردەی خێڵەکان لەوانەیە بەرەو پەیامی کەلتووری یەکێتیخوازی کوردیی لەژێر پەردەی خێڵەکییەوە کەمەندکێشبن، هێندێکیشیان ئەو دەسەڵاتە سیاسیو ئابوورییەی بژاردەی پان خێڵەکیی ڕایاندەکێشێت. بەوەش ئەگەر سوود لەگەوهەری خێڵگەرایی ببنرێت، ئەم هێزە "سەرسەختە" دەتوانێت بەکردار کەمەندکێش بکرێتو بەشدارییەکی ئەرێییش لەجووڵانەوەی نەتەوەییدا بکات.

---

56 Ibid. pp. 410-411.

## ٣. ٢. ٣ خێڵەگەرایی و کوردستان

خێڵگەرایی لەکوردستاندا لەدەرەوەی کۆچەرایەتی گەشەیکردووە- کە بەفۆرمێکی رەسەنی رێکخستنی کۆمەڵایەتی لەقەڵەم دەدرێت. دواتر بونیادی دەرەبەگایەتی لەکۆمەلگادا گەشەیکردووە، ئەو وەرچەرخانە پلە بەپلەیەی تێیدا رێگەی بۆ "landlordism / موڵکدارگەرایی"[٥٧] خۆشکردووە ( واتای ئەوەی زەوییەکان موڵکی ئاغا ساماندارەکان و سەرۆکەکانە کە باپیرانیان موڵکداری دەرەبەگ بوون ). بۆ لەقاڵبدانی ئەمە پێویستدەکات کە بگەڕێنەوە بۆ هەرێمە بەرفراوانەکەو دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق.

لەسایەی کارگێڕیی ناناوەندیی ئیمپراتۆریی عوسمانی، زۆربەی ناوچەکان(بەناوچە کوردییەکانیشەوە) بەشێوەیەکی سەرەکی لەلایەن دەسەڵاتدارە خۆماڵییەکانەوە بەڕێوەدەبرا، کە سەرچاوەکانی دەسەڵات زۆربەیجار لەکۆمەلگایەکی نەریتییەوە ریشەی دەگرت، بۆ نموونە، ئەوەی خێڵەکان. سەرکردە خێڵەکییەکان رەگەزگەلێکی بەرچاوو کاریگەریان لەنێو ئەو توێژە فەرمانڕەوایەی ئەم یەکە کارگێڕییە خۆماڵییانە پێکدەهێنا. هەرچەندە، لەماوەی دوابەشی سەدەی نۆزدەیەمدا، عوسمانییەکان وەك هەوڵێك بۆ تێکشکاندنی دەسەڵاتی کوردیی دەستیان بە پرۆسەی " detribalisation / هەڵوەشاندنەوەی خێڵایەتی"کرد.[٥٨] ئەم رێحەزەی "مۆدێرنە" لەلایەن بریتانیای مەزنەوە پێچەوانە بووەوە، ئەوەی لەماوەی سەردەمی ماندێتدا ١٩١٩-١٩٣٢، سیاسەتێکی گرتەبەر کەبەهۆیەوە زۆرێك لە سەرکردە خێڵەکییەکان ئەو هێزو دەسەڵاتەی خۆیان گێڕایەوە کە لەلایەن حکومەتی

---

٥٧ پێڵێتیر (١٩٨٤) ئەم چەمکەی لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی خێڵایەتی یەکسان کردووە، هەروەك ئەوەی نووسیویەتی :" گەوهەری خێڵگەرایی ئەوەیە کە خێڵ بەگشتی خاوەنی زەوییە، موڵکدارگەرایی پێچەوانەی ئەم بنەمایەیە. ل ١٨.

٥٨ پێڵێتیر مشتومڕێکی درێژی سەبارەت بەم سیاسەتەی عوسمانییەکان باسکرووە. بڕوانە: ل ٣١-٤١.

**عوسمانییەوە لییان زەوتکرابوو.[٥٩] بریتاییەکان تەنانەت کۆتوبەندی یاسایی جیایان بۆ ناوچە خێڵەکییەکان دانابوو.• بەهۆی ئەم هەوڵو هەڵسوڕانە گشتییانەوە لەناوەڕاستی ١٩٢٠کاندا، سەرکردە خێڵەکییەکان جارێکی دیکە وەك هەرە قەوارەگەلی سیاسیو کارگێڕی بەهێز لەناوچە گوندنشینەکاندا دەرکەوتنەوە. ئەمەش بۆ بریتانییەکان جێگەی بایەخ بوو چونکە هاوکاری سەرۆکە خێڵەکییەکان جێگیریو ئارامیی ناوچە گوندنشینەکانی زامندەکرد. مرۆ دەتوانێت لەمەوە ئەنجامگیری ئەوە بکات کە پێدەچێت کە بریتانییەکان تەنیا کاتێك پشتگیری دەوڵەتسازییان کردبێت کە لەگەڵ بەرژەوەندییە کۆلۆنیالیو ئیمپریالییەکانیان هاوجووت بووبێت.**

**ئەو بونیادی دەسەڵاتەی کە لەلایەن حکومەتی بریتانییەوە لەماوەی سەردەمی ماندێتدا پێکهات بە جەختکردنەوە لەسەر جیاوازی توند ناسرابوو لەنێوان ئەو خەڵکەی کە دەوڵەتی عێراقیان پێکدەهێنا، هەروەها ئەم سیاسەتە کاریگەری کردە سەر پەیوەندییە نێو-ئیتنییەکان لەسالانی پاش ماندێتدا. بەوەش هەولگەلێك بۆ گرێدانی خێڵەکان لەپرۆسەی پێکهاتنی دەوڵەتدا نەبوو، وەك نێلیدا فوکارۆ دانی پێدا دەنێت:**

---

٥٩ بۆ باسکردنی کارەکانی بریتانیا سەبارەت بە سەرلەنوێ تۆکمەکردنەوەی خێڵایەتی بڕوانە:
TheKurds, Britain and Iraq' in McDowall (1996).

• لەم قۆناغەدا بەشێکی زۆر لەسەرۆك خێڵە مەزنەکانی عێراق لەبەر بیرکردنەوەیان لەپاراستنی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیانو بەهۆی ئاسانی بەکارهێنانیان لەلایەن بریتانیاو بژاردەی سیاسی نێوخۆییەوە ببوونە بەشێکی سەرەکیی لەنێوگەمەی سیاسیدا. ئەو سەرۆك خێڵانە بەهۆی ئەو کۆمەکەی کە دەیانتوانی پێشکەش بە بریتانیاو بژاردەی شەریفی دەسەلاتدارو سیاسییەکان بکەن جگە لەوەی موڵكو داراییەکی زۆریان لەلادێیەکاندا هەبوو، لەپارلەمانیشدا هەژمووندرابوون. ئەوانە پێگەی لاوازیی دەوڵەتو بوونی شوێنکەوتووانێکی زۆری خۆیان قۆزتبۆوەو بەقازانجی خۆیان لەگەڵ ئەو لایەنانەدا ساتو سەودایان دەکرد، ئەوان لەسۆنگەی ئەو پارەو بەرژەوەندیو تایبەتمەندیە قەزائییەی لەلایەن برتانیاوە بۆیان دابنیکرابوو زۆریان حەز بەمانەوەی قۆناغی ماندات و هێزەکانی بریتانیا لەعێراق دەکردو حەزیان نەدەکرد دامەزراوەکانی دەوڵەتو سوپا بەهێزبێت، هەمیشە سووربوون لەسەر بەشدارییکردن لەژیانی سیاسیو مانەوە لەنێو بازنەکانی کاریگەرییدا. بۆزیاتر:
Paul David "Fom Elite to Class: The Transformation of Iraqi 1920-1939". Internation Journal of Middle East Studies, Leadership, 1980, p344.

"عێراقــی ســەربەخۆ لەعوسمانییــەکانو کــارگێڕی بریتــانی بــەمیرات مــابۆوەو ململانێیــەکی درێژخایــەن لــەنێوان شــارەکانو ناوچــە گوندنشــینەکاندا هــەبوو، کــە بووەهــۆی ڕەنگدانــەوەی دابەشــبوونێکی قــووڵ لــەنێوان نیشــتەجێکانو جیهــانی خێڵەکییدا."[٦٠]

وەك جێپێهەلگرتنی  بریتانییەکانو هەروەها هاشمییەکان، بەعسییەکان سووربون لەســەر گرتنەبــەری سیاســەتی خێڵگــەرایی بۆئــەوەی ئامــانجو بەرنامــەکانیان بەرنەپێش. ئەو "retribalisation / بوژانەوە خێڵگەرایی"ەی دوای ساڵی ١٩٧٥ لە کۆمەلگادا، لەلایەن هەوڵەکانی بەغداوە لەرێگەی پێکهێنانی فەوجەکانی جاشەوە بەهێزکرا. هەروەك داڤید مکدۆواڵ ئاماژەی بۆ کردووە:" ئەوە بەغدا بوو کە بەئارەزوو خێڵەگەرایی هاندەداو بەهێزی دەکرد لەرێگەی کەمەندکێشکردنی سەرۆك خێڵەکانەوە بۆ زێدەکردنی هێزە میلیشیاییەکان دژی جووڵانەوەی نەتەوەیی کورد."[٦١]

بەغدا بەو هەڵمەتەی بەناوی ئەنفالەوە کردی بووەهۆی وێرانبوونی بنەما ئابوورییەکەی زۆربەی ناوچە گوندنشینەکانی کوردستان. هەروەها لەئاکامی ئەمەشدا، هێندێك خێڵ بژارەیەکی کەمیان لەبەردەمدابوو، بەڵکو دەبوو زیاتر ئەو داوا نائەخلاقییە پەسەندبکەن کە لەلایەن دەوڵەتەوە لێیانکرابوو کە بریتیبوو لەراژەکردن لەبەرژەوەندی دەوڵەت. هەروەك ئەلخەفاجی نووسیویەتی، ئەم خێڵانە"بوونە بەکرێگیراو (وەك زێباریو هەرکی) بۆئەوەی بتوانن شێوازەکانی پاراستنو پتەوکردنی دەسەلاتیان مسۆگەربکەن."[٦٢] ئەم گۆڕینەی هێندێك لەخێڵە دەرکەوتەکان بۆ بەکرێگیراو ئەوەندە بەهێزبوو کە رژێم بۆئەوە هەڵدەسوڕا

---

60 Fuccaro (1997), P. 561.

61  McDowall (1995), 'The Struggle for Kurdistan', MEI, No 498,14 April, pp. 19-20.

٦٢ ئەو هەروەها ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەو یەکانە لەو کاتەی لەلوتکەی هێزیاندا بوون ژمارەیان لە ٢٥٠ زیاتر تێپەڕیدەکرد کە دەیانتوانی زیاتر لە ١٠٠,٠٠٠ پیاوی خێڵەکی کورد تەیاربکەن. بڕوانە: al-Khafaji (1994), P. 27.

دابەشبوونێکی توند لەنێوان کورداندا پێکبهێنێت، ئەوەی خەباتی نەتەوەیی کوردی لاوازکرد. بەکارهێنانی خێڵگەرایی وەك ئامرازێك بۆ دژوارکردنی جەنگی نێوخۆیی کوردیی، سیاسەتێکی نویٚ نەبوو کە لەلایەن حکومەتی عێراقەوە گیرابێتەبەر. بەڵام یەکێك بوو لەو سیاسەتانەی کە بەشێوەیەکی هێرشبەرانەو دوژمنکارانە لەماوەی ساڵانی ١٩٨٠کاندا لەدەیەی رابردوودا گیرابووەبەر.

لەوانەیە زێدەبوونی تەیارکردنی کۆمەڵایەتی ببێتە فاکتەرێکی بەشداربوو لە هەڵوەشاندنەوەی ئینتیما خێڵەکییەکاندا، ئەگەر خەڵکی چیدی لەنێو قەڵەمڕەوی بەرتەسکی خێڵەکییدا قەتیس نەبن. دەرفەتەکانی ئەوەی ئاگاهییە خێڵەکێکەیان بەتێپەڕینی کات کەمتر زەقبێتەوە، چونکە ژمارەیەکی گەورە لە کوردان روویان لەژیانێکی ئارامی رێژەیی نێو شارەکان کرد، لەپاش هەڵمەتە بەرفراوانەکانی راگواستن‌و نیشتەجێکردنەوە کە لەلایەن بەغداوە ناوچە کوردییەکانی کردبووە ئامانج. شتێکی ئاسانە گریمانەی ئەوە بکرێت کە دەسەڵات‌و نفوزی خێڵەکان بەشێوەیەکی بایەخدار لاوازبوو لەماوەی دوو دەیەکەدا، هەرچەندە، لەوانەیە کە تائەو ئەندازەیەش نەبووبێت.

بەگەشەسەندنە نوێیەکانی ساڵانی ١٩٩٠کان، رێحەزێکی گشتی هەبوو بۆ دەرهاویشتنی رەگەزی خێڵگەرایی لەشرۆڤەکردنی کۆمەڵگای کوردیی‌و کاریگەرییەکانی لەسەر سیاسەت، هەرچەندە، کوردستانی عێراق بووە ناوچەیەك کە دیاردەیەکی نوێ "خێڵگەرایی نوێ" یان زیاتر بوژانەوەی خێڵگەرایی تێدا روویدا، کە ئاماژەی بەخێڵگەرایی بۆ دەدرێت "لەبەرگێکی نوێدا." ئەمە مانای ئەوە نییە کە جیۆگرافیای دابەشبوونی خێڵایەتی گۆڕراوە، یان ئەوەی کە نفوزی سەرکردە خێڵەکییەکان بەنەگۆڕاوی مابۆوە. چەندین کەسایەتییە سیاسییە جۆربەجۆرەکانی کوردستان لەسەر شانۆی سیاسی کوردیی، هێشتا لەسەر هێڵی دابە خێڵەکییە نەریتییەکان هەڵدەسوڕێن، بەڵام ئەوەی جیاوازە لێرەدا ئەوەیە کە هەریەکە لەدۆخە مرۆیی‌و ژینگەییەکە گۆڕاوە، ئەوەی کاریگەریی "خێڵگەرایی نوێیە".

هەروەك لەسەرەوە پێشاندرا، نیشتەجێبوونی بەشێکی گەورەی دانیشتووان

لەشـــارەکاندا لەســـاڵانی ١٩٨٠کانـــدا بووەهـــۆی وەرچـــەرخاندن لەرێکخســـتنی کۆمەڵایەتییدا، لەپرۆسەیەکدا کە تێیدا خولیا خێڵەکییەکانی پیاوانی پێشووی خێڵ تـــین‌و تـــاوی خۆیـــان لەدەســـتدا. لەنێوەنـــدە شارنشـــینەکاندا ئـــەرکی نێوەنـــدگیریی سەرکردەی خێڵەکیی- هەروەك لەرابردوودا هـەبوو، کـە یـەکێك بـوو لەهـەرە ئەرکـە ســـەرەکییەکانی چـــیدی داواکارییـــەك نـــەبوو، هەرچـــەندە، ئـــەم پەرەســـەندنە ئـــەو بیرۆکەیـەی لەخۆنـەدەگرت، کـە پێویسـتیی بـۆ ریشسـپییەکی پشـتگیرییکار لـەنێو کـــوردانی ئاســـاییدا ســـەردەمی بەسەرچـــووبێت. لـــەبری ئـــەوە، پشتبەســـتن بـــە ریشسپییەکی پارێزگارو بەدیهێنەری پێویستییە سەرەکییەکانی هێشتا بەشێوەیەکی مـــەزن رووخســـارێکی زۆرینـــەی کـــوردانی لادێیـــی‌و هـــەروەها شارنشـــینیش بـــوو، جیاوازییـەکان لەوەدایـە کـە ئـەو بەرپرسـیارێتییەی کەپێشـتر لەئەسـتۆی سـەرکردە خێڵەکییەکانـدا بـوو ئەمێستا کەوتۆتـەملی پـارتی دیمـوکرات‌و یـەکێتی نیشـتیمانی. سەرکردایەتی هەردوو پارتەکە لەناوچەی دەسەڵاتی خۆیاندا کاریانکردووە بۆئـەوەی لایـەنگری خەڵکەکـە مسـۆگەربکەن لەرێگـەی بوارەکـانی دامەزرانـدن‌و دابینکردنـی جێگەو خانوو پێویستییەکانی بنیاتنان‌و هەروەها خۆراك‌و هەر شمـەکێکی جیـاوازو هــەروەها پاراســتنیانەوە، بەوتەیــەکی دیکــە، تــۆڕی پەیوەندییــە کوێخاگــەرایی‌و (ئەرباب-رەعیەت) یەکان پەرەیسەندووەن هەروەك داڤید مکدۆواڵ لێکیداوەتەوە:

"جیاوازییەکانی کۆن‌و نوێ جێگای سـەرنجە: هـەردوولا بەشێوەیەکی چڕ لەڕێگەی دەستەگەلێکی فرە وەفادارەوە هەڵدەسوڕێن، هـەروەها لەڕێگەی ئەمانـەوە وەفاداری چەندین لە "خێڵەکان" بەڕێوەدەبـەن، ئـەم خێڵانـەی کـە ئەمڕۆکـە کـەمتر لەلایـەن دەرەکییەکانەوە دەبینـرێن وەك لە نەریتییەکان، بەڵام زۆربەشیان ئەو فەوجە جاشە کۆنانـەن، یـان ئـەو گروپـە پێشـمەرگانەن کـە لەلایـەن سـەرکردەیەکی لۆکاڵییـەوە سەرکردایەتی دەکرێن، هێندێکیش وەفادارییەکی پشتبەستوویان بـۆ دەسـەڵاتدارێکی بـاڵا هەیـە، کەسانێکی دیکـەش بازرگـانی بـەو داوایانـەوە دەکـەن کـە بەدەسـتیبێنن، لەهەرکوێ قازانجیان دەستبکەوێت وەفاداری خۆیان دەنوێنن." [٦٣]

63 McDowall (1995), MEI, No 499, 28 April.

ئەم خێڵگەراییە نوێیە لەکوردستانی عێراقدا دیاردەیەکی دابڕاو نییە، بەڵکو یەکێکە لەو دیاردانەی دەتوانرێت لەتەواوی عێراقدا ببینرێت. سەدام حسێن بۆئەوەی بەتوندی دەسەڵات بگرێتەوە دەست پاشئەوەی ڕاپەڕینەکەی ساڵی ١٩٩١ بەشێوەیەکی جدیی ڕکابەری دەسەڵاتەکەی کرد، لەسەرکردە کۆنە خێڵەکییەکان نزیکبۆوەو هەوڵیدا لەرێگەی تەرەفداری ئەم ئەشرافە لۆکاڵییانەوە پێگەی خۆی بەهێزبکات. چڕکردنەوەی ئەم تەیارکردنە بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەبەشە ناوەندییە زۆرینە سونییەکانی وڵاتدا بەڕێوەدەچوو. بەڵام هەروەها باشووری شیعی وەك زەمینەیەك بۆ تەیارکردنی خێڵەکی جێگەی بایەخە. بەسوودوەرگرتن لە فەزای زاڵی ترس‌و دڵەڕاوکێدا، هەنگاوی لەمشێوەیە بەڵگەی ئەوەبوو کە سەرۆکی عێراقی خولیای پتەوکردنی یەکێتی نەتەوەیی بوو لەسایەی فەرمانڕەوایەتییە دەسەڵاتگەراییەکەی خۆی بۆئەوەی دڵنیابێت لە ڕێگرتن لەیاخیبوونی جەماوەری زیاتر.[64]

چەمکی خێڵگەرایی نوێ لەوانەیە بەو شێوەی کەهێندێك پێشانیدەدەن "نوێ" نەبێت. لەچوارچێوە ئەفریقییەکەدا، تێبینیکراوە کە نزیکەی دەگەڕێتەوە ساڵی ١٩٧١ سەبارەت بە هەرێمگەرایی کە چیدی تەنیا بنکەی خێڵگەرایی پێکناهێنن، هەروەها دیاردەکە "بۆ ناوچەکان درێژبۆتەوە...گواستراوەتەوە بۆ زۆر دوور لە زێدی خێڵەکیی."[65] وەك ئاکامێکی مۆدێرنە، پیاوە خێڵەکییەکان لەوانەیە لەهەمان جێگەدا نەژین، بەڵام ئەوە ڕێگەی ئەوەی لێ نەدەگرتن کە "هێشتا لەگەڵ یەکتردا لەچوارچێوەیەکی تایبەتدا یەکبناسن."[66] ئەمەش پەیوەندیدارە بەو شرۆڤەکارییەی سەرەوە سەبارەت بە خولیا خێڵگەراییە نوێکان لەسیاسەتی کوردییدا، بەڵگەیە بۆئەوەی هەرچەندە کوردستان لەچەندین ڕووەوە بەشێوەیەکی بەرچاو تایبەتە، پەرەسەندنەکانی ئەوێ ڕەنگدانەوەی ڕێحەزی پەرەسەندنەکانە لەهەرشوێنێکی دیکە.

64 Mafeje (1971), p. 259.

٦٥ ئەمازیا بارام ئەمەی بەشێوەیەکی جدیی لە وتارەکەیدا باسکردووە لەساڵی ١٩٩٧دا.

66 Ibid.

## ٣ . ٣ . ٤ پوختە

پێدەچێت سیماگەلە بنەڕەتییەکانی خێڵگەرایی کوردیی هەمان ئەو بونیادو ڕێکخستنە خێڵەکییانە بن کە لەهەر شوێنێکی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیە، بەڵام لەڕووی کردارییەوە، کوردانی باکووری عێراق سەبارەت بەهێندێك تایبەتمەندی جیاوازن، بۆنموونە، خێڵگەرایی لەچوارچێوە ئەفریقییەکەیدا واباسی لێوەدەکرێت کە زادەی لاوازیی‌و گەندەڵیی دەوڵەتەکانە، نەك هۆکاری بێت،[٦٧] ئەوەی کە بەشێوەیەکی دروست وەسفی ڕەوشەکەی ناوچە کوردییەکان ناکات. ڕەهەندێکی تر کە خێڵەکانی ئەفریقا خێڵە سیاسییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست جیادەکاتەوە ئەوەیە کەخێڵەکانی ئەفریقا بەشێوەیەکی کەمتر بەتوندی گرێدراون وەك ئەوەی پێکهاتەیەکی کەلتووریی بن زیاتر لەوەی قەوارەگەلێکی سیاسی بن. ئەوەی پێچەوانەی خێڵی کوردییە کە وەك کۆمەڵێکی سیاسی بنەڕەتی دەردەکەوێت.

خێڵگەرایی لەچوارچێوەکەی باکوری ئەفریقا یان مەغریبی عەرەبیدا، زادەی خەڵکانێکە کە لەدەوڵەت هەڵدێن، هەروەك لەسەرەوە لەلایەن جۆن داڤیسەوە روونکراوەتەوە، بۆئەم خەڵکە بێدەوڵەتبوون بیرۆکەیەکی ئەرێییە. دووبارە ئەم حاڵەتە دوورە لەسۆزو ریاڵیتەی کوردانەوە. زیاتر لەوەش، لەنیمچە دوورگەی عەرەبی کاتێك دەوڵەتی مۆدێرن دامەزرێنراوە بەباشیی سوودیان لە هێزی خێڵگەرایی کردووە، تاڕادەیەکی وا هاوکاریی نێوان کەسایەتییە سیاسییەکان‌و سەرکردە خێڵەکییەکان، وەرچەرخانێکی سروشتی بۆ دەسەڵاتی سیاسی هێنایەئارا. لەوانەیە ئەم پەرەسەندنە باشترین پەیوەندی بە پێگەی کوردانەوە هەبێت، هەروەها چۆن فاکتەری خێڵەکیی لە سیاسەتی کوردییدا دەشێت وەك رێبازێك بگیرێتەبەرو سوودی لێ وەربگیرێت.

نزیکتر لەوان، بەکارهێنانی خێڵگەرایی لەلایەن رژێمی عێراقییەوە لەوەدا

67 Maybury-Lewis (1997) has elaborated on this, see particularly pp. 53-55.

بەرجەستەدەبوو کە سەدام حسێن زۆر گوێی بە ئایدیۆلۆجی نەدەدا. بە خۆبەردوورگرتن لە تەڵقینی ئایدیۆلۆجی، پشتبەستنێك بە خزمایەتیو سۆزی بەجۆشی وەفاداریو وابەستەیی بۆ سەرکردەو کارگێڕییەکەی پەرەیسەند. سەرکردایەتی دوو پارتە سیاسییە کوردییەکە ئەمە بەهەمان رادە ئەنجام نادەن، بەڵام لەبنەڕەتدا، هەمان خولیاو ئایدیا لەلایەن سەرکردە کوردو عەرەبەکانەوە سوودی لێوەردەگیرێت.

لەکۆمەڵگای کوردییدا هەمیشە دابەشبوون ئامادەگی هەبووە، بەڵام لەبری هەوڵی جدیی بۆ پڕکردنەوەی کەلێنەکانو کەمکردنەوەی پەرتەوازەی، لەڕاستییدا، پارتیو یەکێتی لەرێگەی هێنانەئارای راکێشانو وەفاداری جیاجیا کەلەسەر بەشە جۆراوجۆرەکانی خەڵکەکە ئەنجامیاندا ئەوندەی تر دۆخە پەرتەوازەییەکەیان دژوارتر کرد. سەرکردە خێڵەکییەکان کە ترنجێنراونەتە نێو سیستمە حیزبایەتییە تایبەتەکەیان، نوێنەرایەتی تاقمێك لەخەڵکی پارتی و یەکێتی دەکەن، زیاتر لەتاکەکانی کوردستانی عێراق بەگشتی. چالاکی سیاسیی کە لەرێگەی سیستمی خێڵەکییەوە ئاراستەکرابێت بابەتێکی چەندبارەوە لەمێژووی کورددا، هەروەها ئەتوارێکە پێناچێت بەرەو ئاوابوون بچێت.

وەفادارییە سیاسییەکان کەتەمەنی بەقەد سەدەیەکە، وەك بناغەیەك بۆ تەیارکردنی بەشە گەورەکانی دانیشتووان لەماوەیەکی کەمدا بایەخداره. خێڵ، هەروەك دێرش دەڵێت تاڕدەیەکی زۆر " هاوپەیمانییەکە لەبارەی پاراستنەوە."[68] ئەو پێویستییەی کە وێڕای مۆدێرنەی کۆمەڵگاو شارەکییبوونی دانیشتووانەکەشەوە ناوەستێت، هەرچەندە کەسانێك هەن کە مشتومڕ لەبارەی بەردەوامنەبوونی سیستمی خێڵایەتیی دەکەن. بۆ نموونە، ساتیامورتی، لەو باوەڕەدایە کە " بونیادە نەریتییەکان شایەنی داخورانن لەڕووی قەبارەو توانای جووڵەو هەروەها رێکخستنی کۆمەڵگای مۆدێرن یان پیشەسازیو تەکنەلۆجی."[69] دەتوانرێت داخورانی تەواوی

68 Dresch (1989), P. 346.
69 Sathyamurthy (1983), p. 73.

بونیادی خێڵ بەو ماوەیە دیاری بکرێت کە تایبەت بە بوونی خێڵەکان، هەروەها ئەوە بەتەنیا بەڵگەیەکی بەدوورزانینی دیارنەمانی ئەم قەوارەگەلانەیە لەئایندەیەکی نزیکدا. ئەوەی دێرش لەم پەرەگرافەی خوارەوەدا بەشێویەکی پاراو پوختەی کردووە:

"فۆرمەڵەبوونی دەسەڵات، لەسیستمی خێڵەکییدا سەرهەڵدەداتو دەکەوێت بێئەوەی بەشیکی زۆری ریزبەندی خێڵەکی بگۆڕێت. خێڵەکان، بەدەگمەن، ئەگەر هەرگیز، بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە دەبەنەوە یان دەدۆڕێن. ئاراستەی دەسەڵات ئەوەندە بایەخێکی ژیانی هەیە بۆ تێگەیشتنی رووداوەکان لەمەودای نزیکداو مەزەندەکردنی ئەوەی لەئێستادا کێ پشتگیریی کام لا دەکات. بەڵام ئەگەر سیستمی خێڵەکی وەك سەرچاوەیەکی گرفتی سیاسەتی مۆدێرن تەماشا بکرێت، هەروەها ئەویش شایەنی هەڵمژینە، هەروەها لەراستییدا زنجیرەیەکی نائاسایی لەململانێ دەگرێتەخۆ کەلەهەر لاوە بەسەریدا سەپێنراوە لەمیانەی ئەو هەزار ساڵەی دواییدا. شلڕۆییەکەی، بەشێوازەکەی خۆی، گەورەترە هەروەك ئەوەی، ئاینو فەلسەفە گەورەکان کە پێکهاتەکانیان لە چەندێکی کەم لە پرنسیپە روونەکان لەگەڵ زنجیرەیەکی بەرفراوان و نادیاریکراو لە کردار سەرابی نەگۆڕانێکی بەردەوام دێنێتەبەرچاو." [70]

پرسیارێك کە بەشێوەیەکی مەزن بەباتەکەوە پەیوەندییدارە ئەوەیە داخۆ مۆدێرنیتە، کە مانای ئامـاژەیی بریتیە لە پێکهێنانی دەوڵەت-نەتەوە، لەگەڵ رەگەزێکی نەریتی وەك خێڵگەراییدا کۆکە. مۆدێرنیتە پەیوەندییە خێڵایەتییەکانو دەلاقە کۆمەڵایەتییەکانی لاوازکردووە، هەروەك لەباسی پێشوو قسەی لەبارەوەکرا، کە پێدەچێت لەبەرێوەچوونی درێژخایەنیدا خێڵو بونیادە خێڵایەتییەکان لاوازکات. وادەردەکەوێت کە "کە خێڵ و دەوڵەتی هاوچەرخ بەرجەستەی دوو کۆتایی پێکدژ لە شەبەنگی رێکخستن دەکەن." [71] بەڵام بەپێچەوانەی داناییە

---

70 Dresch (1989), pp . 354-355

71 Crone (1986), p. 77.

نەریتەییەکــە لەوانەیــە بســەلمێت کــە ئــەوە رووبــدات پێکەوەکۆکردنەوەیــەکی بــەردەوامیو نوێکردنــەوە بێتــەدی کــە لەبنەڕەتــدا هــەردوو چــەمكو بیرۆکەکــە پایەدارکات

## ٣ .٣ ئاین

سیاسەتو ئاین جیان، بەڵام ئەوانەی پشت بەیەکتر دەبەستن بۆ ئەوەی کاری خۆیـان بەتەندروستی بکەن. ئەگەر هەڵسوڕانی سیاسی نێوەنـدگیری بـڕوا ئاینییـەکان بێـت، بـڕوا ئاینییـەکانیش بـۆ خۆیـان دەبنــە نێـوەدگیری سیاســەتێکی مرۆڤایەتییانــەی دروست." [٧٢]

ئەگەر هەبێت، ئەوا کەمن ئەو کۆمەڵگایانەی کە بتوانن ئیدعای ئەوە بکەن کە ئـاین هیـچ کاریگەرییەکی لەسەر گەشەکردنی کۆمەڵگاکەیان نەبووە بەومانایەی کە وتـاری سیاسـی بەتاڵـە لەهـەموو فـۆرمێکی کاریگـەریی ئـاینی، ئاماژەگـەراییو سـیمبولیزم. هـەروەك هایـانس لەشـرۆڤەکارییەکەیدا سـەبارەت بـە پەیوەندییـەکانی نێـوان کایـە ئـاینیو سیاسـییەکانی کۆمــەڵگاکان تێبینیکـردوە:" پەیوەندییــەکانی نێـوان ئـاینو سیاسـەت لـە هـەردوو رووی دیـالێکتیو کارلێککارییـەوە هەریەکـەیان مـۆرکی خـۆی لەوی دیکە دەداتو کـاری لێـدەکات." [٧٣] ئەمـەش ئاشـکرایە کـە لـەرژێمی کۆمەڵایـەتی کوردییـدا ببنرێـت، بـەوەی کـە سـەراپای سـەرکردە سیاسـییەکان هـەروەها بەنـەریت کەسایەتی ئاینیی بوون.

زۆرینــەی دانیشــتووانی کوردســتانی ناوەنــدیی موســوڵمانن، هەربۆیــە گەشــەکردنی ئـاینی- مێـژوویی ئـەم کۆمــەڵگا تاڕادەیـەك نەریتییـە، وێـڕای ئـەو رۆڵـەی لەئێسـتا بینـراوە لەلایەن ئـەم پێکهاتـەو پێکهێنـەرە سـەرەکییەی سیاسـەتی کـوردیی، لـەرووی دیدگا ئیسلامییە سونییەکانەوە لێکدەدرێتەوە. هەرچەندە، بـوونی کۆمەڵـە کەمینـە ئاینییـەکان لەناوچـەکە، پرسـیارێك دێنێتـە گـۆڕێ ئـەویش ئەوەیـە داخـۆ کەلێنـە

72 Davis (1980) p. 153.
73  Haynes (1998), p. 5.

ئاینییەکان شایەنی ئەوەن لەنێو کۆمەڵگادا ببینرێن. دەشێت ئەمە سروشتێکی جدیی بێت، بەڵام ئەم دابەشبوونانە لەوانەیە ململانێ ئەنگێز بێتو ببێتە هەڕەشە لەسەر فرەڕەنگیو لێبوردەی ئاینی لەمێژینەی کوردستان.

### ٣ . ٣ . ١ فرەڕەنگی ئاینی لەکوردستان

فەراهەمکردنی لێکدانەوەیەکی قووڵ سەبارەت بە کۆمەڵە ئایینیە جیاوازەکانو کارێلکیان لەسەراسەری کوردستاندا ئەرکێکی فرە گرنگە بۆ ئەم باسەو ئامانجەکانی. دواتر شرۆڤەکارییەکی زێدە پوخت سەبارەت بە بڕوائاینییەکان لەناوچەکەی جێگەی بایەخی راستەوخۆیە، هەوڵی بۆ دەدرێت.

زۆرینەی زۆری کوردان موسوڵمانی شافعینو لەسەر مەزەبی شافعین، بەوەش خۆیان لەتورکو عەرەبەکانی دراوسێیان جیاکردۆتەوە (ئەوانەی لەدەرەوەی چوار مەزهەبەکەی ئیسلام پەیڕەوی لە مەزهەبی حەنەفی دەکەن).[٧٤] هەرچەندە جیاوازی لەنێوان ئەم دوو مەزهەبە لەڕووی کرداره ئاینییەکانەوە زۆر بایەخدار نییە، مەزهەبی شافیعی ئەوەی بۆ هێندێك لەکوردان فەراهەمکردووە کە مۆرکێکی دیاری لێداون بەوەی جەخت لە شوناسی ئیتنیان لەهەمبەر رەگەزە دەرەکییە دوژمنکارەکان بکەنەوە.[٧٥]

مەزهەبە سەرەکییەکەی دیکەی ئیسلام، واتە شیعە، هەروەها لەنێو کورداندا بوونی هەیە، بەڵام بەژمارەیەکی رێژەیی کەمتر. کوردە شیعەکان بەگشتی بە کوردی فەیلی ناودەبرێن، کە لەباکووری عێراقدا بەتایبەت لەشارەکانی خانەقیو مەندەلی دەژین. ئەوان بەشدارییەکی بەرفراوانیان لەتەواوی کوردانی عێراقدا هەیەن بەڵام ژمارەیان بەشێوەیەکی بەرچاو کەمبۆتەوە پاش چوونە دەسەڵاتی حیزبی بەعس بۆسەرتەختی دەسەڵات.[٧٦]

---

74 van Bruinessen (1992), P. 23.

75 Kreyenbroek (1996), p. 93.

٧٦ لەنێوان ١٩٦٩و ١٩٨٨زیاتر لە ١٣٠,٠٠٠فەیلی کورد لەعێراقەوە بۆ ئێران دوورخرانەوە بەو بیانووەی کە رەگەزیان ئێرانییە (بەهۆی کۆبوونەوەی بەدبەختانەی هەردوو رەگەزی ئیتنی–ئاینی بەوەی هەم کوردن و هەم شیعە. وێڕای ئەو راستییەی کە بۆماوەی چەندیم نەوە لەعێراقدا دەژیان: Salih (1994), p. 196.

ئـەهلی حـەق کـە هـەروەها بەکاکـەیی ناسـراون لەمەڵبەنـدێکی باشـووری کەرکوکـدا دەژین، هەروەها مارتن ڤان بروینسن بڕوای وایە کـە ئەوانـە " پاشمـاوەی کۆمـەڵێکی زۆر گەورەترن لەتەواوی ناوچەکە کە ئێستا باشووری کوردستانو لورستانە." [٧٧]

رەوتێکی هەرتەقی دیکە کە زۆرجار بە هەڵەو بـۆ سـوکایەتی ئاماژەیـان پـێ دەدرێـت بـەناوی "شـەیتان پەرسـتانەوە"، بریتیەلـە ئێزیدییـەکان. پێدەچێت لـە مەزهـەبی سـونی ئیسلامەوە سـەریهەڵدابێت، بـەڵام ئـەوان زیـاتر لـە کۆمەڵەیـەکی تونـدڕەوی شـیعی دەچـن. زیـاتر لـەنێو هـەموو گروپـە ئاینییـەکانی دیکـە، ئێزدییـەکان زیـاتر کەوتوونەتەبـەر سـەرکوتکاری لەلایـەن موسـوڵمانەکانی دیکـەوە. ئێزدییـەکان تـەنیا لەنێو کوردانـدا هەن، بەزمانی کرمانجی دەئاخفنو بەشێوەیەکی سـەرەکیی لەناوچـە چیاییەکانی باشووری رۆژئاواو رۆژهـەڵاتی موسـڵو هـەروەها لەشـەنگار نیشـتەجێن، لەسنووری عێراق-ئێران. [٧٨]

بەلەبەرچـاوگرتنی رەگـەزی جـوو لەکۆمـەڵگای کـوردیی، ئـەوان بۆماوەیـەکی درێـژ کۆمەڵەگـەلێکی چـالاکی سەرتاسـەری کوردسـتان بـوون، ئـەوان پێکـەوە لەگـەڵ کریسـتیانییەکاندا، لەبنەڕەتـدا لـەبوارە زۆر تایبەتییـە ئابوورییەکـەی کۆمـەڵگادا هەڵدەسـوڕان. سـەبارەت بـە ئامـادەگیی جووەکـان لەکوردسـتانی عێـراق، ژمارەیـان بەشـێوەیەکی بەرچـاو لەناوەڕاسـتی سـەدەی بیسـتەمەوە دابـەزیوە، کاتێـك زۆربـەی کوردانی جوو کۆچیانکرد بۆ دەوڵەتی ئیسرائیل پاش دامەزراندنی لەساڵی ١٩٤٨دا.

پێشتر لـەتێوەگلانی دەرەکـی لەناوچـە کوردییـەکانو هـاتنی دەسـەڵاتە بێگانـەکان بـۆ هەرێمەکـە، سـێ کۆمــەڵی جیـای کریسـتیانی لەکوردسـتاندا هـەبووە، سـریانییە ئەرتۆدۆکسـەکان، ئاشـوورییەکانو هـەروەها ئەرمەنییـەکان. لـەنێو ئەمانـەدا، ئاشوورییەکان لەو شوێنەدا ژیاون کە ئێستا باکووری عێراقـە، ژمارەیـەکی زۆر لـەوان پاش ئـەوەی لەسـەدەی حەڤدەیەمـدا لەلایـەن مسیۆنێرە کاتۆلیکـە فرەنسییەکانەوە بوونە کاتۆلیكو ناوی کلدانییان بەسەردا دابڕا. ژمارەیـەکی زۆر لـە کریسـتیانییەکان

77 van Bruinessen (1992), p. 23.
78 Kreyenbroek (1996), pp. 96-99.

پاشتر لەناوچەکە هەڵاتن بەهۆی ئەو دوژمنکارییەی بەرامبەریان کرا- وەنەبێ پەیوەندی بەو دەستێوەردانەی بریتانیاو روسیاوە نەبێت کە بەبیانوی پاراستنی کریستیانییە لۆکاڵییەکانەوە ئەنجامیاندەدا- بووەهۆی کۆمەڵکوژیی خوێناوی.[79] زۆر لە کوردان مسیۆنێرەکانیان وەك " مژدەبەخشی دەستێوەردانە سەربازییە راستەوخۆکان" دەبینی، ئەو هەستانەی بوونەهۆی زێدەبوونی دژوارییەکانی نێوان ئەو دوو گروپە ئتنییە-ئاینییە لەکوردستان.[80]

ئەمە پێشانیدەدات کەچۆن ئاین وەرچەرخاوە بۆ فاکتەرێکی هێنانەئارای دابەشبوون و ململانێ لەلایەن دەسەڵاتە بێگانەکانەوە پێش دابەشکردنی کوردستان لەپاش یەکەمین جەنگی جیهانی. دەستێوەردانی دەرەکی لەکوردستان دژوارییەکی توندو دابەشبوونێکی کۆمەڵایەتی-کەلتووری خولقاند کە بێ ئەوانە لەوانە نەبوو سەرهەڵبدات، یان لانیکەم رەهەندگەلێکی مەزنی بەو چەشنەی لێ نەدەکەوتەوە.

## ٣ . ٣ . ٢ پەرەسەندنی "ئیسلامی کوردیی"و رۆڵی سیاسی شێخەکان

ئیسلام تارادەیەکی زۆر بەشێکی تەواوکاری کۆمەڵگاکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، هەروەها کوردستانیش لەوە بەدەر نییە. میشال گیڵسنەن، بەم پەرەگرافەی خوارەوە لێکیداوەتەوە کە ئیسلام چ چەشنە هێزێکی بزۆزو وەرچەرخێنەری بەهێزی بونیادی کۆمەڵایەتییە لەنێو کۆمەڵگادا:

"بەشێك لە زیندوێتیو دینامیزم لە ئیسلام لە کۆمەڵگادا لەو دژواریو رکابەریو پێکدژییە سەرچاوەدەگرێت کە لە پلەوپایەی تایبەتمەندە جیاوازەکانو هەروەها پیاوە پیرۆزەکاندایە، ئەوانەی لەوانەیە لەساتەوەختێکدا بەتەواویو بەئاشکرا بکەونە ناکۆکییەوە، جەخت لە کۆنترۆڵی تەنیای خۆیان بۆ دەسەڵاتی پێدراو یان

79 van Bruinessen (1992), pp. 24-25.
80 Ibid. p. 229.

**ڕێگەی هیدایەت بکەنەوە، هەروەها لەساتەوەختێکی دیکەدا بەدڵخۆشییەوە هاوکار بن یان تەنانەت یەکیشبگرن.."** [81]

**مشتومڕ سەبارەت بەم چەشنە"ڕۆحانییان"ە، بەئاماژەدان بە باسی رابردوو، لەچوارچێوە کوردییەکەدا خۆی لە"شێخەکان"و سەرکردە ئاینییەکانو هەڵسوڕانی سیاسیان بەرجەستەدەکات،• هەروەك پێشتر وتراوە، شێخەکان وەك نێوەندگیرێکی**

81 Gilsenan (2000), pp. 29-30.

• ئەو ڕۆڵە بایەخدارو پەرەگرتووەی شێخەکان لەژیانی کۆمەڵایەتیی و رامیاریی کوردستاندا گێڕاویانە و دەیگێڕن وا دەکات گفتوگۆ لەمەڕ پێگەیان لە کوردستاندا بکرێت . تەنانەت تروسکایی خستنێك بۆ سەر مێژووی کورد دەریدەخات کە ڕێبەرایەتیی شێخەکان لەنێو کوردانـدا و لـەماوەی زیاتر لـە سـەد سـاڵ ، چەسپاوترین شێوازی سەرکەوتووی ڕێبەرایەتیی بووە . بەتایبەت پاش نـەمانی میرنشـینە ئۆتۆنۆمـە کوردییـەکان.. .لەناوەراستی ساڵی ١٩٣٠دا ، (پیرەر رۆندۆت) لـە مێـژووی ژمارەیـەك لـە بنەماڵـەی شـێخەکانی کۆڵیوەتـەوە و گەیشتووەتە دەرئـەنجامێك . بـەگوێرەی دەرئەنجامەکـەی ، ئـەم بنەماڵانـە بەگشـتیی لـە دەرەوە دێـن و لەناوچـەیەکی دیارییکراودا جـێگیر دەبـن ، لایـەنگریی پەیـدا دەکـەن ، ناوبـانگێکی بـاش لـە خواپەرسـتیی و چاکەکاریی بەدەستدێنن ، لەگەڵ بنەماڵە دەسەڵاتدار و دەسترۆیشتووەکاندا لە ڕێگەی ژنوژنخوازییەوە تێکەڵ دەبن . ئەو دیاریی و بەخشینەی لـە موریدەکانیـەوە وەریـدەگرێت وایـان لێـدەکات سـامان و موڵـك و مـاڵێکی بەرچاو پێکەوەنێن ، ئەوەش پێگە و دەسەڵاتیان بەهێز و چەسپاوتر دەکات ... پاش ئەوەی شێخ لـەو شـوێنە نوێیەی بۆی دەچێت نیشتەجێ دەبێت ، یەکەمین کاری بریتیە لەوەی ناوبانگێکی خواپەرستیی و چاکەکاریی بۆ خـۆی بەدەسـتبێنێت . نوێـژی بـەردەوام ، ڕۆژوو ، هـەروەها سـادەیی و خـاکیی بـوونی ئـەم چەشـنە پیـاوە لەخواترسانە کاریگەرییەکی مەزن دەکاتە سەر کوردە چیاییەکان ، ئەوانـەی لەسـەر بێنـەزمیی و ژیـانێکی پـڕ ئارەزووکـاریی ڕاهـاتوون ... شـێخ بـەردەوام ویسـتی خێرخوازانـەی خـۆی بـۆ چارەسـەرکردنی کێشـەکان و ئاشتکردنەوەی دژەکان دەخاتە گەڕ، مورید پەیداکردن یەکێکی دیکەیە لـەو چـالاکییانەی کـە شـێخ بـەو پـەڕی تواناوە لەو شوێنە نوێیەی تێیدا نیشتەجێ بووە کاری بۆ دەکـات . زۆربـەی جـار ئەوانـەی دەیانکاتـە موریـد و شوێنکەوتەی خۆی کەسانێکی ناخێڵەکین کـە پێویسـتیان بـە پاراسـتنە ... هـەروەها شـێخ ، مینـەی کەسـانی دەسەڵاتداری لەنێو لایەنگر و موریدەکانییدا دەکرد .هاوپەیمانیەتیی ژنوژنخوازیی کە شێخ پـاش جێگیربـوونی لە شوێنە نوێیەکەی پێکی دەهێنێت یەکجار گرنگ و بایەخدارە بەهۆی ئەو پێگە و دەسەڵاتەی ئەو پەیوەندییـە پێی دەبەخشێت . ئەم ژنوژنخوازییە بەهەمان شێوەی هاوپەیمانیـەتیی ئەریسـتۆکراتیی پاشـایەتییەکانە ، کـە زۆربـەی جـار لەسـەر بنـەما و لەبەرچـاوگرتنی دەسـەڵاتە ...یەکـەمین پـەیوەنـدیی ژنوژنخـوازیی شـێخ لەگـەڵ سەرداری گوندێك یا سەرخێڵێکی لاوەکییدا دەبێت . دواتر کە بنەماڵەی شێخ پێگە و دەسەڵاتی بەدیهێنا ، ئنجا مینـەی ژنوژنخـوازیی لەگـەڵ بنەماڵـە شـکۆمەند و ناودارەکـان دەکـات . دوای ئـەوەی ئەمـە سـەری گـرت ،

هاوپەیمانیەتییەکی بەهێزی بۆ پێکهات . یەك لەو راستییە بەڵگە نەویستانەی بەگشتیی پەسەندە ئەوەیە کە سامان شێوەیەکی دەسەڵاتە . لە کەشێکی سەرەتایی و ساکاری وەك لەنێو کورددا هەیە ، دەسەڵات تەواوی بنەمای کۆمەڵایەتیی دیاریی دەکات و چالاکییەکانی خەڵك ئاراستە دەکات . سامان هێزێکی هاندەری مەزنە و لەنەستی هەموو تاکێکی دەسەڵاتخوادا ئامادەگیی هەیە ، هەربۆیە بەدەستهێنانی سامان یەکێکە لە خولیا و ئارەزووانەی شێخیان لە شوێنە تازە نیشتەجێبوونەکەیدا سەرقاڵکردبوو ...بەدەستهێنانی سامان وای دەکرد شێخ موریدی زێدەتر بەلای خۆیدا رابکێشێت و بتوانێت بەرێوەیان بەرێت . خواردن و چەك بۆ پاسەوانەکانی دابین بکات ، هەروەها بەو کەسانەدا رابگات کە روو لە خانەقاکەی دەکەن و پێویستیان بە یارمەتیی و هاوکاریی و پاراستنی دەبێت . سامانی شێخ لەو بەخشین و دیارییانەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەلایەن مورید و شوێنکەوتەکانیەوە بەسەریدا دەبارێت ، جا کەم بێت یان زۆر ، شتێکی باوە ، هەرچەندە بە زۆریش نیە ، هەر موریدێك سەردانی شێخ بکات دیارییەکی بچووك پێشکەش دەکات ،هەرچەندە مێر و سەردارە مەزنەکان سەرچاوەی سەرەکیی ئەو خەڵات و بەرات و دیارییانە پێکدەهێنن...خاوەندارییەتیی شێخ بۆ گوندو زەوییە کشتوکاڵییەکان هێز و دەسەڵاتێکی مەزنی بەسەر لادێیی و جووتکارەکاندا پێدەبەخشێت . ئەو پاراستنەی دەیاندرێتێ بەهۆی ئەوەوەیە کە لەسەر ماڵ و موڵکی شێخ ژیانیان دەگوزەرێنن و هەستی پابەندبوون بە کەسایەتییەکی پیرۆزەوە دەیانکاتە وەفادارترین دەروێش و دەستوپێوەندیی شێخ . جێگای سەرنجە ، ئەو گوندانە زۆرجار دەبنە گرنگترین بنکە و پێگەی گرنگی دەست و توانای شێخ ... کوردانی نەخوێندەوار و نەزان زۆر بروایان بە موعجیزە و دیاردە ناسروشتییەکان هەیە ، ئەوەش بە تەواویی دەیانخاتە بندەستی شێخەوە ... سەرباری ئەوەش ، چەندین جار موریدەکان بێئەوەی هیچ گوێ بە ژیانیان بدەن ئامادەبوون لەو راپەرینە جۆربەجۆرانەی لە لایەن ئەم پیاوە پیرۆزانەوە رێبەرایەتیی کراوە بەدەم شێخەکانیانەوە بچن . هەرچەندە نابێت پێمان وابێت ئەم (گوێڕایەڵییە کوێرانەیە) وەك هێندێك نووسەر ناوی لێدەنێن ، بە ئاسانیی بەدەستدێت . ئازایەتیی سەرکردە ، دانایی و لێهاتوویی ، پێگە و کەسایەتیی ، هەروەها توانا و ئامادەیی بۆ بەرگرییکردن لە بەرژەوەندیی مورید و مەنسوبەکانی ، یەکجار گرنگن بۆ ئەوەی بتوانێت بەڵادەستیی خۆی بەسەریاندا رابگرێت ...باوەڕ وایە کە شێخان خاوەن پیرۆزیی و توانایەکی ناسروشتیی دیارییکراون کە هێزێکی نائاسایی و موعجیزەئاسایان دەداتێ کە (کەرامات)ی پێدەگوترێت . ئەوە وای لێکردوون وەك کەسێکی پیرۆز بە رێز و شکۆمەندییەکی بەرچاوەوە سەیر بکرێن

دەگونجێت ئەم توانا نائاسایی و ناسروشتییە لەسەر بنەمای جەماوەرکێش و کاریزمای میراتگر بنیادنرابێت ، کە ئەو خێزانەی هەڵگری سیفەتی کاریزمایین تێیدا بەشدارن ، بەتایبەت خزمە نزیکەکانی ، یاخود لەسەر بنەمای کاریزمای تاکەکەسیی کە ئاکامی شیاویی و لێهاتوویی کەسەکەیە و وادەکات لەنێو پیاوانی دیکەدا دەرکەوێت و بناسرێت . ..پاش ئەوەی شێخ پیرۆزیی و توانای کاریزمایی بەدەست دەهێنێت ، ئیدی دەسەڵاتێکی بێ لێپرسینەوەی بەسەر مورید و شوێنکەوتەکانیدا دەبێت ، چ بەرهەڵستیی و بەرەنگارییەك چاوەڕێ ناکرێت و خواستەکانیشی جگە لە ملکەچیی تەواو، کەمتر پەسەند ناکات . وەفاداری و دەروێشی بۆ

**گرنگ کاریان کردووە بۆ ڕێگرتن لەوەی ناکۆکی نێو خێڵەکان بگاتە ئاستی ئەگەری پەلاماری چەکدارانە. هەروەها زۆرجار ڕۆڵێکی دوولایەنەیان وەك سەرکردەیەکی ڕۆحیو سیاسی بینیوە، ئەوەی سەرەتا کرداره ئاینییەکانیان لەناوچە دووردەستە گوندنشینەکان بەڕێوەدەبرد کە کردبوونی یە هێزێکی دەسەڵاتدار. بەگوێرەی وتەکانی میسوت یاگین، شێخەکان " ڕۆڵی نێوەندگیریان لەنێوان ئاینی ئیسلامو نەتەوایەتی کوردییدا ئەنجامداوە." [٨٢]**

**دوو نموونەی گشتی لەگەشەکردنی مێژووی ئیسلام لەکوردستاندا دەتوانرێت ببینرێت: یەکێکیان "ئیسلامی فەرمیو دامەزراوەییە"، ئەوی تریشیان دەتوانرێت دەشێت بە "ئیسلامی میللی" ناوی لێبنرێت. زۆربەی سەردارانی کورد خۆیان لەگەڵ ئاینە دامەزراوەییەکەدا گرێدابوو بێئەوەی جەخت لە شوناسی نەتەوەیی یان ئیتنیشیان بکەنەوە. لەکەناری ئەو ناوچانەی ئیسلامی فەرمیو دامەزراوەیی دەستی بەسەرداگرتبوون، ئیسلامێکی دیکەی جیاواز هەبوو لەقاڵبی ڕەوتێکی ڕۆحانی سۆفیگەراو لەسایەی ڕێبەرایەتی شێخەکان. هەروەك ڤان بریونسن ئاماژەی بۆ کردووە، " لێرە جیاوازییەکی ئاشکرا لەنێوان ئیسلامی فەرمیو ئیسلامی میللیدا**

---

ئەو دەبێت ڕەها و بێ چەندوچون بێت . ئەو وا دەبینێت کە دانپێدانانی دەسەڵاتە کاریزماییەکەی لەلایەن موریدەکانییەوە ئەرکێکە و پێویستە جێبەجێ بکرێت ، ئەو بەشێوەیەك بەخۆیەوە وابەستەیان دەکات کە شایەنی ئەوە بن هەموو جۆرە قوربانییدانێکیان لێ داوا بکات ...شێخ زۆرجار پەنا بۆ دانانی خەلیفە دەبات تا ناوبانگ و دەسەڵات و پێگەی خۆی لەناوچەکەی خۆی و هەروەها لە دەرەوەشدا بەهێز و پتەو بکات . دامەزراندنەکەشی کارکردنە بۆ کردنەوەی تەکیەیەك کە بۆنە ئایینییەکانی تێدا جێبەجێ بکرێت و هەروەها بەخشینی بەشێکیشە لە توانا و دەسەڵاتی شێخ بە خەلیفەی دانراو . خەلیفە جێگری شێخە لە کاتی ژیانی و تەنانەت دوای مردنیشی ، هەروەها لە شوێنێك یان وڵاتێکیش دادەنرێت کە تا ڕادەیەکی زۆر دووردەستە و لەوێش خەلیفە لە تەکیەکەیدا جێگیر دەبێت ... پتەویی و چەسپاوی دەسەڵاتی شێخ لەنێو موریدەکانیدا لەسایەی هەلومەرجێکی ئاساییدا ، ناتوانرێت هەتا ماوەیەکی درێژخایەن بەختی سەرکەوتنی هەبێت . وەك (وێبەر) ئاماژەی پێداوە ، شکستی توانای کاریزمای سەرکردە دەبێتە هۆی نەمانی دەسەڵاتی کاریزمایی. بڕوانە: جوەیدە، سەرچاوەی پێشوو، ل ١١٠–١٢٣.

82 Yegen (1996), pp. 219-220.

نییـه."، لەکاتێکـدا لێکدانــەوە جیاوازەکـان ئەوەکـەی دیکـەیان دەوڵەمەنـد دەکـاتو پێیداهەڵدەدات " ئەو وەك نەریتێکی رکابەر نابینرێت بەڵکو وەك بەشێك لەهـەمان پێکهاتە." [83]

تایبەتمەنـدی گـەورەی ئـاینیبوون لەکوردسـتاندا لـەو پێگـە بەرچـاوەی تەریقەتـە سۆفیگەراییەکانو کردارو هەڵسوڕانە تایبەتەکانیاندایـە، ئـەوەی کـە لـەنێو کۆمـەڵگا موسوڵمانەکانی دیکـە نابینـرێتـەوە، ئەوانـەی زیـاتر پـەیڕەوی لەشـێوە فەرمییەکـەی ئاین دەکەن. وێنای کوردی بۆ ئیسلام شێوازێکی بەهێزی سـۆفیگەرایی دەگرێتـەخۆو زۆربەی "عولەما"کانی کورد سەر بەیەکێك لەتەریقەتەکان یان ڕەوتە دەروێشـیەکان بوون، کەلەلایەن شـێخێکەوە ڕێبەرایـەتی دەکـرا. لەکۆمەڵگایـەکی نـەریتی کوردییـدا، ڕێبەری ئاینیی پێگەیەکی بەهێزی هەیەو وەك نێوەندو پەیوەسـتێك لـەنێوان خـواو خەڵکـدا تەماشـادەکرێت، زۆرجـار ئـەو خـۆی لەرەوشـێکی لـەباردا دەبینێتــەوە کـە دەتوانێــت ســەرکەوتووانە ســوودی لێوەربگرێــت بۆئــەوەی دەســەڵاتو نفــوز بەدەستبێنێت.

وەك لەلایەن ڤان بروینسنەوە تێبینیکراوە، شێخ تەنیا ڕۆڵێکی نییـە بـەڵکو چـەندین ڕۆڵی هەیە. هەرچەندە ئەو یەکەمجارو دواجار "پیاوێکی پیرۆز یـان ڕۆحانییەکـە"و کەمەندکێشکەری دڵسۆزی میللییە." لەبەر ئەمە، ئەو ڕێزێکی مەزنی لێدەنرێت، کە دەیکاتە ناوبژیوانێکی نموونەیی لەململانێکاندا- ئەو پێگەیەی کە هێزێکی سیاسیشی پێدەبەخشـی.[84] لەگــەڵ دیارنــەمانی تــەواوی میرنشــینە ئۆتۆنۆمــە کوردییــەکان لەناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەیەمـدا، چـەندین ململانـێ لـەنێو خێڵـە کوردییەکانــدا سەریانهەڵدا. لەم چوارچێوەیەدا، شێخەکان تەنیا کەسایەتی کوردیی بوون کەلەسەرو

83 van Bruinessen (1982), p. 285.

٨٤ ئـەتوانرێت ئـەوە زێـدەبکرێت کـە توانـای ئـەو وەك ناوەنـدگیرو ناوبـژیوان بـەهۆی ئـەو ڕاسـتییەوە زیـاتر بـەهێزدەبێت بـەوەی کـە زۆربـەی شـێخەکان حەزناکـەن لـەو شـوێنە بـژین کـە لێـی لـەدایکبوون، کـە هـیچ ئینتیمایەکیان بۆ هیچ یەك لەخێڵە خۆجێیەکان نەبووە.

van Bruinessen (1982), p. 286.

ئینتیما خێڵەکییەکانەوە بوەستن‌و بتوانن لەرەوشێکی پڕ ململانێدا ناوبژیوان بن.[85] بەوەش تەریقەتە سۆفیگەراییی‌و شێخەکانیان بەشێوەیەکی بەرچاو بایەخداربوون کاتێك توانیان " ئاگایی‌و هۆشیارییەکی گشتی سەبارەت بە یەکێتی ئیتنی بێننەئارا کە جیاوازییە خێڵەکی‌و ناوچەییەکان تێپەڕێنێت." [86]

ئاین‌و سیاسەت لەئیسلامدا بەشێوەیەکی بەرفراوان پێکەوەگرێدراون. ئەم تێگەیشتنەش لەو راستییەوە سەرچاوەدەگرێت کە کە کۆمەڵگای ئیسلامی"ئوممە" دوو ئەرکی پێکەوەی وەك جەستەیەکی ئاینی‌و سیاسی دەگرێتەخۆ. لەسۆنگەی ئەم پێشینەیەوە، پێدەچێت سروشتی بێت چاوەڕێی ئەوە بکرێت کە کەسایەتی ئاینیی دوای چالاکی‌و ئامانجی سیاسی بکەون. لەوانەیە نادروست بێت بانگەشەی ئەوە بکرێت کە هۆشی ئوممەی ئیسلامی لەسەردەمی میرنشینە کوردییە ئۆتۆنۆمەکانی سەدەی شازدەیەم‌و حەڤدەیەمدا بەسەر هۆشی نەتەوەییدا زاڵبووە. بەڵکو زیاتر تەواوکەری بوو. لەماوەی کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم‌و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، لەکاتێکدا کە خەریکبوو هێزی نەتەوایەتی پێگەی خۆی لەکوردستاندا دەچەسپاند، رێبەرە رۆحییەکان کەوتنە ئەوەی بایەخێکی زێدەتریان لەسەر شانۆی سیاسیی هەبێت.[87] شێخەکان لەرێی تەریقەتە سۆفیگەراییەکانیانەوە توانیان دەستیان بگاتە موریدو مەنسوبەکانیان لەناوچەیەکی بەرفراواندا، ئەوەی توانای ئەوەی پێبەخشین ژمارەیەکی زۆر لەم موریدە بەجۆشانە لەوکاتانەدا تەیارکەن کە رەوشەکە دەیخوازێت.[88]

زۆرجار باس لەوەکراوە گوایە سروشتی رادیکاڵ‌و سێکیولاری نەتەوایەتی وای لە

---

85 Salih (1994), p. 200.

86 van Bruinessen (1992b), p. 51.

٨٧ سەبارەت بەو شێوازانەی کە شێخەکان نفوزی سیاسی‌و ئابووری لەرێگەی ئاینەوە بەدەستدێنن بڕوانە:
van Bruinessen (1992), p. 210.

88 Breuilly (1982), pp. 311-312.

دەسەڵاتدارە ئاینیە نەریتییەکان کردووە دڕدۆنگانە بڕواننە ئەم ئایدیۆلۆجیایە، بەڵام هەروەك برویسن ئاماژەی پێداوە، دڕدۆنگییەکی بەك چەشنە پشتیبەستووە بە"ئەو پێگەیەی جووڵانەوە نەتەوەییەکە گرتوێتیەبەر لەحاست ئاینە دامەزراوەییەکەدا."[89] ئەگەر مەسەلەی شەڕکردنیش بێتەپێشەوە، لەوانەیە هەمان دوژمن، واتە نەتەوەییەکان، خۆیان بەباشی لەگەڵ دەسەڵاتدارە ئاینییەکان دەکەنە هاوپەیمان. لەوەش زیاتر، " پێناسەکانی نەتەوەییەکان بۆ نەتەوە زۆرجار بە چەمکی ئاینی رازێنرابۆوە."[90] هەروەها ئەزموونە کوردییەکە نموونەیەکی باشە، هەروەك پێشتر ئاماژەی بۆکراوە. لەکوردستاندا، پیاوانی ئاینی یان رۆحانییەکان لەوانەیە کەمتر دامەزراوەیی بن‌و زێدە میللیتر بوون لەزۆربەی شوێنەکانی دیکە، ئەوانە رۆلێکی فرە چالاکیان لە جووڵانەوەی نەتەوەییدا بینیوە.

لەچەندین ئەو تەریقەتە سۆفیگەراییانەی لەجیهانی ئیسلامیدا هەن، دووانیان لەوانە لەکوردستاندا بایەخیان پەیداکردبوو، تەریقەتی قادری‌و نەقشبەندی. یەکەمین یاخیبوونی کوردیی کە رەنگی نەتەوەیی لەخۆیدابوو لەساڵی ١٨٨٠ لەلایەن شێخی تەریقەتی نەقشبەندییەوە "شێخ عوبەیدوڵڵا " رێبەرایەتی کراوە، هەروەها راپەڕینە سەرەکییەکەی ساڵی ١٩٢٠لەلایەن شێخ سەعیدەوە (مەبەستی شێخ مەحموودی شێخ سەعیدی بەرزنجییە/وەرگێڕ) بەرجەستەی تەریقەتی قادری دەکرد.[91] لەکاتێکدا کە رێبەری کوردیی هاوچەرخ لەباکووری کوردستان، مەلامستەفا بارزانی کۆچکردوو(نەقشبەندی) هەروەها جەلال تالەبانی (قادری) بە باشیی سوودیان لەرۆڵی ئاینی نەریتی بنەماڵەکانیان کرد لە هەڵسوڕانە سیاسییەکانیاندا، هەرچەندە بۆخۆیان شێخ نەبوون.[92]

89 Ibid.
90 Ibid
91 For an account of this see Olson (1989).
92 Salih (1994), p. 199.

## ٣. ٣. ٣ ئاین وەك هێزێكی تەیاركردن لەكوردستانی عێراقدا

ئـاین بەدەگمـەن ئایدیۆلۆجییـەكی سـتاتیك‌و چەقبەسـتووە، بـەڵكو فەلسـەفەیەكی بـزۆزە هـەروەك لـە پرۆسـە بەردەوامـەكانی گۆڕانـدا دەبینرێـت- لـەو سۆنگەیەشـەوە پەیوەندییەكانیان لەگەڵ سیاسەتدا بـەگوێرەی كـات دەگۆڕێـت."[93] رۆڵـی ئـاین لـەنێو سیاسەتی كوردییدا لەرۆژە بەراییەكانی جۆشدانی نەتەوایەتییدا ئاوڕی لێدراوەتەوە، هـەروەها لەكاتێكـدا كـە ئـاوڕیش لـە دەمـە هـەر هاوچـەرخەكان دراوەتـەوە، ئەوپرسیارەی كـە داخـۆ جووڵانـەوەی ئیسلامی نـوێ دەتوانێـت هـەمان ئـەو نفـوزو دەسـەڵاتەی بەسـەر سیاسـەت‌و ئاینـدا هـەبێت كـە رێبـەرە ئاینییـەكان لەسـەرەتای سـەدەی بیسـتەمدا هـەیانبووە. راپەڕینەكـەی شـێخ سـەعید لەسـاڵی ١٩٢٥ بەتونـدی پشتی بەئاین بەستبوو وەك ئامرازێكی بنەڕەتی بۆ تـەیاركردن‌و پرۆپاگەنـدەكردن.[94] ئایا ئەمڕۆكـە هـیچ یـەك لەوانـە دەتوانرێـت ببینرێـت؟ ئایـا سـیمبولی نەتەوایـەتی كوردیی، كە لـەباكووری عێـراق خـۆی بەرجەسـتەدەكات، هێشـتا سروشـتێكی ئـاینیی هەیە؟

لەسەرتاسەری رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا، ئـاین وەك ئـامرازێكی رەوایـەتی دەسـەڵات بـۆ زۆر لەرژێمەكان دەبینرێت، جا ئەو رژێمانە پاشایەتی یان كۆماریی بن، هەروەها ئەم بەكارهێنانـە بەردەوامـەی ئامـاژە ئاینییـەكان لـەنێو سیاسـەتی كوردییـدا نەناسـراو نییە. جگـە لـە میراتـی رەگـەزە نەریتییـەكانی كارەكتـەرە ئاینییـەكان‌و كاریگـەرییان بەسەر وتاری سیاسییەوە، هەروەها ئامـاژە ئاینییـەكان وەك ولامێـك بـۆ گەشـەكردنە هەرێمییەكان بەكارهێنراوە. نەك تەنیا شۆڕشی ئیسلامی لەئێران ساڵی ١٩٧٩، بـەڵكو هــەروەها سیاســەتی مەبەســتدارانەی ســەدام حســێن بــۆ رەوایەتییــدان بــە فەرمانڕەوایەتییەكەی لەڕووی ئاینییەوە، كاریگەریان لەسەر كوردو گەڕانـەوەیان بـۆ ئاماژەو سەرچاوە دینییەكان هەبوو.

93 Haynes (1998), p. 5.
94 Olson (1989), p. 153.

بیروڕا مارکسییە- لێنینییەکان ڕەگەزێکی بەهێزە لەوتاری سیاسیی کوردیی بەدرێژایی ساڵانی ١٩٧٠کانو ١٩٨٠کاندا، بەڵام بەهۆی سەرهەڵدانی ئیسلامی ڕادیکاڵەوە لەهەرێمەکەدا لەناوەڕاستو کۆتایی ١٩٨٠کاندا، ڕێکخراوە کوردییەکان (لەبنەڕەتدا یەکەکەو هەروەها بەڕادەیەکی کەمتریش ئەوانە لەباکووری عێراق) ناچاربوون لەهەڵوێستو هەڵسورانیاندا موجامەلەیەکی زیاتری ئاین بکەن، وەك ئاکامێکی فەزای سیاسی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

لەوکاتەی کە ڕاپەڕینێك لەلایەن سمکۆی سەرۆك خێڵەوە بەرسنگی دەوڵەتی ئێرانی لەساڵی ١٩٢٠دا گرت، دوو ئایدیۆلۆجی گرنگ سەریانهەڵدا کە بانگەشەیەکی بەرفراوانتری لە وەفادارییە خێڵەکییەکان هەبوو کە: پان ئیسلامیزمو نەتەوایەتی کوردیی بوو. ئەم جووڵانەوانە سەرچاوەگەلێکی ئایدیۆلۆجیو مادیی دەسەڵاتیان پێشکەش بە سەرکردە خێڵەکییەکان کرد کە هاوشێوەی ئەوەی دەوڵەت بوو، بەڵام جیاوازییەکە ئەوەبوو کە ئیسلامیستو نەتەوەییەکان پشتیان بەخێڵەکان بەستبوو بۆ هێزو دەسەڵاتی سەربازی.[95] کاتێك ئیسلام وەرچەرخا بۆ هێزێکی سیاسی لەکوردستانی عێراق، خێڵەکیان لەبەر هێزە سەربازییەکانیان بوونە پێویستییەك، هاوشێوەیەکی مێژوویی ئەو پرسیارە دێنێتەپێش کە داخۆ جووڵانەوە ئیسلامییەکان ی ئەمڕۆکە لەکوردستانی عێراقدا هەڵدەسوڕێن هەمان پێویستیان بە بنکەی خێڵەکیی هەیە بۆئەوەی هەر کاریگەرییەکیان لەسەر سیاسەتی کوردستانی عێراقدا هەبێت.

لەزۆربەی بەشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە ئیسلامی سیاسی بۆتە هێزێك، ڕێحەزی بەرجەستەبوونیان لەکۆمەڵگای شارەکییو ئەندامگیریشیان بەشێوەیەکی سەرەکی لەنێو لاوانی پەراوێزخراودایە. هەروەها لەکوردستانی عێراق، کاریگەریی ئەم گروپانە تەنیا لەنێو خەڵکانی زۆر موحتاج دەتوانرێت ببینرێت، ئەوانەی پێدەچێت بەهۆی دەستکەوتی داراییەوە دەسەڵاداریێتی ئیسلامییەکانیان پەسەند

---

95 van Bruinessen (1983), p. 378.

کردبێت. هەوڵی جووڵانەوەی ئیسلامی رادیکاڵ بۆ دامەزراندنی خۆیان لە باکووری عێراق‌و خۆسەپاندی خۆی وەك ئەکتەرێکی کۆمەڵایەتی، مل بەملەی دەسەڵاتی شێخ و تەریقەتە سۆفیگەراکان دەکات ، بەوەش گلاوەتە جۆرێك لە "ململانێی کۆمەڵایەتییەوە". بەهۆی سروشتی ئاینییبوونی کوردەوە، بەوەش ئەم چەشنە ئیسلامیزمە نوێیە رووبەڕووی کۆتگەلێك دەبێتەوە کە جووڵانەوە ئیسلامییەکانی دیکەی هەرێمەکە ئەوەندە خۆیانی پێوە سەرقاڵ ناکەن. [96]

لەبەرئەوە پێدەچێت هێشتا سیاسەت، ئاین‌و هەروەها چەکداریی بەشێوەیەکی نزیك‌و راستەوخۆ تێکەڵبن. رەگەزەگەلە ئاینییە نوێکە بنکەی سیاسی‌و سەربازی لاوازە، بەوتەیەکی دی، بنکەی خێڵەکی، لەمپەر دەخاتە بەردەم هەوڵەکانی بەدیهێنانی پێگەی کاریگەر لەسیاسەتی کوردستانی عێراقدا (لەڕاستییدا بزوتنەوەی ئیسلامی سێیەمین هێزی گەورەی قەوارە ئۆتۆنۆمەکەیە، بەلام رکابەری "زلحیزبەکان"ی پێناکرێ). زۆربەی گرفتەکانیان لەو راستییەدایە کە ئەو گروپە ئیسلامییە نوێیانە وەك ئاژانسێك لەقەڵەم دەدرێن کە لەبری هێزە بیانییەکان هەڵدەسوڕێن، بەتایبەت رژێمەکانی ئێران‌و سعودیە، ئەوانەی بەتوندی مایەی بێزاری رۆشنبیرەکان‌و ئەو رەشەخەڵکەن کە "ئاین لەدڵیاندایە". دەتوانرێت زۆربەی دانیشتووانەکە بەسەر دوو گروپدا دابەشبکرێت سەبارەت بە هەڵوێستی نەرێیان لەهەمبەر وردە جووڵانەوەی ئیسلامییە نوێیەکە، یەکەم نەوە بەتەمەنەکە کە خەڵکانێکی نەریتی ئاینین بەئاسانی هیچ هزرو ئایدیایەکی نوێ بەمێشکیاندا ناچێت، دووەم، نەوە نوێ‌و گەنجەکە کە لەرووی سیاسییەوە چالاك بووە کەمە پەیوەستییەکی بەئاینە نەریتییەکەوە هەیەو خولیاو رێحەزی ئەوەیە پێشکەوتنی ئەم جووڵانەوە ئیسلامییە نوێیە رەتکاتەوە. [97]

هەروەها جیاوازی جیۆگرافی گرنگ لە پەسەندکردنی کاریگەریی ئیسلامی نوێدا

---

96 Compare the views of Oliver Roy (1994), The Failure of Political Islam, London: I.B. Tauris.

97 Explained by Dr Latif Rashid, London 1999.

هەیـــە. هــەروەك داڤیــد مكــدۆواڵ ئامــاژەی بــۆكردووە، بزوتنـــەوەی ئیســـلامی پشتگیرییەكی بەهێزی لە ناوچە شارنشینە سۆرانییەكاندا هەیـە...كـە پێشانیدەدات پاڵنەرە ئیسلامییەكان لەناوچـە فـرە نەریتییەكانـدا كـەمتر بـەهێزترە، واتـە ناوچـە شـاخاوییەكانو دەڤـەری كرمانجییــەكان."[98] لەڕاسـتییدا، جوندولئیسـلام، هــەروەك پێشتر تێبینیكرا، لەباشووری ڕۆژهەڵاتی هەرێمەكە هەڵدەسوڕێت.

حەمیـد بوزئەرسـلان لەگفتوگۆیەكـدا سـەبارەت بـە ئیسـلامی سیاسـی لەكوردسـتان دەڵێـت لەوانــەی كـە ئیسـلامیزمی كـوردیی بەشـێوەیەكی سـەرەكی لـەدوو ڕێگـاوە كاریگـەریی لەسـەر هەرێمەكـە هـەبێت. مەترسـی دابەشـبوونی زێـدەتری كۆمـەڵگای كـوردیی لەگۆڕێدایـە گـەر گروپـە ئیسـلامییە كوردییـەكان ڕێبـازێكی جیهـانی گشـتی بگرنـەبــەرو پەیوەســتی یــەكگرتوو لەگــەڵ هێزگەلێكــدا دابمــەزرێنن لــەدەرەوەی چوارچێوە كوردییەكـە، چ تـوركی یـان ئێرانـی یـا عێراقـی یـاخود هـەر بەدەنەیـەكی ئیسـلامی دیكــە(ئــەو ترســەی كــە بــە پەیوەنــدی ئیــدعاكراوی جوندولئیســلام بــەرێكخراوی ئەلقاعیــدەوە نموونــەی بــۆ دەهێنرایــەوە). ئیسـلامیزم بــە گــوێرەی پێناســەكردنی بــریتی نییــە لەئایدیۆلۆجییــەكی گشـتی بـۆ خــەباتی نەتەوایــەتی، هەروەها ئەو ڕایەڵەیەی لەنێوان نەتەوایەتیو ئیسلامیزمدا هێنراوەتـەئارا لەوانەیـە تەمومـژ لـەوتاری سیاسـییدا بخولقێنێـت، هــەروەها ببێتــەهۆی گروپگـەلی سیاسـی نائیسلامی سوود لە ئامـاژە ئیسـلامییەكان بكـەنو ڕەوایـەتی بـە گرتنەدەسـتیان یـان خولیای بەدەستهێنانی دەسەڵات بدەن.[99]

وێـڕای ئـەوەی زۆرینـەی بـەرفراوانی كـوردان موسـوڵمانن، كەچـی فانـاتیزمی ئـاینی نائامادەگییەكی ڕێژەیی لەكوردستاندا هەیە. پـێش دەركـەوتنی جوندولئیسلام، ئـەو جووڵانـــەوە ئیســـلامییانە لـــەنێو هەرێمـــە كوردییەكـــەدا پێكهـــاتبوون، خولیـــای میانـەڕەویو تەنانـەت پێشكەوتنیش بەشـێكی كارەكتـەریان بـوو، بەبـەراورد لەگـەڵ گروپە ئیسلامییەكانی شـوێنەكانی دیكـەو ئەوانـەی بۆناوچـەكە "هـاوردە"كرابـوون.

98 McDowall (1995), 'The struggle for Kurdistan', MEI, No 499, 28 April
99 Bozarslan (1998

پاش شۆڕشی ئیسلامی ساڵی ١٩٧٩، ئیسلامییە توندڕەوەکان بەشێوەی گروپی بچووك لەکوردستاندا دەرکەوتن، بەڵام ئەمە بەزادەی دەستوەردانێکی دەرەکی بۆ رژێمێکی دیاریکراو لەقەڵەم دەدرا بۆئەوەی رێکخراوی پاڵپشتیکەر لەنێو کورداندا دابمەزرێنن، یاخود بەئاسانی بۆ هاندانی دژوارییەکانی نێوخۆییو هەروەها نێوان هێزە کوردییەکان، لەرێگەی فرۆمیکی نوێی ئیسلامیی فرە بەسیاسییکراوەوە.[١٠٠] لەوانەیە جوندولئیسلام زیاتر وەك دیاردەیەکی مۆدێرن لەقەڵەم بدرێت ئەوەندەی کاردانەوەیەك بێت لەحاست مۆدێرنیتە لەنێو رەشەخەڵکێکی نەخوێنەواردا.
پارتەکانی ئیسلامی سیاسیی کە لەلایەن کۆماری ئیسلامی ئێرانەوە دامەزرێنران و بەهێزکران، وێڕای هاوکاری مادیی و سەربازی ئێران نەیانتوانی ماوەیەکی زۆر بمێننەوە.[١٠١] بەردەوامترین هێزی ئیسلامی، گروپەکەی شێخ محەمەد خالیدی بارزانی بوو بەناوی حیزبوڵلا، هەرچەندە، ئەو بۆ بەدەستهێنانی پشتگیریی بۆ پارتەکەی پشتی بە وەفادارییە نەریتییەکە دەبەست بۆ شێخانی بارزانی زیاتر لە ئایدیۆلۆجی ئیسلامی.[١٠٢]

## ٣ . ٣ . ٤ پوختە

سەرهەڵدانی جووڵانەوەکانی ئیسلامی سیاسی لەجیهانی عەرەبی دەتوانرێت بەشێوەیەك بخوێنرێتەوە کە دژی ئەو پێشینەیەی شکستی سەربازی عەرەب بوو بەتایبەت ئەوەکەی ساڵی ١٩٦٧، هەروەك لەلایەن پیسکاتۆرییەوە روونکراوەتەوە، بەڵام پێدەچێت ئەوانە هەروەها وەك کاردانەوەیەك لەحاست سێکیۆلاریزەو مۆدێرنیزەی کۆمەڵگا دەرکەوتبن، ئەوەی کە درك بەوە دەکات ئەم دۆخە لاوازی

---

١٠٠ بۆ زیاتر سەبارەت بەمە بڕوانە باسی شەشەم" کوردستانی عێراق لەسەر شانۆی هەرێمی".
١٠١ تێوەگلانی ئێرانییەکان لەکوردستانی عێراق لەباسی شەشەمی دادێ باسدەکرێت.
102 Salih (1994), pp. 204-205

بایەخی ئیسلامی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتـەوە.[103] هەرچـەندە، لەکۆمـەڵگای کوردییـدا، پێناچێت ئەو رەوشە فەیراناوییـە سیاسـیو کۆمەڵایەتییـە روویـدابێت. بـەهۆی ئـەو سروشـتـە ئاینییبوونــە کوردییــەی پێشـتر ئامــاژەی بـۆکراوە لەگــەڵ رەگەزگــەلێکی بەهێزی سۆفیزم، بایەخی ئاین لەکایەی کۆمەڵایەتی ژیانـدا پێناچێت لاوازبووبێت. گەر بچینە سـەر کایـە سیاسـییەکەش ، ناتوانرێـت تێیـدا ئـاین بـە هێزێکـی کاریگـەر لەقەڵەم بدرێت. هـەروەك ڤـان برویسـن ئـەنجامگیریی کـردووە، ئـەوەی بـەرفرەترین کۆڵینەوەی سـەبارەت بـە رێکخـراوە سیاسـیو کۆمەڵایەتییـەکانی کۆمـەڵگای کـوردیی کــــردووە:" فاکتــــەری ئــــاینی، وێــــڕای گرنگــــی...پێناچــــێت وەك خــــودی خــــۆی لەهاوپەیمانێتیو نارەزایەتییە سیاسییەکاندا کاریگەرو یەکلاکەرەوە بن."[104]

بنەما تیۆکراتییەکە سـەبارەت بـە ئەسڵی خوادییبـوونی دەسـەڵات، ئـەوەی کـە پاشـا دەسەڵاتی خۆی لە خواوەندەوە وەردەگرێت نەك لە خەڵکەوە کـە فەرمانڕەوایـەتیان دەکات- لەجیهانی ئیسلامیدا زۆر راشکاوانە خـۆی لـە بنـەمای "ویلایـەتی فـەقیهی" ئایــەتوڵڵا خومەینیــدا بەرجەســتەکردووە- وادەکــات ئــاین پێگەیــەکی بــەهێزی لەدەسـەڵاتدا هـەبێت. ئـاین هـەرگیز بەتـەواوی گاریگەرییـەکی ئـەوتۆی لەسیاسـەتی کوردییـدا بەدینـەهێناوە- ئـەو وەك رەگـەزێکی گشـتگیری نـەریتییو بەشـێوەیەکی بەرچـاو لەگـەڵ خێڵگەراییـدا بەناویەکداچـوون، بـەڵام نـەك خـودی خـۆی وەك رەگەزێکی بەهێز.

پێدەچێت گرنگی ئیسلام لە گەشـەکردنی کۆمەڵایـەتی-سیاسـی کوردییـدا هاوشـێوەی خۆی لەکۆمـەڵگای عەرەبییـدا ببینێتـەوە، بـەوەی کـە " پەیامبـەر لـەنێو خێڵەکانـدا هەڵسوڕاوە، بـەها خێڵـەکییو ئاینییـەکانیان یـەکتریان بـەهێزکردووەو رەوایـەتیان بەیەکتر داوە.[105] بایەخی قووڵی ئـەم خاڵـەش ئەوەیـە کـە بەشـێوەیەکی جیـا سـەیری

---

103 James P. Piscatori, (1986), Islam in a World of Nation-States, Cambridge: Cambridge University Press, pp. 26-34.
104 van Bruinessen (1992), p. 23.
105 Crone (1986), p. 75.

فاکتــەری ئــاینی نــەکرێت، بــەڵکو لەبەرامبــەر پێشــینەی خێڵــەکیی‌و بونیــادی کۆمەڵایەتی-ئابووری کۆمەڵگاشدا.

لەکۆمەڵگایــەکی نــەریتی وەك کۆمــەڵگای کوردییــدا کــە هێشــتا ئــاین هێزێکــی دەسەڵاتداری نێو ژیانی خەڵکی پێکدەهێنێت، پێویست دان بەو دابەشبوونەی نێوان سایکۆلۆجیەتی جیای شارو گونـد-خێـڵ بنرێـت، ئـەوەی دواییـان کـە زێـدەتر بـۆ دەسەڵاتدارێتییە ئاینیەکە دەچەمێتەوە. هەروەك ساتیامورتی ئاماژەی بۆکردووە، " کۆدەنگی سیاسی لقێکە لەو ئیجماعە ئاینییە گشتییەی لەجیاتی کۆمەڵگا لەلایەن موجتەهیدەوە یان عولەماوە دەردەبڕێت. تەواوی پرۆسە تەشریعی‌و سیاسی‌و ئاینییەکە لەسەر ئیجماع راوەستاوە."[١٠٦] رەوشێکی بەو چەشنە بۆ سەرکردایەتییەکی نەتەوەیی نموونەیی نییە بیەوێت تەواوی نەتەوە پێکەوە یەکبخاتو ئامانجی ئەوەبێت بگاتە دەوڵەتێکی هەمیشەیی بۆ نەتەوەیەکی یەکگرتوو. وەستانەوە بەرووی ئینتیمای خەڵکی بۆ عولەماکان پێویستی بە رێبازێکی وردی وریایانە هەیە لەلایەن ئەوانەوە خوازیارن بنکەی جەماوەری جووڵانەوەی نەتەوەیی بەرفراوان بکەن، ئاماژەیەك نییە بەگرفتەکانی بەدیهێنانی هۆشیاری خێڵایەتی کە لەوانەیە کۆمەڵگای وێناکراوی کوردیی بۆئەوان هەستی پێنەکرێت. ساتیمورتی ئەنجامگیریی کردووە، " ئایدیۆلۆجی نەتەوایەتی لەگەڵ هەموو جەختکردنەوەیەکی لەسەر مۆدێرنیتە، پێشکەوتنی مادیی‌و زیندوێتیی سیاسی بەشێوەیەکی بەردەوام شایەنی ملکەچبوونە بە کورتەحەزی هێزی جیاوازی بونیادگەرا کە لەفۆرمی سەنگەرگرتنی ئایندان."[١٠٧]

## ٣ . ٤ زمان

بۆ گەلێك کە شەڕ بۆ ژیان‌و کۆنترۆڵی خاکی خۆیان دەکەن، زمانەکەیان شتێکی یەکجار بەنرخە. هەموو کوردان لەگەڵ سیما ئەوروپییەکاندا نایەنەوە، هێندێکیان

106 Sathyamurthy (1983), PP. 79-80.
107 Ibide.

لەعـەرەب دەچـن. هـەموو کـوردان شـەرواڵە نەریتییوکراسـە رەنگاورەنگـەکانیان لەبەرناکەن، هێندێکیان لەشاردا کاردەکەنو بەبەرگی رۆژئاواییەوە دەچنە زانکۆکان. بـەڵام تـاکو ئێستا، نزیکـەی هـەموو کـورد، خوێنـدەوارو نەخوێنـدەواریان، قـژ کـاڵو ئەسمەریان، لەتورکیا یان ئێران یان عێراق یاخود یەکێتی سۆڤێت، بـەکوردیی قسـان دەکەن.[١٠٨]

وێـڕای شکست لـە بـەکارهێنانی زمـانی هاوبـەش لەناوچـە کـورد زمانەکانـدا، زمـانی کوردیی وەك پێکهاتەیەکی سەرەکی نەتەوەو هەروەها دەوڵەتسازی لەقەڵەم دەدرێت. مرۆ تەنیا پێویستی بەوەیە سەیری دابەشبوونی هندستان بکات بۆ چەند هـەرێمێك بۆ تێگەیشتن لە کاریگەریی زمان لەسەر ئایدیۆلۆجی نەتەوەو دەوڵەتسازیی. بایەخی زمـان بەشـێوەیەکی مـەزن زێـدەبووە بـەهۆی سـەرهەڵدانی نەتەوایـەتی جۆراوجـۆر لەچەندین بەشی جیهاندا، هەروەك لەکەیسەکەی جووڵانەوەی نەتـەوەیی کوردییـدا، سیمای زمان سەنگێکی زێدەتری بە ئامانجە سیاسییەکان بەخشیوە. جیاوازی زمانیی لەکوردسـتان مەسـەلەیەکی واقیعـی چەسـپاوە، وێـڕای ئـەوەش، زمـانی هاوبـەش بنکەیەکی فراوان بۆ نەتەوایەتی دابیندەکات.

## ١. ٤، ٣ زمان وەك فاکتەرێکی سیاسی

زمـانێکی جیـا بـۆ گـەل مـۆرکێکی کەلتوورییـە کـە بەهایـەکی بـاڵای هەیـە، ئـەوەی زۆرجار بەرجەستەی فاکتەرێکی هەرە هاوبەستەیە بۆ شوناسـێکی نەتـەوەیی گشـتی. هەمیشـە زمـان رۆڵێکـی گـرنگو تایبـەتی لـە پێناسـەکردنی نەتەوایەتییـدا هەیـە. لەکاتێکدا زۆرجار لەگەڵ بنیاتنانی دەوڵەتدا ململانێیەك بۆ هەژمونـداری هەیـە کـە دەشێت لە " دەسەڵات بۆ پێناسەکردنی زمان" دا بەرجەسـتەبێت، بـەگوێرەی وتـەی بیلیـنگ، " ئـەوەی زیـاتر جێگـەی مشـتومڕە کێشـانی سـنووری زمانـە زیـاتر لـە

108 Kahn (1980), p xii.

زمانەوانی."[109] لێرەشەوە بایەخی زمان درێژدەبێتەوە بۆ ئەودیو زمانـەوانی رووت و بۆ فاکتەرێکی سیاسـی وەردەچـەرخێت، زۆرجـار لـەوەڵامی ئـەو سـەرکوتکارییەی کـە لەسەر زمانو کەلتوور چڕ دەکرێتەوە، رێگە لەگەشەکردنی دەگرێت.

بەوەش زمان بەشێوەیەکی یەکجار زۆر دەبێتە سەرچاوەیەك بۆ دەسەڵاتو هـەروەها خـــۆی لەخۆیـــدا پێکهاتەیـــەکی ســـەرەکی نەتەوایەتییـــەو رۆڵێکـــی بنـــەڕەتی لەجێبـــەجێکردنی ئایدیۆلۆجییەکـــەو هـــەروەها لەفۆرمەڵـــەکردنی هۆشـــیاری ئایدیۆلۆجییدا دەبینێت. [110] سکوتناب –کەنگاس و فلیبسۆن، زمانیان بـە رەهەنـدێکی سەرەکی لە پلانـدانانی کۆمەڵایەتیـدا لەقەڵەمـداوە کـە ئامـانجی زاڵبـوونی گروپێکـی ئیتنی/زمانی/سیاسییە لەسەر حسابی یەکێکی دیکە. ئـەوان نووسـیویانە کـە:" زمـان بەشـــێوەیەکی زێـــدە بـــەکاردەهێنرێت...لـــە پتـــەوکردنی رەوایـــەتی، کاریگـــەریو بەرهەمهێنانـــەوەی دابەشـــبوونێکی نایەکســـانی هەریـــەك لـــە بونیـــادی دەســـەڵاتو سەرچاوە مادییەکاندا." [111]

سەرهەڵدانی (نەتەوایەتی زمانیی / linguistic nationalism) ریشەگەلی خۆی لە بیروڕاکانی هێردەری فەیلەسوفی ئـەڵمانیی لەبەشـی کۆتـایی سـەدەی هەژدەیەمـدا هەیـــە، ئـــەوەی بـــڕوای وایـــە کـــە "بـــوونی نەتـــەوە بـــەبێ زمانەکـــەی ناتوانرێـــت وێنابکرێت"[112] هەروەها فیشتە جـەختێکی زۆر کردۆتەسـەر نەتـەوە وەك کۆمـەڵێکی کەلتووری- "لەهـەر شـوێنێك زمـانێکی جیـا هـەبێت نەتەوەیـەکی جیـاش هەیـە." [113] هـەر لەسـەرەتای دەسـتپێکی هاورچـەرخییەوە، زۆرکـەس لەراسـتییدا نەتەوایـەتیان وەك پەیوەســـتێکی حـــەتمیی لەگـــەڵ زمانـــدا لەقەڵـــەم دەدا. زمـــان بەشـــێوەی"

109 Billig (1995), p. 32.
110 Ibid. p. 17.
111 Skutnabb—Kangas and Phillipson (1999), P. 29.
112 Quoted in Edwards (1985), p. 23.
113 Fichte (1922), Addresses to the German Nation, Chicago:Open Court, p. 215 (quoted in canovan (1996a), pp. 52-53).

نیشانەیەکی ئاشکرای شوناسی تایبەتی گروپەکانو هەروەها ئامرازێکی بایەخداری زامنکردنی بەردەوامیان" بینراوە.[114] پەیوەندی نێوان زمانو نەتەوایەتی فرە نزیك لەیەکتر ماوەتەوە، لەگەڵ ئەوەی زمان مۆرکێکی روونی ناسراوی ئەو جیاوازییانەیە کە نەتەوەکان لەیەکتر جیادەکاتەوە.

بۆئەوەی بکۆڵینەوە لەوەی کە رۆڵی زمانی کوردیی چەندە مەزنە لە جووڵانەوەی نەتەوەییدا، پێدەچێت سوودبەخش بێت چەند نموونەیەکی هاوشێوەی مێژوویی لەئەوروپا بێنینەوە، کە ئەم ئایدیایانە لەوێوە سەرچاوەی گرتووە. هۆبسباوم تێبینیکردووە کە " بۆ ئەڵمانو ئیتالییەکان، زمان تەنیا بەکارهێنراوێکی کارگێڕیی یان ئامرازێکی پەیوەندی وڵاتێکی پانو بەرینی یەکگرتوو نییە، هەروەك زمانی فرەنسی لەفرەنسا...ئەوە تەنیا شتێکە کردوونی بە ئەڵمانی یان ئیتاڵی، هەروەها دواتریش ئەرکێکی فرە سەختری لە شوناسی نەتەوەیی هەڵگرتووە، وەك ئەوەی بڵێت، ئینگلیزیی بۆئەوانەیە کە دەزانن زمانەکە بخوێننەوەو بنووسن."[115] مرۆ دەشێت بڵێت کە بۆ کوردو شوناسی کوردیی، فاکتەری زمان پێگەی نێوەندی هەیە لەنێوان ئەم کەیسانەی ئەڵمانییو ئیتالییو ئینگلیزیی، بەلەبەرچاوگرتنی فاکتەرەکانی دیکەی کوردبوون دیاریدەکەنو پێکدیدێنن.

هۆبسباوم دەڵێت کە تاکو پلەیەکی جیاواز، گرنگە بۆ نەتەوایەتی زمانیی داوای " کۆنترۆڵی دەوڵەت یاخود لانیکەم بەدەستهێنانی دانپێدانان بۆ زمانەکە" بکات. ئەو بەردەوام دەبێت و دەڵێت کە"لەهەموو رووداوە گرفتاوییەکانی دەسەڵات، ستاتیۆو هەروەها ئایدیۆلۆجیدا، نەك بۆ پەیوەندییکردنو یان تەنانەت کەلتووریش، دەکەونە نێو جەرگەی نەتەوایەتی زمانەوە."[116] نموونەیەکی سەرنجراکێش سەبارەت بەمە بریتیە لە جووڵانەوەی نەتەوەیی جوولەکەو هەوڵە سەرکەوتووەکانی بۆ

114 Kedourie (1961), p. 71.
115 Hobsbawm (1992), pp. 102-103.
116 116.Ibid. p. 110.

ژیانەوەی زمانی عیبریی. ئەوەی کە زایۆنییەکان کاریان بۆ زمانێك کرد کە لەلایەن کەسەوە قسەی پێنەدەکرا جەخت لەو قسەیەی سەرەوە دەکاتەوە کە پەیوەندیو کۆمیونیکاسیۆن لەکرۆکی پرسەکەدا نین.

بەڵگەی ئەوە هەیە پێشانبدرێت کە زۆربەی ئەوانەی بایەخ بە جەختکردنەوە یان، ئەگەر پێویست بکات، ژیاندنەوەی زمانێك دەدەن، ئەو رۆشنبیرە نەتەوەییانەن کەسەر بەچینی ناوەڕاستی شارەکین، ئەو چینەی کۆمەڵایەتییەی بەرجەستەیەکی نەریتی لەکوردستاندا نییە. لەوانەیە ئەم تاکانە بەهۆی زمانەخۆماڵییەکەی نێوجەرگەی وڵات نوێنەرایەتی نەکرێن، خودی ئەو کەسانە پێدەچێت " لەڕاستییدا سەرکەوتووانە لەنێو زۆربەی زۆرینەدا توابێتنەوە." [١١٧]

زۆربەی کوردان لەبەشە تورکییەکە بەکوردییەکی لاواز یان هەر بەکوردیی قسان ناکەن، بەڵام هەروەك یاڵچین-هەکمان تێبینیکردووە " زانینی زمانەکە فاکتەرێکی کەم بایەخترە وەك لە هەڵوێستی کەسێك لەحاست زمانەکە." [١١٨] بەتایبەتی، کاتێك درك بەوەکرا کە شوناسی گەلێك رووبەڕووی تەمومژو دژوارییەکی مەزن دەبێتەوە، زمان بەئاسانی دەبێتە خاڵێك کە هەستی نەتەوەیی چاوی تێدەبڕێت.

زمانەوانی ناسراو، ئینار هاوگین، بەراشکاوی لە مۆدێلە هەنوکەییە فرە پەسەندکراوەکەیدا سەبارەت بەستانداردکردنی زمان، گەشەکردنی زمانی بە سەرهەڵدانی نەتەوایەتییەوە بەستۆتەوە.[١١٩] ستانداردکردن " پرۆسەی یەکجۆرکردنی زمانێکە کەبەشێوەیەکی فراوان لەئاخاوتنی کۆمەڵدا وەك "نۆرمێکی سوپەرزار " پەسەند بکرێت."[١٢٠] بەمانایەکی دیکە، "بالاترین" فۆرمی تێکڕای زارەکان. ئەفراندنی فۆرمی ستاندارد بۆ زمانی نەتەوەیی پرۆسەیەکی ئاڵۆزە. کارڵ دوێچ،

117 Edwards (1985), p. 71.
118 Yalcin-Heckman (1989), p. 119.
119 Einar Haugen (1966), 'Dialect, Language, Nation', American Anthropologist, Vol. 68, No. 6, pp 922-35.
120 Ferguson (1983), p. 31.

تێبینیکردووە کە " زمانی ستاندارد تەنیا ستانداردکردنی فۆرمێکی لۆکاڵی ساکار نییە، بەڵکو تێکەڵبوونی ئیدیۆمە جیاوازەکانە."[121] لەوەش زیاتر، "زمانی ستانداردی ستانداردی نەتەوەیی خۆی لەخۆیدا زادەی هاوکاریی‌و ئینتیمایەکی ئابووری‌و کەلتووری‌و سیاسییە."[122]

کاتێك لەپرسی بەستانداردکردنی زمانی کوردیی دەکۆڵینەوە وا باشە کورتە بەراوردکارییەکی هەرێمیی بکەین. بەپێچەوانەی زمانی فارسیی‌و عەرەبییەوە، زمانی کوردیی، وەرچەرخانێکی بەرەو زمانێکی نەتەوەیی یەکگرتووو گشتی بۆهەموو کوردان ئەزموون نەکردووە، ئەویش بەشێوەیەکی سەرەکی بەهۆی نەبوونی دامەزراوەیەکی دەوڵەتی کە سەرپەرشتی‌و چاودێریی گەشەکردنێکی لەو چەشنە بکات، گرفتێکی وا کە لەگەڵ جیاوازییە زمانییە هەنوکەییەکان‌و سەرکوتکاری فەرمی هاوجووتە، کرینبرۆك، تێبینیکردووە کە " لەکاتێکدا کوردیی بەشێوەیەکی سەرەکی وەك زمانی قسەکردن دەمێنێتەوە، جیاوازی نێوان فۆرمە ناوچەییەکانی زارەکانی ئاخاوتن گرفتێك ناهێنێتەپێش." هەرچەندە، لەسالانی پێشترو هەروەها دوای دارمانی ئیمپراتۆری عوسمانی، کاتێك دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی ئەگەرێکی راستیینە بوو، پێویستیی بۆ زمانێکی ستانداردی نووسراو بەشێوەیەکی ئاشکرا بەتوندی هەستیپێدەکرا."[123] ئەمەش روونیدەکاتەوە کە بۆچی بەستانداردکردنی زمانی کوردیی دەبێت لەلایەن سەرکردایەتی کوردەوە هانبدرێت، هەروەك ئەوەی کە بەستانداردکردنی زمان لەولاتانی عەرەبییزماندا بیرۆکەیەکی گرنگ‌و بایەخدار بوو.

---

121 Deutsch (1942), p. 536.
122 Ibid. p . 53.
123 Kreyenbroek (1992), p. 69.




شێوەی ١. ٤. ٣ ناوچەکانی زمانی کوردیی لەعێراق[١٢٤]

## ٣ . ٤ . ٢ جیاوازیی زمانیی لەکوردستان- زمان و سنوورەکان

لە ناوچەگەلێکی دیارییکراوی جیهان، بەتایبەت ئەوروپا، سنوورە نەتەوەییەکانیش وەك سنوورگەلی زمانیی راژەیان کردووە. بۆ نموونە، پیرنسییەکان، بەشێوەیەکی

---

124 Hassanpour (1992), p. 5. (Hassanpour, however, terms it 'Kurdish speech areas in Iraq'.)

سروشتی فرەنسی جیان‌و بەزمانی ئیسپانی قسان دەکەن، هەروەها نموونەی هاوشێوە هەیە، هاوشێوەیی سنوورە سیاسی‌و زمانییەکان هەیە لەکەیسی سوید و نەرویجدا. هەرچەندە، نەك تێکڕای سنوورەکان، لەڕووی زمانی‌و نێونەتەوەیی یاخود کارەکتەری ئیتنییەوە بەشێوەیەکی ئاشکراو جیا سنووردارو دیاریکراون. ئەمەش بۆتە هۆی پەیدابوونی "زۆنە زمانییە تێکەڵاوەکان"[125] کەلەوانە زۆریان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەن.

کوردیی بەهەموو جۆرەکانییەوە بۆماوەیەکی درێژ لەزۆنە زمانییە تێکەڵاوەکاندا بوونی هەبووە. کوردیی زمانێکی ئێرانییە، بەشێوەیەکی دیار لە عەرەبیی‌و تورکیی جیاوازە. ژمارەیەکی بەرچاو زاری کوردیی هەیە، کە هێندێکیان لەسەر ئاستی گشتی مایەی تێگەیشتن نییە.[126] دابەشبوونە گشتییە باوەکە لەنێوان دوو زاری سەرەکییدایە کە کرمانجی (یان کوردیی باکوور) کە لەکوردستانی بەشە تورکییەکەو هەروەها ناوچەکانی هەرە باکووری عێراق‌و ئێران قسەی پێدەکرێت، لەگەڵ سۆرانی (یان کوردیی باشوور) کە لە کوردستانی ناوەندیی‌و باشوور) بۆ نموونە، باکووری عێراق‌و باکووری ڕۆژئاوای ئێران قسەی پێدەکرێت. (بڕوانە شێوەی ١. ٤. ٣ : ناوچەکانی زمانی کوردیی لەعێراق) لەپاڵ ئەم دوو ئیدیۆمە سەرەکییە، زاری بچووکتر هەیە، زازاو گۆرانی، ئەوەی پێشەوەیان لەتورکیاو ئەوەی دواتریان لە کوردستانی باشوورو باشووری ڕۆژهەڵات قسەیان پێ دەکرێت. هەریەك لەم زارە خۆماڵییانە دابەشدەبن بەسەر دیالێکتی دیکەدا. هەرچەندە، ، گرنگە تێبینی ئەوە بکرێت، کە سنوورێکی ڕوون‌و ئاشکرا لەنێوان ئەم زارو زمانانەدا نییە، هەروەك ڤان بروینسن تێبینیکردووە، " زارەکان وردە وردە تێکەڵ دەبن، گرووپگەلێك کە بە

125 Fischer (1980), p. 413.

١٢٦ بۆ بینینی لیستێکی گشتی سەبارەت بەزمانی کوردیی‌و زارو شێوازی دابەشبوونی بڕوانە: Izady (1992), p. 169.

**زاریێـك قسـان دەكـەن دەشـێت لـەنێو زۆرینەیەكـدا بـژین كـە بـەزارێكی دیكـە دەپەیڤن."[127]**

**دابەشبوونی زمانی كوردیی بەسەر دوو زاری سەرەكی كرمـانجیو سـۆرانی ( وێـڕای ئـەوەی چـەمكەكان نـوێن) بەدرێـژای مێـژوو جـەختی لێكراوەتـەوەو چەسـپێنراوە لەڕێگەی كۆبوونەوەی ریالیتە جیۆپۆلیتیكییەكانەوە،• ئەوەی بۆتە هۆی هاتنـەئارای**

127 Van Bruinessen (1992) p. 22.

• ستانسـفیلّد دەڵێـت: " دەمێكـە رادەی زمـانی هاوبـەش وەك بەڵگەیـەكی سـەرەكیی پەسـەندی هۆشـیاریی ئیتنییو ئیتنۆ نەتەوایەتیی ناسێنراوە. هەرچەندە، لەراستییدا تێكڕای بانگەشەكەرانی كوردایەتییش پێ لەسەر ئەوە دادەگرن كە زمانی كوردیی زمانێكی جیاوازەو وەك ئامرازێكی باوی پەیوەنـدیی هاوبـەش لـە كوردسـتاندا بـەكاردەهێنرێت، بەتایبـەت لـە كوردسـتانی عێراقـدا، بـەڵام بایـەخی زمـانی كـوردیی وەك هانـدەرێكی هەسـتی نەتەوایـەتیی بابەتێكـە جێگـەی مشـتومڕە، بـەوەی بەپێچـەوانەی دراوسـێ عـەرەبو تـوركو فارسەكانیشـەوە، كوردان هێشتا تاكو ئێستا لەڕووی نووسینو گوتنەوە پەرەیان بە زمانێكی ستاندەری رێكخراو نەداوە. هەروەها ئەوەی راستییەكی تاڵە ئەوەیە كە زمانی كوردیی لەزۆربەی حاڵەتەكاندا بەڵگەی پەرتەوازەبوونـە تـاكو یـەكێتی سیاسیی. ئەو زمانەی كە زۆربەی خەڵكی كوردستان قسەی پێدەكەن بریتییە لە زمانی كوردیی، زمانی كوردیش لە چەندین زاری جیاواز پێكدێت كە پەیوەندییەكی توندوتۆڵیان بە فارسییەوە هەیە، بەڵام تـوركو عـەرەب لێـی تێناگەن. كوردانی سەر بە زارە جیاوازەكان ناتوانن بە ئاسـانی لەگـەڵ یـەكتردا بـە زمـانی دایكیـان پەیوەنـدیی بكەن، ئەوەش بە چەشنێك تایبەتمەندیی زمانی هاوبەشی لاواز كردووە، بۆنموونە: كوردییە بادینانییەكەی زاخۆ تەواو لە كوردییە هەورامییەكەی تەوێڵە جیاوازە، زمـانی گروپـی كـوردیی دەگەڕێتـەوە سـەر لقـەكانی بـاكووری رۆژئاوا یاخود باشووری رۆژئاوای زمانە ئێرانییەكان، كە دەتوانرێت بكرێت بە چوار لقی سەرەكییەوە:

١- زاری باكوورو باكووری رۆژئاوا، كە بەگشتیی بە "كرمانجیی" ناودەبرێت. ئـەم زارە لـە توركیـاو بەشـەكانی زۆر سەرووی عێراقو كوردستانی ئێـران قسـەی پێـدەكرێت. لەكوردسـتانی عێـراق بـە "بـادینیی" ئامـاژەی بـۆ دەكرێت.

٢- زاری باشوور، زۆرجـار "سـۆرانیی" پێـدەگوترێت، كـە لەڕاسـتییدا كۆمەڵـە زارێكـی ناوچـەكەیە. سـۆرانیی بەگشتیی وەك زمانی سوننەتیی كوردستانی عێراق لە قەڵەم دەدرێت. ئەم زارە لە باشووری كوردسـتان قسـەی پێدەكرێت، بە زۆربەی كوردستانی عێراقیشەوە.

٣- زاری باشووری رۆژهەڵات وەك " سنەیی، كرماشانیی،لەكیی، ئەم زارانە زیاتر لە فارسی هاوچەرخەوە نزیكن تاكو لەو دوو زارەی كە پێشتر ئاماژەی بۆ كراوە.

٤- زاری زازاو گۆرانیی، زازا لە باكووری رۆژئاوای كوردستان قسەی پێدەكرێت (لە باكوورو رۆژئـاوای دیاربـەكر لە توركیا)، گۆرانیش لەچەند شوێنێكی جۆربەجۆری كوردستانی عێراق قسەی پێدەكرێت.

دوو زمانی وێژەیی نەتەوەیی: ئەوەی یەکەمیان ئەلف بێی لاتینیو ئەوی دواتریان بە پیتی هاوشێوەی عەرەبیی بەکاردەهێنن. پێدەچێت پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییەی لەنێوان سۆرانیو کرمانجیدایە زیاتر ئەرکێکی سەختە، هەروەها فۆرمە ستانداردەکانی هەردوو زارە سەرەکییەکە کەبەشێوەیەکی سەربەخۆ لەیەکتر گەشەیکردووە دەبێت وەك بنەمایەکی یەکسان ببینرێت، ئەگەر هەوڵ بۆ بەستانداردکردنێکی "تەواو" بدرێت. پرۆسەی بەستانداردکردن سنوورگەلی خۆی هەیە تا ئەو ئەندازەیەی کە زمانێك " پێناسەی رەوشگەلێك دەکات کە لەسایەیدا دەتوانرێت لانیکەمو لانیزۆری گونجاندن بەڕووی بڵاوبوونەوەیەکی ئاسۆیی جۆراوجۆری زمانی ئەنجامبدات بۆئەوەی شایستەیی نەتەوەیی لەسەر ئاستێکی گەورەتر پتەوبکات.[128]

بەوەش پێدەچێت ئایدیای پێکهێنانی فۆرمی ستاندارد لەزمانی کوردیی، یەك زمانی هاوبەش کە لەلایەن هەموو کوردە پەسەند بکرێت، فرە لەوە ئاڵۆزتربێت بێتەدی. بەپەسەندکردنی رای حەسەنپور، زمانی کوردیی زمانێکی جووت-ستانداردە،[129] ئەگەرێکی گەورەی گەشەکردنی بەردەوام هەیە بەرەو هەروەها پشتگیرییکردنی یەك فۆرمی ستاندارد لەکرمانجیو یەکێکیش لەسۆرانی. ئەمەش لەبنەڕەتدا لەسەر ئەو گریمانەیە راوەستاوە کە یەکخستنی زمانێکی جووت-ستانداردی کوردیی زەحمەتێکی زۆر مەزنە. بەو پێیەی کە سیماگەلە زمانییە پوختەکان لەزۆربەی ئەگەرەکاندا

---

لەکوردستانی عێراقدا، کوردانی پارێزگای دهۆكو ناوچە شاخاوییەکانی باکووری هەولێر بە کوردیی بادینانیی قسانددەکەن،لەکاتێکدا ئەوانەی پارێزگای هەولێرو سلێمانیو دەربەندیخان بەگشتیی بە سۆرانیی دەدوێن. هەروەها گروپێکی بچووك بەڵام گرنگی خەڵکی هەورامیی کوردزمان هەن، ئەوانە لەناوچە شاخاوییەکانی نێوان عێراقو ئێران نیشتەجێنو لەوناوچانەدا کۆبوونەتەوە کە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی باکووری هەڵەبجەوە. بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ل ٩٤–٩٦.

128 Sathyamurthy (1983).
129 Hassanpour (1992), p. 436.

بەلایەکـدا دەڕۆن‌و پرسـە سیاسـییەکان تێدەپـەڕێنێت. بـۆ کـوردان، " پێدەچـێت یەکخستنی سیاسی مەرجی بنەڕەتی یەکخستنی زارەکان بێت."[130]

لەدەوڵـــەتێکی ســـەربەخۆی کوردییـــدا، تەنانـــەت لەکەیســـی (microstate / دەوڵەتۆکە)یشدا،[131] دەبێت کرمانجی‌و سۆرانی بە زمانگەلێکی فەرمی پەسەندبکرێن، هەژمووونی هیچ لایەکیان نابێتە هۆی ڕەزامەندی گروپە زمانییەکەی دیکە. لـەوەش زیاتر، پێویست بەزیاتر لـە پەسـەندکردنێکی گشتی دەکات بـۆ پێکـەوەییبوونی زارە جیاوازەکانی دیکەی زمانی کوردیی، کـە ئەرکـە تایبەتییـەکانی زمـانێکی دیـارییکراو دەبێت لەلایەن کارگێڕی ناوەندیی کوردییەوە پشتگیریی بکرێت.

بۆ کوردان، بەستانداردکردنی زمانەکەیان بۆ خودی خۆی کۆتاییـەك نییـە. هـەروەك حەسەنپور بەدروستی ئاماژەی پێداوە. زیاتر " وەك ئامرازێك بۆ بۆژانەوەی زمانی‌و نەتـــەوەیی بـــەکاردەهێنرێت." [132] ئـــەو راســـتییەی بەرجەســـتەکردووە کـــە زمـــان تاڕادەیـــەکی زۆر فاکتـــەرێکی بەسیاســـییکراوی سیاســـەتی کوردییـــە. بنیاتنـــان‌و پتەوکردنی دوو زمانی هاوبەش لەلایەن ئەکادیمیانی زمانی کوردییەوە ئاسانکاری بۆ دەکرێت. جێگای سەرنجە ئەکادیمیاکانی زمان بەنەبوونیان لەکوردستان، لەبەشەکانی جیاوازەکانی دیکەی جیهاندا وەك دەزگایەکی پتەو راژەیان بە نەتەوەییەکان کردووە تاکو لەسەری بنیادبنێن.[133] مێژوو ئەکادیمیای کوردیی بەخۆوە بینیـوە، کـە لـەماوەی هەشـت سـاڵی ۱۹۷۰کانـدا لـەعێراق هـەبوو، ئـەو دەزگایـەی کـە بنیاتنـان‌و ژیـانی چاوەڕوانکراویشی بەتەواوی بە هەلومەرجگەلە سیاسییەکەوە بەسترابوو.[134] پێویستە

130 .Ibid.

١٣١ ئەگەرێکی بەم چەشنە لە ئەنجامگیری باسی هەشتەمدا مشتومڕی لەبارەوەکراوە.

132 Ibid. p. 35.

١٣٣ کەیسە بەراوردکارییە پەیوەندیدارەکان بریتییە لە ئەکادیمی زمانی عەرەبی لەسوریاو عێراق‌و میسرو گرنگیان بۆ عەرەبە نەتەوەییەکان، کە مشتومڕی لەبارەوە کراوە لەلایەن:

Altoma (1974), 'Language education in Arab countries and the role of the academies' in Fishman, J. (cd.), Advances in Language Planning, The Hague: Mouton & Co. N.V.

١٣٤ بۆ باسی سەرهەڵدان‌و داڕمانی ئەم دامەزراوەیە بڕوانە: Hassanpour (1992), pp. 448-451.

کوردانی عێراق سەرکەوتنی خۆیان بسەلمێنن لەهەوڵەکانیاندا بۆ دەوڵەتسازی، ئەکادیمیایەکی زمانی کوردیی سیاسیی نوێ ئەمرۆکە روونـاکی ببینێت. پێویستییەکی بەپەلە هەیە بۆ دەزگایەکی بەو چەشنە تاکو سەرپەرشتی پرۆسەی بەردەوامی بزواوی بەستانداردکردنی زمانێکی نوێنەرایەتی بکەن.

لەهەر زمانێك، بەدەر لەوەی داخۆ کە ستانداردەکەی بەو زووانە دامەزراوە یان نا، ستانداردەکە گەشەکردنی خۆی دەپارێزێت: بەستانداردکردن ئەرکێك نییە کە جارێك رووبدات‌و ئنجا دیارنەمێنێت کاتێك بەشێوەیەکی رەزامەندبەخش چارەسەر بکرێت.[١٣٥]

ئەوە ئەرکێکی سەختە کە هەوڵی روونکردنەوەی ئەوە بدرێت داخۆ هەردوو فۆرمە سەرەکییە کوردییەکە وەك زمانی جیا لەقەڵەم بدرێن یاخود تەنیا زارگەلێکی جۆراوجۆری گەورە لەخۆبگرن، بەتایبەتی لەبینینی ئەو راستییەی کە زۆربەی شارەزاکان لەو بوارەدا بەئەستەمیان زانی بۆچوونەکانی خۆیان سەبارەت بەو بابەتە هاوساز بکەن. لەبواری زمانەوانیدا، ئەو جیاکارییە گشتییەی بەشێوەیەکی باو وێنادەکرێت ئەوەیە کە زارەکان "کۆی چەمکە هاوبەشەکانی زمانێکن، لەکاتێکدا زمانەکە بەشێوەیەکی هاوبەش ئاڵۆزەو تێگەیشتنی سەختە"[١٣٦] ئیزادی، بۆ جارێك جەخت لەو راستییە دەکاتەوە کە لێکچوونی بنەڕەتی لەنێوان کرمانجی‌و سۆرانیدا "زۆر بەهێزە"و قسەکەرانیان دەتوانن "تارادەیەکی ماقووڵ" پێکەوە پەیوەندی بگرن."[١٣٧] هەرچەندە، کەسانی دیکە هەن کە بەشێوەیەکی جیاواز شرۆڤەی رەوشەکەیان کردووەو هەروەها لەدیدێکی زمانەوانییەوە کە لەسەر بنەمای جیاوازی زاراوەکان، گرامەرو دەربڕینی دەنگەکان لەنێوان هەردوو زارەکە راوەستاوە، ئەوان لایەنگری ئەوە دەکەن کە" سۆرانی‌و کرمانجی هێندە ئەڵمانیی‌و ئینگلیزیی لەیەکتر جیاوازن" بەوەش گونجاوترە کە وەك دوو زمانی جیاواز بناسێنرێن.[١٣٨]

---

135 Ibid. p. xxxi (Ladislav Zgusta's introduction: 'Introduction: Language, Nationhood, and Minority Status').
136  Edwards (1985), p. 18.
137 Izady (1992), p. 170.
138 Kreyenbroek (1992), P. 71., Edwards (1985), p. 20).

پێدەچێت حەسەنپور گەیشتبێتە خاڵی نێوەندی ئەم دوو پێگەیە کاتێك دەڵێت:
"قسەکەرانی ئەم دوو زارە، لەرەوشێکی گفتوگۆیی نائاساییدا، بە زەحمەت پەیوەندیدەگرن،... بەلآم... تاکو ئەوەی پەیوەندییەکی بەرفراوانی پێشکەوتوویان دەبێت، قسەکەرانی کرمانجیو سۆرانی ناتوانن کاریگەرانە لەهەموو ئاستوچوارچێوەکاندا ناتوانن پەیوەندیی بگرن."[139] بەلەبەرچاوگرتنی توانایی تێگەیشتنی هاوبەشی نێو زارەکان، مرۆ دەتوانێت ئاماژە بەو راستییە بدات کە پلەی جیاوازی توانایی تێگەیشتن هەیە تائەو رادەیەی کە قسەکەرانی زارێکی دیارییکراو لەوانەیە بەباشیی لە زارەکەی دیکە تێبگەن، لەکاتێکدا ئەوانەی تر نەخێر. فاکتەرێکی رێگری دیکەی لەبەردەم ئەوەی برپارێکی یەکلاکەرەوە لەم پرسە سەخت بێت ئەوەیە کە لەوانەیە زارەکانی دەوروبەر بەشێوەیەکی هاوبەش مایەی تێگەیشتن بێت، لەکاتێکدا قسەکەرانی کرمانجی لەناوچەکانی هەرە باکووری کوردستان پێدەچێت لەو سۆرانییانە نەگەن کە لەباشووری سلێمانی نیشتەجێن.
ئەگەر مرۆ مشتومرەکە بخاتە قالبی سیاسییەوە، دەتوانێت تێبینی زێدەتری بخاتەسەر، بۆئەوەش دەبێ بگەرێتەوە بۆ ئەو بابەتەی لەسەرەوە ئاماژەی بۆکراوە سەبارەت بە سنوورە زمانیو نەتەوەییەکان. ریزبەندکردنی زمانو زارەکان ئارەزووی بەدواچوونی سیاسەتەکانی دەوڵەتسازیی دەکات کەلەلایەن میشێل بیلینگەوە پێشانداراوە، ئەوەی سەرنجەکەی شایەنی ئەوەیە بەدرێژیی وەربگیرێت:
"لەو شوێنەی سنوورە نەتەوەییەکان دادەنرێن، جیاوازیی لەنموونە وتارییەکان لەهەریەك لەدیوەکانی سنوورەکە زیاتر لەوانەیە ببینرێت کە بۆ زمانگەلێکی جیاواز دەگەرێتەوە بەهۆی قسەکەران خۆیانو ناوەندە نەتەوەییەکانیانو هەروەها جیهانیش بەگشتی...پراکتیکە هاوبەشەکان لە ناونانی زمانەکان ( کۆڵینەوە لێی داخۆ زمانە یان زار ) لەرێگەی ململانێوە بۆ زاڵبوون مەیلی دەرکەوتنی دەبێت."[140]
بروا وایە کە سۆرانیو کرمانجی "بەدرێژایی هێڵگەلێکی تەریب" گەشەیانکردووە

139 Hassanpour (1992), P. 24 (italics original).
140 Billig (1995), P. 33.

**لەکۆنەوە تاکو رووخانی ئیمپراتۆری عوسمانی لەکۆتای یەکەمین جەنگی جیهانیدا.[141] پاشتر لەدوای دابەشبوونی کوردستان، رێگە بە پەرەسەندنی سۆرانی لەباکووری عێراق درا ( بەپێچەوانەوە کرمانجی لە کۆماری تورکیادا بەتەواوی قەدەغەکرا)، سۆرانی هەروەك زارێك کە لەنێوان دوو زارەکەدا لەرووی ئەدەبییەوە فرە باش گەشەیکردووە، پێگەیەکی بەرزتری لەکوردستاندا بەدیهێناوە وەك لە کرمانجی.[142] بەگریمانەگرتنی ئەم رێحەزەی ئێستا، ئەوەی دەشێت رووبدات ئەوەیە کە لەسیناریۆی ئایندەیی دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی لەعێراقەوە، وادەکات لایەنگرانی سۆرانی پێگەیەکی زاڵتر لەحاست کوردییەکەی باکووردا بەدەستبێنن، بۆ کردنی ئەمەش هانی ململانێی نێوخۆیی دەدەن لەپێناو هەژموونی زمانییدا. لەبری ئەوە، لەوانەیە سەرکردە نەتەوەییەکان لەبایەخی زمان یان زار کەمبکەنەوە بۆئەوەی بێزاریو دوورکەوتنەوەی ئەو کوردانەی لێنەکەوێتەوە کە پێشینەیەکی جیاوازی ئیتنۆ-زمانیان هەیە. لەڕاستییدا جەختکردنەوەیەکی زێدەڕۆیانە لەسەر زمان ئەو پشتگیرییە بەجۆشە نەتەوەییە بۆ بیرۆکەی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی لاوازدەکات، ئەوانەی خۆیان بەکورد دەزانن بەڵام بە سۆرانی ناپەیڤن.[143] هەروەها ململانێی لەنێوان لایەنگرانی سۆرانیو کرمانجی لەپێناو**

141 Hassanpour (1992), P. 436.

١٤٢ کرمانجی کەهێشتا گەشەکردنی راستیینەی نزیکەی بەتەواوی لەتاراوگە روودەدات. هەروەها کرینبرۆك پشتی بە ئامارەکەی ساڵی ١٩٤٧ بەستووە سەبارەت بەهەرێمە کوردزمانەکانی عێراق، کە سۆرانییەکان نزیکەی ٧٠ لەسەدو کرمانجییەکانیش ٢٠ لەسەدابوون.

Kreyenbroek (1992), p. 75.

١٤٣ پرسی ئەوەی کەچۆن رێبگرێن لەدەرکەوتنی خولیا هەژمونیکە زمانییەکان لەسەر هەردوولای دابەشبوونی کرمانجی–سۆرانی بەشێوەیەکی شارەزایانە لەلایەن دەنگی کوردیی لەرادیۆی ئەمەریکاوە مامەڵەی لەگەڵ کرا. میشاڵ چیت ئەمەی خوارەوەی وت:

" بۆئێمە، گرنگترین شت ئەوە نییە تەنیا بە کرمانجی یان سۆرانی پەخشبکەین. ئێمە هەوڵی بەکارهێنانی هەردوو زمانەکە پێکەوە دەدەین. دەمانەوێت گوێگرانمان بەهەردوو زارەکە گوێیان لێبێت. بۆنموونە، رادیۆی بەغدا ساتێك بە سۆرانیو ساتێك بە کرمانجی بەرنامەوکانی پەخشدەکات، هەربۆیە کاتێك یەکێك دەیەوێت گوێی لەکرمانجییەکە بێت تەنیا بۆ ساتێك گوێ دەگرێ، ئێمە ئەو بژارەیە نادەینە گوێگرانمان. ئەوەی رۆژانە گوێ

**باڵادەستی زمـانیی لـه دیاسـپۆراش دەگوزەرێـت. ئەوانـەی دواییـان کـه بەشـێوەیەکی مەزن له تاراوگه گەشەیانکردووه، بانگەشەی ئەوه دەکـەن کـه ئـەلف بێـی لاتـینی بـۆ زمـانی کـوردیی زۆر لـەپیتی عـەرەبی شـیاوترە، ئـەوەی کـه بـۆ نووسـینی سـۆرانی بـەکاردەهێنرێت، هـەروەها لایـەنگرانی هـەر یـەك لـه زارەکـه بەجۆشـەوە پاسـاوی گونجاویی بۆ سەرنج و دیدەکانیان دێننەوە.[144]**

**هـەروەك زۆرجـار لـه کەیسـی پاککردنـەوەی زمانـدا روودەدات، هـەوڵی کوردانـدنی تەواوی زمانی کـوردیی هەیـه کاتێـك ئـەو وشـانەی پێشـتر بەشـێوەیەکی فـەرمی یـان نافەرمی لەزمانی زاڵەوە وەرگیراون وەدەردەنـرێن. ئـەم پرۆسـەیه لەسـاڵانی ١٩٢٠کـان لەعێراق دەستیپێکرد. وێڕای ئەو راستییەی که کوردانی عێراق تـەنیا ١٨٪ی تێکـڕای گەلی کورد پێکدێنن،[145] ژیانی کەلتووری کوردیی لەعێراق فـره چـڕبۆتەوە، هـەروەك لەلایەم کرینبرۆکەوە قسەی لەسەرکراوە بەم شێوەیەی خوارەوە:**

**" سـەرکەوتنی کـوردانی عێـراق لـەبواری زمـان و پـەروەردە وایکـردووە...بتـوانن ئـەدەبێکی بایەخـدار و زمـانێکی تـەواو گونجـاو بێننـەئارا، هـەروەها نەوەیـەکیان هێناوەتەبەر که خوێندنی سەرەتایی و ئامادەییان بەکوردییە. بێگومان ئەم چەشـنه دەستکەوتانه هاوکاری کوردانی عێراق دەکات له هەوڵە ئایندەییەکانیان بۆ پاراسـتنی کەلتوورو شوناسی ئیتنییان."[146]**

**میدیا رۆڵێکی کاریگەریی هەیه کاتێك بێتەسەر ئەوەی زمانێك بەهێز یان سـەرکوت بکات. سەبارەت به پلاندانانی زمان، لەم پرسەدا، گروپه ئیتنییه فەرمانڕەواکان، یان حکومـەتی ناوەنـدی، قۆرخکـاریی خۆیـان بـۆ میـدیا دەکـەن بۆئـەوەی زامـنی**

---

لەپرۆگرامەکانمان بگرێت لەهەردوو زارەکه تێدەگات، لەو بـاوەڕەدام، بـەم رێگەیـە، دەتوانرێـت پەیوەندییـەکی باشتر لەنێوان ئەوانەدا پێکبێت که هەر زارێك بەکاردەهێنن. لەوانەیه لەیەکەمجاردا یـەکێك گـوێگرتنی بـۆ گـران بێت ، بەڵام بەتێپەڕینی کات، ئەو کەسه دەتوانیت سوود لەهەردوو زارەکه وەربگرێت.

١٤٤ ئەم ململانێ زمانییه بەڕوونی لەناوەندە ئەکادیمییەکانی کوردیی بەسوید دیارە کـه پوختـەی رۆشـنبیرانی کوردی لەخۆگرتووە.

145 .Blau (1992), p. 49.

146  Kreyenbroek (1992), p. 79.

سەرکوتکردنی زمانو کەلتووری کوردیی بکەن لەرێگەی پەراوێزخستنی پەخشکردنی لە تەلەفیزیۆنو رادیۆکاندا، ئەوەش داپێدانانێکە کە"رادیۆو تەلەفیزیۆن لەنێو هەرە بەهێزترینی ئامرازەکانی پێکەوەبەستنی نەتەوەیین." [147] لەگەڵ یەکەم دەستپێکی کەناڵی سەتەلایتی تەلەفیزیۆنی MED-TV لەساڵی ١٩٩٤( دواتر قەدەغەکراو ناوی MEDYA-TV لێنرا) کە لە بریتانیا رێپێدانی وەرگرتو ستۆدیۆشی لەزۆربەی وڵاتانی یەکێتی ئەورووپا هەبوو، کوردان سەرکەوتنیان لە دامەزراندنی ئامرازێکی بەهێزو سوودبەخش بەدەستهێنا کە لە نێوخۆیاندا پێکەوە پەیوەندیی بگرن، ئەوەی هەروەها سوودبەخشبوو لەلاوازکردنی ئەو هەژموونە کەلتوورییەی لەلایەن دەوڵەتانی هەرێمییەوە بەسەر کورددا سەپێنرابوو. [148] ئەم هەوڵە سەرەتاییە سەرکەوتووە کە بنکەکەی لەئەورووپا بوو، بەو هەوڵانەی کوردانی عێراق تەواوکرا. ئەوان خۆیان بەرپرسیاربوون لەمیدیاو جۆشی زێدەیان بۆ پێشاندانی دامەزراندنی پێگەی تەلەفیزیۆنی نوێو تایبەت، ئەوەی زمانی کوردیی بە زیندوێتییو باشیی لەباکووری عێراق پاراست.

## ٣ . ٤ . ٣ گۆڕینی زمان لەبەرامبەر پتەوکردنی زمان

پێگەی زمانی کوردیی ئەوەنییە تاڕادەیەکی مەزن بەهێزبێت. لەئاکامی پلەی جۆراوجۆر لە تواندنەوە، بەزۆر یان وەك پابەندبوونێکی خۆبەخشانە، ژمارەیەکی زۆر لەکوردان زانیاری شیاویان لەبارەی زمانی کوردییەوە نییە (بەتایبەت سەبارەت بە فۆرمی نووسینەکەی) هەروەها زۆرجار وایان پێ باشە بەتورکی یان عەرەبی یاخود فارسی پەیوەندیی بگرن. ئەمەش وای لەهێندێك چاودێر کردووە پرسیار

147 van Bruinessen (1998), p. 48.
148 .For an account of this see Amir Hassanpour's article 'Satellite Footprints as National Borders: MED-TV and the Extraterritoriality of State Sovereignty', Journal of Muslim Minority Affairs, Vol. 18, 1998

لەبارەی مانەوەو ژیانی درێژخایەنی زمانی کوردیی بکەن، بەوتەیەکی دیکە، داخۆ بڵێی گۆڕینی زمان لە ناوچانەی کوردزمانەکان رووبدات. ئاڵۆزییەکانی شرۆڤەکاریی ئەم چەشنە بابەتە لەم پەرەگرافەی خوارەوەدا دەربڕراوە:

" زمانە جیاوازەکان مافی سیاسی جیاوازیان هەیە، نەك بەهۆی تایبەتمەندییەکی خودی زمانەکە خۆی، بەڵکو پشت بە هێزی پەیوەندییەکانی نێوان قسەکەرەکانی ئەو زمانانە."[149]

گۆڕینی زمان بەواتای ئەوەی کە" کۆمەڵ بەتەواوی واز لەزمانێك بێنێت بەقازانجی زمانێکی دیکە." [150] ئەمەش هەروەها هێندێکجار وەك مردنی زمان ئاماژەی بۆ دەکرێت، هەروەها بەڵگەی گۆڕینی سەرەکییە لە رەوشگەلی قسەکەرانی ئەو زمانە. گۆڕینەکانی زمان چەندین جار لەئەوروپای دەورانی ناوەڕاستدا روویانداوە، نموونەی گونجاو لەم بارەیەوە بریتیە لەو وەرچەرخانە زمانییەی کە لە ئیسپانیا روویدا کاتیچك عەرەبەکان وردە وردە لەسەدەی چواردەیەمدا پاشەکشەیانکرد. [151]

وتراوە کە "گۆڕینی زمان تەنیا وەختێك روودەدات ئەگەر، هەروەها تاکو ئەو رادەیەی، کۆمەڵێك خوازیاری وازهێنان بێت لە شوناسەکەی وەك گروپێکی کۆمەڵایەتی-کەلتووری جیاواز بەقازانجی شوناسێك وەك بەشێك لەهێندێك کۆمەڵی تر." [152]مانۆڕکردن بەرەو ئەو ئاراستەیە هەستی خۆبەکەمزانین لەحاست کۆمەڵە زمانییەکەی دیکە دەردەخات، پرۆسەیەك، بەپێی مێژووی کوردان، دەردەکەوێت کە دوورە لەوەی لەلایەن کوردەوە ئەنجامدرابێت. هەرچەندە، هەلومەرجگەلێك هەن کە پێدەچێت تێیدا زمانی کوردیی پلەیەك خۆبەکەمزانینی زمانی بەباڵادا بڕواوە، بەتایبەت، لەرەهەندی ئاینییەوە، هەرچەندە، لە ئیسلامیشدا هەر زمانێکی دیکەی

149 Slcutnabb-Kangas and Phillipson (1989), p. 60.
150 Fasold (1984), p. 213.
151 Bartlett (1996), p. 132.
152 Fasold (1984), p. 240.

غەیرە قورئانی پێگەیەکی کەمتری پێ بڕاوە، هەربۆیە نابێت زمانی کوردیی لەو هەستەدا تاقانە دەربکەوێت.

هەروەها پێویستە مرۆ ئاماژە بەوە بدات کە گروپێکی زمانی کەمینە دەشێت خۆبەخشانە خۆی لە پێگەیەکی وابەستەییدا ببینێتەوە بەهۆی کارگەلێکەوە لەلایەن گروپی زۆرینەوە. بۆ روونکردنەوەی ئەمە، تیۆری هیچەر سەبارەت بە کۆلۆنیالیزمی نێوخۆیی دەیسەلمێنێت کە سوودبەخشە ( هەروەك ئەو کەیسەکەی باسی پێشوو ). بەگوێرەی هیچەر، دابەشبوونێك لەنێوان ناوەندو کەناردا هەیە، هەروەها پێشکەوتووترین گروپی لەرووی سیاسییەوە لەشوێنی خۆیانەوە لەناوەندەوە دەست بەسەر کەناردا دەگرن، ئەو زاڵبووانە دانیشتووانی کەنار ملکەچی خۆبەکەمزانیو پلەنزمییەکی ئاشکرا دەکەن لەرێگەی ئامرازە سیاسییەکانی ئیستغلالکردنەوە بە هەموو شێوە جیاوازەکانییەوە.[153] بەوەش زمانەکە لەوانەیە وەك نزمەئاستێك لەحاست زمانەکانی دەوروبەر دەربکەوێت.

فاسۆڵد، هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی-ئابووری دیاریکراو دەناسێنێت کە بەقازانجی ئان ئاڵۆزکەری گۆڕانە بەرەو زمانێك کە بەشێوەیەکی مەزن بەکاردەهێنرێت، ئەوەی لەسەر بنەمای چەند کەیسێکی جیاوازی لێکۆڵراوی وەك: بەرزاییەکانی سکۆتلاند، هەنگاریا، کەنەدای فەرەنسی زمانو هەروەها نیومەکسیکۆ، فرەرەنگی ئەم بابەتە وادەکات ئاکامەکانی شیاوی ئەوەبن بەسەر کەیسە کوردییەکەدا جێبەجێبکرێن. خەڵکی شار کە ژمارەیان سنووردارەو لەناوەندە پیشەسازییو بازرگانییەکان چڕبوونەتەوە زۆر بەزەحمەتی دەبینن جەخت لەزمانەکەیان بکەنەوە هەروەك ئەو خەڵکە گوندنشینانەی لەناوچەگەلێکی جیۆگرافی دابڕاو لەیەکتردا دەژین. باشبوونی گواستنەوەکانو پەیوەندییەکان خولیاو رێحەزی گۆڕینی زمانی بەهێزکردووە" ناوەندەکانی کەلتووریی بە زمانە هاتووەکەوە پەیوەستبووە."[154] لەنێو ئەو

153 Hechter (1975).
154 Fasold (1984), p. 241.

هۆكارانـەی زمـانێكی لاوازكـردووە كـە لـەرووی سروشـتییەوە بـەرەو دارمـان دەچێت "كۆچـكردن لەجەرگـەی زمانـەوە"، بـەڵام هـەروەها وەك ئێـدوارد دیاریـدەكات، "كۆچـكردنو هاتنـەناوەوەی بێگانـەزمانان " رۆڵێكـی گـرنگ دەبینێـت.[155] ئـەم تێبینییانە پەیوەندییان بـە كوردسـتانەوە هەیـە، لەكاتێكدا ئـەو تەعریبـە قورسـەی بەتێرژانێكی قورسی خـەڵكانێك كـە لـە گروپـە ئیتنییـە گەورەكـەوە هـەبووە-ئەگـەر رێگـەی بـەردوامی پێبـدرێت- لەوانەیـە لەمـەودای درێژخایەنـدا ببێتـەهۆی گۆڕینی زمان. هەرچەندە، حاڵەتی هەنووكەیی زمانی كوردیی، هێزێكی تەواوی پێشانداوە لە خۆبەدوورگرتن لەوەی كە لەلایەن زمانی عەرەبییەوە "لەنێوببرێت".

هەرچەندە، گۆڕینی زمان لەوانەیە گەر لەكوردسـتاندا رووبـدات، زادەی گەشـەكردنی ململانێئـامێزی نێـوان دوو زارە خۆماڵییەكـە بێـت زیـاتر لـەوەی ئاكـامی حاڵـەتی شـكۆمەندیی زمـانیی یـان زاڵبـوونی ناچاركەرانەی عـەرەبیو تـوركیو فارسـی بێـت بەسـەر زمـانی كوردییـدا. زمـانی جێگـەی پرسـیار بریتییـە لـە گـۆرانی، ئـەوەی كرینبرۆك نزیكەی وەك زمانێكی مردووی لەقەڵـەم دەدات،[156] هەرچـەندە، ناتوانرێـت مردنەكەی بۆ تیۆری كوشتنی زمان بگەڕێنرێتەوە. گـۆرانیی وەك زمـانێكی وێـژەیی پایەبـەرز لـەرابردوودا،[157] وردە وردە شـوێنێ بـە زاری سـۆرانی گیرایـەوە. ئـەم گەشـەكردنە لەسـەدەی هەژدەیەمـدا دەسـتیپێكرد" لەگـەڵ سـەرەتای دژوارییـە كۆمەڵایەتییـە ئابوورییـەكان...لەرێگـەی جەنگـەكانو راگواسـتنەكانەوە."[158] ئـەو راسـتییە بەرجەسـتە دەبێـت كـە" ئـاوابوونی زمـان لـە بۆشـاییەوە روونـادات بـەڵكو

155 Edwards (1985), p. 71.
156 Kreyenbroek (1992), p. 82.
١٥٧ "زمانی كۆمەڵگای پایەبڵندو نامە رازاوەكان لەزۆربەی كوردستان" كەلەلایەن بنەماڵەی میرایەتی ئەردەڵان بەكاربراوە(١١٦٣–١٨٦٧).

Izady (1992), p. 175. 
158 Ibid. p. 173

هاوکاتە لەگەڵ گۆڕانکاریی لەتەواوی پێکهاتەی کۆمەڵایەتییدا.[159] لەگەڵ ئاوابوونی سیاسی فەرمانڕەوایەتی مرنشینی ئەردەڵانو شوێنگرتنەوەی بە بنەماڵەیەکی تری فەرمانڕەوایەتی، ئەو ژینگەیەی کە گۆرانیی تێدا پەرەیسەندبوو بەتەواویی گۆڕا. گۆرانیی هێشتا لەهێندێك گیرفانە ناوچەی کوردستانی عێراقدا ماوە، هەروەها لەباکووری رۆژئاوای ئێران " لەلایەن قسەرکەرانی کرمانجی باشوورەوە لەژێر فشارێکی مەزندایە." هەروەها ئیزادی ئاماژەی پێداوە کە " لەگەڵ تێڕژانی پەنابەرانی کوردانی عێراقیی، کە تێکڕایان بە کرمانجی خواروو قسەیان دەکرد، بۆنێو رۆژهەڵاتو باشووری کوردستان لەئێران، پرۆسەی کاڵبوونەوەو توانەوەی گۆرانیی بەشێوەیەکی مەزن خێرابوو."[160] نەك تەنیا گۆرانیی پێگەی باڵای خۆی وەك زمانێکی ئەدەبیی لەسەدەی نۆزدەیەمدا لەدەستدا، بەڵکو لەوکاتەوە تووشی دارمانێکی بەردەوامی تاڕادەی لەناوچوون بۆوە.

زانراوە کە زمان لاواز دەبێتو دواجار مردار دەبێتەوە " ئەگەر ناوەندی قسەکەرانی ئەو زمانە رووبەڕووی هاوسێگەلێکی بەهێزی ئابووریو تەکنیکی لێزان ببێتەوە."[161] ئەمە بەتەواوی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست رەنگی نەداوەتەوە، چونکە مۆدێرنە هێشتا دەبێت دوڵەتە هەرێمییەکان وەرچەرخێنێت بۆ گەمەکارێکی بەهێز لەهەردوو کایەی ئابووریو تەکنەلۆجی پێکەوە. هەرچەندە، لەوانەیە زەمینەیەکی پێویست هەبێت کە لێیەوە ترس لەمۆدێرنە هەبێت لەبەر ئەو کاریگەرییانەی دەشێت لەسەر زمانی نەتەوەیی هەیبێت، تائەو ئاستەی کە " گۆڕینی زمان زۆرجار رەنگدانەوەی رێحەزو خولیایەکی پراگماتییانەیە بۆ راگوزەری کۆمەڵایەتیو باشکردنی ئاستی ژیان."[162] رووکردنە زمانی زاڵ لەوانەیە وەك سوودبەخش لەمەودای درێژخایەندا

159 Edwards (1985), p. 86.
160 Izady (1992), p. 174.
161 Edwards (1985), p. 50.
162 Ibid.

لەقەڵەم بدرێت، بەڵام هەروەها بۆ زورێك لەخەڵكانیش مەسەلەیەكی بنەڕەتییە. هەرچەندە، گرنگە تێبینی ئەوە بكرێت كە باشبوون لە ئاستی تاك لەكۆمەڵگادا بەشێوەیەكی ئۆتۆماتیكی گۆڕینی زمانی بەدوادا نایەت، ئەگەر كەسەكە بە ئاوێتەیەكی ئیتنی دروست لەقەڵەم نەدرێت.

بەكارهێنانی زمانی زاڵ زۆرجار دەردەكەوێت كە گرنگییەكی مەزنی لەزۆربەی بوارە بنەڕەتییەكانی ژیاندا بۆ ئایندەی زۆر لەخەڵك هەیە، هەروەها جێگای مشتومڕە كە داخۆ خەڵك بەتەواوی پشتگیریی لە جەختكردنەوەو پاراستنی مۆركێكی كەلتووری وەك زمان دەكەن، ئەگەر لەڕووی ئابوورییەوە قازانجیان پێنەگەیەنێت. كوردستانی توركیا نموونەیەكی باشە: ناوچەیەكی دواكەوتوو، كەلەڕووی ئابوورییەوە، هاوتایە لەگەڵ كاڵفامیو موحتاجی خەڵكەكەی، بۆ خودی خۆی پەیوەندی بە زمانی قسەپێكراوەوە هەیە، وەك كوردیی. ئەم "linguicism / راسیزمی گوزارشتلێكراو لەڕووی زمانییەوە) [١٦٣] كە لەتوركیادا هەیە بەتەواوی هاوشێوەی سیاسەتەكانی دەوڵەتو هەستی گشتی لەعێراق نییە، لەوی بەهۆی بەرگریی نەتەوەیی كوردانەوە سەركوتكاری حكومەت كەمتر توندە، ئەوەی هەلومەرجێكی رێژەیی لەبارتری بۆ گەشەكردنی زمانەكەیان هێناوەتەرئارا.

پێدەچێت ئەوە دروستتر بێت بهێنرێتە بەرچاو، كە لەجێی ملكەچبوون بۆ زمانی عەرەبیی، سیاسەتێكی چالاكی پتەوكردنی زمان[١٦٤] لەباكووری عێراق بەڕێوەبچێت، لەگەڵ بەكارهێنانی زمانی كوردیی وەك زمانێكی پەیوەندییگرتن كە ماوەیەكی زۆرە وەك زمانی ئاخاوتنو نووسین لەسەر ئاستێكی گشتی كۆمەڵ بەكاردەهێنرێت.

---

163 A concept coined by Tove Skutnabb-Kangas in 1988 and outlined in her 'Multilingualism and the Education of Minority Children' in Skutnabb-Kangas and Cummins (eds.), Minority education: from shame to struggle, Clevedon: Multilingual Matters, pp. 9-44.

١٦٤ نموونەیەكی بەرچاوی پتەوكردنی زمان بریتییە لە خەڵكی كیوبكی فرەنسی زمان لەكەنەدا، كەیسەكەی مۆنترێل كە ئاماژەی بۆكراوە لەلایەن: Fasold (1984), pp. 227-231.

## ٣ . ٤ . ٤ پوختە

پێدەچێت سۆرانی و کرمانجی بەتەواوی توانای بەرگریان لەحاست کاریگەریی زمانیی زمانە باڵادەستەکانی هاوسێیان هەبێت، بەڵام زمانی کوردیی هێشتا دەبێت لەڕیزی ئەو زمانانە دابنرێت کە لەمەترسیدایە بەهۆی سیاسەتە زمانییە فەرمییەکانی حکومەتی ناوەندی. بەدرێژایی مێژوو چەندە نموونەی گۆڕینی زمان روویداوە، هەروەها ئەو گرفتانەشی زمانی کوردیی ئەزموونی کردوون، رۆڵی سیاسەتی دەوڵەت دەسەلمێنن.

دەشێت نەتەوەخوازانی کورد بەکارهێنانی زمانی کوردیی هەڵبژێرن لەپێناو لابردنی مۆرکی زمانی عەرەبیی لەکوردستان‌و پێچەوانەکردنەوەی رێحەزی کۆمەڵایەتی- سیاسیی تەعریب، بۆئەوەش دەبێت ئەو سیاسەتە بێ دوودڵی بیچێتەپێش.[١٦٥] هەرچەندە، زۆر گرنگە تێبینی ئەوەبکرێت کە تەعریب یەکسان نەکرێت بە مۆدێرنە، چونکە هەرێمە کوردییەکە بەهۆی ئەو عەرەبانەوە مۆدێرنە رووی تێنەکردووە کە لەوێ نیشتەجێبوون. ئەگەر هەردوو چەمکی تەعریب و مۆدێرنە هاوشانی یەکتر ببینرێن، پێدەچێت ئەوکاریگەرییەی لەسەر وەرچەرخانی جووڵانەوەی لایەنگریی لەزمانی کوردیی هەبێت، کە لەنێوەرۆکدا نەتەوەییە، لە پرۆسەیەکی نێوەرۆك بزۆزەوە بۆ قەوارەیەکی وەستاوی چەقبەستو- ئیدی ئەوسا وەك دواکەوتووو نەریتیی دەبینرێت.

لەنەبوونی بەستانداردکردنی زمانی کوردییدا پشێوییەك‌و تەنانەت گومانێکیش سەبارەت نەتەوەبوونی کوردان پەیدابووە، هەربۆیە زۆر بەقازانجی بەرژەوەندی نەتەوەییە- هاوکات بەقازانجی تەواوی بەژەوەندی زمانیشە- کە هەوڵی راستکردنەوەی ئەم رەوشە بدەن. هێشتا کوردان لەسەریانە پێگەو بوونێکی سیاسیی

---

١٦٥ بۆ سیما زمانییەکانی پەیوەست بە تەعریبەوە بڕوانە: Hassanpour (1992), P. 123.

چەسپاو بەدیبێنن، تاکو ئەوەش روودەدات، دەبێت دەرفەتەکانی بەردەم بەدیهێنانی فۆرمی بەستانداردکردنی زمانەکەیان بەلاواز لەقەڵەمبدرێت. ئەمەش گرنگی پرسە زمانییەکان بەرجەستە دەکات لەوەی شوێنیان لە جووڵانەوەی نەتەوەییدا پێبدرێت وێڕای هەر ئەزموونێکی دیکە لەگەشەکردنی سیاسیی هەرێمەکەدا.

# باسی چوارەم: پێکهاتنی شوناسی کوردیی

## ٤ . ١ شوناسسازیی لەسەر ئاستی نەتەوە، کۆمەڵ و تاك

کاتێك مشتومڕ سەبارەت بە پێکهاتنی شوناس دەکەین زۆر گرنگە جیاکاریی بکەین لەنێوان شوناسی سیاسیی-دامەزراوەیی لەلایەك، و هەروەها شوناسی ئیتنیی-نەتەوەیی لەلایەکی ترەوە. هەروەك پاریخ جەختیلێکردۆتەوە، "شوناسی کۆمەڵی سیاسی لەبونیادە سیاسییەکەیدایە، نەك لەو تایبەتمەندییە کەسایەتییە بەرفراوانە هاوبەشەی لەئەندامگەلە تاکەکانیدایە."[1] ڕێبازی سیاسیی-دامەزراوەیی لێرەدا زۆر بەگونجاوی بەکارهاتووە لەکاتێکدا " تایبەتمەندییە ئیتنۆ-کەلتوورییەکان ئەوەندە تەمومژاوییو ئاڵۆزە کە دیاریبکرێتو لەسەری کۆکبن، کە بەدەگمەن لەلایەن هەمووانەوە یان تەنانەت زۆرینەشەوە بەشداریی تێدا دەکرێت، سەردەکەنە ژیانی تایبەتی خۆیان، لەباشترین حاڵەتدا وەك خەڵك نەك کۆمەڵگای سیاسیی دەناسرێن."[2] چەندین پێکهێنەری شوناسی گروپ هەن کە پێشتر فاکتەرەکانی ئاماژەیان بۆکراوەو ( چین، خێڵ، ئاینو زمان) کەمێکین. ئەم مشتومڕەی لەسەر پێکهاتنو پێکهێنەکانی شوناسە لە(شێوەی ١. ١. ٤ : دایەگرامی شوناس) دا ڕوونکراوەتەوە. چوار پێکهێنەرە سەرەکییەکە پێشتر پێناسەکراون، وەك: چین، خێڵ، ئاینو زمان کە هەموویان لەهاوبەستەگی گەلی کورددا ڕاژەیان کردووە . وێڕای ئەو پێکهێنە سەرەکییانەی شوناس، دیارییکراوی دیکە هەن کە هەروەها کاریگەریی بەرچاویان لەسەر پێکهاتنی شوناسی کوردییدا هەیە. ئەو دوو گۆڕاوەی دوایی سەر کلێشەکە پێشتر قسەیان لەبارەوە کراوە، ئەو دانەیەشی سەبارەت بە دەستێوەردانە دەرەکییەکانە لە بەشی ( د )دا قسەی لەبارەوە دەکرێت. ئەم مۆدێلە تیۆرییە لەفۆرمە بنەڕەتییەکەیدا بەسەر دەوڵەتدا جێبەجێدەکرێت، هەربۆیە هێندێك دەستکاری کراوە تاکو لەگەڵ ئەم کەیسەی بەردەستدا بگونجێت، ئەوەی

1 Parekh (1999), P. 69.
2 Ibid.

دەشێت ناوی "sub-state entity / قەوارە وردە دەوڵەتەکان" ی لێبنرێت. بە بنیاتنان لەسەر باسی سێیەمو مشتومڕەکەی سەبارەت بە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردیی، شێوەیەکی دیکەی زێدەکراو هەیە کە (شێوەی ٢. ١. ٤ : دایەگرامی شوناس ٢) ە، کە گۆڕان لەرۆڵی شوناس پێشاندەدات لە پشتبەستنەوە بۆ حاڵەتێکی گۆڕاو لەپێکهێنانی بەرێوەبردنی دەوڵەتدا. ئەمەش کارلێکی نێوان دینامیکە نێوخۆیی و دەرەکییەکان پێشاندەدات وەك شوناس لەم حاڵەتە جیاوازانەی بەرجەستەی گۆڕاوە یەکلاکەرەوەکان دەکات.[٣]

شێوەی ١. ١. ٤ دایەگرامی شوناس




شێوەی ٢. ١. ٤ دایەگرامی شوناس ٢




تێبینی: شوناس: گۆڕانی بەسەرداهاتووەکان
ئاکاری دەوڵەت: گۆڕانە پشتبەستووەکان

---

٣ ئەم دوو دایەگرامە وەك روونکردنەوەیەك پێشکەشکراوە لەلایەن:
Theophylactou: see p. 6, (1995). 

## ٤ . ١ . ١ بنیاتنانی شوناسی نەتەوەیی

شوناس لەبنەڕەتدا "سەرچاوەی ماناو ئەزموونەکانی گەلە"، مانایەك كە "لەدەوری شوناسی سەرەتایی ڕێکخراوە...کە لەبەرامبەر کاتو بۆشاییدا بەردەوامی بەخۆی دەدات."[٤] بەشێوەیەکی زێدە تایبەت، شوناسی نەتەوەیی کە هێندەی پێویست بێت لەڕووی شرۆڤەکارییەوە، بایەخ بە" کۆمەڵێکی دیارییکراو دەدات لەسەر بنەمای ئینتیمای هاوبەش...هەروەها بەشداریی لە تێگەیشتنی خودی دەستەجەمعیدا."[٥]

پێدەچێت لەنێو بازنە نەتەوەییەکاندا گریمانەیەکی بەرفراوان سەبارەت بەشوناس لەگۆڕێدابێت بەوەی کە بەردەوامییەکی هەیە هەر لەسەردەمە کۆنەکانەوە تاکو رۆژگاری ئەمڕۆ، بەوەش "بەرۆمانتیکیکردن"ی میراتی شوناس هاتۆتەئارا (زیاتر هەروەك ئەوەکەی لەگەڵ چەمکی نەتەوەدا کراوە). هەرچەندە، زۆربەی چاودێرانی سیاسەتەکانی شوناس ئاماژەیان بەو راستییە کردووە کە شوناس بریتییە لە هەرشتێك جگەلە قەوارەیەکی نەگۆڕ کە تایبەتمەندبێت بەبزووتن، کە هەمیشە لە پرۆسەیەکی گۆڕاندایە. کیتو پیلی، دەریانخستووە کە پێویستە شوناس وەك "ناتەواو" لەقەڵەمبدرێت، هەروەها "زیاتر وەك پرۆسەیەك فام بکرێت تاکو ئەوەی ئاکام بێت."[٦] بنیاتنانی شوناسی نەتەوەیی بەشێوەیەکی ئاسایی رەهەندی مێژوویی، کۆمەڵایەتیو سیاسیی دەگرێتەخۆ، هەروەها ئەگەر مرۆ هەمان هەڵوێستی کیتو پیلی وەربگرێت، ئەم پرۆسە ناتەواوە مانای شکلگرتنەوەو چاککردنەوەو دیسانەوە کۆکردنەوەی فاکتەرە بەکارهاتووەکان دەگەیەنێت.

نەریتی داهێنراو زۆرجار پشتدەبەستێت بەوەی کەی هاتۆتەئاراو وەك شوناسی نەتەوەیی جەختی لێ کراوەتەوە، رەگەزێکی بنەڕەتیی بۆئەوەی ببێتەهۆی بەدەستهێنانو پتەوکردنی جێگیریی کۆمەڵایەتی. هەرچەندە، لەوانەیە هەروەها لەلایەن گروپە نەتەوەییەکانەوە سوودی لێوەربگیرێت، بۆ پتەوکردنی ئەو

4 Castells (1997), p. 6.
5 PareIch (1999), p. 69.
6 Keith and Pile (1993), p. 28 (italics added).

بنەمایانەی خولیا سیاسییەکانی لەسەر سەقامگیر بووە. چەمکی نەریتی داهێنراو درك دەکرێت وەك " دەستەیەك لە کردار...کە خوازیارە لەزەینیدا بەهاگەل‌و چەند نۆرمێکی ئاکاری دیارییکراو بچەسپێنێت لەرێگەی چەندبارەکردنەوەوە، کە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی مانای بەردەوامی لەگەڵ رابردوو دەگەیەنێت."[7] هۆبسباوم سێ جۆری نەریتی داهێنراو دەناسێنێت: یەکەمیان ئەو هاوبەستەگییە پێشکەوتووە کۆمەڵایەتییانەی کۆمەڵن، کە جیاکراونەتەوە لەوانەی دامەزراوەکان پێکدێنن‌و رەوایەتییان پێدەبەخشن، هەروەها نەریتگەلێك کە ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان دیاریدەکەن ( چاندن‌و چەسپاندنی بیروبڕواکان، سیستمەکانی بەهاو نەریتەکانی ئاکار.)[8] ئەم داهێنانی ئاکارە لە سیاسەتی کوردیی سەبارەت بەپێکهاتنی شوناسدا نییە، هەروەها مرۆ دەتوانێت پشت بە پێشنیازەکەی ئۆشیا ببەستێت سەبارەت بە "ئەفسانە یەکخراوەکان"ی پتەوکردنی شوناسی کوردیی: ئەوانەی سەبارەت بە زمان‌و تۆپۆگۆافی‌و هەروەها نموونە باڵاکانی گوندنشینین."[9] ئەوەی دواییان بەڵگەی فۆکوسێکی گرانە لەسەر ژیانی گوندنشینی لەسەر حیسابی ژیانی شارەکیی، وێنەی شوناسی نەتەوەیی کوردیی دێنێتەئارا کە لەسەر بنەمای بابەتەکانی شوانکارەیی راوەستاوە- هێندێك بەدروستی وێنەیانکردووە، هێندێکیش کەمتر بەدروستی- کە لەوانە نییە بەرجەستەی رێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانی ئیستا بکەن لەکوردستاندا، بەڵام هاوبەستەگی هەستی نەتەوایەتی پتەودەکات‌و هۆشیاریی دەستەجەمعی بەهێزدەکات. بەوەش نەریتی داهێنراو لە چوارچێوە کوردییەکەدا پێدەچێت لەبنەڕەتدا ئامانجی پێشخستنی هاوبەستەگی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگادا بێت.

رابردوویەکی ناسێنراوو بەباشی بەرجەستەکراو دەتوانێت شوناسێك پتەوبکات ئەوەندەی وەبیرهێنانەوەی کۆمەڵگا بێت سەبارەت بە ریشەی هاوبەش، بەهاکان، ئامانج‌و بەرژەوەندییەکان‌و هەروەها ئەزموونە سۆزەکییەکان. ئەگەر هەست بکرێت

---

7 Hobsbawm (1983), p. 1.

8 Ibid. p. 14.

9 Paper presented by Maria O'Shea, 'Imagining Kurdistan' at the Kurdological Conference Between Imagination & Denial. Kurds as subjects and objects of political and social processes, May 29-31 1998, Berlin.

شوناسی نەتەوایەتی لەژێر هەڕەشەدایە، ئەوا ئەم کۆمەڵگا ورەنزمانە زۆرجار ئاوڕ لەرابردوو دەدەنەوە بۆ ئیلهام وەرگرتن، ئەوەی لەکاتێکدا سوودبەخشبوونی نەریتە داهێنراوەکە ئاشکرابێت، کۆمەڵەکە دەست بەوەبیرهێنانەوەی شوناسی خۆی لەرێگەی دووبارە هێنانەوەئارای رابردوودا دەکات. بەوەش رابردوو لە ئەفراندنو پاراستنی شوناسدا گرنگو یەکلاکەرەوەیە. شوناس تەنیا دەتوانێت بەئاماژەدانی بەردەوام بۆ رابردوو - بەشێوەی ئاماژە یان روون - بمێنێتەوە. وەك لەپێشدا جەختی لێکراوەتەوە، شوناس شتێکی یەکپارچەیی نییە، بەپێچەوانەوە، لەقەڵبەزەیەکی بەردەوامدایە، ئەو دەگۆڕێت بەهۆی هەریەکە لە دینامیکییە نێوخۆییەکانو هەروەها وەك وەڵامدانەوە بە کاریگەرییە دەرەکییەکان. زنجیرە رووداوە مێژووییەکان لە یادگەی دەستەجەمعیدا دەبینرێتەوە، وەلادەنرێت، دەردەکەوێت، دووبارە دەردەکەوێتەوە یان دیارنامێنێت.[10]

لە فۆرمە جیاوازەکانی کاستێل سەبارەت بە " identity-building / شوناسسازیی"، یەکێکی بەتایبەت دەتوانرێت بەسەر کەیسە کوردییەکەدا جێبەجێبکرێت، ئەوەی ناوی " resistance identity / شوناسی بەرگریی" لێنراوە " لەلایەن ئەو ئەکتەرانەوە هاتۆتەئارا کە لەپێگەو رەوشێکی کەمنرخکراودان یان مۆری لۆجیکی زاڵبونو هەژمونیان لێدراوە، لێرەوە بنیاتنانی سەنگەری بەرگریی‌و ژیانەوە لەسەر بنەمای پرنسیپگەلێکەوە جیاواز لە، یاخود دژ بە، ئەوانەی دزەدەکەن نێو دامەزراوەکانی کۆمەڵگاوە.[11] ئەم شوناسە لەرێگەی بەرگرییەوە بەفرە گرنگ لەقەڵەم دەدرێت، یاخود جۆرە هەرە گرنگەکانی شوناسسازییە تاکو ئەوەی " بونیاتەکەی لە بەرگرییەکی دەستەجەمعی پێکدێت دژی هەر زۆردارییەکی قبوڵنەکراو.[12]

شوناس دەشێت وەك کۆی هەموو ئەو سیمایانە ببینرێت کە کۆمەڵێك خەڵك بڕوای

---

10 Connerton (1989), p. 51.
11 Castells (1997), p. 8.
12 Ibid. p. 9.

پێیەتی بۆ جیاکردنەوەیان لە گروپێکی دیکە. پرۆسەگەلێکی پێکهاتنی شوناس بەشێوەیەکی بەرفراوان کاری تێدەکرێت بەهۆی کارلێککردن لەگەڵ جۆرە جیاوازەکانی هاتووە دەرەکییەکان، هەروەها هەمیشە پێویستییەك بۆ بوونی "ئەوی دیکە" هەیە لەبەرامبەر ئەوەی شوناسی تایبەت بەخۆی پێکهاتووە. هەربۆیە شوناس "'other-related / پشتبەستووە بەوانی دیکە" [١٣] لەگەڵ جیاوازییە پێشگریمانەییەکان. گەشەکردنی هەر شوناسێکی بەهێز بەبێ ناساندنو دەستنیشانکردنی ئەو جیاوازییانەی ئەوانی دیکە پێناسەدەکات، بەتەواوی وێناناکرێت. شوناس، وەك هێزێکی کۆمەڵایەتی ناجێگیرو هاوپەیوەست، وادەردەکەوێت کە لەبەرامبەر ئەو جیاوازییانەی کە پێناسەی شوناسی ئەوانی دی دەکات، بگۆڕێت. بە دەربڕینێکی ساکار، مرۆ دەشێت وەك کۆهین بڵێت " تەنیا لەڕێگەی زانینی ئەوەی تۆ کێ نیت دەتوانی بزانیت تۆ کێیت."[١٤] ئەوەی کە پێدەچێت هەروەها بەسەر شوناسی نەتەوەیی کۆمەڵدا جێبەجێبکرێت.

لەپەیوەندی بە ئەوروپای پاش وێستیفالیاوە، "مەترسیی توركیی" بەمانایەکی دیکە، عوسمانییەکان بەرجەستەی "ئەوی دیکە" یان لەژیانی سیاسی ئەوروپییەکاندا دەکرد، هەروەها هەروەك مەرجێکی پێویست راژەی بە شوناسی ئەوروپییەکان کرد. ئەو شێوازەی ئەوروپییەکان کاریان پێکرد بۆ بەرگرییکردن لە ئەوروپا دژی "مەترسیی توركیی" لەپاش قۆناغی وێستیڤالیاوە وایکرد عوسمانییەکان رەگەزێکی ئامادەو هەمیشەیی بن لەکەلتووری سیاسیی ئەروپییەکاندا، ئەوەی ئەو راستییە بەرجەستە دەکات کە بوونی دوژمنی دەرەکیی هەمیشە هەماهەنگیی کۆمەڵ بەهێزدەکات- کەزۆرجار دەگۆڕێت بۆ شوناس. ئەو شێوازەی کەئەورپییەکان ئاماژەیان بەعوسمانییەکان دەدا "ئەوی دیکە"، وادەکات وەك هاوشێوەیەك بۆ خۆجیاکردنەوەی کوردان لەوانی دیکە: بەتایبەت عەرەبو

---

13 Keller (1992), p. 141
14 Cohen (1994), p. 1.

تورك‌و فارس وێنابكرێت. هەرچەندە، لەكاتێكدا  جیاوازییەكان لەوی دیكە زۆرجار دەبێتە بنەمای شوناسی گەلێك، زێدەڕۆیی لەجەختكردنەوە لەم ڕەگەزە وا لە شوناسی گەلێك دەكات "other-directed / لەلایەن ئەوی دییەوە ئاراستەكراو بێت. بەوتەیەكی دیكە، " ئەوانی دیكە دەبنە چوارچێوەی جێگیری ئاماژەدانی"،[15] ئەوەش دەبێتە هۆی لاوازبوونی فۆكوسكردن لەسەر شوناسەكەی خۆی، ئەوەی سەرچاوەی مەترسییە بۆ گەشەكردنی شوناسی نەتەوایەتیی كوردیی.

ئایدیای پێناسەكردنی شوناسی تایبەتی یەكێك دژی ئەوەكەی ئەوانی دی، ڕەهەندگەلێكی مەزن دەگرێتەبەر لەناوچە دژوارو ناجێگیرەكەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بەگشتی‌و كوردستان بەتایبەتی. لەساڵی ١٩٩٤دا، كەنعان مەكیە، پەنجەی خستۆتە سەر ئەمە كاتێك تێبینیكردووە كە چۆن "بەرزبوونەوەی لوژیكی توندوتیژیی" لەرابردووی نزیكدا ئەزموونكراوە بۆتە هۆی "هەریەك لە هۆكارو ئەنجامی زێدەبوونی ناشایستەیی تاكەكان‌و گروپە سیاسییەكان لەدامەزراندی شوناسێك بۆ خۆیان كە لەریشەیدا بەتایبەتی كاردانەوەیی‌و دوژمنكارانەیە لەحاست ئەوانی دی."[16] ڕەوشێك كە شوناسێكی نەتەوەیی كوردیی بەردەوام‌و چەسپاوی تێدا بئافرێنرێت خۆی نەنواندووە، هەروەها سەبارەت بەو ڕەوشە سەختەی كە لەسایەیدا كوردان جەختیان لەشوناسی خۆیان كردۆتەوە، لەوانەیە گونجاو بێت بوترێت كە ئەوان، پێدەچێت تەنانەت زێدەتر لە شوناسە نەتەوەییەكانی ئەوانی دی كاردانەوەیی‌و پەلاماردەرانەو دوژمنكارانە بن لەحاست "ئەوانی دیكە"یاندا.

## ٤ . ١ . ٢  تاك لەهەمبەر شوناسی دەستەجەمعیدا

شوناسی بەكۆمەڵ پێویستی بە ئەزموونی بەكۆمەڵ‌و یادەوەریی بەكۆمەڵ هەیەو بەهۆیانەوە دەمێنێتەوە. ئەو ئەزموونانەی زۆرجار لەمیانەی بوونی گروپەكەكاندا

---

15 Parekh (1994), p. 503.
16 Makiya (1994), p. 198.

کەڵەکەدەبێت، لەرێگەی مێژوو، کەلتوور، ئـەدەبو ماتریـاڵو سێرمۆنیاکانیشـەوە بـۆ نـەوەی دواتـر دەگوێزرێتـەوە، هـەروەها، بـەکورتی لەرێگـەی نـەریتی کۆمـەڵگاوە. یادەوەریی بەکۆمەڵ ئەو ئەزموونانە دەگرێتەخۆ کەژمارەیەکی بەرچاوی ئەنـدامانی گروپەکــە کــەم یــان زۆر لــەڕابردووی دووردا پێیــدا تیپــەڕیون. نێوەرۆکەکــەی بەبـەردەوامی دەگـۆڕێن - ئـەو سـەرکوتکارییە درێژخایەنـەی کـوردان لەسەردەسـتی بەعسییەکان تووشی هاتوون بۆخۆی لەوانەیە بووبێتە هۆکارێك بۆ هاندانی کـوردان تـاکو جـەخت لەشوناسـی خۆیـان بکەنـەوە- بـەڵام هـەروەها یادەوەرییـە ئەرێییـەکان یادەوەریی بەکۆمەڵی نەتـەوەی کـورد پێکـدێنێت. هەرچـەندە، یـادەوەریی بەکۆمـەڵ دەتوانێت بەتەواوی لەسروشتدا دەستنیشانکراو بێت، ئـەوەی کـە دەشـێت ئەفسانەی وەك ریالیتە بێت، ئەمـەش کاتێـك کاریگـەری نـەریتی داهێنـراو لەوانەیـە نیشانەی خـۆی جێبهێڵێـت. هـەروەها جێگـەی بایەخـە کـە،"ئـەوەی خـەڵکی بـۆ وەبیرهاتنـەوە هەڵیدەبژێرن پشت بە رەوشو خولیاو رێحەزەکانی ئێستایان دەبەستێت."[١٧]

چەمکی شوناسی بەکۆمەڵ مانای " هەستێکی بەشداریی بەردەوامییە لەلایـەن نـەوە یەکبەدوایەکــەکان ســەبارەت بــە یەکەیــەکی دیــاریکراو لەدانیشــتووان، هــەروەها بەشـداریی لەیادەورەییـەکانی دەورانـی بـەرایی، رووداوەکـانو هـەروەها کەسـایەتییە دیارەکانی مێژووی ئەو یەکەیە: دوو پێکهاتە کە "بڕوایـەکی بەکۆمـەڵ سـەبارەت بـە چارەنووســی ئــەو یەکەیــەو کەلتووریەکــەی بەرهەمــدێنن.[١٨] لێــرەوە دەکرێــت ئەنجامگیریی بکرێت کە چین، خێڵ، ئاین، زمان، ئیتنیكو خاك لەخۆیاندا بەس نین بۆئەوەی شوناسێکی نەتەوەیی بـەهێز بئافرێنرێـت- ئـەوە ئەزمونـە هاوبەشـەکەیانە دەیکات.

جیاوازییەکی گرنگ لەنێوان پێناسەی تاكو بەکۆمـەڵ ئەوەیـە کـە شـوناس بـۆ تـاك بەشـێوەیەکی ئاسـایی "situational / دۆخـەکیی"ە، لەکاتێکـدا رێحـەزی شوناسـی بەکۆمەڵ " pervasive and persistent/ گشتگیرو چەسپاوە"...کەمتر مـل بـە

17 UNRISD (1995), p. 95.
18 Smith (1992), p. 58 (italics added).

گۆڕانی خێرا دەدات...و توندترو تۆکمەیە.[19]

وێڕای جیاوازیی ئاشکرای نێوان دوو فۆرمە سەرەکییەکەی شوناس، هێشتا پێویست بەوەدەکات دان بە پێویستیی دانانی شوناسی تاكو بەکۆمەڵ لەچوارچێوەیەکی شرۆڤەکاری یەکگرتوودا بنێین، هەروەك جێنکینز بانگەشەی بۆکردوە. ئەوەش لەبەرئەوەی " تەنانەت هەرە شوناسە تایبەتەکان ناتوانێت وەك هەرشتێکی کە وێناکراوبێت جگە لە بەرهەمی هۆشیارییەکی بەکۆمەڵایەتییکراوو هەروەها رەوشێکی کۆمەڵایەتی...هەروەها...تەنانەت هەرە بەکۆمەڵەکانی شوناس پێویستە، بەشێوەیەك لەشێوەکان، لە ئاگاهیی تاکەکاندا بوونی هەبێت."[20] بە وتەیەکی تر، " بەکۆمەڵی ناتوانێت بێ تاك "راستیینە" بێت."[21] دواجار بەکۆمەڵی یاخود هەستی بەگروپیبوون، پشت بە شوناسی تاك دەبەستێت. شوناسی تاكو بەکۆمەڵ لەبنەڕەتدا یەکێکن کە هەمیشە لەلایەن هێردەرەوە لایەنگری لێکراوە، ئەوەی کە ئەم پرسەی لەبەر تیشکی گەشەکردنی زمان لێکداوەتەوە، هەروەها پێشنیازی کردووە کە " ئەوە لەرێگەی زمانەوەیە کە تاکەکان یەکسەر لە خودبوونو نەتەوەبوونی خۆیان بەئاگادێنەوە...لەم هەستەدا شوناسی تاكو شوناسی بەکۆمەڵ دەبنە یەك."[22]

## ٤ . ٢ ڕەهەندی شوناسی سیاسەت

ڕەهەندی شوناسی سیاسەت لەکوردستانی عێراق بایەخێکی گرنگی لەو ئەگەرەیدا هەڵگرتووە کە یا پتەوکردن یان پارچەکردنی هاوبەستەگی بافتی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە. واتە ئامرازێکی بەکارهێنانی فرەڕووە، بەوەش دەتوانرێت سیاسەتی شوناس بەشێوەیەك سوودی لێوەربگیرێت کە کۆمەڵگای خۆجێ بەهێزبکات، بەڵام، بەکارهێنانی بەدانایییەکی کەمەوە لەوانەیە هەروەها خزمەت بەلاوازکردنی یەکێتی ئەو گەلە بکات.

---

19 .Ibid. p. 59.
20 Jenkins (1997), p. 72.
21 Ibid. p. 166.
22 Barnard (1969), p. 7.

نابێت شوناسی سیاسەت وەك " جۆرێك لە بڵقی سەرئاو لەقەڵەمبدەین کە لەدەوری لوتکەی زیاتر لە پرۆسەگەلێکی گرنگی کۆمەڵایەتی دەردەکەون."[23] زیاتر لەوەی کە سیمایەکی زیندووی گرنگەو دەبێت لەکاتی شرۆڤەکاری گەشەکردنی سیاسی بەگشتیو ئەوانەی ناوچە ناجێگیرەکان بەتایبەتی، لەبەرچاوبگیرێت، لەوێ کە پێکدادانەکانی شوناس دەتوانێت ببێتە هۆی دەستپێکردنی پێکدژییو ململانێیەکانو پاراستنی پتەوییو تۆکمەیی. هەروەك لەخوارەوە مشتومڕی لەبارەوە دەکرێت، نە هەمیشە گونجاوە، نە بۆ ئەو مەسەلەیەش ئارەزووکراوە، کە وێنای بواری ئاین، زمان، ئابوریو خێڵ بکرێت بۆئەوەی لە ڕەگەزەکانی دیکە جیابکرێتەوە لەپرۆسەی شکلگرتنی شوناسێکی نەتەوەییدا، لەکاتێکدا ئەوانە بەبەردەوامی کارو کارلێك لەیەکتر دەکەن.

## ٤ . ٢ . ١ پێکەوەگرێدان لەگەڵ دەوڵەت

لەگەڵ سەرهەڵدانی دەوڵەت-نەتەوە ئەو هزرە هاتۆتەئارا کە پێویستە یەك شوناسی ناوەندی بۆ کۆمەڵگای خۆجێی سیاسی هەبێت- شوناسێکی هاوبەش وەك گرێبەستێکی کۆمەڵایەتی لەنێوان ئەو خەڵکەدا ڕاژەدەکات کەدەیانەوێت دەوڵەتێکی نوێ پێکبهێنن. هەرچەندە، هەروەك ئەوەی لەئێستادا بەچاکی ڕاستییەکی زانراوە، دامەزراندنی دەوڵەت-نەتەوە شتێکە، بەڵام وا لەو خەڵکەی ناوی بکەن کە بڕوایان پێی بێت بەتەواوی شتێکی دیکەیە- فرە ئاشکرایە کە لەکاتی دامەزراندنی دەوڵەتی هاوچەرخی عێراقەوە دوای دەرچوون لە ماندێتی بریتانی لەساڵی ١٩٣٢دا، ئەو ڕێگەی کە دەبوو عێراقیی پێ پێکبهێنرێت، یان چۆن ئەو خەڵکە دەبوو بۆ هاوڵاتییەکی عێراقیی بەشوناسێکی عێراقییەوە وەرچەرخێن، گرفتێکی بنەڕەتیی بوو، هەروەها ئەم پرۆژەیەی ئەندازەگیریی کۆمەڵایەتی بووە هۆی دروستبوونی کارەکتەری شوناسی بەعسی عێراقیی.

---

23 Keith and Pile (1993), p. 31.

ریالیتەی نوێی "شوناسی فەرمیی" کە ئەندامەتی لە دەوڵەت-نەتەوەدا فەراهەمدەکات، لەوانەیە جۆرە دژواریی‌و ئاڵۆزییەك بۆ زۆربەی ئەو خەڵکە بێنێتەئارا کە شێوەژیانی نەریتی دەگوزەرێنن. ساتیمورتی، مشتومڕی لەبارەی ئەم جیاوازییانە کردووە لەنێوان کۆمەڵگا ساکارو هاوچەرخەکان، هەروەها جەختیکردۆتەوە لەوەی پێگەی هەرکەسێ لە کۆمەڵگا ساکارەکاندا "دیاریدەکرێت بەهۆی ئەو پێگە شیاوەی (نێر بێت یان مێ) کە لە کۆمەڵگادا هەیەتی، کە خۆی لەخۆیدا بەهۆی: پیشە، خێزان، بنەچە، ئەندامێتی عەشیرەت‌و شوناسی خێڵایەتییەوە." دیاریدەکرێت.[٢٤] بەوتەیەکی تر، ئەمەش بنەمایە بۆ نەتەوایەتی: ئەندامەتی گرووپی بچووکتر زەمینە بۆ ئەندامەتی گرووپی گەورەترو گشتگیرتر خۆشدەکات. ئەمە بەتوندی پێچەوانەی سیستمی کۆمەڵگا مۆدێرنەکان دەوەستێتەوە، کە تاکەکان راستەخۆ پێگەی هاوڵاتیبوونیان هەیەو نەك وەك ئاکامێکی لۆژیکی ئەندامەتییەکی پێشینە بۆ " some organic sub-part / جۆرە وردە بەشێکی ئەندامیی" لە دەوڵەت-نەتەوەدا."[٢٥] ئەم فۆرمە لە هاوڵاتیبوونی یاسایی‌و تەکنیکی بۆ ئەوە شێوەژیانەی خەڵکانی کۆمەڵگا نەریتییەکان نامۆیە، لەگەڵ ئەو ئاکامەی کە " لەزۆر لە کەیسەکاندا هەروەك شوناسی فەرمیی جیاوازە لە ئەندامەتی "راستیینە" و "ئاوێتە"و "سۆزەکیی-هەستپێکراو".[٢٦]

لە وەسفکردنەکانی ئێستا سەبارەت بە چەمکە "toponymic or ethnonymic / تۆپۆنیمی‌و ئیتنۆمیکەکان- ئەوەی پێشەوەیان وەسفی شوێن‌و هەرێم یان وڵاتێك دەکات کە یەکێکی تێدا نیشتەجێیە (وەك کوردستانەکەی بەشی عێراق) هەروەها ئەوەی دواییان مانای ئینتیمایەکی ئیتنکیی‌و کەلتووریی- شوناسی کوردیی کە رەهەندگەلێکی جیاوازی گرتۆتەخۆ وادەکات لەهەرێمە ئۆتۆنۆمەکەدا بەئاراستەی

24 Sathyamurthy (1983), pp. 72-3.
25 .Ibid.
26 .Ibid.

سەربەخۆییەکی کوردیی سیاسییدا گەشەبکات. بەوەش پێناسە نەتەوەییەکان دەتوانرێت بە چەمکی "politonymic / پۆلیتۆنۆمیك (مانای ڕێگەیەك بۆ وەسفکردنی خەڵك بەگوێرەی ئەو قەوارە سیاسیەی ئینتیمای بۆدەکات" دەرببڕرێت. بەوتەیەکی دیکە، ئەو دەمە "کوردیی" مانای هاولاتی لەدەولەتێکی کوردییدا دەگرێتە خۆ.[٢٧]

دابەشبوونەکەی "ئێمە-ئەوان" کە پێکهاتنی شوناس هێناویێتیەئارا ( لەڕووی ئەوانی دیکە)وە پێویست نییە کە بۆ دەولەت زیانبەخش بێت، ئەلام پێدەچێت ئەمە تەنیا لەو کاتەدا روبدات کە هەستی نەتەوەیی بۆ زۆربەی نەتەوەکە لەهەر دابەشبوونێکی دیکە بەهێزترە بۆ هەرێمگەلە جیاوازەکان کە شوناسە لۆکاڵییە بەهێزەکان دەخولقێنێت. جەختکردنەوەی یەکێك لەشوناسی کەلتووریی خۆی‌و پابەندبوون بە شوناسێکی نەتەوەیی گشتگیرتر پێدەچێت پێویست نەکات پێکدژ بن.[٢٨]هەرچەندە، دەبێت دان بەو راستییەدا بنرێت کە ئەگەری سەرکەوتن‌و مانەوەی دەولەتێك، بەتایبەتی ئەگەر دەولەتێکی نوێ بێت، تاڕادەیەکی زۆر پشت دەبەستێت بەوەی کە چەندە خەڵکەکەی باوەشیان بە شوناسە نەتەوەییەکەیاندا کردووە. لاوازیی شوناسی نەتەوەیی عێراقیی هۆکارێکی سەرەکییە بۆ ئەو ئاستە بەرزەی دژواریی‌و توندوتیژییە لەعێراق، ئەگەرێکیش هەیە لە شوناسی نەتەوەیی دامەزراوەیی کوردییدا کە هێندە کەیفی بە گونجاندن لەگەڵ وردە شوناسە جیاوازەکاندا نایەت.[٢٩]

ریشەی هەریەك لە خێڵگەرایی‌و ئاین بەتایبەتی هێندە قووڵە کە سەپاندنی

---

٢٧ ئەم چەمکانە وەرگیراوە لە ئەتۆگرافەری روسی:

Y. V. Bromley (1984), Theoretical Ethnography, Moscow: Nauka Publishers.

28 Cf. Connor (1972), P. 345.

٢٩ ترسێك لەلایەن کوردە شیعە عێراقییەکانەوە دەربڕرابوو، کوردستانی ئێران، مارتی ٢٠٠١.

شوناسێکی نەتەوەیی نوێ لەوانەیە رووبەڕووی بەرگرییەکی توند بێتەوە. هەروەها پێدەچێت ئەو هزرەش شایەنی جێبەجێکردن نەبێت کە هەوڵی ئەوەبدات تۆپەڵێك خەڵك بەوردە شوناس و ئینتیمای بنجداکوتراوی جیاوازەوە لە دەوڵەتێکی نوێبنیاددا کۆبکاتەوە. لەئاکامی پرۆژەی نەتەوەیی نەتەوەسازیی، پێدەچێت زۆربەی کوردان بە وێناکردنی "کوردستانی گەورە" ئاشنابن، وێڕای ئینتیما بۆ کوردستان (وەك وەستانەوەیەك لەبەرامبەر عێراق یان تەنانەت کوردستانی عێراق) کە لەسەر هەستکردن بە هیواو کەلتوورو مێژوو شوێنیگرتووە، هەستکردن بەوەی بەشێك لە نەتەوەی کورد پێکدەهێنن.[٣٠] هەرچەندە، لەواقیعدا، بەشێکی زۆر لە کوردانی عێراق دان بەوەدا دەنێن کە ئەوان بەشێکن لەعێراق (هەرچەندە، لەدەرەوەی بونیادە یاساییەکانی دەیەکانی رابردوو)، لەکاتێکدا گۆڕانەکانی ئەوێ بەشێوەیەك کاریان تێدەکات کەدەشێت گۆڕانەکانی هەر لایەکی دیکەی کوردستان ئەوها نەبێت. لەڕووی سۆزەکیی و تەنانەت ئایدیۆلۆجیشەوە، لەوانەیە ئەوان هەستبکەن بەشێکن لە نەتەوەیەکی گەورەتری کوردیی کە بۆ ئێران، عێراق، سوریاو تورکیا پەلدەهاوێت، بەڵام بەشێوەیەکی راستیینەو واقیعی لەگەڵ عێراقدان.[٣١]

## ٤ . ٢ . ٢ " Globalisation / **بەجیهانیبوون**"و بەسیاسییکردنی شوناس

لەوانەیە رێحەزێکی کاریگەری بەجیهانییبوون کە لەسەر کوردستانی عێراق هەبێت، هەروەك زۆربەی شوێنەکانی دیکەش، بریتیبێت لە داکشانی " ناساندنی "ئێمە" کە ئەوانەی عەقڵە هاوشێوەکان دەگرێتەخۆو هەروەها فراوانکردنی "ئەوان" بۆئەوەی هەرکەسێکی دیکە بگرێتەخۆ."[٣٢]

---

٣٠ هەروەك لەو پرسو راوێژانەوە دیارە کەلەگەڵ ئەندامانی جۆربەجۆری کوردانی دانیشتووی سویددا کراوە.

٣١ هەستێکی ئاشکرا لەلای زۆربەی کوردانی عێراق دەبینریتەوە. کوردستانی ئێرانن ، مارتی ٢٠٠١.

32 Rosenau (1995), P. 193.

لەم دنیا بەجیهانییبووەدا، شوناسێکی نەتـەوەیی هـەروەك میشێل بلینـگ دەڵێت، " کێبڕکێ لەگەڵ شوناسەکانی دیکەدا دەکات لەسەر بازاڕی ئازادی شوناسـەکان."[٣٣] یـەك لـە کاریگەرییـەکانی بـەجیهانییبوون بریتیـە لـە کەمکردنـەوەی جیـاوازیی نێـوان نەتـەوەکان، بـەڵام هـەروەها رێحـەزێکی هـەمان ئـەو پرۆسـەیە هەیـە کـە ببێتـەهۆی هەڵوەشانەوەی قەوارەکان، وێناکراو بن یان راستیینە، لەنێو ئەو نەتەوانەدا. دەوڵەت کەمبوونـەوەو داکشـان لەدەستبەسـەرداگرتنی هێـزو دەسـەڵاتدا ئـەزموون دەکـات، هەربۆیـە ئـەو توانایـەش بـۆ سـەپاندنی هەسـتکردنێکی یـەکگرتووی شـوناس لەدەسـتدەدات، کـە لەوانەیـە ببێتـەهۆی پشـکووتن یـان بـەهێزبوونی شوناسـگەلێکی نوێ. لە باسـەکەی پێشـەوەدا ئـەنجامگیریکراوە کـە پرۆسـەی بـەجیهانییبوون لەوانـە نییـە ببێتـەهۆی داکشـانی دەسـتبەجێی دەسـەڵات لەدەوڵەتـەکانی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا، ئـەوەش مایـەی مشـتومڕە ئەوەیـە کـە داخـۆ توانـای بـەدیهێنانی یەکگرتوویی لەشوناسییێکی نەتەوەییدا هەرگیز لەسایەی حکومەتگەلـە جیاوازەکانی فەرمانڕەوایەتی کوردستان دەکەن، هەرگیز دەچەسپێت.

بـوونی شوناسـە دووسـەرە بەناویەکداچـووەکان، وەك لـەخوارەوە لێکدراوەتـەوە، بەرجەسـتەی بـژاردە فـەرمانڕەواکان دەکـات لەگـەڵ دەرفەتگـەلێك بـۆ شـکڵگرتنی شوناسـی نەتـەوەیی بـەگوێرەی بەرژەوەندییـە سیاسـییەکانیان. کاتێـك زۆر قـازانجی لێکرا، ئامرازی سیاسی زۆرجار خولیاگەلێکی نەگونجاوە جـەخت لـە تاقـە شوناسـێکی تایبەت دەکات لەسـەر حیسابی ئەوانـەی دیکـە — ئـەو بژارەیـەی کـە دەبێتـە ئـامراز زیـاتر لـەوەی بنـەماو مەبـدەئێك بێـت. ئـەم چەشـنە کردارانـە بـۆ رژێمـە دەسەڵاتگەراکان شتێکی باوە — نموونەیەکی هەرە ئاشکرا عێراقەکەی سەدام حسێنە — کاتێـك "دیکتاتۆرییـە ناوەندگـەراکان، کـە لاوازییـەکی بـەرفراوانی دامـەزراوەییان هەیـە، پێویسـتیان بەوەیـە بەشـێوەیەکی مـەزن پشـت بـە هەوڵـەکانی تـەیارکردن ببەستن، لەپەنابردنە بەر شوناس ."[٣٤]

---

33 Billig (1995), p. 133.
34 Darwisha (1999), p. 555.

**شوناسی کوردیی سەرکوتکراوە، هەروەها فرە لەسایەی سیاسەتی تەعریبو بەرنامەکانی راگواستنی بەغدادا ماوەتەوە.[35] ئەم بەسیاسییکردنەی شوناسی کوردیی بۆماوەیەکی درێژ ئامرازێکی گرنگی هێناوەتەئارا کە لەلایەن دەوڵەتانی هەرێمییەوە لەپێناو ئامانجەکانی سیاسەتەکانی دەرەوەیاندا سوودی لێوەربگیرێت، ئەوەش بەشێوەیەکی بەرفراوان بۆئەوان گونجاوە بەهۆی پێگەی وابەستەی کوردان لەناوچەکەدا. دەتوانرێت تێبینی دیاریکراوی مێژوویی بکرێت سەبارەت بەوەی کە چۆن ئایدیۆلۆجییەکانی دەوڵەت کاریان کردۆتە سەر شکلگرتنو پێکهاتنی شوناسی کوردیی. بۆ نموونە، لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، شوناسێکی ئیسلامی گشتگیر هەبوو کە خەڵکیان پێکەوەبەستبۆوە، یەکەیەکی ئاینی کە بە هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆری عوسمانیو دامەزراندنی (دەوڵەت-نەتەوە)یەکی سێکیولارو ئایدیۆلۆجی ئەویش لەبەردەوامی کەوت. پاش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی کە توێژێکی سونی فەرمانڕەوایەتی تێدا دەکرد، رەگەزە ئاینییەکە فۆرمی شوناسێکی ئۆپۆزسیۆنی(شیعە) وەرگرت( بۆ بژاردە حوکمڕانەکە)، ئاوێزانبوون بە بنەما بەعسییەکانەوە لەتەواوی وڵاتەکەدا بەدیهاتنی هێندە ئاسان نەبوو.**

**ئەوە روونە کە پێناسەکردنی شوناس وەك سەرخەرێکی سەرەتایی راژەی بە زامنکردنی مانەوەی رژێمی بەعس لەبەغدادا کردووە، بەڵام دەشێت بۆ حکومەتە کوردییەکە بەوشێوەیە نەبێت، چونکە هەلومەرجەکە لەکوردستان بەشێوەیەك جیاوازە. هەرچەندە، بوارێك بۆ لەخۆڕازیبوون سەبارەت بە دەسەڵاتی سیاسەتەکانی شوناس لەگۆڕێدا نییە، ئەوەی کە بەتەواوی شایەنی روودانە ئەوەیە کە حکومەتێك**

---

٣٥ ژمارەیەکی زۆر نموونە هەن سەبارەت بەو گروپە ئیتنیانەی کە ملکەچی سیاسەتی توندوتیژانەی دەوڵەت کراون لەڕووی شوناسەوە. یەك لەوانە بریتیە لە کۆمەڵگای تورکیی لە بولگاریا، ئەوەی شوناسەکەیان وەك راپۆتی چاودێری مافی مرۆڤ لەساڵی ١٩٨٩دا وەسفیکردووە، تووشی وێرانکردنو شێواندنی بەرنامەبۆداڕێژراو بۆتەوە لەلایەن دەسەڵاتدارانی بولگارییەوە، بەو بانگەشەیەی کە "لەراستییدا تورکان بولگاریین و باوباپیرانیان ناچارکراوە لەماوەی فەرمانڕەوایەتی عوسمانییەکاندا ببنە موسوڵمان:
Human Rights Watch (1989), Destroying Ethnic Identity: The expulsion of the Bulgarian Turks, New York, NY: U.S. Helsinki Watch Committee,p.5.

لەوانەیە بڕووخێت ئەگەر یاری بە کارتی شوناسە خێڵەکییەکان بکات بە وردییـەکی کەمتر لەوەی کـە پێویست دەکات. هـەمان شـت بـۆ شوناسـی زمـانیش راسـتە، لـەوێ بەشـێکی گـەورەی ئـەم دەوڵەتۆکـە پێشـنیازکراوەی بـاکووری عێـراق دەشـێت دژی حکومـەت بوەسـتنەوە ئەگـەر زارەکـەیان (کـە کرمانجییـە/و) لەگـەڵ سـۆرانییەکەدا پێگەیەکی یەکسانی نەدرێتێ.

## ٤ . ٢ . ٣ ئیتنۆگەرایی وەك شوناسێكی ئیتنۆ-سیاسی

"ئیتنۆگـەرایی بریتیـە لـە سەرچـاوەیەکی کۆمەڵایـەتی، کـە لەچوارچـێوەی جۆربـەجۆردا پشتیپێدەبەسترێت یان ئیستیغلال دەکرێت" [٣٦]

لەوانەیە سروشتی دەرکەوێت کە ئەوە ئیتنۆگەراییـە یەکـەمجارو دواجـار شوناسـێکی نەتەوەیی پێناسەدەکات. لەکەیسەکەی کورداندا، "Kurdishness / کوردییبـوون" بەدڵنیاییەوە کەمەندکێشکەرێکی بـەهێزە، بـەڵام ئـەوە تـەنیا یەکێکـە لـەو چـەندین ئینتیمایانەی کە شوناسی فرەپێکهاتەی کوردیی پێکدێنن. هەرچەندە، کاتێك شوناس بەسیاسـییدەکرێت " تێکـڕای پێکهاتـەکانی دیکـەی شوناسـی کۆمەڵایـەتی مـل بـۆ پێکهاتە ئیتنییەکـە کەچـدەکەن." [٣٧] ئەمـەش لەکاتێکدا دەبێت کـە "هێـزی تایبـەتی ئیتنۆگەرایی...کۆبێتەوە"- بۆ تێپەڕاندنی ئینتیماو پابەندییەکانی دیکـەو بۆئـەوەی ببێتە تاقە بنەمای شوناس." [٣٨]

لەکاتێکدا شوناسی کۆمەڵایەتی، ئیتنۆگەرایی سـیماگەلێکی بەکۆمـەڵو هـەروەها تـاك دەگرێتـەخۆ، " لــە کــارلێکی کۆمەڵایەتییــدا بەرجەســتە دەبێــتو هــەروەها لــە خودناساندندا ئاوێتە دەبێت." [٣٩] ئەوە دەرکەوتووە کـە شوناسـی ئیـتنی زیـاتر لەهـەر

36 Jenkins (1997), p. 90.
37 Yalcin-Heckman (1989), p. 120.
38 UNRISD (1995), p. 195.
39 Jenkins (1997), P. 14

فۆرمێکی دیکەی ناساندنەکان " وەك چاکەتێك وایە، هێندێکجار لەبەردەکرێت یان دادەکەندرێت، یان تەنانەت ئەگۆڕێتەوە، ئەگەر دۆخەکە بیسەپێنێت."[40] دەتوانرێت ئەمە زۆر بەڕوونی لەنێو کوردانی تورکیا ببینرێن.

جێنکینس، ئاماژەی بە ئیتنۆگەرایی داوە کە بنیاتدەنرێت وەك " تایبەتمەندی ئەوانی دیکە."[41] (بنەما بۆ بنیاتی شوناس دادەنێت وەك لەسەرەوە وەسفکراوە) هەرچەندە، بایەخی زۆرترینی لەگەڵ ناساندنی "ئێمە"دایە لەکاتێکدا پلەبەندیکردنی "ئەوان" پێناسەی بڕواکانی ڕەگەزپەرستی دەکات.[42]

بیرچ، وا ئیتنۆگەرایی وەك گۆڕاوێکی سەربەخۆ دەبێنێت ، کە دەرفەت دەبەخشێتە سەرهەڵدانی شوناسو هەروەها ئینتیماکان کە بەدرێژایی ماوەیەکی زۆر بوونیان هەیە، بەشێوەیەکی گەورە حساب بۆ هۆکارەکانی دیکە ناکات.[43] ئێدوارد، ئیتنۆگەرایی لەبنەڕەتدا وەك "مەسەلەیەکی بڕوا"[44] دەبینێت، ئەو بڕوایەی کە لەلایەن ئەندامەکانی گروپە ئیتنییەکەوە هاوبەشی تێدا دەکەنو بۆ باوباپیرانی هاوبەشیان دەگەڕێتەوە. ئەم بڕوایە بە باوباپیرانی هاوبەش بەگوێرەی هزری وێبەر دەبێتە :

" ئاکامێکی کارە بەکۆمەڵە سیاسییەکان زیاتر لەوەی هۆکاری بێت، خەڵك دەکەونە ئەوەی بەوشێوەیە خۆیان ببینن کە پێکەوە بەستراون – لە پێشینەیەکی هاوبەشەوە سەرچاوە دەگرن- وەك ئاکامێکی پێکەوە کارکردن. بەوەش بەرژەوەندییە بەکۆمەڵەکان بەئاسانی ڕەنگدانەوەی یاخود وابەستەی هاوشێوەییو جیاوازیی نێوان خەڵك نییە، هەرچەندە، عەودالبوون بەدووی بەرژەوەندییە گشتییەکان، هانی

40 van Bruinessen (1996).
41 Jenkins (1997), p. 14.
42 As argued by M. Banton in his, Racial and Ethnic Competition, Cambridge: Cambridge University Press 1983.
43 Birch (1978), pp. 333-334.
44 Edwards (1985), p. 8.

شوناسی ئیتنیکی دەدات.[45]

یالچین-هێکمان، لەسەر گرانی جیاکاری بونیادی ئیتنیکیو شوناس لە خێلگەرایی، بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەناوچە گوندنشینەکان، راوەستاوە،: " تێکەڵەی روونی ئتنۆگەرایی لەگەڵ خزمایەتیو خێڵ وا لە دیاردە سیاسییە لۆکاڵییەکان دەکات بەرچاو بن."[46] ئێدوارد دەڵێت کە " ئەندامەتی ئیتنی ...جیاوازە لە گروپی خزمایەتی بەوەی کە شوناسێکی گریمانەییو مەزەندەکارییە.[47]

دەرکەوتنی ئاشکرای ئیتنۆگەرایی لەناوچە کوردییەکەی عێراقو ئەو ئاگاهییە بەرفراوانەی سەبارەت بە ئینتیمای تایبەتی ئیتنییان هەیە، بەلگەی کاریگەری بەهێزێتی. پشکووتنو بەسیاسییکردنی چەمکی ئیتنۆگەرایی کوردیی لەسەر بنەمای رێبازی ریشەگەرایی بەباشیی لێکدراوەتەوە، هەروەك لەلایەن هەقان یاڤوزەوە پوختەکراوە، ئەو لێکیداوەتەوە کە ئایدیۆلۆجی ریشەگەرایی " شوناسی ئیتنیکی بریتییە لە یەکەیەکی بابەتی لەگەڵ سیماگەلێکی خودچەسپاوی وەك " رەگەز، ئەدەب، زمانو خزمایەتی."[48] بەگوێرەی دیدی ئەم ریشەگەراییە، ئیتنۆگەرایی سیمایەکە لەسروشتی مرۆڤ، دیاردەیەکی کۆمەلایەتی بونیات نەنراوە. هەروەها گونجاوە کە "کوردییبوون" لەگۆشەیەکی ئامرازییەوە ببینرێت، وەك شتێکی شوێنەکیی پێناسەبکرێت ( هەروەها وەك ئەوەی بۆ مەبەستی ستراتیژیی یان تاکتیکی کاری پێبکرێت ) هەروەها گۆڕاو – بەوتەیەکی دیکە، بەشێوەیەکی کۆمەلایەتی بنیاتنراوە. جێنکینس، مشتومڕی لەم بارەیەوە کردووە کە ئەمە" ئیتنۆگەرایی شوێنەکی لەبەرامبەر ریشەگەراییە" هەروەها ئەو دان دەنێت بەوەدا کە" ئیتنۆگەرایی نە وەستاوەو نە تاقانەو یەکپارچەیە، (هەروەها) نابێت وا ماناکەی وا ببینرێت کە بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوەو هەمیشەیی لەهەڵقولاندایە."[49]

45 Jenkins (1979), pp. 9-10 accounting for the views of Max Weber from his Economy and Society, G. Roth and C. Wittich (eds.), Berkely, CA: University of California Press, 1978.
46 Yalcin-Heckmann (1991), p.40.
47 Edwards (1985), p. 389.
48 Hakan Yavuz (1998), p. 10.
49 Jenkins (1997), p. 51.

## ٣ . ٤ فرەڕەنگی شوناسی کوردیی

"شوناسی کۆمەڵگا بریتییە لە...کۆمەڵێك خولیاو ڕێحەزی پێکەوەپەیوەستو بەشێوەیەکی ڕێژەیی ناسنووردار بەئاراستەگەلێکی جیاوازدا دەکشێتو توانای ئەوەشی هەیە بەشێوەی جیاواز گەشەبکاتو هاوسەنگ بێت."[٥٠]
شوناسی کوردیی پێکدێت لە چەندین " گورزە شوناسگەلی تێکەڵو ململانێکەر."[٥١] پێویستە لەکاتی تەتەڵکردنی ماناو گەوهەر شوناسی کوردییدا جەخت لەو گورزە فرەڕەنگانە بکرێتەوە. فرەڕەنگیو تێکچڕژاوی شوناسی کۆمەڵایەتی لەڕێگەی ئەم وردەشوناسو ئینتیمایانەوە بەرجەستە دەبێت هەروەك ئەوەی لەتێکڕای فۆرمەکانی شوناسدایە، لەوانەیە ئەوانە زۆر لەچوارچێوە کوردییەکەی شوناسسازییدا بەربڵاوبن وەك ئەوەی لەزۆربەی شوناسی نەتەوەیی دیکەدا. لەکاتێکدا شوناسگەلە سەرەکییەکان بەشێوەیەکی ورد هاوجووت نابن بەڵکو یەکتردەبڕنو لەگەڵ یەکتر تێکەڵدەبن، هەروەك درێش دەڵێت، کوردان توانایەکی سەیریان هەیە لە دەستپێوەگرتنی شوناسی جیاوازدا لە"سایەی ڕەحمەتی ڕووداوەکاندا."[٥٢] لەکاتێکدا کە زۆربەی تاکەکان زۆربەی ئەم وردەشوناسانەیان هەیە، ئەوەش زۆری جێگرەوە جیاوازەکانی شوناسی هێناوەتەئاراو لاوازیی بنکەی شوناسێکی کەلتووریی-ئیتنی رابەری بەرجەستەکردووە. شوناسگەلە جیاوازەکانی کوردان ناتوانرێت بەروونی لەیەکتر جیابکرێتەوە، پێکهاتەو بونیادە ئاڵۆزەکانیشیان چەندین رەگەزی پێکدژ لەخۆدەگرێت.[٥٣] وێڕای ئەوە، ناگونجێت شوناسەکانو هەلومەرجەکانیان لێکتر جیابکرێنەوە، چونکە" هیچ شوناسێك لەدەرەوەی چوارچێوەکەیدا نییە."[٥٤]

---

50 Parelch (1994), p. 504.
51 Hakan Yavuz (1998), p. 10.
52 Dresch (1989), p. 346.
٥٣ هەرچەندە، هەڵسەنگاندنی ئەوەی کەئەم وردەشوناسانە جۆن پێکەوە پەیوەستن ئامانجی ئەم کۆڵینەوەیە نییە، وێڕای ئەوەش، مەسەلەیەکی وا زیاتر لەرووی ئەزموونییەوە لێکدەدرێتەوە تا تیۆریی.
54 Keith and Pile (1993), p. 28.

لەکاتێکدا کە ئاستگەلێکی بەرزی جوولەی شەخسیی "interclass / نێوچینی" هەیە وەك لەپێشەوە پێشاندرا، هەربۆیە جوولەیەکی "inter-identity / نێوشوناسیی" بەڕوونی لە کۆمەڵگای کوردییدا درکی پێدەکرێت. بوونی ئەم چەشنە ئاڵۆزیی و فرەییەی شوناسەکان ئاسانکاریی بۆ شرۆڤەکاری سیاسەتی کوردیی ناکات. بۆ نموونە، ئینتیمای خێڵەکیی زنجیرەیەك شوناسگەلی پۆتانسێل فەراهەمدەکات زیاتر لەوەی کە بنەمایەکی پتەو بۆ شوناسێکی بەرجەستەی بەکۆمەڵ بێنێتەدی. لەوەش زیاتر، شوناسی خێڵەکیی بەشێوەیەك ناسێنرا کە سروشتێکی نەیارو ناکۆکی هەیە، زێدەتر ئاڵۆز دەبێت بەهۆی ئەو راستییەوە کە شوناسی تاکەکانو ئەوەی خێزانو بنەماڵەکان زۆربەی جار جیاو جیاوازە لە شوناسی خێڵەکیی بەکۆمەڵ. وێڕای ئەوەش، شوناسی ئاینیش، لەوانە نییە بەباشی کارلێك بکات لەگەڵ پرنسیپەکانی پێناسەکانی دیکەدا، لەچەشنی ئەوانەی بە بەرژەوەندییە ئابوورییەکاندا پەیوەستن.

وادەردەکەوێت، لەکاتێکدا کوردان لەنێو خوێندنگا عێراقییە عەرەبییەکاندا پەروەردەبوون، وردە وردە بە هۆشی نەتەوەیی-نیشتیمانی عێراقیی بارگاوی بووبن. هەرچەندە، ئەمە بە کۆمەڵایەتییبوونیان لەنێو کۆمەڵگای (ئیتنی) کوردییدا هاوسەنگ بۆتەوە، ئەوەی کە ئاگاهی ئیتنیانی پتەوکردووەو بەرەو شوناسێکی گشتیی چۆتەپێش کە سیمای جیای لەهەریەك لە ئینتیما نیشتیمانیو ئیتنییەکە گرتۆتەخۆ. ئەمە لە تێبینیەکەی یاڵچین-هەکماندا رەنگیداوەتەوە کە " بەئاسانی بەدەرکەوتنی تەنیا ئاستێکی یەکەی کۆمەڵایەتی مرۆ دەتوانێت پەی بەو هەستەی لێکچوونو یەکێتیو هەماهەنگی نێو خەڵك بەرێت.[55] شوناسێکی بەکۆمەڵی بەم چەشنە، کە لە سۆزی عێراقییو کوردیی پێکدێت، فرە ئاڵۆزترە بەهۆی تایبەتمەندییە وردەشوناسەکانی دیکەی وەك : ئاین، خێڵ، زارو هەروەها تاڕادەیەکی دیارییکراویش بەرژەوەندی چینایەتیەوە. ئەم شوناسگەلە جۆربەجۆرانە " خولیای بەرزونزمی دەکات لەسەر بنەمای رەهەندەکانی چوارچێوەو کات لەنێو گۆڕاوەکانی

55 Yalcin-Heckmann (1991), p.39.

دیکەدا."[56] ئەم فۆرمە جیاوازانەی شوناس واپێدەچێت پێکەوە بپارێزرێن، بەڵام بەشێوەیەکی جیاو دەستنیشانکراویش ئاستی جیاواز لە جۆش‌و توندی‌و بڕوا نمایشدەکات — تەنیا لەو کاتەدا کە شوناسێك ڕەوشێك یان پێویستییەکی تایبەت دەبینێتەوە کەوادەکات پەیوەستەکان (ئەوانی تر) گرنگ‌و بایەخداربن.[57]

دەتوانرێت ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی شوناسەکان بەشێوەی پلەبەندی زنجیرەیی یان هیرارکی ببینرێت، ئەوەی کە بە ناولێنانی بە "Russian doll / بوکە رووسیەکە" رووندەکرێتەوە.[58] هەر بوکێك بۆکەڵەیەکی دیکە لەخۆدەگرێت، هەتا بوکەڵەکان لە بچووکترەوە بۆ بچووکتر پێدەگەن ئەوەکەی دواییان دەبێتە کرۆك‌و خاڵی چڕبوونەوەی دیارییکردن‌و ناساندنی. ئەگەر هەر هەشبێت، شوناسگەلێکی کەم هەن، ، کە بتوانرێت بەوردیی‌و ڕێکی ڕێکبخرێت‌و پلەبەندیی بکرێت، هەروەها ئاسانکارییەکی بەم چەشنە لەوانە نییە ئاکامێکی قەناعەتپێکەر لەکەیسە کوردییەکەدا بێنێتەبەر. لەبەرامبەر ڕێکخستنی هیرارکی شوناسەکاندا، کە پلەیەك زاڵبونی بەسەر ئەوانی دیکەدا بەرهەمدەهێنا، پێویستە شوناسەکان بەشێوەیەکی " laterally / لایەکی" ڕێکبخرێت، هەروەك هاندڵمان پێشنیازی کردووە.[59] ئەم جۆرە ڕێکخستنە پێشانیدەدات کە هەموو شوناسەکان گرنگی یەکسان‌و گونجاویان بۆ کەیسە کوردییەکە هەیە، لەکاتێکدا دەتوانرێت خەڵکی باکووری عێراق بەشێوەی جیاوازو لە هەلومەرج‌و شوێنی جیاوازدا پلەبەندی بکرێت. ئەمەش بەباشیی پشت بە شوناسی دۆخەکیی دەبەستێت، هەروەك پێشتر وەسفکراوە، چۆن تاکێك " هەر یەك لە ژمارەیەك شوناسگەلی کۆمەڵایەتی گونجاو بنیاتدەنێت‌و پێشکەشدەکات، کە پشت بە دۆخەکە دەبەستێت...ئەوەی چوارچێوەکە دەیخوازێت."[60] ئەمە دەتوانێت سوودبەخش بێت، بەڵام لەوانەیە هەروەها کاری تێبکرێت ئەوەندەی دەرکەوتە دەرەکییەکان بەبایەخ بگیرێت، لەکاتێکدا زمان‌و زار یاخود ئاکار لەوانەیە فرە

56 Theophylactou (1995), p. 58.
57 UNRISD (1995), p. 97.
58 Jenkins (1997), p. 85.
59 Clearly outlined in his 'The organization of ethnicity', Ethnic Groups, 1(1977), PP. 187-200.
60 Cohen (1994), p. 205.

ئەستەم بێت بگۆڕێت.

مەترسی بوونی بنەمایەکی بەهێز لە شوناسگەلێکی ئاڵۆز ئەوەیە کە پێدەچێت بەئاسانی ببێتە هۆی وەفادارییو ئیتنیمای دووسەرە، بەرچاوترین ململانێی سەرهەڵدات کاتێکە کە وەفاداری بۆ دەوڵەتو هەماهەنگی لەگەڵ کۆمەڵگای ئیتنیدا، لەنێو یاخود لەدەرەوەی سنوورەکانی دەوڵەتدا، دەبێتە هۆی رووبەڕووبوونەوەی سیاسی، کە نزیکەی بەشێوەیەکی هەمیشەیی زیانی بەگەلی کورد گەیاندووە. بەم مانایە، شوناسەکان لەگەڵ یەکتردا کێبڕکێ دەکەنو خەڵکەکە دەخەنە دۆخێکی سەختەوە، " پەرتبوونی نێوان بانگەشەی کۆمەڵە کێبڕکێکارەکانو شوناسەکانی لێدەکەوێتەوە."[٦١] هەمەجۆری شوناسەکان دەبێتە هۆی ئەگەری " جۆرێك لە جەنگی گەریلایی دژی بەهێزەکە"، ئەوەندەی کە " رێگە بە هەموو جۆرە هاوپەیمانیو تاکتیکەکان دەدات."[٦٢] هەرچەندە، وەك کیتو پیلی ئاماژەیان بۆکردووە" بەداخەوە، ئەمە لەوانەیە نەتوانێت کە جیاکاری لەنێوان خەباتی گرنگ و بێبایەخدا بکات، لەوانەیە هاوپەیمانی پێکدژ لەنێوان گروپگەلێکدا بێنیتەئارا کە پێویست نەکات "هاوجێگە"بن.

بۆ ئاماژەدان بە مشتومڕی پێشوو لەسەر میرنشینە ئۆتۆنۆمە کوردییەکان کە زەمینەی گەشەکردنی لەماوەی قۆناغی عوسمانییدا بۆ رەخسابوو، هەروەها ئەم قەوارانە دەبێت وەك فەراهەمکاری هاندانی شوناسی نەتەوەیی کوردیی ببینرێت. ئەمەش لەلایەن (یاغین)ەوە پێشاندراوە کە " ئەم قەوارانە فەزای سیاسی-کۆمەڵایەتی "کوردییبوون" پێکدەهێنێتو دەناسێنێت."[٦٣] لابردنی میرنشینەکان کە دوو سەدە دواتر هەڵوەشانەوەی خەلافەتیشی بەدواداهات، هەروەك یاغین دەڵێت، کاریگەرییەکی هەڵتەکێنەری بەرچاوی لەسەر هۆشی کوردیی هەبووە، ئەو فەزا کۆمەڵایەتییەی داخوراند کە بەهۆیەوە "کوردییبوون" پێکدەهات."[٦٤] سروشتی پەرتەوازەییو فرەجۆری مەزنی شوناسی نەتەوەیی کوردیی بەهۆی ململانێی نێوان

61 Smith (1992), p. 59.
62 Keith and Pile (1993), p. 35.
63 Ibid.
64 Yegen (1996), p. 218.

جووڵانــەوەی نەتــەوەیی کــوردیی‌و (ئــەوانی دی) تایبــەت بــەخۆیان، دژوارتربــوو، گرفتــەکان بــەهۆی ململانــێ بەرژەوەندییــەکان لەگــەڵ هاوشــێوەکانیان بەدریــژایی سنووره نەتەوەییەکان زێدەبوون.

هەروەك ئەنتۆنی سمس بەراوردی شوناسی ئەورووپی بە شوناسی نەتەوەیی کـردووە، دەتوانرێــت نموونەکــەی ئــەو بــۆ کەیســەکەی کــورد ســوودی لــێ ببینرێــت. سمــس پێشانیداوە کە پێکدژی نێوان هەردوو پێناچێت ئەوەندە گەورەبێت هەروەك یەکەم جار دیارە. کاتێك ئەو دەنووسێت،" زیاتر پشت دەبەستێت بە جێبەجێکردنی بنـەما نەتەوەییـەکان."[65] بنەمایـەك کـە ڕەنگکرابێـت بەهزرگـەلێك لـە ڕۆمـانتیزم، لەگـەڵ درککردنی بۆ نەتەوە وەك " قەوارەیەکی کەلتووریی ئۆرگانیکی بەردەوام." کە هـەر خولیاو ڕێحەزێکی پێکدژ پتەودەکات، لەکاتێکدا تێگەیشتنە زێدە پلوراڵەکان، پێیوایە نەتــەوە " کۆمەڵەیــەکی عەقڵانییــە لەیاســاگەل‌و کــەلتوورێکی هاوبــەش‌و لــەنێو قەڵــەمڕەوێکی ناســێنراودا،" کــە دەرفــەتێکی زۆرکــەم بــۆ نــاکۆکی جێــدەهێڵێت. لەژینگەیەکی لەم شێوەیەدا، " پنتە کێبڕکێکارەکان لەشـوناس " کـە هێنـدێك فـەزای مانۆڕی پێ دەبەخشرێت، وادەکات خەڵکی بە نەتەوەکەی خۆیان بناسێنێت بێ‌ئەوەی لەشوناســە لارە نــاجێگیرە عێراقییەکــە دووریانخاتــەوە. هەرچــەندە، لەکەیســەکەی عێراقدا ئەوەی کەدەتوانرێت وەك بنەمای ڕۆمانتیکی لەقەڵەم بدرێت خراوەتەگەڕ، شوناسگەلێکی پێکدژی بەئاراستەی پێکدادانی بەردەوام هێناوەتەئارا. [66]

وێڕای فرەڕەنگی شوناسەکان لەسەر شـانۆی سیاسـیی کـوردیی، پێدەچێت ئاگاییـەکی بـەهێز سـەبارەت بـە شوناسـی هاوبەشـی کـوردیی لـەنێو کوردانـدا هـەبێت.[67] فشـاری ســەرکوردانی عێــراق لــەئاکامی ئــەو دوژمنکارییــە درێژخایەنــەی نێــوان کــوردو حکومــەتی ناوەنــدی. هۆشــیاری نەتــەوەییانی تارادەیــەکی زۆر بــەرزکردبووەوە،

---

65 Ibid. p. 221.

66 Smith (1992), P. 56.

٦٧ کوردانی عێراق وەك راوێژیان لەگەڵدا کراوە، لەئەورووپا و هـەروەها لـەئێران، داخـۆ لـە تاراوگـە بـن یـاخود بەشێوەیەکی کاتیی لەدەرەوەی باکووری عێراق بن، بەڵگـەی بـەهێزیان لـەم رووە پێشـانداوە، لـەوەش زیـاتر، لەنێو کوردانی تاراوگە– گرنگ نییە لەکوردستان تاکەکان لەئەسڵدا کوێیین– بەڵگەی شوناسێکی هاوبەشی بـەم چەشنە ئاشکرایە.

بەبەراورد بە وردە شوناسەکانیان. هەرچەندە، ئەو کەلێنەی بەهۆی جیاوازییەکانی ئینتیماخێڵەکییو هەروەها ئاینو زمانەوە هاتبووەئارا هەروەها تەنیا هەڵوێستە گشتییەکانیان رێگەی کاری هاوبەشی لێگرتنو لەمپەری خستەبەردەم پێکهێنانی بنکەیەکی پتەو کە سیاسەتی لەسەر بەڕێوەبچێت، هەروەها ئەم تەوەرە فرەڕەنگەی ناساندن بۆتەهۆی کە شکلگیری شوناسی کوردیی تەمومژاویو ئاڵۆزبێتو "سنوورێکی ناڕوون"ی پێبەخشراوە.[٦٨]

فرە بەتایبەتی، شوناسی نەتەوەیی کوردیی عێراقی لە شوناسی کوردیی "ئەوانی دیکە"جیاوازە، بەهەمان شێوە کە شوناسی فەلەستینییەکان لەشوناسی عەرەبیی جیاوازە.

شوناسی عێراقیی کە بەسەریاندا سەپێنراوە وایکردووە لە هاوشێوە ئێرانییو سورییو تورکییەکان جیاوازبن. کوردان بەئەستەم لە بوونی شوناسگەلێکی فرەڕەنگدا تەنیان. هێندێك ئەوە دەگێڕنەوە بۆ"جیاوازییو جووڵانەوەی نێوان شوناسەکان وەك تایبەتمەندی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان."[٦٩] هزری مارکس سەبارەت بەوەی کە هەموو شوناسە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانێت ببێت بە شوناسی چینایەتی، بەروونی بەکەیسی کوردییەوە پەیوەست نییە، هەروەها مرۆ دەگاتە ئەو بڕوایەی کە بەگشتی وەك وێناکردن تەواو پەسەندنەکراوە.

شوناسی کوردان لەوانەیە لەگەڵ عەرەبەکانی ئیسرائیلدا بەراوردکراوبێت، ئەوانەی کەهەمان وردەشوناسیان هەیە. ئەو شێوەیەی کە عەرەبەکانی ئیسرائیل دووری خۆیان لەعەرەبە غەیرە ئیسرائیلییەکان پێ ئەزموونکردووە[٧٠] بریتییە لە رەنگدانەوەی ئەو شێوەیەی کە لای کوردانی عێراقیی هێندێك جار تێبینیکراوە کە خۆیان لە کوردانی غەیرە عێراقیی ( هەرچەندە زۆربەی جار لە مەسەلە سیاسییەکاندا).

لەگەڵ ئەوەی کە شوناسی نەتەوەیی کوردیی فرەرەهەندە، زۆربەی کوردان

---

٦٨ بیرۆکەکە لەبنەڕەتدا ئاماژە بۆ شوناسی بریتانی ئەکات:

Cohen (1994), p. 35.
69 Bondi (1993), p. 86 (reflecting the views of Marx).
70 Hofman and Rouhana (1976), p. 79.

توانیویانـه بـه ئاکاری نـاجێگیر  دەسـت بـه شوناسـگەلێکی جیـاوازەوە لـەو زنجـیرە شوناسـگەلە سەرنجڕاکێشـەیان بگـرن، پشـتیان بـەوە بەسـتووە کـە دۆخەکـە چـی دەخوازێت. لەکاتێکدا شوناسی نەتەوەیی کوردیی بـه چەشـنێك وێنایـەکی نـاجێگیرو نامۆیە، هەوڵدان بۆ کردنەوەی گرێی سروشتی ئاڵۆزی ئینتیماو شوناسـه ئـاڵۆزو فـرە ڕەنگـەکانی ئـەرکێکی گرانـه. ئـەم گرانییـە هاوکاتـە لەگـەڵ بـوونی دیاسـپۆرایەکی گەورەی کوردیی، ئەوەی هەروەها وادەکات پێناسەکردنی کوردییبوون سەرسوڕهێنەر بێت. لەکاتێکدا شوناسی کوردیی بەشانازییەوە لەشوێنگەلێکدا بانگەشەی بۆدەکرێـت کـە زۆر لەسـنوورە جیۆگرافییـەکانی کوردسـتانەوە دوورە. بـەهۆی ئـەم واقیعـەوە، پێویسـت بـه ریزبەنـدی زێـدە هەیـە بـۆ پێناسـەکردنی شوناسـی نەتـەوەیی کـوردیی زیاتر لەهەر شوناسێکی نەتەوەیی دیکە کەدامەزراندێکی چەسپاوی هەیە.

شوناس وێناکردنێکی فرە پەرەسەندووە، هەروەها بێ رابردوو ناتوانرێت شوناسـێکی رەسـەن هـەبێت. لـەپاش ئەمەشـەوە هـیچ شوناسـێك بـێ ئێسـتاو داهـاتوو توانـای بەرگەگرتنو مانەوەی نییە: نەتەوە تەنیا ئاوڕ لە دەستکەوتەکانی رابردوو ناداتـەوە بـەڵکو دەڕوانێتـە ئاینـدەش. هەربۆیـە شوناسـی نەتـەوەیی کـوردیی پـاڵی داوەتـەوە بەسـەر رابـردووداو لـەوێنای ئەزموونـەکانی رابـردووەوە خوازیـاری ئایندەیـەکی پرشنگدارە، کە پێچەوانە بێت لەگەڵ هەنووکە تاریکە ناوازەکەی. وەرچەرخانێکی بەم چەشنە درێژخایەنەی شوناس بۆ کەلتووری سیاسی لەکوردستانی عێراق گرنگە. چاکسازیی ئامرازەکانی شوناسـەکەی مانـای کەمکردنـەوەی دەسـتپێوەگرتنی رابـردوو دێت، کە رێگە بە بەرهەمـەکانی رابـردوو دەدات هـەر پەرەسـەندنێکی نەتەوەسـازیی پتەوبکات.

پێدەچێت شوناسـی کـوردیی عێـراق زیـاتر بـە زمانـەوە پەیوەسـت بێـت تـا ئـاین،[٧١] هەروەها سەبارەت بەو پێکهاتانەی شوناسـی کۆمەڵایـەتی-سیاسـی کـوردیی کـە پێشـتر ئامـاژەی بـۆکراوە، لەوانەیـە کـە زمـان ئـەو رەگـەزەی شـوناس بێـت کـە زۆر رێـی تێدەچێت بگۆڕێت. ئەگەر توانای تێگەیشتنی شوناسی گرووپێك گۆڕا، لەوانەیە ئەمـە

---

٧١ لەکاتێکدا بۆکوردانی ئێرانی، کە سونین لەنێو زۆرینەیەکی فارسیو ئازەری شیعەدا، چـاوەڕێی ئـەوەی لـێ دەکرێت شوناسە ئیتنییەکەی زیاتر بە مەزهەبەوە پەیوەستبێت.

ببێتە هۆی پەیدابوونی ئارەزوویەك بۆ گۆڕینی زمان. هەرچەندە وەك لە باسەكانی پێشوودا ئاماژەی بۆ كراوە، گەشەكردنێكی لەم چەشنە لەوانە نییە لە كوردستانی ناوەندییەوە دەستپێبكات، بەلاّم بەلگەی تەواو لەبەردەستدان پێشانیدەدات كە شوناسی كوردیی دەرەفەتی باشی لەبەردەمەدایە بۆئەوەی بژی تەنانەت ئەگەر زمانەكەشی لێ دابماڵرێت. ئەمە رەنگدانەوەی بیروڕاكانی ئێدواردە لەبارەی بابەتەكەوە، ئەوەی وتویەتی كە"بەگرووپبوون چەندایەتییەكی سەختەو توانای بوژانەوەی لەدەستدانی هەر نیشانەیەكی بابەتی هەیە، لەوانەش زمان." [72]

خاڵێكی ناوەندی سەبارەت بەپێكهاتنی شوناس لەكوردستانی عێراق بریتییە لە بنیاتنانو پتەوكردنی شوناس، بەگوێرەی وتەی كاستێل، " هەمیشە لەچوارچێوەیەكدا روودەدات كە بە پەیوەندییەكانی دەسەلاّت سنووردارکراوە."[73] لە باكووری عێراقی ئۆتۆنۆمدا، هەموو پێوەندییە نەرمڕۆكانی دەسەلاّتی نێوخۆی كوردیی لەرێگەی كاریگەرییو دەستێوەردانی هێزە هاوسێكانی دەوروبەرەوە زیاتر ئاڵۆز بووە. ئەمە رەگەزە دەرەكییە لەپێكهاتنی شوناسدا لەوانەیە بۆ كەیسەكەی كوردان گرنگییەكی مەزنتری هەبێت وەك لەگەلانێكی تر.

ئەنتۆنی سمس تێبینیكردووە كە پێناسەكردن لەسەرئاستی نەتەوەیی لەقۆناغی هاوچەرخدا بۆتە" نۆرمێكی كەلتووریو سیاسیی، لەرووی ئامانجو دەسەلاّتەوە هەموو وەفاداریو ئینتیماكانی دیكە تێدەپەڕێنێت،"[74] شایەنی جێبەجێكردنە وەك ئەوروپا. هەرچەندە، پرۆسەی كوردیی پێكهاتنی شوناس نەگەیشتۆتە هەمان قۆناغ. زۆر وردەشوناسی دیكە، بەتایبەتی خێڵ، وەك فرە بەهێزتر لەتێكڕای هەموو ئەو رەگەزانەی شوناسی نەتەوەیی پێكدێنن، هێشتا پێچەوانەی ئەو ئاراستەیەیە، بەلاّم لەگەڵ كاتدا، پێناسە بنەڕەتییەكان لەگەڵ كۆمەڵگایەكی وێناكراوی نەتەوەیی لەوانەیە هەروەها ببێتە نۆرمێكی كەلتووریو سیاسی لەكوردستاندا.

هەروەك لەلایەن سەرچاوەیەكەوە سەبارەت بەكورد ئاماژەی پێدراوە، نەتەوایەتی

---

72 72.Edwards (1985), p.160.
73 Castells (1997), p. 7.
74 Smith (1992), p. 58.

کوردیی بریتییه له سیاسەتی چەسپاندنی شوناسی نەتەوەیی کوردیی، شوناسێك کە سروشتێکی "transnational / بان نەتەوەیی" هەیە.[75] دەبێت ڕەوشی سیاسی لەهەرێمەکەدا بەقازانجی کوردان بگۆڕێت، ئەم نێوەرۆکەی شوناسە دەوڵەتتێپەڕەکە لەوانەیە لە شکڵی "کوردستانی گەورە"دا بەدیبێت. ئەمەش ئەگەرێکی چاوەڕوانکراوە بەلەبەرچاوگرتنی تواناکەی لە تێپەڕاندنی هەموو ئەو کارەکتەرە سیاسیو کەلتوورییە پەرتەوازەیەی شوناسگەلە جۆراوجۆرە کوردییەکان. لەم ڕەوشەی ئێستادا ئەمە تەنیا ئەگەرێکی تیۆرییە، بەڵام دەبێت مرۆ لەئاسۆیەکی دووردا لەبەرچاوی بگرێت.

لەکاتێکدا پێناسەکردنی "ئەوانی دیکە" بەشێکی بنەڕەتییە لەپێناسەکردنی خود لەلای گروپەکە، شوناسی نەتەوەیی کوردیی لە کوردستانی ناوەندیی بەشێوەیەکی جیاو دابڕاو گەشەی نەکردووە، بەڵکو لەپشتسەری شوناسی بەعسیی عێراقییەوە بووە. نەك تەنیا بەهۆی کوردانەوە ئەوانیش شوناسگەلی فرەڕەنگیان هەیە، بەڵکو لەگەڵ دەوڵەتانو گەلانی دەروبەریش بەشداریان تێدا دەکەن. عێراقو تورکیاو ئێران، زۆربەی کات هێندێك لو شوناسانەیان بۆ بەدیهێنانی ئامانج و مەبەستەکانی خۆیان بەکارهێناوە. وێڕای ئەوە، هێزە جیهانییەکانیش هەوڵی بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان مامەڵە لەگەڵ ئەو شوناسانەدا بکەن، بابەتێکی وا کە لە بەشی ( د)دا ساغدەکرێتەوە. هەروەك ئەوەی کە شوناس دەتوانێت لەسروشتیدا هێزێکی دابەشکەرو پەرتکەربێت، هەروەها دەتوانێت کلیلی چارەسەرکردنی ململانێکان بێت، تا ئەو دەمەی کە هێندێك لەو شوناسانە بۆ گروپەکانی دیکە لەنێو بونیادی سیاسی دیکە لەهەرێمەکەدا درێژدەبێتەوە. هەروەك تیۆفیلاکتۆ لەمشتومڕەکەی خۆیدا سەبارەت پێکهاتنی شوناسی قوبرس درکی کردووە :" لەوانەیە دەریچەی هاوبەش لە ململانێو چارەسەرکردنی ململانێکاندا شوناس

75 Stated by Abbas Vali in his paper 'The nation-state and its "other": Kurdish national identity and the politics of denial and exclusion in Turkey', presented at the Kurdological Conference Between Imagination & Denial. Kurds as subjects and objects of political and social processes, May 29-31, (1998), Berlin.Theophylactou (1995), p. 16.

بێت."[76]

# بەشی ( ج ):
# کوردستانی عێراق لەسیستمی دەوڵەتی هەرێمی و نێودەوڵەتییدا

76 Theophylactou (1995), p. 16.

# باسی پێنجەم: کوردو سیستمی دەوڵەت

## ١ . ٥   بنەمای خۆدیارییکردنی چارەنووس self-determination

خولیای ناوەکیی کوردان بۆ دەوڵەتی سەربەخۆ چەمکی بنەمای خۆدیارییکردنی چارەنووس دێنێتەپێش، کە کورتە مشتومڕێك لەبارەیەوە بەشێوەیەکی بایەخدار راژە بەوە دەکات کە بکرێتە دەستپێکێك بۆ ئەم باسە. لەڕاستییدا مافی کوردان بۆ خۆدیارییکردنی چارەنووس ، بەپێی گوزارشتی هۆرچ " دواکەیان لەخوارەوەیە" وا لەوانە دەکات کە "لەسەرەوەن" نەحەوێنەوە."[77] دەکرێت ببێتە خاڵێکی دەستپێکی سروشتی بۆ شرۆڤەکاری سیستمی دەوڵەتو گەشەکردنی، هەروەها ئەوەی کە چۆن کوردستان دەتوانێت لەنێویدا خۆی بگونجێنێت.

لەڕاستییدا، ئەم ئایدیایە بۆ یەکخستنی کۆمەڵی نەتەوەیی لەقەوارەی سیاسیی خۆیدا بەشێوەیەکی نایارمەتیدەر تەمومژاوییە، لەکاتێکدا ئەوەی هەیە بەوردیی بریتیە لەوەی ئایا ئەوە "خود"ی نەتەوەیەکە کە دەتوانێت "ویستی" خۆی دەربڕێت؟ هەستکردن بە شوناسی نەتەوەیی زەمینەی " pre-political / پێش-سیاسیی" بۆ پشکووتنی هەستکردن بە خۆدیارییکردنی چارەنووس فەراهەمدەکات، ئەو پرسەی کە پێشتر لێکدراوەتەوە.

دەبێت مافی خۆدیارییکردنی چارەنووسی نەتەوەیی لە مافی "self-rule / خود حوکمڕانی" جیابکرێتەوە، یایل تامیر، ئاماژەی بۆکردووە. هەڵێنجراوە لەتیۆری نەتەوایەتی لیبراڵ، ئەوەی پێشوویان بەشێوەیەکی بنەڕەتی سەبارەت بەو "

---

77 Hroch (1995), p. 65.

داواکارییەیە بۆ کایەیەکی گشتی کە تێیدا سیما کەلتوورییەکانی ژیانی نەتەوەیی روو لە پێشکەوتن بکات."، لەکاتێکدا ئەوەی دواییان کە ریشەی لە تیۆری دیموکراسییدا هەیە برتییە لە " ماف بەشدارییکردن لە دامەزراوە سیاسییەکان کە حوکمی ژیانی یەکێك دەکات."[78] بەوەش داوای خۆدیارییکردنی چارەنووس زیاتر بایەخ بە مافە کەلتوورییەکان دەدات وەك مافە سیاسییەکان — ئەوانەی پاراستنی بوونی نەتەوەیەك وەك یەکەیەکی کەلتووری جیا. لەم رۆشناییەوە دەبینرێت، داواکاریەکان بۆ خۆدیارییکردنی چارەنووسی نەتەوەیی یەکسان نییە بە داواکارییەکان بۆ سەربەخۆیی سیاسیی.

هەرچەندە، بەشێوەیەکی جیاواز لێکدراوەتەوە، لەحاڵەتگەلێکدا کە لایەنگرانی خۆدیارییکردنی چارەنووسی نەتەوەیی جەخت لەسەروەریی تەواو بۆ نەتەوەکەیان دەکەنەوەو دەیهێننەبەرچاو، ماف خۆدیارییکردنی چارەنووس لەگەڵ جەختکردنەوەو پاراستنی یەکێتی خاك پێکدژو ناکۆکە. لەهەلومەرجێکی بەم شێوەیەدا ئەم دوو چەمکە پێکدادەدەن، هەروەك تەماشکردنێکی بلاوکراوەی فەرمی نەتەوە یەکگرتووەکان روونیدەکەنەوە. بەندی یەکەم لە یەکەم بەشی بلاوکراوەکەی نەتەوە یەکگرتووەکان کە باس لە ئامانجو بنەماکانی نەتەوە یەکگرتووەکان دەکات جەختدەکاتەوە لەوەی "رێزگرتن لە مافە یەکسانەکانو خۆدیارییکردنی چارەنووسی گەلان." بەندی دووەم، هەرچەندە، دەڵێت کە " رێکخراوەکە (نەتەوە یەکگرتووەکان) لەسەر بنەمای پرنسیپەکانی یەکسانی سەروەریی تەواوی ئەندامەکانی راوەستاوە."[79]

پێدەچێت ئەو دژایەتییە بەهێزەی بۆ هەر پێشێلکردنێکی یەکێتی خاکی هەرێمی هەیە بالادەستبێت بەسەر زۆربەی بانگەشەکانی خۆدیارییکردنی چارەنووسی سیاسیی، بێ لەبەرچاوگرتنی شەرعییەتو رەوایەتی ئەو بانگەشانە. ئەگەر مرۆ قەزاوەت لەسەر پێگەی یاسای نێودەوڵەتی بکات بەگوێرەی تۆمارەکانی نەتەوە

78 Tamir (1993), p. 9.
79 See Articles 1 and 2 of the Charter of the UNat
http://www.un.org/aboutunicharter/index.html .

یەکگرتووەکان، لەوانەیە ئەنجامگیریی بکات، هەروەك هاكان ویبێرگ کردوویەتی لە بەنێودەوڵەتییکردنی پرسی خۆدیارییکردنی چارەنووس، کە " پشتگیرییەکی کەم هەیە بۆ ئەو خەڵکانەی لەنێو دەوڵەتانێکی سەربەخۆی خاوەن سەروەرییدا دەژین، کاتێك خەبات بۆ سەربەخۆیی یان ئۆتۆنۆمی دەکەن."[٨٠] هەرچەندە، ئەزموونی تەیموری رۆژهەلات لەساڵی ١٩٩٩دا، نموونەیەکی ناوازەی بەدەرە لەم تێبینیکردنە گشتییە، پێشانیدەدات کە "سۆزی نەتەوەییبوون هەمیشە لەچوارچێوەی دەسەلاتدا هەڵدەسورێت." [٨١]

لەوانەیە داواکان بۆ خۆدیارییکردنی چارەنووسو خودحوکمڕانی دابەشبوونی بنەڕەتی لەکۆمەڵگادا بێنێتەئارا، کاتێك پێکداچوونی زەوییەکان (هەروەك بە بەردەوامی لەم کەیسەدایە) دەبێتە هۆی ناکۆکیو بەتێپەڕینی کات رەهەندی مەزنتر دەگرێتەخۆ. لەئاکامی پەرەسەندنە پرکێشەکانی سەرەتای ١٩٩٠کان، کاتێك زیاتر لە دەرزەنێك دەوڵەتی نوێ لەسەر شانۆی سیاسی نێودەوڵەتی دەرکەوتن، سیاسەتی نێودەوڵەتی دەستیکرد بە پێشاندانی "statehood fatigue / ماندوێتییەکانی بەدەوڵەتبوون". لەوانەیە وڵاتان بەهۆی داواکانی بەدەوڵەتبوونی زیاتر یان دژوارەوە کاریان تێبکرێت لەوەڵامدانەوە لەگەڵ خێراییەکی زۆرو سیاسەتی نوێ بۆ هەر ئەگەری رێحەزە جیابوونەوەخوازەکان. نموونەیەکی گونجاو بۆ ئەمە بریتییە لە نزیکبوونەوەی نوێی ئێرانو تورکیاو سوریا کە بڕیاریان لە هەماهەنگکردنی کاردانەوەکانیان دا لەحاست ئەو گەشەکردنە دیموکراتییە نیگەرانکەرەی لەسەرەتادا مۆرکی "کوردستانی ئازاد"ە ئۆتۆنۆمەکە بوو.

مافی کوردان بۆ خۆدیارییکردنی چارەنووس لەسەر تایبەتمەندییە هاوبەشەکان بنەمای گرتووە (هاوشێوەی ئەوانەی کە تایبەتمەندی نەتەوەیەکن) کە لەوەوە سەرچاوەیگرتووە گەلێکی جیانو جۆرە ئەزموونێکی مێژوویی هاوبەشیان ئەزموونکردووە، لەگەڵ کەلتووری هاوبەشو زمانو رێکخستنی کۆمەلایەتیو

80 Wiberg (1983), p. 50.
81 Billig (1995), p. 5.

هـەروەها قەڵـەمڕەوێکی جیـۆگرافی جیـا.[82] هـەروەها مافگـەلێکیش هـەن کـە لـە پاراسـتنەوە سەرچـاوەی گرتـووە، ئـەو سـەرکوتکارییە تونـدەی بـەهۆی دەوڵـەتو تەنانەت سیاسەتی جێنۆساید بانگەشەی بۆ رادەیەکی بەرزی لە پاراستن دەکرد کە دەتوانرێـت بـەبوونی دەوڵـەتێکی تایبـەت بـەخۆیان دابـین بکرێـت. ئـەم پێودانگـە هاوبەشانە بەئاسانی بۆ خەڵکی کورد بەدیهاتووە. گرفتەکە خۆی لە بەدەستهێنانی دانپێدانانـدا دەبینێتـەوە، کـە هـەروەها مانـای پشـتگیرییە —مەعنـەویو هـەروەها سـەربازیو ئـابووریش- لـە کۆمـەڵگای نێودەوڵەتییـەوە، ئـەو پرسـەی کـە زیـاتر لەخوارەوە چووینەتەوە سەری.

## ٥ . ٢ سیستمی دەوڵەتو ریشەکەی

لەهەر شرۆڤەکارییەکدا سەبارەت بە دەوڵەتی هاوچەرخ، پێویستە دان بەو راستییەدا بنرێت کە ئەم قەوارە سیاسییانە بوونیان بەشێوەیەکی جیاو دابڕاو لەیـەکتر نییـەو، بەگوێرەی قسەی کۆلین بارکەر، نابێت بەشێوەیەك مامەڵـەیان لەتەکدا بکرێـت وەك "ئەوەی بە شێوەیەکی تاك هەبن:زیاتر لەوەی کە ئەوانە سیستمی جیهانی دەوڵـەت پێکدەهێنن." [83] پێدەچێت لەبەرچاوگرتنی دەوڵـەتان لـەدەرەوەی ئـەم چوارچـێوەیە دیـارییکراوە شـتێکی ناچـاوەڕوانکراوبێت. ئـەم سیسـتمەی دەوڵـەت کەلەسـەدەی حەڤدەیەمدا هاتۆتە بوون لەسەر بنەمای رێکەوتننامەی وێستیفالیا بناغەی گرتـووە کە لەساڵی ١٦٤٨دا بەسترا، ئەوەی کۆتایی بەجەنگی سی ساڵە لەئـەوروپای ناوەندییـدا هێنا. ئەم فەزایەی رێکەوتننامەکە، رووداوێکی مێـژوویی ناوەنـدیی بـوو لەچـەندین رووەوە- بـەهۆی ئاکامـە درێژخایەنـەکانی بەسـەر سیاسـەتی نێودەوڵەتییـەوە کـە

٨٢ ئەم فاکتەرانـە دانپێـدانیکی دیفاکتۆیـە لـە رێکەوتننامـە سـیڤەری سـاڵی ١٩٢٠، هەرچـەندە ئـەو بەندانـەی تایبەتبوون بەو مەسەلەیەوە هەرگیز جێبەجێنەکران، ئەم رێکەوتننامەیە گرنگییەکی زۆری هەیە کـە ئامـاژە بـە مافی کوردان بۆ بەدەوڵەتبوون دەکات.

83 Barker (1978), P. 118.

بونیادو بونیادی سیستمی دەوڵەتی ئەوروپیو بناغەی ڕێسا نێودەوڵەتییەکانی دەستنیشانکرد کە تاکو ئێستا هێشتا لەکاردایە. ئەوەی دامەزراوەکانی سیستمەکەی داناو "زەوی" کردە بنەمای پیادەکردنی دەسەڵات – کە پێچەوانەی ڕێسای بنەماڵە فەرمانڕەواکانی پێشوو بوو کە لەبنەڕەتدا لەسەرکۆنترۆڵکردنی زەوی سەرچاوەی نەگرتبوو.[84] بۆ تێکڕای مەبەستو خواستەکان، "وێستیفالیا چارەسەرییەکی مام ناوەندیو پێکەوەژیان بوو، ڕێکەوتنێك...لەسەر ملدانی هاوبەشی دەسەڵاتە سیاسییەکان بە دەستوەرنەدانە زەوی قەڵەمڕەوی ئەوی دیکەوە (ڕاوەستابوو)."[85]

لێرەوە، سنوورەکان کە، پێشتر گرنگییەکی کەمتریان هەبوو، بایەخیان پەیداکرد.

وەك مۆدێلێکی تۆکمە بۆ پێکەوەژیانی نێوان دەوڵەتە خاوە سەروەرییەکانو هەروەها یەکەمین هەنگاو بەرەوە بەستانداردکردنو ڕێکخستنی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، بڕیارەکانی وێستیفالیا بونیادی بەڕێوەبردنی ململانێکانو هاوسەنگی هێزودەسەڵاتی دیاریکرد. ئەم سیستمە بزۆزە، لەگەڵ چەمکە ناوەندییەکانی دەسەڵات، دەوڵەتو سەروەریی، مانای کەڵەکەبوونی دەسەڵاتی دەوڵەتو لەبەرامبەریشدا لاوازبوونی بونیادی پەلهاوێژی نەتەوەییو هەروەها "subnational / نەتەوەیی لاوەکی".

ئەم تەرزە سەروەرییە گسکی لە سیستمە دەرەبەگایەتییە کۆنەکەو بنەماکانی سەروەریی دەداو فەرمانڕەوا لۆکاڵییەکانی لە میراتگریی پێگەو پلەو پایەکەیان بێبەشدەکرد. ئەو ناجێگیرییو نائارامییەی پێشتر سیمایەکی ڕژێمە کۆنەکە بوو، دەبێت تێپەڕێنرێتو شوێنی بە کۆمەڵگایەکی جێگیر بگیرێتەوە، کە لەلایەن حکومەتێکی بەهێزەوە پێکبهێنرێتو بپارێزرێت لەڕێگەی پیادەکردنی سەروەرییەوە. بەوەش توانای ڕێگریکردن لە پشێویو نائارامیی لەدامەزراندنی حکومەتێکی خاوەن سەروەریی بەسەر خاكو خەڵکەکەیدا هەڵدەهێنجرێت.

هاوسەنگی هێز سیمایەکی گرنگی سیستمی دەوڵەتە. ئەم دامەزراوەیە بۆ

---

٨٤ زیاتر، لەسەر بنەمای گەڕانەوەی سادە بۆ خێزانێکی دیاریکراو بوو: کاتێك بەدوایەکداهاتنی فەرمانڕەواکان لەڕێگەی پەیوەندی خوێنەوە دیاریدەکرێت، کارەکتەری سیاسی لەئامانجەکەیدا زۆر سنووردارە– سیاسەتی شاهەنشاهی سەفەوی دەبێت بەشێوەیەك لێکبدرێتەوە وەك سەفەوییەك.

85 Philpott (1998), p. 89.

کۆنترۆڵکردنی توندوتیـژیی یارمـەتی شـکڵگرتنو پاراسـتنی سیسـتمی دەوڵـەتی داوە لەرێگەی پاراستنی سەربەخۆی دەوڵەتـە تاکەکانـەوە لـەماوەی سـەدەکانی رابـردوودا. لەپرۆسەکەدا، بەشداریی لە پتەوکردنی جێگیری سەر شانۆی نێودەوڵەتیـدا کـردووە. لـە سیسـتمی دەوڵـەتی کلاسـیکی ئەوروپیـدا گـرنگترین رەگـەز، کـە ئاسـانکاریی بـۆ چەسپاندنو پاراستنی هاوسەنگی هێز دەکات، بریتیە لە کەلتووری هاوبەش، ئـەوەی " هانی تێگەیشتنو پەسەندنکردنی ئامانجو ئامرازەکانی هاوسـەنگی هێـز دەدات."[٨٦] لەکاتێکدا کە سیستمی دەوڵەت فراوانبۆوەو کۆمەڵگایەکی نوێی نێودەوڵەتی هاتەئارا، چیدی تەنیا تاکە کـەلتوورێك نەمایـەوە کـە تـەواوی ئەکتـەرەکانی پـێ بناسـرێتەوە. لەڕاسـتییدا، هەژمونگـەرایی کـەلتووریی کـە تاموبۆیـەکی بەرجەسـتەو جیـای بـە سیسـتمی دەوڵـەتی ئـەوروپی بەخشـیبوو لەگۆڕیـدا نـەما."[٨٧] هەربۆیـە بەتێکـەڵبوون لەگـەڵ پشـکووتنی فاکتـەرە دیاریکـەرەکانی دیکـەی وەك ئایـدیۆلۆجی، هەڵسـوڕانی سادەی هاوسەنگی هێز بووە کارێکی گران.

چەمکی سیستمی نێودەوڵەتی دەوڵەت واتای کۆمەڵە پەیوەندیگەلێکی وشكو وەستاو ناگەیەنێت، بەڵکو بیرۆکەی "سیستم"، هەروەك تیۆری سیستمی جیهانی ئـەمانۆئێل واڵەرشتاین لـەخۆی گرتـووە، لەبەرامبـەر قوتابخانـەی فیکـری ریالیسـتیدا، لەوانەیـە ئامـاژە بێـت بـە بوونێـك لـەپاڵ ئابوورییـەکی جیهانییـدا، کـە بتوانێـت هێنـدێك کـۆنترۆڵی خـۆی بەسـەر سیسـتمی دەوڵەتـدا بسـەپێنێت. ئـەو رادەیـەی کـە پرۆسـە سیاسـییەکە بـەهۆی ئـابووری جیهانییـەوە دیاریـدەکرێتو کـاری تێـدەکرێت بەشێوەیەکی بەرفراون مشتومڕی لەبارەوە کـراوە، بـۆ ئـەم مشـتومڕە کورتـە هێنـدە بەسـە قامـك بخرێتـە سـەر رەهەنـدەکانی سیسـتمی جیهـانی واڵەرشـتاینو هـەروەها تیـۆرە ململانێکـەرە ئەڵتەرناتیڤەکـەی تیـدا سـکۆکپول کـە رەخنـەگرێکی سـەرەکی واڵەرشتاینە،

واڵەرشـتاین نەیویسـتووە ەك زاراوەیـەکی جیـۆگرافی جیهـانیی لـە سیسـتمە جیهانییەکەی تێبگەن. ئەو زیاتر وەك سیستمێکی "جیهان"دنیایی دەیبینی، نـەك

86 Berridge (1987), p. 152.
87 Ibid. p. 153.

تەنیا لەبەرئەوەی باوەش بەتەواوی جیهاندا دەکات، بەڵکو بەوهۆیەی کە لەهەموو قەوارە سیاسییە ناسێنراوە یاساییەکانی دیکە گەورەترە."[88] لەوەش زیاتر، ئەو بریتیبوو لە "ئابووری جیهان" چونکە رایەڵەی نێوان بەشەکانی سیستمەکە "ئابووری" بوو.[89] والەرشتاین بەشێوەیەکی بەرفراوان جەختی لە پرۆسە ئابوورییەکان کردۆتەوە کاتێك گەشەکردنی دەوڵەتی لێکداوەتەوە، ئەو رێبازەی پێشانیدەدات کە دەوڵەت وەك ئەکتەرگەلێکی سەربەخۆ کارناکات، بەڵکو بەشێوەیەکی ورد لەنێو بونیادێکی چەسپاوی ئابووری سەرمایەداری جیهانیدا هەڵدەسوڕێت. ئەم شێوە درککردنەی دەوڵەت وەك دیاردەیەکی لاوەکی بۆ ئابووری سەرمایەداریی جیهانی لەلایەن سکۆکپولەوە رەتکرایەوە، ئەوەی جەختێکی زیاتری کردەسەر دیاریکردنە سیاسییەکان لەگەشەکردنی دەوڵەتدا، هەروەها پێی لەسەر ئەوە داگرت کە دەوڵەتان لەهێنانەئارای ئابووری جیهانییدا کاریگەرن. بەگوێرەی سکۆکپول، لەوانە نییە لە بازاڕو نموونەکانی بازرگانی " لەڕووی ریشەو کارکردن‌و هەروەها کاریگەریان بگەین بەبێ ئاوڕدانەوە لە گۆڕانەکانی بونیادی چینایەتی‌و سیاسیی." [90]

پێدەچێت تیۆری سیستمی جیهانی بەدەست کەمی شلڕۆیەوە گرفتاربێت تائەو رادەیەی کە پێکهاتنی پەیوەندییە نێوخۆییە بزۆزەکانی نێوان هێزە سیاسییەکانی لەنێوخۆی دەوڵەتدا لەلایەك لەبەرچاونەگرتبێت‌و بەدەری کردبێت، لەگەڵ ئابووری جیهانیشدا لەلایەکی ترەوە. مرۆ مەیلی بەلای ئەو باوەڕدا دەڕوات کەهۆکارگەلێکی سیاسی کاریگەری مەزنیان هەیە لەپێکهاتنی سیستمی دەوڵەتدا هەروەك لەلایەن والەرشتاینەوە دانیپێدانراوە، هەرچەندە سکۆکپولیش بەشێوەیەکی زێدە جەختی لەگرنگی هۆکارگەلێکی بەم چەشنە کردۆتەوە.

پێدەچێت کە بنەمای جیهانی هەنووکەیی دەوڵەتان کە پشتی بە پرنسیپەکانی وێستیفالیا بەستبێت بریتیبێت لە بناغەیەکی لۆژیکی بۆ گونجاندنی پێویستییە

88 Wallerstein (1974), p. 15.
89 Ibid.
90 Skocpol (1977), p. 1087.

ڕێکخستنییەکانی مرۆڤایەتی. بەوەش سیستمی دەوڵەت دەشێت ئەوە بسەلمێنێت کە سیمایەکی هەمیشەیی ڕێکخراوەکانی مرۆڤە. هەرچەندە، سیستمی نێودەوڵەتی دەوڵەت لەدیدگایەکی بەرفراوانترەوە گەشەکردنێکی بەراوردکاری هاوچەرخە، هەروەها وەك ئەوەی دامەزراوە سیاسییەکانی پێشوو سەلماندوویانە کە شایەنی داهێنانی مرۆیین، ماقوولێشە چاوەڕوانی ئەوە بکەین کە ئەم فۆرمە لە ڕێکخستنی سیاسی سروشتێکی گواستراوەیی هەبێت. پێدەچێت دوو مل بەملێی سەرەکی بۆ بنەمای وێستیفالیا هەبێت: ڕەگەزی بەجیهانیبوونو ئەو هەڕەشەیەی بەهۆی پشکووتنی جۆراوجۆری نەتەوایەتییە لاوەکییەکانەوە هاتۆتەئارا.

## ٥ . ٣ هەڕەشەکانی سەر بنەمای وێستیفالیا:
## ئایا دەوڵەت-نەتەوە دەبێتە شتێکی زێدە؟

وێڕای ئەو ڕاستییەی کە ژمارەی دەوڵەت-نەتەوەکان لەم دەیەی ڕابردوودا زیادیکردووە، بەڵگەگەلێکی ئەوتۆ هەن کە کۆنترۆڵیان بەشێوەیەکی مەزن کەمبۆتەوە، بەشێوەیەکی بەرفراوان بەهۆی بەجیهانیبوونەوە. لەڕێگەی بەنێودەوڵەتیکردنی ئابووری نەتەوەییەوە دەوڵەت-نەتەوە بەشێکی سەروەریی خۆی لەدەستداوە، بەتایبەت ئەوەندەی پەیوەندیی بەئابوورییەوە هەیە، هەروەها هێندێك لەوەش زیاتر دەڕۆن کە بڵێن " دەسەلاتی دەوڵەتان وەك پارە وایە، دوورەکەنار ڕۆیشتووە" [91] ئەمە لەڕێگەی گواستنەوەی جیهانی هێزی کارە بەهۆی کۆچکردنی بەرفراوان کە سنوورە نەتەوەییەکانی تێپەڕاندووە، هەروەها بەنێودەوڵەتییکردنی سەرمایە، بەلام لەوانەیە ئەوەی زۆر گرنگە، گەشەکردنی سیستمی پەیوەندی جیهانی بێت. بەگوێرەی وتەی میشێل بیلینگ، " تێڕژانی زانیارییەکان بۆنێو تۆڕە ئەلکترۆنییەکان سنووری نەتەوەیی نازانێت."[92] هەرچەندە، ئەوەی گرنگە تێبینی

91 Rosenau (1995), p. 193.
92 Billig (1995), p. 130.

بکرێت ئەوەیە کە جیهان تەنیا لەڕووی ئابووریو کەلتوورییەوە بەجیهانیبوونی نەکردووە، بەڵکو خودی دەوڵەتیش بەهۆی بەجیهانییبوونەوە کاریتێکراوە. بەم مانایەوە دەتوانرێت بوترێت کە کۆبوونەوەی تێکڕای ئەو هۆکارانەی سەرەوە راژە بە کەمبوونەوەی سەربەخۆیی دەوڵەت-نەتەوە دەکاتو سەرەوەرییەکەی پێشێل دەکات. ئەوەی وەك هەڕەشەیەکی مەزن بۆ دەوڵەت دەبینرێتو هەوڵی گۆڕینی دەدات بریتییە لە ئەکتەرە پەلهاویشتووە تێپەڕەکان یان نادەوڵەتییەکان – رێکخراوە ناحکومییەکان، کە بەشێوەیەکی نێودەوڵەتی هەڵدەسوڕێت."[93] ئەمانە لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا لەسەر شانۆی سیاسی نێودەوڵەتی بەشێوەیەکی چەسپاو ئامادەگییو کاریگەریی خۆیان زێدەکرد. ئەکتەرە نێودەوڵەتییەکان کە وادەردەکەوتوون فرە بەهێزبن لە مل بەملەکردنی دەوڵەت لەسەر هەردوو ئاستی نێودەوڵەتیو نێوخۆیی برتیین لە فرەنەتەوەکان، یان کۆمپانیا بان نەتەوەتییەکان، ئەو چەمکەی کەمانای ئەوەیە کارو چالاکییەکان لەولاتێك زیاترەوە بەڕێوەدەچێت، هەروەها مامەڵە لەگەڵ وەبەرهێنانە بیانییە راستەخۆکان دەکات.[94] یەکەمجارو پێش هەر شتێك، دامەزراوەیەکی ئابووری، کۆمپانیایەکی جیهانی وێڕای ئەوەی لەهەرێمێکدا جێگیرە بنکەی بەڕێوەبەرایەتییەکەی لەجێگایەکی هەڵبژێرداودایە کە مێژوویەكو ئامادەگییەکی یاسایی هەیە. هەرچەندە، نەبوونی بنکەیەکی چەسپاوی هەرێمی لەولاتێکی ناسێنراودا، دەتوانێت کاریگەرییەکی بەرچاو بگێڕێت لەسەرشانۆی سیاسی بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

" یەکەم، لەرێگەی کاریگەریی، یاخود تەنانەت کۆنترۆڵ، بەسەر هەریەك لە سیاسەتە دەرەکییو نێوخۆییەکانی دەوڵەتی خانەخوێ – لانیکەم لەو بابەتانەی کە کاریگەریی لەبەرژەوەندییەکەی دەکەن.، دووەم، لەرێگەی بەکارهێنانییەوە وەك ئامرازێکی سیاسەتە دەرەکییو نێوخۆییەکانی دەوڵەتانی خانەخوێ .، سێیەم، لەڕێگەی کاریگەرییەوە، یان کۆنترۆڵەوە، بەسەر سیاسەتەکانی سیاسەتی دەرەکیو سیاسەتی ئابووری ولاتەکە سەرەکییەکەی لەحاست ولاتەخانەخوێیەکەی، یان ئەو

93 Berridge (1987), p. 23.
94 Ibid. p. 24.

دەوڵەتانەی ئەگەری بوونە خانەخوێیان تێدایە. چوارەم، لەرێگەی بەکارهێنانی وەك ئامرازێك لە سیاسەتەکانی سیاسەتی دەرەوەو ئابووری دەرەکیی وڵاتە سەرەکییەکەی لەهەمبەر وڵاتە خانەخوێیەکانی لەنێو ئەوانی دیکە، ، هەروەها بەچاوپۆشین لەوەی ببێ یان نا، رۆڵی لە شکلگرتنی ئەم سیاسەتانەدا بینیوە.[٩٥]

لەگەڵ ئەو هەموو دەسەڵاتە لەخۆگرتووە زۆرەدا، کۆمپانیا فرەنەتەوەکان بەئاشکرا لەپێگەیەکدا بوون کە کاریگەرییەکی مەزن لەسەر دەوڵەتدا هەبێت،[٩٦] هەرچەندە، گرنگە زۆر جەخت لەم پۆتێنساڵە یان لەخۆگرتنە نەکرێتەوە- کۆنترۆڵیان بەشێویەکی رەها ناسووردارە. دەوڵەت " لەرووی سیاسییەوە بەهۆی نەتەوایەتییەوە دژی کۆمپانیا فرەنەتەوەکان پشتگیری دەکرێتو هەروەها هاوسەنگی دەسەڵات بایەخدارە." [٩٧] ئەگەر کۆمپانیا فرە نەتەوەکان بتوانن کۆنترۆڵێکی ناسنووردار بەسەر پرۆسەی بڕیارسازی دەوڵەتاندا بکەن، بازرگانی بەدەگمەن وەك چەکێکی سیاسی بەکاردەهێنرێت. نموونەیەکی ئەمە بریتییە لەو گەمارۆ یەکلایەنەی کە ئەمەریکا کەبەسەر ئێراندا جێبەجێیکرد لەرێگەی یاسای داماتۆ/ کاری گەمارۆی ئێران-لیبیا، لەساڵی ١٩٩٦دا ئەرێ کرا، ئامانجی پێشگرتن بوو لە نەتەوەکان کە بازرگانی لەگەڵ ئێراندا بکەن. نەك تەنیا کۆمپانیا بیانییەکان کرانە ئامانج، بەڵکو تەنانەت کۆمپانیا ئەمەریکیە خاوەن نفوزەکانیش رێگەیان لێگیرا کە هەر رێکەوتنێك مۆربکەن کە کێڵگە نەوتیو گازییەکانی ئێران پەرەپێبدات. ئەم جۆرە سیاسەتانە لەرووی ئابوورییەوە ناکاریگەرەو لەرووی سیاسیشەوە ئاکامی پێچەوانەی دەبێت، ئەگەر کۆمپانیا فرەنەتەوەکان دەسەڵاتێکی بەو چەشنە بەسەر دەوڵەتاندا پیادەبکات وەك ئەوەی هێندێك جار بانگشەی بۆدەکرێت، جەنگی ئابووری ناتوانرێت زۆر لەسیاسەتی نێودەوڵەتیدا بەکاربهێنرێت.

---

95 Ibid. p. 25.

٩٦ پەیوەندییەکانی نێوان کۆمپانیا فرە رەگەزەکانو دەوڵەتەکان هاوشێوەی پەیوەندییەکانی نێوان کلێساو دەوڵەتە لەسەدەکانی سیازدەهەمەوە بۆ هەژدەیەم. بۆ باسێکی سەنجراکێش لەم بارەیەوە بڕوانە: Strange (1986), P. 310

97 Berridge (1987), p. 26.

پێدەچێت بەجیهانیبوون بەشێوەیەك درك بكرێت كە لە مەودای دووردا دەوڵەت- نەتەوە لاوازبكات،[98] بەشداری لەپرۆسەی ئەم قەوارەگەلانەدا دەكاتو دواجار هەڵدەمژرێت بەرەو قەوارەگەلێكی مەزنترو لەكۆتاییدا بەحكومەتێكی جیهانی شوێنی دەگیرێتەوە. هێڵد، پێشانیداوە كە ئەم گەشەكردنە لەسەر ئاستی ئابووریو كەلتوورییدا روودەدات، لەكاتێكدا زێدەبوونی پەیوەستبوونەكان دەبێتە هۆی كەمبوونەوەی توانای حكومەت لەپیادەكردنی دەسەڵاتیدا بەشێوەیەكی كاریگەر. گەشەكردنێكی فرەڕوو لە پرۆسەگەلە نەتەوەتێپەڕەكاندا دەبێتەهۆی كەمبوونەوەی زێدەتری دەسەڵاتی دەوڵەت- گەشەكردنێك كە هەماهەنگییەكی نێودەوڵەتی یان نێوحكومەتی لەوناچانەدا دێنێتەپێش كە بەشێوەیەكی نەریتی كۆنترۆڵكراوەو یەكلایەنە لەلایەن دەوڵەتەوە بەڕێوەدەچێت. لەئاكامی ئەمەدا، سەروەریی تەواو بەشێوەیەكی كاریگەر سازشی تێدا دەكرێت كاتێك بەشداریكردن لەكۆمەڵە پرۆژەیەكی ئابووریيو سیاسی لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی گەورەتر دەبێت. پێویستییە ئابوورییەكان لەوانەیە هێندە بەهێزبن كە دەوڵەتان ناچاربكەن بەشێك لە سەروەریی خۆیان رادەستی رێكخراوە یان نەتەوەییەكان بكەن، كە وادەكات پشكووتنی حكومەتێكی جیهانیی رێی تێبچێت. ئەم جۆرە نەزمە تایبەتمەندی سیستمێكی چەماوەكێشی لەسیاسەتسازیيو كارگێڕییدا دەبێت، كە تێیدا "پێدەچێت پیادەكردنی دەسەڵاتی دەوڵەتە تاكەكان تەنانەت زێدەتریش كەمبێتەوەو دەوڵەتێكی یان نەتەوەیی بەدەسەڵاتێكی زێدەوە لەسەر شانۆی نێودەوڵەتی بپشكوێت."[99]

ئەم گەشەكردنە ئەوە خێرادەكات كە رۆسینۆ بە " قەیرانە بڵاوبووەكانی دەسەڵات." ئاماژەی بۆ كردووە، كە مانای لاوازبوونی كاریگەرییو تواناییە لەڕووی جێبەجێكردنی سیاسەتەكانەوە. ئەو نووسیویەتی كە دەوڵەتان " دەتوانن لەرێگەی پۆلیسەكانیانەوە نەزمی گشتی رابگرن، بەڵام تواناو شایستەییان لەوەستان بەڕووی پرسە راستیینەكانو چارەسەركردنی گرفتە راستیینەكان پاشەكشەیكردووە

98 بۆ شرۆڤەكردنی ئەوەی كە بۆچی ناتوانرێت بەجیهانیبوون رەتبكرێتەوە بڕوانە:
Walter B. Wriston, 'Technology and Sovereignty', Foreign Affairs, Vol. 67, Winter 1988/89, pp. 63-75.
99 Held (1991), pp. 207-9.

لەکاتێکدا خەڵك هەڵەی ئاکارو هەڵسوڕانیان دەبینو بەوەش دەسەڵاتیان دەخەنە ژێر پرسیارەوە، بنەماکانی رەوایەتییان پێناسەدەکەنەوەو هاوکاریی خۆیان رادەگرن."[100] ئەمە لەپاش ئەو وەرچەرخانە قووڵانە ئاشکرابوو کە لەساڵی ١٩٨٩وە روویاندا، بەڵام ئەوە تەنیا یەکێتی سۆڤێتی پێشوو و ئەوروپای رۆژهەڵات نەبوون کە ئەم قەیرانی دەسەڵاتەیان ئەزموونکرد. رۆسینۆ بڕوای وایە کە دەبێت ئەو وەرچەرخانانە لەزۆربەی بەشەکانی جیهاندا ببینرێن، بەڵام ئاماژەی پێکردووە کە ئەوانە خۆیان لە شێوەو قەوارەی جیاوازدا خۆیان دەرخستووە. ئەو نموونەیەکی پێشکەشکردووە کە لەکەنەدایە، لەوێ " قەیرانی دەسەڵات لە پرسگەلێکی زمانی، کەلتووریو دەستووری سەرچاوەی گرتووە لەکاتێکدا کیوبیك عەوداڵی جیابوونەوەیە یان بەشێوەیەك دەیەوێت پەیوەندی بەحکومەتی ناوەندییەوە پێناسەبکاتەوە."[101]

رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەتایبەت ناوچە کوردنشینەکان بەدەرنییە لە قەیرانەکانی دەسەڵاتدارێتی هەروەك لەلایەن رۆسینۆوە پێناسەکراوە. لەراستیدا، زەحمەتە دەوڵەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بتوانن رێگەی سیما بنەڕەتییەکانی بەجیهانییبوون- زێدەبوونی تێڕژانی ئابووریو گۆڕینەوەی کەلتووریی- لەکوردستان بگرن. لەکاتێکدا حکومەتەکانی تارانو ئەنکەرەو بەغداو دیمەشق خۆیان لەدۆخێکی وادا دەبیننەوە کە نەتوانن دەست بەسەر ئەو تێڕژانەی ئایدیاو کاڵاکان لەسنوورەکانی کوردستانەکانیان بگرن، ئامرازەکانی سیاسەتی نێوخۆییان بێکاریگەر بووە. نزیکەی لەساڵانی ١٩٨٠کانیشدا ئەنجامدانی ئەم کۆنترۆڵە زەحمەت بوو، هەروەها لەگەڵ دامەزرانی قەوارە ئۆتۆنۆمە کوردییەکە لەباکووری عێراق لەساڵی ١٩٩١دا، نزیکەی بووە شتێکی مەحاڵ.

بۆ پاراستنو گێڕانەوەی رادەیەکی کەم لە دەسەڵاتی دەوڵەت لە ناوچە کوردییەی عێراقو هەروەها بۆ رێگرتن لە توندبوونەی پرۆسە نەتەوەتێپەڕەکان لەنێو هەرێمە

100 Rosenau (1995), p. 207.
101 Ibid. p. 207.

کوردییـــه جۆربەجۆرەکانـــدا، حکومەتـــە بایەخـــداره تایبەتـــەکان وایـــانکردووه ئامادەگییـــان لەڕێگـــەی چەســـپاندنی دەزگـــا هەوالگرییەکانیانـــەوه لـــه هەرێمـــه ئۆتۆنۆمەکـەدا هەسـتی پێبکرێـت.[١٠٢] ئەمـەو لەگـەڵ ئاراسـتەکردنی رادەی جیـاوازی سـەرکوتکاری دژی دانیشـتووانه کوردەکـەی خۆیـان، کـه وابکـات رێگـەبگرێت هـەر سۆزێکی کوردییخوازی تەشەبکات، لانیکەم لەمەودایەکی کورتخایەندا.

بەهۆی بڵاوبوونـەوەی خولیاکـانی بـەجیهانییبوون، پێدەچێت ئارەزوویـەکی بـەهێز هـــەبێت بـــۆ کـــۆنترۆڵکردنی دامـــەزراوه هەرێمییـــەکانو ســـنووردارکردنی هـــەر گەشـەکردنێك کـه ببێتـەهۆی کەمکردنـەوەی سـەروەریی نەتـەوەیی. بـەرگری دژی پشـکووتنی ناوەنـدی هێـزی کێبڕکێکـەر کـە بتوانێـت ببێتـە هـۆی دابەشـبوونی ئینتیماکـان نیشـانەیەکی دیکـەی هەوڵـدانی دەوڵـەت بـوو بـۆ دژه بـەجیهانییبوون. لەکاتێکدا تێـوەگلانی ئـەم دەوڵەتانـه لـه رێکخـراوه نێودەوڵەتییـەکانو رێکەوتننامـه فرەلایەنـەکان بەشـێوەیەکی مـاقووڵ سـنووردارکرا، ئـەوان ناچـارنەکران سـەروەریی زیاتر، یان هەر هیچ، بەمەبەستی هاوکـاری لەسـەر ئاسـتی هـەرێمی یـان نێودەوڵـەتی رادەستبکەن. دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە دانیشتووانێکی کـوردیی تاڕادەیـەك گەورەیان لەخۆگرتووه، پێدەچێت خۆیان بەدووربگرن لەو بان نەتەوەییەی کە بۆتە تایبەتمەندی بەشەکانی دیکەی جیهانو هـەر سیسـتمێکی "حکومـەتی جیهـانی"یـش پێناچـێت جێپێـی خـۆی لـەم هەرێمـەدا بکاتـەوه. ئەمـە ئـەوه نییـە کـە بڵـێین ئـەم دەوڵەتانه بەهۆی جیهانیبوونەوه کاریان تێنـەکراوه، بـەڵام رادەی چـەمانەوەیان بـۆ ئەو کاریگەرییەی بەهۆی هێـزه نێودەوڵەتییەکانـەوه لەسـەر شـانۆی جیهـانیی هەیـە بەشێوەیەکی گونجاو رێژەییو سنووردارە.

ئاکـامێکی بنـەڕەتی بـەجیهانییبوون ئەوەیـە کـە گەشـەکردن لەوڵاتێکـدا کاردانـەوه لەوڵاتێکی دیکه دێنێتەئارا، دوور لەسـنوورەکانی ئـەو دەوڵەتـە. بـەوەش بڕیارسـازیی لەسـەر بنەمایـەکی ئـابووریی نێوخـۆیی یـان هەلومـەرجێکی سیاسـی تاقانـە دەبێتـە مەحاڵ، لەبەرچاوگرتنی گەشەکردنه هەرێمیو نێودەوڵەتییەکان دەبێته پێویستیی.

---

١٠٢ ئەمە لەباسی شەشەمدا گەنگەشەی لەبارەوە دەکرێت.

لـەکاتی مامەڵـەکردن لەگـەڵ کێشـەی کـورددا ئەمـە فـرە پەیوەسـتدارە، بەتایبـەت سـەبارەت بـە پەرەسـەندنەکانی لـەماوەی دەیـەی رابـردوودا لەکوردسـتانی عێراقـدا هاتوونەتەئارا.

بەتایبەتی بۆ رژێمگەلێك کـە کارەکتـەرێکی فـرە دەسـەڵاتگەرایان هەیـە- تاڕادەیـەکی زێـدەتر یـان کـەمتر پێناسـەکردنی سروشـتی دەوڵـەتانێکی خـاوەن دانیشـتووانی کـوردیی- سـیمای بـەجیهانییبوون لـەرووی ژینگـەی دەرەکییەکەیـەوە دەتوانێـت لەناخەوە پڕکێشە بێت، لەکاتێکدا ئەو پرۆسەیەکە، هەروەك پێناسـەکراوە، هەڕەشـە لە سەروەریی خاك دەکات لەرێگەی لاوازکردنـی ئـەو کۆنترۆڵـەی لەلایـەن دەوڵەتـەوە کـاری بـۆکراوە. دوورهێشـتنەوەی هێـزو کاریگەرییـە بەجیهانییـەکان دەبێـت دواتـر لەگـەڵ ئـەو هەوڵانـەدا کۆبکرێتـەوە بـۆ رێگـرتن لەهەڕەشـە سـەرەکییەکە بـۆ سـەر بوونیان وەك دەوڵەت-نەتەوە: واتە هەڕەشە نێوخۆییەکەی "sub-nationalisms / وردە نەتەوایەتییەکان"،

جیاوگەکانی سەروەریی دەوڵـەتان تـەنیا شایەنی ئـەوە نییـە بکەوێتـە بـەر چالاکیی هێزە جیهانییـەکان، بـەڵکو هـەروەها داواکاریی لەسەرچاوە نێوخۆییەکانیشـەوە مـل بەملەی دەسەڵاتدارێتیو بالادەستی هـەرێمییان دەکـات. ئـەم رێحەزانـە بەشـێوەیەکی دابڕاو لەرووداوەکانی سەرئاستی جیهانی فۆرمەڵە نابن، هەروەك لەلایـەن کۆلینسـکی یەوە تێبینیکراوە، " ئەو گۆڕانکارییانەی "لەسەروو" ئاستی دەوڵەتەوە روودەدەن بێ ئاکـامی نییـە بـۆ ئـەو نموونانـەی دەسـەڵاتو پێکەوەگرێدانـە سیاسـییانەی لـەنێو بونیـادی نەتەوەییـدان."[103] لەرێگـەی "ethnification / بـەئیتنیکردن" ی نەتەوایەتیەوە، یاخود بەرجەستەکردنی سیاسەتەکانی شوناس، بنـەما سیاسـییەکانی دەوڵـەت-نەتـەوەی هاوچـەرخ داکشـاوە. پێدەچـێت بایـەخێکی پـەرەگرتوو هـەبێت سەبارەت بەوەی کە ئەمڕۆکە مەترسی ململانێی نێوان دەوڵەتان لەوانە نییە هێنـدە مـەزن بێـت بەقـەد مەترسـی دژواریـیو دارمانـە نێوخۆییـەکان بـەهۆی پشـکووتنی

103 Kolinsky (1981), p. 86.

ئینتیماگەلێکی ئیتنیو کەلتووریی کە بۆماوەیەکی درێژ سەریان لەبەردەم وەفادارییی بۆ دەوڵەت کز کردبوو.

### ۱ . ۳ . ٥ لەپاش وێستیفالیا

سیستمی دەوڵەت بەشێوەیەکی کاریگەر لەشوێنی خۆی پارێزراو بەهۆی جەنگی ساردەوە بەهێزبوو، لەو ماوەیەدا فەزای گشتی دوژمنکارانەی نێوان زلهێزەکان رێگەی پشکووتنی لەدەربڕینە وردە نەتەوەییەکانو تێپەڕبوو لەسنوورە نەتەوەییەکان گرتووە، گەشەکردنی ئەوانە کە لەوانەبوو توانایی دەوڵەتی کەمبکردایەتەوە لەجێبەجێکردنی ئەرکە سەرەکییەکانی.[١٠٤] کۆتایهاتنی جەنگی سارد دەستی هێزە وردە نەتەوەییەکانو تێپەڕبوو لەسنوورە نەتەوەییەکانی ئاوەڵاکرد کە بەشێوەی جۆراوجۆر بەهێزبنو پەرەبگرن کە پێشتر رێگەی گەشەکردنیان لێگیرابوو: گەشەکردنێك کە گریمانەی پرسیارێك دەکات ئەویش ئەوەیە داخۆ هەڵوەشاندنەوەی تەواوی سیستمی دەوڵەت دەبێت چاوەڕوانبکرێت.(؟)
ئەوانەی جەختدەکەنەوە لەوەی کە ئێمە بەرەو قۆناغێکی نوێ دەڕۆین کە سنوورەکان ناجێگیرو شایەنی گۆڕانی بەردەوامن بەچەشنی ماوەی سەدەکانی ناوڕاستی ئەوروپا، وێنای پشکووتنی جیهانێکی یان نەتەوەیی دەکەن کە تێیدا دەوڵەت-نەتەوە وەك قەوارەیەکی هەڵسوڕاو ئەو گرنگییەی نامێنێت، زەمینە بۆ جیهانێکی بێ سنوور خۆشدەکات.[١٠٥] گەشەکردنێکی ئەوتۆ مانای ئەوەیە کە کە خاڵە سەرەکییەکانی وێستیفالیا: لەوانە رەگەزەکانی سەروەریی نەتەوەییو هەرێمی سیاسی (بنەما شەرعییەکانی دەوڵەت) پێویستی بە چاوپێداخشانەوە یاخود تەنانەت وەلانانیش بوو ئەگەر نەزمی پاش وێستیفالیا یان وێستیفالیای نوێ بئافرێنرێت.

---

104 See for instance Rosenau (1995).

١٠٥ لایەنگرێکی سەرەکی ئەم تیۆرە هۆبسباومە، بەتایبەت بڕوانە:
Nations and Nationalism since 1780: Programme, Myth, Reality (1992), Cambridge University Press.

ئەوە لەدەرەوەی بواری ئەم کۆڵینەوەیە کە بەقووڵی تیۆریزەی دەرکەوتنی گشتی ئەم سیستمە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بکرێت، بەڵام کورتە ئاماژەیەك پێدەچێت سوودبەخش بێت.

لەنەزمی وێستیفالیای نوێدا، پشێوی سەروەریی، هەرێمیو هەروەها نەتەوەیی مل بۆ گۆڕانی بنەڕەتی دادەنەوێنێت. هیگڵ مشتومڕی لەوبارەیەوە کردووە کە چەسپاندنی بەهێزی دەوڵەتی مۆدێرن وەك دامەزراوەیەکی هەمیشەییو بنەمایەك بۆ نەزمێکی نێودەوڵەتی لەسەرکەوتنەکەیدا قەرزاری ئەو فاکتەیە کە " ئەو لە هاوسەنگی دروستی نێوان مافەکانی تاكو وەفاداریی بۆ کۆمەڵگە، ئابووری بازاڕ، خۆشگوزەرانی کۆمەلایەتی، سەروەریی دەوڵەتو هەروەها نەزمی جیهانی دەدات،"[106] دارمانی ئەم هاوسەنگییە قەیرانئامێزە، وەك (کار) مشتومڕی لەبارەوەکردووە، قەیرانەکانی دەوڵەتی هێناوە، بەتایبەتی بەهۆی پێکدژی هێزە نەتەوەییو نێودەوڵەتییەکان.[107]

کار، لەپێناو گێڕانەوەی هاوسەنگییدا، وێنای بونیادێکی نوێی دەوڵەت دەکات، کە هاوسەنگی " ڕێزگرتنی جیاوازییە نەتەوەییەکانو هەستە کۆسمۆپۆلیتانەکان (جیهان نیشتیمانی) دەکات."[108] هەروەها سەروەریی "هێشتا بەرگەی لەدەستدانی بەشێکی زۆر لەبایەخە کلاسیکییەکەی دەگرێت."[109] هەروەك لینکلاتەر تێبینیکردووە،" نەتەوەکان لەوەدا بەردەوام دەبن کە لەبونیادە نوێیەکەی هاوکارییدا گرنگ بن، بەڵام پەیوەستی نێوان نەتەوەو سەروەریی دەوڵەتی دەپچڕێت."[110] پێکهاتەی نوێی بونیادەکانی دەوڵەت زێدەتر کۆسمۆپۆلیتان دەبێت، زێدەتر ڕێز لە فرە شوناسی دەگرێت، هەروەها توندتر لەهەر یەك لەوانەی پێش

106 Linklater (1998), p. 147, referencing Hegel (1952), The Philosophy of Right, Oxford: Oxford University Press. Bull argues in a similar vein: see chs 10-13 in his The Anarchical Society: A Study of Order in World Politics (1977), London: Macmillan.

107 Analysed in part two of his Nationalism and After (1945), pp. 38-70.

108 As quoted in Linklater (1998), p. 159.

109 Ibid. p. 163

110 Ibid.

خۆی، له بەگژداچوونەوەی نایەکسانییە ئابوورییەکان تێوە دەگلێت.[111]
خاڵی ناوەندی لەنووسینەکانی کاردا ئەوەیە کە بونیادە پۆست نەتەوەییەکان زیاتر لە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت دەبێتە هۆی تۆکمەبوونی خۆشگوزەرانی تاکەکان. لینکلاتەر ئەوەی خستۆتەسەر شرۆڤەکارییەکەی کارو پێشانیداوە کە چوارچێوەی پاش وێستیفالیا دەتوانێت گەشەبکات لەکاتێکدا کۆمەڵگا هاوبیرەکان پەرۆشی دامەزراندنی فۆرمی هاوکاری سیاسی نزیك لەیەکن کە نۆرمە ئیتنیکییە هاوبەشەکان بە بونیادەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیو سیاسییەوە گرێبدات.[112]
هاوکارییەکی بەو چەشنە کە بەمانای وازهێنانە لەبەشێکی سەروەرییەکەیان وەك جۆرێك لە حوکمی نێودەوڵەتیو لەلایەن لینکلاتەرەوە وێناکراوە لەسەر توانەوەی سەروەریی، هەرێمییو نەتەوایەتیی بنەمای نەگرتووە. هەرچەندە، دەوڵەتان وەك فۆرمێکی سەروەریی دەمێننەوە وێڕای شێوە ساکارەکەی چەمکەکە، بەڵام لە نەزمی پاش وێستیفالیا، هێزگەلێکی بایەخدار لەسەر ئاستی نەتەوەیی وەردەچەرخێن بۆ دەسەڵاتگەلێك لەئاستی نێودەوڵەتییدا. فرەیی ئیتنیما سیاسییەکانو نائامادەگیی دەسەڵاتێکی سەروەریی ناوەندیی دێتەپێش، کە ریزبەندییەکی ئینتیما جۆربەجۆرەکان دێنێتەئاراو رێگری لەو پرۆژە دەسەڵاتگەراییانە دەگرێت کە خولیای هەژمەنگەراییان هەیە.
هەروەك بۆ نەتەوایەتی، کۆمەڵگایەکی نێودەوڵەتیی بەتەرزی پاش وێستیفالیا "transnational citizenry / هاوڵاتی بان نەتەوەیی یان هاوڵاتی جیهانی"دەئافرێنێت، ئەوەی، هەروەك لینکلاتەر داینەوە،" رایەڵەی نێوان سەروەرییو هاوڵاتیبوون دەپسێنێت."[113] بەگشتی، کۆمەڵگای پاش وێستیفالیا، هانی تۆکمەبوونێکی زیاتری جیهانچێتیو جیاوازییەکانیش دەدات لەرێگەی خەبات بۆ هاوسەنگی داواکان بۆ دانپێدانانی جیاوازیی قووڵ لەگەڵ نموونەی هاوڵاتی جیهانیدا."[114]

111 Can (1945), p. 43.
112 Linklater (1998), p. 167.
113 Ibid. p. 175.
114 Ibid.

فۆرمـەکانی پـاش وێسـتیفالیای ڕێکخـراوە سیاسـییە جیهانییـەکان لەوانـە نییـە کـە پێکەوە لە هەموو بەشەکانی جیهاندا گەشەبکەن. جێگەی سەرسوڕمان نابێت کـە لـە ئەورووپا، "لانکی دەوڵـەتی هـەرێمی هاوچـەرخ" داهێنانـە سیاسـییەکان بەردەوامـە.[115] ئـەم گەشـەکردنە بـەرەو فیدراسـیۆنێکی ئـەورووپی بەردەوامـە، ئـەورووپا لەوانەیـە بەباشی ڕاژە بە مـۆدێلی ڕێکخسـتنە سیاسـییەکانی پـاش وێسـتیفالیا بکـات، بۆئـەوەی لەبەشـەکانی دیکـەی جیهانـدا وەبەربهێنرێتـەوە. هەرچـەندە، ئەمـە پرۆسـەیەکی درێژخایـەن دەبێـت، هـەروەها ئـەوەی جێگـای مشـتومڕە ئەوەیـە داخـۆ ئـەم هزرانـە هێندە شیاون کە بەپێودانگەجیهانیەکەی جێبـەجێبکرێت. پێناچێت هاوشـێوەکاری گەشەکردنەکان لەئەورووپا بەهیچ جۆرێك لـەجۆرەکان لەڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا بـەو زووانە بێتەی دی.

ئەوەی دەبینـرێت کە لەچوارچێوە کوردییەکەدا فۆرمێکی گونجاوی هاوشێوەی نەزمی پێش وێستیفالیا لەوانەیـە تایبەتمەنـدی لـەو ئەلتەرناتیڤـە هاوچـەرخەی میرنشـینە کوردییـە دریـژبووەکانی سـەدەی شـازدەیەم و حەڤدەیەمـدا بێـت.[116] ئـەم میرنشـینانە کەوتبوونـە ناوچـە سـنوورییەکانی ئیمپراتـۆری عوسمـانی و سـەفەوییەوە، خـاوەنی ئۆتۆنۆمییـەکی بەرچـاوبوون و بـەهۆی پێگـەی سـنووریی بـەڵام سـتراتیژییانەوە بەرجەستەی دەسەڵاتارییەکی بـەهێزیان دەکـردو ئیمپراتۆرییـەکان هـەوڵی ئـەوەیان دەدا بەلای خۆیانـدا ڕایانکێشـن و وەفاداریـان بەدەسـتبێنن بۆئـەوەی زامـنی ئاسایشـی سنوورەکانیان بن.

لەئاکامی شکستی ئێرانییەکان لەجـەنگی چاڵدێراندا لـە سـاڵی ١٥١٤، زۆربـەی کـوردان کەوتنـە نێـو قەڵـەمڕەوی عوسمانییـەوە، وێـڕای ئـەوەی، ژمارەیـەك لەمیرنشـینەکان لەناوچەی نفوزی عوسمانییەکاندا بوون.[117] شاکانی سەفەوی ئەوەیان پێ خۆشبوو کە

115 For an interesting account of this development, see Falk (1994), p. 136-137.

116 Martin van Bruinessen provides a detailed discussion on the Kurdish emirates and their setting: (1992c) pp. 145-175.

117 See McDowall (1996), pp. 25-31 on the Kurds' role in the Ottoman-Safavid relations.

که ناوچه کوردییەکانیان لەلایەن ئەو فەرمانڕەوا تورکمانە یان فارسانە بەڕێوەبەرن کە لەناوەندەوە دادەمەزرێنران، لەکاتێکدا سوڵتانەکانی تورك ڕێبازێکی پراگماتیکیان گرتەبەر- بێگومان درکیان بەو زەحمەتییە زۆرەی سەپاندنی دەسەڵاتێکی ناوەندی کردبوو لە ناوچە سنوورییەکانی ئیمپراتۆرییەکەیاندا- ئۆتۆنۆمییەکی زیاتریان بەکوردان بەخشی بەوەی سەرۆکە لۆکاڵییەکانیان وەك فەرمانڕەوا راژە بکەن. کارگێڕییەکی نویێ لەناوچەکەدا دامەزرێنرا کەلەسەر رێکەوتنێکی کوردو عوسمانی بنەمای گرتبوو، کە شازدە میرنشینی سەربەخۆی کوردیی لەلایەن عوسمانییەکانەوە دانی پێدانرا.[118] ئاکامی پراگماتیکی تورکیی یاخود شکستی رێبازی ئێرانییەکان هەرچییەك بێت (ئەسفەهان[119] ناچاربوو ئەوە پەسەند بکات کە دانانی ناوەندییانەی فەرمانڕەوای غەیرە کورد سیاسەتێکی نەگونجاو بووە)، میرە کوردە فەرمانڕەواکان وەك میرێکی سەربەخۆی راستیینە لەمیرنشینەکانیاندا هەڵدەسوڕان.

جێگیریی رێژەیی لە بونیادی سیاسی کوردستان لەو کاتەدا لەلایەن کوردە نەتەوەییەکانەوە بەئەفسانەکراوە،[120] بەلام ئەم تێگەیشتنە تارادەیەك هەڵخەڵەتێنەرانەیە. دروستە بوترێت کە ئەو هەلومەرجە بۆ فەزایەکی سیاسی جێگیرتر لەناوچە کوردییەکاندا هاتەئارا کاتێك جەختکردنەوە لە هاوسەنگییەکی سیاسیی جێگیر لەنێوان تورك‌و ئێرانییەکان لەلایەن زۆربەی لایەنەکانەوە داواکرابوو. ئەو سیستەمە کارگێڕییەی لەسەر رێکەوتنی کوردو عوسمانییەکان بنەمای گرتبوو، بەگوێرەی وتەی داڤید مکدۆواڵ، "وەك هاوسەنگییەکی نموونەیی لەنێوان خۆجێگەرایی‌و حکومەتی ئیمپراتۆریدا"بینراوە.[121] هەرچەندە، ناجێگیریی لەم نەزمەدا خۆی لە خولیاو ئارەزووخوازی هەموو لایەنە بایەخدارەکان دەبینێتەوە- عوسمانییەکان، سەفەوییەکان، هەروەها سەرۆکە کوردەکان- کە قەڵەمڕەوەکانی

118 Kendal (1993), p. 14.

١١٩ ئەسفەهان پایتەختی دەوڵەتی سەفەوی بوو، هەروەها بۆ چەندین سەدە ناوەندێکی گرنگی ئیمپراتۆری فارسی بوو.

120 An issue examined by O'Shea (1998) p. 139.
121 McDowall (1996), p. 28.

خۆیـان زێدەبکـەن لـەکاتی توانـاو هێزێکـی زیـاتری فـەردی کـە بەدەگمـەن هـانی فەزایەکی ئاشتییانەی چەسپاوی کردووە،

سـەبارەت بەهێنانەبەرچـاوی نـەزمی پـاش ویسـتیفالیا لـە رۆژهەڵاتـە ناوەڕاسـتە کوردییەکە، رێکخستنێکی هاوشێوە کە لەسەرەوە ئاماژەی بۆکراوە دێتەبەرچاو، کە ئۆتۆنۆمییـەکی بـەرفراوان دەردەخـات بـێ بـوونی حکومـەتێکی ناوەنـدیی لاواز یـان بەمەبەست لاوازکراو. دووپاتبوونەوەی ئەم چەشـنە بونیـادە مۆزاییکە لەهەرێمەکە کە بەشێوەیەکی بەرجەستە رێگـە لـە رەگـەزە ناجێگیرەکـان بگرێـت وەك ئـەوەی کـە ململانێی توند لەنێوان هێزە رکابەرە هەرێمییەکان وادەکات کـوردان هێشـتا دووبـارە خۆیان وابییننەوە کە وەك لەمپەرێك لەنێوان رکابەرەکاندا هەڵسوڕێن.

لەئاسـتێکی بەرفراوانـدا، نـەزمێکی سیاسـی پێناسـەکراوی بـەم چەشـنە دەتوانێـت بەگونجاوی مامەڵەیەکی سەرکەوتووانە لەگەڵ نەتەوە بێدەوڵەتـەکانی ئـەمڕۆ وەك کوردانـدا بکـات. بێدەوڵـەتبوون، بەشـێوەیەکی دیکـە جـۆرە چـەمکێکی نامۆیـە بـۆ سیســتمە بەڕێوەبەرەکــە. زاراوەی بێدەوڵــەتبوون- وێــڕای هزرەکــەی لــەبارەی راگواسـتنەوە-پێویسـت نییـە مانـای رەهەنـدەکانی ئانارشـیزم پەرەپێبـداتو نـەزمی کۆمەڵایەتی بخاتە حاڵەتی پشێوییەوە. ئەمە بەتایبەتی شایەنی ئەوەیـە لـە کۆمـەڵگا خێڵەکییەکاندا ببینرێت کە تێیدا ناشەخسانییەتی دەوڵەت لەگەڵ گرێ بـەهێزەکانی وەفادارییو هەماهەنگی پیاوانی خێڵەکییدا پێکدژ دێتەوە، کە لەنێویانـدا ئـەم پشت بەیەکتربەستنە بەرجەستەی دەزگایەك دەکات کە ئاستیو نـەزمی کۆمـەڵگای لەسـەر راوەسـتاوە. کۆمەڵگایـەکی کۆسمۆپۆلیتـان کـە پابەنـدی تۆکمـەکردنی خۆشـگوزەرانی نێودەوڵەتییە، هەروەك لەلایەن کـارەوە وێنـاکراوە، ئـەوەش بـەهۆی لەبەرچـاوگرتنی بەرژەوەندییـەکانی ئـەو لاوازە سیاسـییانەوە زامنـدەبێت- بەوتەیـەکی دیکـە، ئـەو نەتەوانەی بێدەوڵەتن، هەروەها لەوانەیە کوردان، باشتر لەجیهانێکدا بیگوزەرێنن کە تێیدا پاش وێستیفالیا سەرلەنوێ بنیادبنرێتەوە.

## ٥ . ٤ ئایا دەوڵەت-نەتەوە هێشتا هێزێکی کاریگەرە؟

پێچەوانەی تیۆرەکانی زێدەبوونی دەوڵەت-نەتەوە بریتیە لەو تێڕوانینەی کە پێیوایە ئەم فۆرمە بەهێزەی ریکخراوی سیاسی بونیادێکی زێدە نەرمتری لەو حاڵەتە هەیە کەهێندێکجار پێوەی دەردەکەوێت، هەروەها لەوانە نییە لەنێوبچێت و دیارنەمێنێت. نکۆڵی ناکرێت، ئەو قەیرانانەی پێشتر ئاماژەیان بۆکراوە "قەیرانەکانی دەوڵەت"، دەشێت زۆر زوو بێت ئەنجامگیریی ئەوە بکرێت کە ئەوەی لەوانەیە دەرکەوێت هەستی نەتەوەیی بێت (هەروەك ئەو ئایدیۆلۆجییە پشتگیریکەرەی دەوڵەت) لەسەر ئەو ئاوابوونەی کەوەك پێویست مانای لاوازبوونی بەردەوامی دەوڵەت-نەتەوە دەگەیەنێت. نکۆڵی لەوەناکرێت کە دەوڵەت-نەتەوە بونیادێکی لاوازە، بەلاّم فرە لەو هۆکارانەی کە پێدەچێت کاریگەرییەکی پێچەوانەیان بۆسەر کارو هەڵسوڕانەکانی دەوڵەت هەبێت، وەك قەوارەگەلە بان نەتەوەییەکانی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکانو هەروەها کۆمپانیا فرەنەتەوە جیهانییەکان، لەوانەیە بیسەلمێنن کە پێویستە بۆ زامنکردنی بەردەوامی دەوڵەت-نەتەوە لەم فۆرمەی ئێستایدا.

هێزی دەوڵەت-نەتەوە خۆی لە ئاوێتەکردنی چەمکە بەرچاوەکانی وەك (دەوڵەت) و (نەتەوە) دا دەبینێتەوە.هەروەك گۆردۆن سمس ئاماژەی بۆکردووە، ئەم جووتە بیرۆکەیە " سەرچاوە ململانێکارەی رەوایەتییەکان پێکەوە کۆکردۆتەوە: نەتەوە (وەك خەڵك) زادەی لەبەرچاوگرتنە کەلتووریو ئیتنییەکانەو بەوەش، بەگوێرەی وتەی سمس، هزرێکی "ناعەقلاّنی" پێشکەش دەکات، کە بەتوندی لەگەڵ دەوڵەتی هاوچەرخدا پێکدژە، ئەوەی "بەرجەستەی بنەمای " legal rationality / عەقلاّنیەتی شەرعی" دەکات."[122]

هەروەك ئەو دەوڵەتەی لەوانەیە لەلایەن نەتەوەیەکەوە پێکبهێنرێت، نەتەوەیەکیش لەوانەیە لەلایەن دەوڵەتەوە دروستبکرێت، ئەو پرۆسەیەی کە خولیای ملکەچکردنی دەربڕینە نەتەوەییەکانی "گچە دەوڵەت"ی هەیە کە دەتوانێت هەڕەشە لە

---

122 A. D. Smith (1981), p. 197.

پشکووتنی یەکێتی "نەتەوەیی" بکات.[123] هەروەك لەسەرەوە ئاماژەی بۆکراوە، نموونەیەکی بەرجەستەو گونجاو بۆ ئەمە پرۆسەکەی عێراقە، کە دەوڵەت هەوڵیداوە نەتەوەیەکی عێراقی لە عەرەبو کورد پێکبهێنێت، بەڵکو هەروەها لەتورکمانو ئاسورییەکانیش لەگەڵ هەردوو رەگەزە ئاینییە ناکۆکەکەی شیعیو سوننی. عێراق ئەستەمە دەوڵەتێکی تاکە ئیتنی بێت، تەنانەت لەوانەیە ناوی پرۆژەیەکی دەوڵەت-نەتەوەی بخرێتەسەر، کە تێکۆشانی خۆی بەئاراستەی رێکخستنێکی سیاسییدا بخاتەگەڕ کە نەتەوەو خاكو دەوڵەتی تێدا ببێتە یەك. دووبارە بەپێی وتەی گۆردۆن سمس، هەوڵی "گرتنەخۆی نەتەوەبوونێکی پێکەوەیی دەدات تاکو نەتەوایەتی بکاتە گۆڕاوێکی وابەستە کە لەگەڵیدا ئاکامە سروشتییەکانی تۆکمەبوونی رەوایەتی دەوڵەت بێنێت."[124] پێناچێت بەوشێوەیە دەرکەوێت کە عێراق تەنیا دەوڵەت بێت لە هەرێمەکەدا کە باوەش بەم چەشنە رەوتەی داهێنانی تەواوکاری نەتەوەیدا بکات.[125] جیاوازییەکی بەرچاوی ئیتنیو ئاینیو زمانی، تایبەتمەندی بەشێکی زۆر لەدەوڵەتەکانی ناوچەکەن، هەموو ئەم فاکتەرانە لەشتێکدا کۆبوونەتەوە کە بەشێوەیەکی تەواو نەگونجاو ناوی دەوڵەت-نەتەوە یان لێناوە، ئەوەی بەرسینگی ئەو پیاوە دەوڵەتمەدارانە دەگرێت کە خولیای دامەزراندنی نەتەوایەتییەکن کە لەزۆربەی حاڵەتدا نوێ بێو هەمووان لەخۆبگرێت.

## ٥ . ٤ . ١ داکشانی چەمکی دەوڵەت-نەتەوە

ئاشکرایە کە پەرەسەندنەکانی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمو بەتایبەتی لە دوا دەیەدا، بووە هۆی سەرلەنوێ لێکدانەوەی سیفەتی هەرێمیو سەرەوەریی دەوڵەتان. زۆربەی ئەو دەوڵەتانەی لەقۆناغی رزگارییو نەهێشتنی کۆلۆنیالیزمدا دامەزرێنران،

123 Ibid. p. 198.
124 .Ibid.
١٢٥ نموونەیەکی ئاشکرا، لەنێوان زۆر لە "پرۆژەی دەوڵەت–نەتەوە" بریتییە لە میرنشینەکانی عەرەبی یەکگرتووە، کە دەوڵەت هەوڵی بنیاتنانی نەتەوەیەکی نوێ لە میرنشینە جیاوازەکان داوە.

وێـڕای ژمارەیـەکی زۆر لـەو دەوڵەتانـەی لەسـاڵانی ١٩٩٠کانـدا هاتنـەئارا دوای هـەمان شـــێوەی بـــاوی دەوڵـــەت کـــەوتن‌و پێدەچـــێت بەشـــێوەیەکی ئۆتۆماتیـــك‌و وەك ئاراستەیەکی سروشتی هەڵسوڕان" فۆرمەڵەی دەوڵەت-نەتـەوە یـان کـرد".[126] جێگـەی گومانـە داخـۆ هـیچ یـەك لـەو هـاتووە نوێیانـەی سەرشـانۆی سیاسـی نێودەوڵـەتی، بیانتوانیایـە لـەقۆناغێکی زووتـردا دەوڵـەتبوونیان بەدیبهێنایـە، کاتێـك جـەخت لەبوونێکی سەربەخۆ بکرایەتەوە، وەك : بەرگریکردن لـە هەرێمـەکان‌و دابینکردنـی ئاسایشی فیزیکی بۆ هاوڵاتییـەکانی."[127] کـە یـەکێك بـوون لـە ئەرکـە سـەرەکییەکانی دەوڵـەت. ئـەم گەشـەکردنە کەمکەرەوەیـە دەشـێت بـە " دابەزانـدنی پێوسـتییەکانی ئاست" ئاماژەی بۆ بکرێت."[128] — دەستەواژەیەکە کـە لەلایـەن جۆزیـف رۆتشـێڵدەوە بـەکارهێنراوە وەسـفی داکشـانی وردە وردەی دامـەزراوەی دەوڵـەت-نەتـەوە دەکـات- ئـەوەی دەرکـەوتنی جیـاوازیی لـەنێوان ئـەو دەوڵـەت- نەتـەوە انـەی زۆر بەودواییـە دامەزراون لەگەڵ هاوشێوە کۆنەکانیان.

مرۆ دەتوانێت زێدەتر بڕوات بۆ ئەو پرسیارەی داخۆ ئەم دەوڵەتە نوێیانـە دەوڵـەت- نەتـەوە ی "دروسـت‌و تـەواون"، هـەروەك تینکـەر کردوویـەتی، بـە "دەوڵـەتانێکی پشتشکاو" پێناسە بکرێن. ئەم زاراوەیە مانای پشکووتنی نموونەیەکی نوێی دەوڵەتـە کە سیما سەرەکییەکەی ناکارایی ناوەندە لەوەی دەسەڵاتی خـۆی بگەیەنێتـە تـەواوی ناوچەکانی دەوڵەتەکە.[129] عێراق لەگەڵ نموونـەی دەوڵـەتانێکی پشتشـکاوی تینکـەردا دێتـەوە لـەو بەشـانەی وڵات کـە لـەماوەی جیـاوازدا لەسـایەی کـۆنترۆڵی چـەکدارە نەیارەکانی حکومەتی ناوەندیدا بوون.

هەرچەندە، ئەو راستییەی کە دەوڵەت-نەتەوەکانی کۆتایی سەدەی بیستەم پێدەچێت

---

126 A. D. Smith (1981), p.200.

127 .Ibid.

١٢٨ لە مشتومڕکردن سەبارەت بەو بەڕووداوەستانەوەی گرفتائامێزی دەوڵەت لـە ئـەوروپای کۆتـایی سـەدەی بیستەمدا، ئەو نووسیویەتی کە پرسی ئەگەری ژیانی دەوڵەتان " کەمبوونەوە لەکاتێکدا کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ئاستی داواکارییەکانی خۆی هێنایەخوارو هەروەها پێناسەکردنی کـە چـی شـتێك ئەگـەری ژیـان‌و زیندوومانـەوە پێکدەهێنێت." Rothschild, (1979) p. 37.

129 Tinker (1964), pp. 6-7.

کەمی توانای تەواویان بۆ بەتەواوی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەرکە نەریتییەکانیاندا هەبێت، پێناچێت مانای دیارنەمانی دەستبەجێیان لەسەر شانۆی سیاسی بدات بەدەستەوە. پێویستییە وەزیفییە بنەڕەتییەکان لەڕێگەی هەڵسوڕانی فرەلایەنییەوە زامندەکرێن، سروشتی سەربازییان بەرگریکردن لەدەوڵەت مسۆگەر دەکات. پێکهاتە هاوپەیمانییەکان زۆرجار ڕەنگدانەوەی بەرژەوەندییە ستراتیژییە جیهانییەکانە بۆ ڕێبەرایەتی وڵاتەکان، ئەم فرانبوونەی تۆڕەکانیان توانای تاك دەوڵەتە سەربازییەکان تۆکمە دەکات. چوونە نێو هاوپەیمانییەکانەوە بەشێوەیەکی بنەڕەتی ڕاژەی خودی دەوڵەت دەکات تاکو وەك پێکهاتەیەکی دەوڵەتی سەربەخۆ بمێنێتەوە. بەوەش توانایی تاك دەوڵەت لە زامنکردنی ئاسایشی فیزیکی خۆی، یان کەمبوونەوە، پێناچێت لە ژیانی چاوەڕوانکراوی کەمبکاتەوە.

## ٥ . ٤ . ٢ دووبارە لێکدانەوەی بەجیهانیبوون

بەجیهانیبوون بەرجەستەی پرۆسەیەك ناکات کە لەقۆناغی نوێیدا پشکووتبێت، بەوتەی میشاڵ سمس، زیاتر لەوەی" ڕەنگدانەوەی پرۆسەیەکی درێژخایەنی گەشەکردنێکیی مێژووییەو کێبڕکێیەکی سیاسی توندو ڕەنگدانەوەی پیادەکردنی دەسەلات بە فۆرمە جۆربەجۆرەکانی تایبەتمەندییەکەی پێکدەهێنن."[١٣٠] ئەم تێڕوانینە لەلایەن ئەنتۆنی گیدنزەوە پشتگیریی لێکراوە، ئەو پەیوەستێکی بەهێز لەنێوان سەرهەڵدانی بەجیهانیبوونو گەشەکردنی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان دەبینێت.[١٣١] کە زۆرجار وەك بەرهەمهێنەری ئۆتۆماتیکی یەکشێوەیی کەلتووری درك دەکرێت، لەوانەیە ئەم پرۆسە درێژخایەنەی بەجیهانیبوون پێچەوانەکەی بکات-وابکات ئاستی نوێی فرەجۆری دەربکەوێت. بوونی دەوڵەت-نەتەوەکان لەسەراسەری جیهاندا بنەمایەك دێنێتەئارا کە کۆمەڵگاکان دەتوانن لەسەری پەیوەندی پێکترەوە

130 Michael Smith (1992), p. 254.
131 See his The Consequences of Modernity, (1990) Cambridge: Polity Press.

بکەن. هەربۆیە دەگونجێت پێناسە ئیتنییەکان ببوژێنەوە، لەکاتێکدا بەجیهانییبوون پێویستی بە سەپاندنی هەژموونگەرایی‌و تێکپەستان نییە. بە وتەی میشاڵ بیلینگ " هێزەکانی بەجیهانییبوون بەشێوە ڕەهاکەی هەژموونگەرایی کەلتووریی بەرهەمناهێنن. لەوانەیە ئەوان جیاوازییەکانی نێوان کەلتووره نەتەوەییەکان کەمبکەنەوە، بەڵام ئەوانە هەروەها جیاوازییەکانی نێو نەتەوەکانیش زێدەدەکەن."[132] مالکۆم واتەرس بیر لەم ئایدیایە دەکاتەوە بەوەی کە دەوڵەتیکی گلۆباڵ ناتوانێت فۆرمی حکومەتێکی جیهانی وەربگرێت. لەبری ئەوە، وەك ئەو نووسویەتی:" دەوڵەتێکی بەجیهانییبوو دەتوانێت تایبەتمەندی تۆڕێکی هەماهەنگی لەناوەندەکانی دەسەڵات هەبێت...چونکە کۆنترۆڵکەرانیان بەشداری لە نۆرمی هاوبەش‌و بەرژەوەندی هاوبەشدا دەکەن."[133] ئەم هەماهەنگییە بۆتە پێویستیی لەکاتێکدا بازرگانی نێودەوڵەتی‌و ئابووری نەتەوەیی لەرێگەی پرۆسەی بەجیهانییبوونەوە بەتوندی پێکەوە پەیوەست دەبن – پشت بەیەکتر بەستنێك کە زەحمەتێکی بەرچاو بۆهەر یەکێك لەو دەوڵەتانە دێنێتە پێش کە بتوانن کۆنترۆڵێکی توندی سیستمی ئابووری خۆیان بکەن‌و ئابووری خۆیان بەشێوەیەکی تەواو دابڕوا لەوانی دیکە بپارێزن.

بەهۆی پێویستی‌و هەروەها وەك ئاکامێکی لەبەرچاوگرتنە ستراتیژییەکان، هاوکاریی ئابووری بەدرێژایی سنوورەکان بەهێزبوو، بەڵام ئەم هاوکارییە واناکات رۆیشتن بەئاراستەی "پێکەوەگرێدانی بان نەتەوەیی" پێویستییەك بێت وەك لەسەرەوە پێشاندراوە. لەجیاتی ئەوە، لەتواناییانەوە وەك پێکهاتەیەکی سەرەکی رێکخراوێکی سیاسی کە هەر بایەخیکی هەبێت، ئەوە ماقووڵە کە کە دەوڵەتان لە کاری سەرەڕۆیانەی هاوبەشدا لێکدەئاڵێن چونکە ئەوانە ئەوە بە "باشترین رێگە دەزانن بۆ پاراستنی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی خۆیان‌و دواجار بەهێزکردنی پێگەیان‌و تەنانەت بوونیشیان لە کۆمەڵگای جیهانیدا."[134] لەهەمان ڕووەوە، دەبێت مشتومڕ

132 Billig (1995), p. 132.
133 Waters (1995), p. 111.
134 A. D. Smith (1981), p. 202.

لەوە بکرێت کە ڕێکخراوە نێودەوڵەتییەکان بریتین لە " درێژبۆوەی ئەو دەوڵەتانەن کەهەن"و لە"ڕۆڵیاندا وەك هەماهەنگکارو نێوەندگیری سیاسی لەسەر هەریەکە لەئاستی نەتەوەیی‌و نێودەوڵەتی، حکومەتی ناوەندی لەپێگەیەکی ستراتیژی سەرەکییدا دەمێنێتەوە."[135] لەکلاورۆژنەی ئەم دیدەوە، دامەزراوەی دەوڵەت – نەتەوە پێدەچێت تۆکمە بووبێت‌و تەنانەت پاڵپشتیشی کرابێت لەڕێگەی ئەو فرە هێزە بان نەتەوایەتییانەی هەوڵیان داوە لێی رزگاربن.

هەروەك لەسەرەوە وتراوە، بەجیهانیبوونی ئابووری وا لەدەوڵەت دەکات بەخێرایی کاری تێبکرێت‌و ناچاربێت هەماهەنگی لەسیاسەتە ئابوورییەکانی لەگەڵ دەوڵەتانی دیکەو ئەکتەرە نادەوڵەتییەکانی سەر شانۆی نێودەوڵەتییدا بکات، بەلام دەوڵەت لەوە دوورە کۆنترۆڵی خۆی رادەستی دەوڵەتان یان هێزگەلی دیکە لەم سیستمە پشت بەیەکتر بەستووەدا بکات. مرۆ دەتوانێت لەراستییدا ئەنجامگیریی بکات، هەروەك کۆلینسکی کردوویەتی، کە " هیچ دەوڵەتێك هەمووی نابەخشێت: ویستە گشتییەکەی لە هەماهەنگکردنی سیاسەتەکانی دەگونجێنرێت لەرێگەی هێشتنەوەی گەڕان بەدوای قازانجی کێبڕکێ لەسەرکراو لەوشوێنەی گونجاوە، هەروەها لەرێگەی پەرۆشی بۆ کەمکردنەوەی ئەگەری کارتێکردنی بەهۆی گۆڕانە پێشبینینەکراوەکان لەجیهانی دەرەکیدا. پەنجەیەك دەدرێت، دەستێك دەگەڕێنرێتەوە." [136]

ڕێحەزەکانی بەجیهانیبوون لە سیاسەتدا تەنیا بەشێوەیەکی تەمومژاوی هاوشێوەی بەجیهانیبوونی ئابوورییە لەڕووی توندی‌و هێزەوە. دەوڵەت وەك مەیدانێکی یەکلاکەرەوە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان دەمێنێتەوە، ئەوەی لەوانەیە لەرێگەی سیاسەتەوە لێکبدرێتەوە هەروەك چالاکییەکی هەرێمی بالا."[137] دەوڵەت وەك چەسپاوێکی هەرێمی، لەلایەن هێزە بەرفراوانەکانە پاڵپشتی کراوە، ئەمەش، بەتایبەت لەرۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، دەبێتە هۆی ئەوە سنوورەکان لەلایەن سیستمی ئێستای دەوڵەتەوە تۆکمە بکرێت.

---

135 Kolinsky (1981), pp. 100-101.
136 Ibid . p. 99.
137 Waters (1995),

ئـەم مشـتومڕە بابـەتێکی کۆڵینـەوەیی دێنێتـەئارا کـە شـایەنی لێکۆڵینەوەیـە-وەك ئەوەی سەبارەت ئەگەری بەدەوڵەتبوونی کوردیی لەنێو سیستمی هـەرێمی دەوڵەتـدا هەیـە. ئەمـە بەتـەواوی لەباسـی هەشـتەمدا لێکدانـەوەی بـۆ دەکرێـت، ئامـاژە بـە ئەگـەرەکانی هاتنـەئارای دەوڵەتۆکەیـەکی کـوردیی، یـان کوردسـتانی گـەورە یـاخود ئەگەری پشکووتنی چەند کۆمارێکی کوردیی. هەرچەندە، ئەم مشـتومڕە بایەخـدارە، پێویستی بە شرۆڤەکردنی سروشتی نەتەوایەتی کوردییە: نەك تەنیا گـەڕان بـەدوای ریشـەکەیو هەڵسـەنگاندنی پەرەسـەندنە گشـتییەکەی، بـەڵکو هـەروەها دابینکردنـی ریزبەندییەکی پشتبەستوو بە ئەزموونەکانی پێشوو.

## ٥. ٥ دەوڵەتو نەتەوایەتی لەچوارچێوەی کوردییدا

"کوردان نەتەوەیەکی بەرچاو پێکدەهێنن، کە لانیکەم سێ هەزار ساڵە لـەم شـوێنەی ئێستاکەیدا نیشتەجێیە. ئەوان لەگـەڵ سـەرهەڵدانو داڕمـانی چـەندین ئیمپراتـۆری رەگەزەکانـدا ژیـاون" وەك ئاشـوورییەکان، فارسـەکان، یۆنـانی، رۆمـانی، عەرەبـەکان، مـەنگۆلو تورکـەکان. ئـەوان مێـژوو، زمـانو هـەروەها کـەلتووری خۆیـان هەیـە. وڵاتەکەیان بەشێوەیەکی ناڕەوا دابەشکراوە. بەڵام ئەوانە خاوەنی رەسەنین،و غەوارە نـین تـاکو وەك کەمینەیـەك چاوپۆشـیان لێبکرێـت لەسـەر ئـارەزووی داگیرکـەرانی جیاوگێکی سنووردارییان پێ بدرێت." [١٣٨]

## ٥ . ٥ . ١ ریشەگەلو پەرەسەندنی نەتەوایەتی کوردیی[١٣٩]

تێگەیشـتنێکی گەوهـەری بـیری نەتـەوەیی کـورد، هـەروەك لـەو پەرەگرافـە فـرە

---

138 Edmonds 1971, P. 88.

139 For a comprehensive history of the Kurdish nationalist movement, see Jwaideh, Wadie (1960), The Kurdish Nationalist Movement: Its Origins and Development, Unpublished Ph.D Thesis, Syracuse University.

**وەرگـــیراوەی ئیدمۆنـــدزدا پوختکراوەتـــەوە، پێویســـتە بۆئـــەوەی ئـــەو شـــێوازە روونبکرێتــەوە کــە سیاســەتی کــوردیی لەســەر ئاســتی خــۆجێیی‌و هــەرێمیی پــێ بەرێوەچووە. هـەروەك هزرێكـی رێكخـراوی كۆمەڵایـەتی، دەكەوێتـە نێوەنـدی دوو شـێوە تێـڕوانین سـەبارەت بـە پەرەسـەندنی لەناوچـەی بـەرفراوانی كوردسـتان-لەلایەكـەوە كوردسـتان بەگشـتی،و لەلایـەكی تریشـەوە، نەتەوایـەتی كـوردیی لەهـەر ناوچـەیەكی كوردییـدا بەرهـەمێكی تایبـەتی رەوشـگەلە كۆمەڵایەتییـە-ئابوورییـە تایبەتــە مێژووییەكــەی خۆیــەتی. راڤــەكردنی هــەر جۆربەجۆرییــەكی هــەرێمی نەتەوایەتی كوردیی لـەدەرەوەی بـواری ئـەم كۆڵینەوەیەیـە. بەواتایـەكی دی، ریشـەو پەرەســەندنی دیــاردە گشــتییەكە شــرۆڤەدەكرێت، لەكاتێكـدا تیشـك دەخرێتەســەر كوردســتانی عێــراق. وێــڕای ئــەوەی، كــە ئــەوە لەعێراقدایــە كــە رادەیــەكی گــەورەی ســەركەوتنەكان لەلایــەن جووڵانــەوەی نەتەوەییــەوە بــەدیهاتوون، لەكاتێكـدا عێـراق تەنیا دەوڵەتە كـوردان تێیـدا دانپیانـانی شـەرعی‌و فـەرمییان بەدەسـتهێناوە، ئـەوەی مافێكی دیارییكراوی بەوان وەك كورد بەخشیوە.[140]**

**لەوسـۆنگەیەوە كـە كارەكتـەرو پەرەسـەندنەكەی بەتونـدی پەیوەسـتە بەپرۆسـە مێژووییەكـەی دامەزرانـدنی دەوڵـەت-نەتـەوە لەناوچـەكەدا، شـرۆڤەكارییەك بـۆ جووڵانەوەی نەتەوایەتی كوردیی ناتوانرێت بەجیا ئەنجامبدرێت‌و پێویستە لەئاستە لۆكاڵییەكـەی سـەربخرێت. هـەروەك سـاتیمورتی ئامـاژەی بـۆكردووە،" جووڵانـەوە نەتەوەییـــەكان لـــەماوەی قۆنـــاغی دوای جەنگـــدا پێویســـتە لەچوارچـــێوە نێودەوڵەتییەكەدا ببینرێت هەروەها لەحاست ئەو پێشینە مێژووییە تایبەتمەنـدەی**

---

١٤٠ ئیدمۆنـدز (١٩٧١) چـەند راسـتییەكی پێشكەشـكردووە كـە ئـەم " هەلومەرجـە نائاسـاییەی لێـوە سەرچاوەدەگرێت" كە زۆربەیان بەشێوەیەكی توند پەیوەندییان بە سیاسەتی هێزی پێشووی منداتەوە هەبوو. بۆ نموونە، لەساڵی ١٩١٨دا، بریتانییەكان هەرێمێكی نیمچە ئۆتۆنۆمییان پێ باش بوو، كە تـەنیا بەشـێوەیەكی كەم بەناوەندەوە ببەسترێتەوە. لەوەش زیاتر، كۆمەڵەی گەلان لـە سـاڵی ١٩٢٥دا، ئـەوەی كردبـووە مـەرج كـە كوردیی ببێتە زمانی فەرمی لە خوێندن‌و كارگێڕی ناوچە كوردییەكاندا. كاتێك دواتر عێراق داوای بوونە ئەندامی كۆمەڵەی گەلانی كـردو داواكـەی سـاڵێك دواتـر پەسـەندكرا، مەرجەكـە بـووە بەشـێك لەدەسـتوورو بەشـێوەكی یەكلاكەرەوە بووە "بابەتێكی جێگەی بایەخی نێودەوڵەتی". ل ٩٢–٩٣.

که تێیدا پەرەیانسەندووە."[141] ئەم چوارچێوەی دەکرێت بخرێتە بیروڕاکانی ریچارد جێنکینسەوە، ئەوەی کە لێکیداوەتەوە:

" دەبێت لۆکاڵییەکان شانبەشانی هەرێمییەکانو نیشتیمانییەکان و تەنانەت بان نەتەوەییەکانیی ئەو رۆژانە (تەنانەت جیهانییەکانیش) درك بکرێنو شرۆڤەکارییەکانیان پێوە گرێبدرێت...جووڵانەوە نەتەوەییەکان خودی خۆیان شتێك نین، مێژووەکەیان لەلایەن خەڵکانی ترو شوێنانی دیکەدا لەچوارچێوەی فراوانخوازییە ئیستیعمارییەکاندا، لە چوارچێوەی هێزو خەبات بۆ دەستبەسەرداگرتندا هاوبەشە." [142]

بەو پێیەش، لەکاتێکدا نەتەوایەتی کوردیی لەوانەیە وەك بەرهەمی پەرەسەندنە بەرفراوانە نێوخۆییەکان لەقەڵەمبدرێن، ئاوڕێك لەمێژوو ئەوە بەدەستەوە دەدات کە تاڕادەیەکی بەرچاو بەهۆی ململانێی لەگەڵ دوژمنە دەرەکییەکانی کۆمەڵگای کوردییدا شکڵیگرتووە. نەتەوایەتییەکانی تورکییو ئێرانییو عەرەبیی بەکارەکتەرە شلرۆییەکانیان نەناسراون، هەروەها کوردستان لەپێگەیەکدایە کە ئەم سێ ( لەڕووی دیالێکتییەوە چوارن، ئەگەر جیاوازی لەنێوان نەتەوایەتی عەرەبی عێراقییو سورییدا بکرێت) ئایدیۆلۆجییە نەتەوایەتییە بەیەك دەگەن کە بەقووڵیی کاریگەریی لەسەر پەرەسەندنی نەتەوایەتی کوردیی هەبووە. کەمالیزمە سێکیولارە ناوەندگەراکان هەمیشە کوردیان وەك مەترسی بۆسەر یەکێتی دەوڵەتی تورکیی لەقەڵەم دەدا، هەروەها تواندنەوەی زۆرەملێی دانیشتووانە دواکەوتووەکانی کورد بەشێکبوو لەو هەوڵە مۆدێرنەخوازانەی لەپێناو هێنانەئارای تورکیایەکی مۆدێرن دەدرا کە شوێنێکی بۆ هیچ کەمینەیەکی ئیتنیی نامۆ تێدا نەبێتەوە. لەئێرانیش رەوشێکی هاوشێوە هەبوو، بەوەی خێڵە کوردییەکان رەگەزێکی بێزارکەری رێگریان لەبەردەم سیاسەتی مۆدێرنیزەی شاهەنشا پێکدەهێنا. وێڕای ئەوەی، کاریگەریی ئاینیش هەبوو، کە بووە سیمایەکی فرە بەرچاو لەپاش شۆڕشی ١٩٧٩دا، کاتێك کوردانی سونی بوونە لەمپەرێکی نەتەوەیی لەبەردەم تۆکمەبوونی ئایدیا شیعەگەرا

141 Sathyamurthy (1983), p. 229.
142 Jenkins (1997), p. 139.

**گشتییەکان. نەتەوایەتی بەعسییەکان بەهەمان نالێبوردەیی ئیتنی نەیدەهاژوو، بەڵکو ستاتۆیەکی دەستووری بەکوردان بەخشی وەك کەمینەیەکی نەتەوەیی خاوەن مافگەلێکی دیاریکراو لەڕووی زمانو میدیاوە. هەرچەندە، هەروەك لەپێشتر لێکدراوەتەوە،[١٤٣] فەرمانڕەوایەتی بەعس خولیا نەتەوەییەکانی کوردی بۆ قووت نەدەچوو، ئایدیۆلۆجییەکەشی، هەروەك کەمالیزمو خومەینیزم، لەگەڵ نەتەوایەتی کوردییدا پێکدژە.**

**حاجی قادری کۆیی یەکەمین رۆشنبیری کوردە کە لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا دامەزراندنی ئەو قەوارەیەی دەربڕیوە کە دواتر وەك چەمکی دەوڵەتی کوردیی پەرەیسەند. بەلەقەڵەمدانی سەرکردە نەریتییەکان بە " لەمپەرو گومڕاکەرە نالەبارەکان."[١٤٤] هەرچەندە، هزرو بۆچوونەکانی لەو دەمەدا بەشێوەیەك نامۆ لەقەڵەم دەدرا.**

**ئایدیای تۆکمەتری نەتەوایەتی هێنرایە کوردستان بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەلایەن بریتانییەکانەوە، ئەوانەی پاڵپشتی دامەزراندنی قەوارەیەکی سیاسی جیای کوردییان کرد لەرێکەوتننامەی سیڤەری پاش یەکەمین جەنگی جیهانییەوە. هەروەها گەشەکردنی نەتەوایەتی کوردیی پاش یەکەمین جەنگی جیهانی بەهۆی پلانی هاوپەیمانە سەرکەوتووەکانەوە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی کاری تێکرا.[١٤٥] رێکەوتننامەی بایەخداری سیڤەر کە لە ئابی ١٩٢٠دا مۆرکرا، دوو بەندی سەبارەت بە نەتەوەی کورد تێدابوو،• کە بە راشکاوی دانینابوو بە بوونی گەلی کوردو پێدانی**

---

١٤٣ سەیری باسی یەکەم، سێکشنی ١. ٣. ١ بکە.

144 Izady (1992), p. 56.

145 Pelletiere (1984), p. 61.

• سێ بەند، بەشی سێیەم (بەندی ٦٢، ٦٣، ٦٤) ی رێکەوتننامەی سیڤەر لەمەڕ کوردستان دەدوێت . لە بەندی ٦٢دا هاتووە :" کۆمسیۆنێك کە لە ئەستەمبوڵ بارەگا دەخات ...پێویستە تاوەکو شەش مانگ لە رۆژی جێبەجێکردنی ئەم رێکەوتننامەیەوە نەخشەیەك بۆ دیارییکردنی هەرێمێکی ئۆتۆنۆمیی دابنێت بۆ ئەو ناوچانەی کوردیان تێدا زاڵە و دەکەونە رۆژهەڵاتی رووباری فورات و باشووری مەرزەکانی ئەرمینییا وەك لە دواتردا دیاریی دەکرێت ، هەروەها باکووری مەرزی تورکیا لەگەڵ سوریا و میسۆپۆتامیا ." هەروەها ئەم بەندە باس لە پاراستنی ئاسوریی–کلدانەکان و کەمینەی رەگەزیی و ئایینیی دیکەش کردووە . ئەم بەندە داوایکردووە بۆ ئەوەی ئەو پاراستنە جەختی لەسەر بکرێتەوە ، پێویستە کۆمسیۆنێك لە نوێنەرانی بەریتانیی ، فەرەنسیی ،

**دەوڵەتی سەربەخۆ پێیان.[١٤٦] وێڕای ئەوەی ئەم ڕێکەوتننامەیە هەرگیز جێبەجێنەکرا، لەلایەن کوردانی نەتەوەییەوە پیرۆزکراوەو ئەم دوو بەندە لەدڵی بانگەشەکردنیاندا بۆ کوردستانێکی خاوەن سەروەریی ماوەتەوە.**

**نەتەوایەتی کوردیی بەدڵنیاییەوە لەلایەن جووڵانەوە نەتەوەییە خاوەن کارەکتەر شۆڕشگێڕییەکانی روسیاو ئێران‌و تورکیاوە لە دەیەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا کاری تێکراوە. ئەو فەزا لیبراڵەی ئەو کاتە لەئەستەمبوڵدا بەرقەراربوو زەمینەی بۆ دامەزراندنی یەکەمین ڕێکخراوی کوردیی خۆشکرد، کە چەندین ڕێکخراوی دیکەی بەدواداهات. هەرچەندە، ئەم ڕێکخراوانە لەلایەن دەرەبەگە ئەریستۆکراتەکانەوە سەرۆکایەتی دەکران‌و دەبوو چەند دەیەیەك تێپەڕن پێش ئەوەی ڕەگەزەکانی چینی ناوەڕاست دەستبکەن بە چوونە نێو سەرکردایەتییەکەیەوە – پرۆسەیەك کە**

---

ئیتالییەکان ، ئێرانییەکان و کورد پێکبهێنرێت بۆ " بڕیاردان لە دەستکاریی کردنی سنووری تورکیا گەر پێویستی کرد ، بەوشێوەیەی لەگەڵ بڕیارەکانی ئەم ڕێکەوتننامەیە بگونجێت ، ئەو سنوورەی کە هاوجووت ئەبێت لەگەڵ ئەوەکەی ئێراندا ."بەندی ٦٣ باس لە پەسەندکردن و جێبەجێکردنی نێوەرۆکی بەندی ٦٢ دەکات لە لایەن حکومەتی تورکییەوە . بەندی ٦٤ ی ڕێکەوتننامەی سیڤەر باس لەوە دەکات چۆن و کەی کوردان پەنا بۆ کۆمەڵەی گەلان دەبەن تا خواستی خۆیان سەبارەت بە وەرگرتنی سەربەخۆیی لە تورکیا بخەنە بەرچاو :"ئەگەر کوردەکانی ئەو هەرێمەی بڕگەی ٦٢ ی ئەم ڕێکەوتننامەیە دەیانگرێتەوە لەماوەی یەك ساڵدا لە ڕۆژی دەرچوونی ڕێکەوتننامەکەوە بتوانن بەڵگە پێشانی ئەنجومەنی کۆمەڵانی گەلان بدەن کە زۆرینەی دانیشتووانی ئەم ناوچەیە ئارەزووی سەربەخۆیی لە تورکیا دەکەن ، ئەگەر ئەنجومەنیش پێیوابوو کە ئەم گەلە شایەنی سەربەخۆیین و ڕاسپاردەی ئەوەبکەن سەربەخۆییان بدرێتێ ، تورکیا دەبێت ئەو ڕاسپاردەیە جێبەجێ بکات دەست لە هەموو ماف و پایەیەکی هەڵبگرێت کە لە ناوچەکە هەیەتی." لەکۆتاییدا ، بڕگەی ٦٤ دەڵێت پاش ئەوەی تورکان دەستبەرداری هەموو ماف و پایەیەکیان لەو ناوچەیەدا دەبن ، ئەوا هێزە هاوپەیمانەکان و دەوڵەتە سەرەکییەکان ناڕەزایەتیی پێشان نادەن بە رووی " سووربوونی خۆبەخشانە بۆ بوونە بەشێك لە دەوڵەتە کوردییە سەربەخۆکە لە لایەن دانیشتووانی کوردی ئەو پارچەیەی کوردستان کە تائێستا لە چوارچێوەی ویلایەتی موسڵدان " ڕێکەوتننامەی سیڤەر ، وەك دەبینین ، لە لانکدا خنکێنرا و لەلایەن کەمالیستە تورکە بەخۆدا ڕاپەرمووەکانەوە پێشێلکرا و لە ساڵی ١٩٢٣ بە ڕێکەوتننامەی لۆزان شوێنی گیرایەوە. بڕوانە، جوەیدە، سەرچاوەی ناوبراو، ل ٢٩٠–٢٩١.

146 See appendix 1 p. 129 'The Treaty of Sêvres 1920' in Sheri Laizer, (1991).

هەروەك حەسەنپور تێبینیکردووە هێشتا لەپێکهاتنیدایە.[١٤٧]

ئـــەوە پەرەســـەندنی ئایـــدیۆلۆجی نەتەوایـــەتی بـــوو کـــەوایکرد تێکۆشـــانەکانی نەتەوەسازیی بـەمۆدێلێکی چالاك مەسـەلەیەکی گونجاوبێـت. نەتەوایـەتی کـوردیی لــەئیمپراتۆری عوسمانییـــدا هەژارانـــە پەرەیســـەندبوو، لەکاتێکـــدا جووڵانـــەوە نەتەوایەتییەکانی رەعییەتەکانی دیکەی وەك عەرەبو ئەرمەنیی، هەروەها هەروەك گـەلانی دراوسـێی خۆبەنەتـەوەزان کـەخۆیان لـەدەوری پرنسـیپی دەوڵـەت-نەتـەوە رێکخسـت، کـوردانیش دوای هـەمان بانگەشـە کـەوتن. هەرچـەندە، لەدیدگایـەکی هەرێمییەوە، ئایدیۆلۆجی نەتەوەییـەکانی کـورد هێشـتا دواتـر پەرەیسـەند. کـوردان تـاکو سـەرەتای سـەدەی بیسـتەم بەهۆشـیارییەوە سـوودیان لـەم ئـامرازە وەرنـەگرت، هەڵسـوڕان بـۆ بەسیاسـییکردنی ئیتنیکـی کـوردیی هاوکاتـە لەگـەڵ هەڵوەشـانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانیو بنیاتنانی سیستمی دەوڵەت-نەتەوەی هاوچەرخ لەرۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا، ئـەوەی دواییـان لەلایـەن هێـزە کۆلۆنیالییەکانـەوە پێشکەشـکرابوو. ئـەم پەرەســەندنە هـانی پوچـکردنەوەی ئـەو سیسـتمە نەریتییەکـەی دەسـەڵاتی دا، و لەکاتێکدا نەتەوایـەتی کـوردیی وەك جووڵانەوەیـەکی سیاسـیی پشـکوت، تێکۆشـا بـۆ خێرا لاوازکردنی خێڵگەرایی بۆئەوەی وەفاداریی خەڵکەکە بەرزبکاتـەوە لـە سـەروو ئینتیمـا ئـاینیو خێڵەکییـەکان بـۆ ئینتیمایـەکی گشـتگیری نەتـەوە. لەڕاسـتییدا، لەکاتێکـدا کـە هـزری جیابوونـەوە لـە ئیمپراتـۆری عوسمـانی لـەنێو نەتەوەییـە شارەکییەکاندا گەشەیکردبوو، هەروەها "نەتەوەی وێناکراو" کەوتە ئەوەی رەهەندی هەرێمی بۆپەیدابێت، چینی خوارەوەی کۆمـەڵگا بەشـێوەیەکی چالاکانە هانـدران بـە جووڵانەوە پێکهاتووەکەوە پەیوەستبن.[١٤٨]

لەکوردسـتانی ناوەنـدیی، رێکخـراوە نەتەوەییـە کوردییـەکان لەسـەرەتای سـاڵانی ١٩٢٠کانــەوە هــەبوون، بــەڵام ئەگــەر ئــەوەیان هەڵبــژاردبێت وەك فــۆرمێکی جیــا لەدەســەڵاتداری بــەهێزی نــەریتیی کەســێکی وەك شــێخ مــەحموودی بــەرزنجی

147 Hassanpour (1992), p. 58.
148 van Bruinessen (1992b), p. 51.

لەسلێمانیدا بمێننەوە، رەوشێکی وایان هەبوو کە کاریگەرێکی سنووردariyan بەسەر خەڵکەوە هەبوو. هەروەك ڤان بروینسن ئاماژەی بۆکردووە، ئەو رەشەخەڵکەی بەراپەڕینەکانەوە پەیوەستبوون " بەهۆی وەفاداریی یان ملکەچی بۆ سەرکردە ئاینیو خێڵەکییەکان، نەك بەهۆی هەستێك بە ئینتیما بۆ نەتەوەی کورد".[١٤٩]

ئەو راپەڕینە• کوردییانەی لە تورکیا روویاندا لە سالانی پاش دامەزراندنی کۆمارەکە پێویستە لەبەرچاوبگیرێت کاتێك لێکدانەوە بۆ پەرەسەندنی گشتی نەتەوایەتی کوردیی دەکرێت. ئەمانە لەجۆری دەرەبەگایەتی بوونو بەتەواویی کارەکتەرێکی نەتەوایەتییان نەبوو، هەرچەندە، ئەوانە نوزەیەکی نەتەوەییان هەبوو. بۆ نموونە، راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران لەساڵی ١٩٢٥دا، کە وەك بێزارییەك دژی کۆتایهێنان بەخەلافەت سەریهەڵدا، لەهەمان کاتدا ئاینیو خێڵەکیو نەتەوەیش بوو.[١٥٠] شێخ سەعید کە رابەری راپەڕینەکە بوو، سەرکردایەتی پشتگیرییەکی بەرچاوی جەماوەرەکە بوو، بەڵام هزرو تاکتیکی راپەڕینەکە داڕێژراوی رێکخراوی نەتەوەیی کوردیی ئازادی بوو، کە ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی بوو. بۆ زۆربەی سەرکردە خێڵەکییو ئاینییەکانی بەشداربوو لەراپەڕینەکەدا، هاندەرە نەتەوەییەکان گرنگییەکی سەرەکی نەبوو بەڵکو لەپەراوێزی لەبەرچاوگرتنە خێڵەکییو ئاینییەکاندا بوو. نارەزایەتی لەبەرامبەر هەڵوەشاندنەوەی خەلافەت مانای ئەوە بوو کە " جووتیارەکان زیاتر خولیای ئاینیی

149 Id.(1998), p. 39.

• نووسەرە بیانییەکان وشەی "revolt" یان "uprising / راپەڕین" یاخود "rebillion /یاخیبوون" بۆ جووڵانەوەی چەکدارییەکانی کورد دژی حکومەتەکانی ناوچەکە بەکاردەهێنن. لەزمانی ئینگلیزییدا وشەی (revolt) پڕبەپێستی وشەی "شۆڕش"ی کوردییە بەمانا زمانییە سەرەتاییەکەی.(واتە هەژانو راپەڕینی توندوتیژی خەڵکی ناڕازیی دژ بە سەرکوتکارانی). چەمکی" Revolution /گۆڕانی ریشەییوسەرتاسەریی سیاسییو کۆمەڵایەتیی لە قەڵەمبازێکی مێژووییدا" بۆ رووداوی شۆڕشە گەورەکانی وەك فەرەنسییو ئەمریکییو رووسیی بەکاردەهێنن، کە کورد لەمێژووی خۆیدا بەخۆیەوە نەدیوە.

150 Olson (1989), pp. 153-155.

ئیسلامییان هەبوو تاکو هەژانی نەتەوەیی کوردیی."[151] سیاسەتی خێڵەکیی ڕۆڵێکی بنەڕەتی بینی لەو ڕاپەڕینانەی دواتری کوردستانو هەروەها بەردەوامبوو لە پیادەکردنی کاریگەرییەکی بەرچاو لە گەشەکردنی بیروبڕواکانی نەتەوەییەکانی کورد.

ئەم ئایدیا نەتەوەییە هاوچەرخانە، بەهۆی ئەو گۆڕانە سەرەکییانەی پاش ساڵەکانی دووەمین جەنگی جیهانی لە ڕووی کۆمەڵایەتیو ئابوورییەوە لەکۆمەڵگای کوردییدا هاتنەئارا، پەیدابوونو بەشێوەیەکی بەرفراوان گەشەیانکرد، ئەوەش خۆی لە گەشەکردنی خێرای شارەکییبوونو پشکووتنی چینی نوێی ناوەڕاست بەرجەستەکرد. ئاکامێکی سروشتی ئەم گۆڕانانە بریتیبوو لە پەرەسەندنێکی سیاسی گرنگ سەبارەت بەسەرهەڵدانی سەرکردایەتییەکی هاوچەرخگەراو هەروەها لاوازبوونی هاوکاتی ناوەندی نەریتیی دەسەڵات کە خۆی لە موڵکدارە دەرەبەگەکانو سەرکردە ئاینییەکاندا بەرجەستەدەکرد.[152]

لەگەڵ کۆتاییهاتنی سیستمی دەرەبەگایەتی لەناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا، کوردان کەوتنە ئەوەی پێکەوە کۆبنەوە لەکاتێکدا هەستی هاوبەشی خولیا نەتەوەییەکان ئایدیۆلۆجییەکی هێنابووەئارا ئەویش "کوردایەتی" بوو، کە هەر چوارپارچەکەی کوردستانی یەکخستبوو. حەسەنپور لێکیدەداتەوە، ئەم " سیستمە هاوبەستەیەی بیرکردنەوە، واتە ئایدیاو خەبات بۆ ڕزگارکردنی کورد لە ستەمی نەتەوەیی لەرێگەی یەکخستنی هەموو بەشەکانی کوردستان لەسایەی فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی."[153] لەبنەڕەتدا لەو وەرگێڕاوەی سەرەوەی ئیدمۆندز دا پوختەکراوە.

نەتەوایەتی کوردیی، بە پێکهاتە مەزهەبییە سوننییە بەهێزەکەشییەوە، هەر لەسەرەتاوە بەئاینەوە بەستراوە، کە"هەماهەنگییەکی لایەنگرانەیە بۆ ئیسلام."[154]

151 van Bruinessen (1982), p. 292 (He also provides an interesting account of the interplay between Shaylch Said and the Azadi group on pp. 287-88.)
152 Ibid. p. 61.
153 Hassanpour (1992), P. 62.
154 van Bruinessen (1998), p. 40.

**بەهەمان ئەو شێوەیەی کە گەلانی ئیمپراتۆری عوسمانی بەهۆی هاوبەشییان لەئاینی ئیسلامدا وابەستەی فەرمانڕەواکانیان بوون. هەوڵدان بۆ بەنەتەوەییکردنی بیروبڕوای ئیسلام مەسەلەیەکی پڕگرفتە، ئەوە مانای بەڕووداوەستانەوەی بنەما سەرەکییەکانی ئاینە جیهانییەکەی دەگەیاندو هەروەها پیادەکردنی بێگومان دەبووە هۆی بەرەنگاربوونەوەیەکی توند لەلایەن زۆر لە رەعییەتە وەفادارەکانی ئیمپراتۆرییەکەوە. هەرچەندە، وەلانانی خەلافەت رەوشەکەی بەشێوەیەکی بەرچاو گۆڕی، ئەوەی رێبەری تەریقەتە سۆفیگەراکان بوون باوەشیان بەهزری نەتەوەییدا کرد، پەسەندکردنی بەشێوەیەکی مەزن ئاسانکاری لەلایەن ئەو راستییەوە بۆ کرد کە ئەوان ئەو هزرەیان لەسایەی سەرکردەگەلێکی موسوڵمانی نەریتی پێشکەش بە خەڵکەکە کرد. ئەمەش بەشێوەیەکی کاریگەر جووڵانەوەیەکی نەتەوەیی سونئی بەرچاوی هێنایەئارا، ئەو پێکهاتەیەی جەختی لێکرایەوە تاکو ساڵانی ١٩٦٠کان، کاتێك سەرکردایەتییەکی سێکولارخواز زەمینەیەکی گونجاویان رەخساند تاکو کوردانی شیعەش ببنە بەشێك لەجووڵانەوەکە. لەدەیەکانی داهاتوودا، نەتەوەییەکانی کورد سەرکەوتووانە کەوتنە ئەوەی کەمینە نەتەوەییەکان راکێشنە نێو جووڵانەوەی نەتەوەیی کوردییەوە.[155]**

**ئایدیۆلۆجی نەتەوەیی کوردیی هاوچەرخ بەئەستەم پەیوەستە بەئاینەوە، بەڵکو لەسروشتدا سێکیولارەو هەر لەساڵانی ١٩٨٠کانیشەوە زنجیرەیەکی بەرفراوان ئایدیۆلۆجیو رێحەزی سیاسیی وەك "پۆپۆلیزم"و "سۆشیالیزم"و " دیموکراتی نەتەوەیی"و "سۆشیالیزمی نەتەوەیی" گرتۆتەبەر.• ئەو بژاردە کوردییەی لەپشتی**

---

155 Id. (1992b), pp. 52-53.

• لەکۆتایی ساڵانی ١٩٦٠ کاندا، لاوانی عێراق بەگشتییو کوردان بەتایبەتیی کەوتبوونە ژێر کاریگەریی سیاسەتی سۆشیالیستییەوە. لەئاکامدا چالاکییە سیاسییەکان زۆربەی جار بە بیروبڕوای چەپگەرایانە بارگاویی بوون. هەرچەندە، لەکۆتایی ساڵانی شەستەکاندا، ئایدیۆلۆژیی کۆمۆنیستی شورەویی لەلایەن کۆمۆنیستی چینییەوە رکابەریی دەکرا، بە چەشنێك کە کۆمۆنیستی چینیی بە "ریڤیژینیست/پێداچووەوە" دەناسران، کە بە کردار کۆمۆنیستی نێونەتەوەییان بە هەستی نەتەوایەتییەوە گرێداو بە ئاکارێکی چەپگەرایانەوە شۆڕشی نەتەوەییان رێبەرایەتیی دەکرد. ئەم گۆڕانکارییانە لە رێگەی پارتە چەپەکانی ئێرانەوە گەیشتە کوردستانی

**چوونەپێشـەوەی کوردایەتییـدا بـوون لەچـەند قۆنـاغێکی جیـاوازدا کەوتنـە ژێـر کاریگـەری بـیری مارکسـیزم-لینینیـزم[156] و هـەروەها وێـڕای نەهێشـتنی سـتەمی نەتەوایەتی جەختیان لە نەهێشتنی نادادپەروەریی کۆمەڵایەتی-ئابووری دەکـردەوە. هەرچەندە، ئایدیا مارکسییەکان بایـەخی کـەمتربوو بـەو هۆیـەی کـە زەحمـەت بـوو لەگەڵ ئایدیۆلۆجی نەتەوایەتییدا پێکەوە کۆبکرێنەوە، وەك ئـەوەی کـە لەسیاسـەتی پەکەکـەدا ئاشـکرایە ( پەکەکـە نموونەیـەکی بەرچـاوی رێکخراوێکـی کـوردیی مارکسییە) ئەوەی بەشێوەیەکی تێبینیکـراو لەساڵانی ١٩٩٠کانـدا بایـەخێکی کـەمتری بە ئایدیا مارکسییەکان دەدا.**

**ڤان بروینسن جەخت لەوە دەکاتەوە کە ریشـەی نەتەوایـەتی کـوردیی لـەنێو توێـژی جیـاوازی کۆمەڵایەتییـدا دەبینـرێتـەوە، یـەکێکیان ئـەو توێـژە خوێنـدەوارەن کـە لـە ژینگەیـەکی شـارەکییدابوون، ئەوانــەی وەڵامــدەری ئــەو ئایدیۆلۆجییــە سیاسـییە هاوچەرخانە بوون کە هاندەری نەتەوایەتی بـرا عـەرەب‌و تورکـەکانیان بـوو. پایـەی دووەمـی هەسـتی نەتەوایـەتی بریتییـە لـە بنکـە خێڵەکییـە لادێییەکـە. بـەدەر لـە جیاکردنەوەیان لەیەکتر، ئەم دوو توێژە کۆمەڵایەتییە پێکەوە پەیوەستن لەکاتێکدا**

---

عێراق، وەك "تۆفان" و "تودە" ، کە دژی شێوازی پارتە کۆمۆنیستە. لەراستییدا دوو گروپ لە لاوانی مـاویزمی ئێرانیی کاریگەریی خۆیان لـە بڵاوکردنـەوەی ئـەو بـیرە لـە باشـووری کوردسـتاندا هـەبوو، یەکـەمیان ئـەو لاوە کوردانە بوون کە لە زانکۆی تارانـەوە هاتنـە باشـووری کوردسـتان وەك ئیسـماعیلی شـەریف زادەو محەمـەدی سیراجی کە بە حیزبی دیموکراتی کوردستانەوە پەیوەست بـوون‌و دواتـر لەگـەڵ سـلێمانی مـوعینی دا سـازمانی ئینقلابی حیزبی دیموکراتیان دامەزراندو چوونەوە بۆ ناو ئێران بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش، ئەوی دیکەشـیان ئـەو فارسە ماویزمانە بوون کە لەلایەن جەلال تاڵەبانیەوە ئاسانکاریان بۆ کـرا بەمەبەسـتی یارمـەتی جووڵانەوەکـەی سازمانی ئینقلابی حیزبی دیمـوکرات بێنـە باشـووری کوردسـتان. ئەوانـە بریتیبـوون لـە: کـورش لاشـائی، علـی صادقی، سیاوش پارسانژاد، عەتا کەشکوڵی، ئیسـماعیل موئەیـدزادە، خوسـرەو سـەفایی، موحسـن خاتـەمی‌و ئیرەج کەشکوڵی. بەشێك لەوانە بە هاوکاری تاڵەبانی لە "بەکرەجۆ" کۆرسی راهێنیان کردەوە تـا لاوانـی کـورد فێری بنەماکانی ماویزم‌و خەباتی شۆرشگێڕانە بکەن. بۆ زیاتر:

حمید شوکت، نیگاهی از درون به جنبش چپ ایران، گفتوگو با ایرەج کشکولی، تهران ،چاپ اول، ١٣٨٠، ص ١١٧–١٣٠.، ستانسفیلد، سەرچاوەی پێشوو، ل١٩٣–١٩٤.

156 Hassanpour (1992), P. 64.

ژینگە خێڵەکییەکە ئەوەیە کە رۆشنبیرە شارەکییەکانیان سەریان لێوە جوقانـدووە. [157] وێڕای جێهێشتنی ناوچە خێڵەکییەکە بۆ شارە گەورەکان، پەیوەنـدی بـە سـەرۆك خێڵەکانـەوە ( کـە تایبەتمەندییـەکی وەفـادارییو ملکەچـی لـەخۆ دەگـرت) نەپچـڕا، هەروەها لەکاتێکدا ئەم بەڕیشە خێڵەکییانە بوونە سیاسەتمەداری شارەکیی، بایـەخی پابەندییـە خێڵەکییـەکان نەهاتـەخوار. ئەمـەش رەهەنـدێکی دیکـەی هەیـە: تائـەو کاتەی رۆشنبیرە شارەکییەکان بەدوای بەدەستهێنانی پاڵپشتی لـە خێڵەکانـەوە بـوون، ئەگەری گەشەکردنیان بۆ هێزێکی سیاسی تۆکمە لەئاستی لانیکەمە. هەربۆیە فۆرمە هاوچـەرخەکەی سیاسـەتی کـوردیی ئـەوە بـەخۆوە دەبـینی کـە زۆرجـار بەرپرسـان لەهەوڵی رازیکردنی سەرۆك خێڵەکاندان، پێدەچێت لـەپێناوی بـەدیهێنانی ئامـانجی سیاسـییدا بێـت. بـۆ ئەنجامـدانی ئەمـە "ئـەوان دەسـەڵاتی ئـەم سـەرۆك خێڵانـەیان بەسـەر بـاقی دیکـەی خەڵکەکـەدا بـەهێزکردووە، هـەروەها بەشـدارییان لـە جەمسەرگیریی کۆمەڵایەتیو ئابووری کۆمەڵگای کوردییدا کردووە." [158]

ئەم وابەستەییە بـە رەگـەزە خێڵەکییەکانـەوە بەتونـدی لەمپـەری خستۆتە بـەردەم پەرەسـەندنی کوردایـەتی کـە ببێتـە هێزێکـی سیاسـی هاوبەسـتەو پێکەوەگرێـدراو لەوسۆنگەیەوە کە رۆشنبیرە شارەکییەکانو خێڵەکان لەبنەڕەتدا ناکۆکبوون سەبارەت بە زۆربەی ئەو پرسانەی سروشتی سیاسیان هەبوو. پێدەچێت هێنانـەدی هاوکاریی لەسەر بنەمایەکی خێڵەکیی نزیکەی کارێکی مـەحاڵ بێـت، ئـەرکێکی وا بـەهۆی ئـەو دژوارییو ململانێ بەردەوامەی لەنێوان خێڵگەلێکی دیاریکراودا لەئارادابوو، هێندێك سەرۆك خێڵی ناچاردەکرد (ئەگەر بێلایەنیان هەڵنەبژاردایە) کە پـەنایان بـۆ لاکـەی تر بردبا بـۆ رکابـەری سـەرۆك خێڵێکـی دیکە کـە خـۆی بەجووڵانـەوەی کوردییـەوە بەستبۆوە. بەوەش بژارەی لایەنگری جووڵانەوەی نەتەوەیی کورد یاخود چوونەپاڵ هێزەکـانی بەغـدا بـەگوێرەی قەناعـەتێکی سیاسـی نـەبوو بـەڵکو زادەی ململانێـی خێڵەکیی بوو.

---

157 van Bruinessen (1986), p. 16.
158 Ibid. pp. 43-44.

نموونەیـەکی ئاشـکرا سـەبارەت بـە هەلپەرسـتی سیاسـی کـە پێدەچـێت پێناسـەی تایبەتمەنـدی هێنـدێك لەسـەرۆکە خێڵەکییـەکان بێـت بریتییـە لـە ئەزموونـە سیاسییەکەی کۆمـاری مـەهاباد، کـە هێنـدێك لـە سـەرۆك خێڵانـە خـاوەنی "جـووت ئینتییمـا بـوون" بـۆ هەریـەك لەکۆمارەکـەو هـەروەها بـۆ حکومـەتی ئێـرانیش. " هـەروەك عەباسـی وەلـی ئامـاژەی بـۆ کـردووەن " ئـەم لێبوردەییـە چەسـپاوە مەسـەلەیەکی تـاکتیکی نـەبوو. زیـاتر لـەوەی ئـەو درککردنـە تاڵـەی سـەرکردایەتی کوردیی بـوو بـۆ پێگـەی گرنگـی مولکدارە خێڵەکییـەکان لـەبونیادی دەسـەڵاتدارێتی سیاسـی لەکۆمارەکـەدا." بەوتەیـەکی دیکـە، مانـەوەی کۆمارەکـە بەشـێوەیەکی مـەزن پشتی بەهاوکاری ئەوان دەبەست."[159] ئـەم تـەرزە ئاکـارە، وێـڕای ئـەوەی بەتێپـەڕینی کـات بەشـێوەیەکی رێـژەیی تووشـی بـەڕوودا وەسـتانەوەو لاوازیـی بـووە، بـەڵام تـاکو ئـەمڕۆش بەردەوامـە، ئـەوەی کاریگەرییـەکی نـەرێیی لەسـەر نەتەوایـەتی کـوردیی هەیە. لەلایەکی ترەوە، جەمسەرە رۆشنبیرە شارەکییەکە، هەمان کـات لەسـەنگەرێکی دژ بە ئاکارە خێڵەکییەکەو هەروەها بەهەمان مـۆدێلیش خیانـەتی لەزۆرێنـەی نـاوی جووڵانەوە کوردییە کردووە بە گەیشتنە رێکەوتن لەگەڵ حکومەتی ناوەندییدا.[160]
هاوشێوەی هەلومەرجەکەی سـەدەی هەژدەیـەمو نۆزدەیـەمی ئـەوروپا، کاتێـك " زۆر لەنەریتە شـکڵییەکانی کـۆن هێنرانـەوە گـۆڕێ"[161] دەتوانرێـت نموونەیـەکی هاوشـێوە لەکوردستانیشدا ببینرێتەوە کاتێك هەوڵەکان بۆ نەتەوەسازیی هـەنگاوی خۆیـان نـا. لـەئاکامی ئـەو سروشـتە سـەرکوتکارییەی ئـەم نەتەوایەتییـە دەوڵەتییانـەی وڵاتـانی دەوروبـەر، نەتەوەییـە کوردەکـانیش کەوتنـە هۆنینـەوەی مێـژووی کـۆنی خۆیـان، لەوانەیە زیاتر وەك کاردانەوەیـەك بێـت لەحاسـت سیاسـەتی تواندنـەوە کـە تـورك و

159 Vali (1996-1997), p. 11.

١٦٠ هەردوو ئەم رێحەزە لەیەکەمین باسدا دەرکەوتووە، ئەوەی پێشوویان لەمشتومڕکردن لەبارەی جاشـەوەو هەروەها ئەوەی دواییان لەلایەن هـەردوو سـەرکردەوە بەرجەسـتەکراون، " هەوڵگـەلێك بـۆ رازیکردنـی سـەدام: تاڵەبانی لەساڵی ١٩٨٣و بارزانیش لە ١٩٩٦دا.

161 .Billig (1995), p. 25 (For more on invented traditions in Kurdistan, see chapter 5, section 5.1. The Construction of a National Identity.)

فارس‌و عـەرەب لەرێگـەی نووسـینەوەی مێـژووەوە گرتبوویانەبـەر، ئـەوەی نکـۆڵی لـەوەدەکرد هـیچ پێگەیـەکی مانـادار لەمێـژوودا بـەکوردان ببەخشێت. ئـەم مێـژووە کوردییە ریشەی کوردانی گەڕاندبۆوە بۆ ئارییەکان‌و ئیمپراتۆرییەکەیان کە میدیایە، ئـەوەی کـە رۆشـنبیرە نەتەوەییـەکانی کـورد چـەندین ئەفسانەیان بـۆ ئـەو مێـژووە هەڵبەستبوو.[١٦٢] بنیاتنانی مێژووی نەتەوەیی بۆ کوردان فرە گرنگترە تاکو گـەلانێکی دیکە، هەروەك بروینسن جەختی لێکردۆتەوە. لەگەڵ بەشـێکی زۆر لـە کەسایەتیی‌و رووداوو رابردووان‌و دابونەریت‌و ریشەی زاراوەکان‌و جەژن‌و بۆنە مێژووییـەکان کـە بژاردەی رۆشنبیری‌و سیاسی نەتەوەکانی دەوروبەر کێبڕکێـی لەسـەر دەکـەن، کـوردان هەست بە پێویستییەکی زێدەتر دەکـەن بۆئـەوەی جـەخت لـەخۆیان‌و مێژووەکـەیان بکەنەوە. یەك لەو نموونانە بریتییە لە (بـەد) مامەڵـەکردنێکی نەتەوەییانـە لەگـەڵ سـەلاحەدین دا، کـە بـە جـەنگاوەرێکی مـەزنی کـوردیی دەناسـرێت، ئـەو سـەرکردە سـەربازییەی فەرمانـدەی سوپای ئیسلامی کـرد بـەرەو سـەرکەوتنێکی یەکلاکـەرەوە بەسەر خاچهەڵگرەکاندا، پاش ئـەوەش دەسـەڵاتی بنەماڵـەیی ئەیوبییـەکانی لەمیسـر دامەزرانـد. بەپشتبەسـتن بـەو پێگـە وەرگـیراوە، رۆڵـی سـیمبولیکی سـەلاحەدین لـە پاڵـەوانێکی تورکـەوە• کراوەتـە نەتەوەییـەکی عێراقـی یـان بەشـێوەیەکی سـادەتر سەرکردەیەکی مەزنی ئیسلام. بۆ کوردێکی خاوەن ئاگاهی نەتـەوەیی، ئـەو چیدیکە وەك سـیمبولێك بـۆ نەتەوەکـەوەی خۆیـان بـەکارناهێنن.[١٦٣] شـایەنی تێبینییـە کـە لەتێپەڕینی ئەمە لەسالانی ١٩٧٠کاندا، جووڵانەوەی نەتەوەیی کوردیی دەسـتیکرد بـە

162 As explained by Amir Hassanpour in his paper 'The racialisation of Kurdish National Identity', presented at the Kurdological Conference Between Imagination & Denial. Kurds as subjects and objects of political and social processes, May 29-311998, Berlin

• لەڕووی مێژووییەوە، کوردبوونی سەلاحەدین گومانی تێدانییەو مەسەلەیەکی چەسپاوە.

163 87.van Bruinessen (1998), 'The Kurds as Objects and Subjects of their History: Between Turkish Official Historiography, Orientalist Constructions, and Kurdish Nationalists' Recuperation of their History', paper presented at the Kurdological Conference Between Imagination & Denial. Kurds as subjects and objects of political and social processes, May 29-31, Berlin

پشتگیرییکردنی بیروڕا ئاینییه ئێزیدییەکانو ئەم ڕەگەزەی کەلتووری کوردیی وەك ئـاینێکی ڕەسـەنەی کـوردیی خستەبەرچـاو.[١٦٤] ڕەگـەزێك لـە مێژووسـازیی خـودی نەتەوەییەکانی کورد دەتوانێت هـەروەها هـەوڵێك بێـت بـۆ بـەرفراوانکردنی پێگـەی جەماوەری نەتـەوایەتی کـوردیی. ئـەم شـێوازەی بنیاتنـانو سـەرلەنوێ بنیاتنانـەوەی مێژوو بەرجەستەی سیمایەکی زیانبەخش بۆ چالاکییە نەتەوەییـەکان دەگرێتـەخۆ، هـەروەها مـرۆ دەتوانرێـت بـەدوای ئەوانـەدا بچێت لـە نەتەوایـەتی کوردییـدا. لـەو سۆنگەیەوە کـە نەتـەوایـەتی خوازیـاری سـەرلەنوێ لێکدانـەوەی مێـژووەو بۆئەمـەش چاککردنی ڕەوشە هەنووکەییەکەی ئەو گەلـەی نەتەوەیـەکی پێکدەهێنێت، ئـەوەی کە تێڕوانێنێکی داخراوی هەیـەو بەچاوێکی کەمـەوە بـوونی شـتەکان ڕەتدەکاتـەوە. هەروەك ئێدوار تێبینیکردووە،" لێخوڕین بەرەو ڕابردوو، ئەو ناتوانایـیـە دەردەخـات کە بێنو دەست بە واقیعە هەنووکەییەکەوە بگـرن، هـەروەها لـەوەش تایبـەتتر، ئـەو گەشەکردنە کۆمەڵایەتییەی ڕابردوو بە ئێستاوە دەبەستێتەوە." [١٦٥]

هەروەك پێشتر تێبینیکرا، یەکەمین کۆمەڵە کوردییەکان کە سروشتێکی کەلتووریی- سیاسـییان هـەبوو لەشـارە گەورەکانـدا دامـەزران، ڕێـجـەزێك کـە بـەردەوام بـوو. کوردستان بۆ خۆی شانۆیەکی سەرەکیی نەبووە بۆ بڵاوکردنەوەی گۆڤـاری کـوردییو یـاخود پێشکەوتنی نەتەوایـەتی. کۆچـکردن لـە کوردسـتانەوە بـۆ شـارە گـەورەکانو هەروەها وڵاتـانی بیـانی، لەراسـتییدا، بەشـدارییەکی گرنگی لـە گەشـەکردنی ئاگـایی نەتـەوەیی کوردییـدا کـردووەو ئەمێسـتا بۆتـە دیاردەیـەکی گشـتیو بێئـەوەی هـیچ سەرکوتکارییەکی دەوڵەت بەری پێی بگرێت. ئـەم گەشـەکردنەی کـەلتووری کـوردیی بـەهۆی تاراوگـەوە گونجـاو بـووەو هـەروەها بـەهۆی ئـەو پێشـکەوتنانەی لـەبواری تەکنەلۆژیای زانیاریو پەیوەندییەکانـدا ڕوویانـداوە زەمینـەی بـۆ ڕەخسـاوە. ئیتنـۆ- نەتەوایەتییە هاوچەرخەکانی هاوچەشنی ئەوەی کوردان فرە سوودی لەمـە کـردووە، هـەروەها وێـڕای ململانیـێ دژوارە نەتەوەییـەکان، چاکتربوونی فۆرمـە جیاوازەکـانی

164 Fuccaro (1997), p. 575.
165 Edwards (1985), p. 43.

پەیوەنـــدییکردنو شانبەشـــانی ســـەرکوتکاری حکومـــەت، نەتـــەوەی کـــوردی بەهێزکردووە.

کاتێك لێکدانەوە بۆ نەتەوایەتی کوردیی دەکرێت، دەبێت ئـەو ژمـارە زۆرەی کـوردان کـە لـەدەرەوەی کوردسـتان دەژیـن[166] لەبەرچاوبگیرێن، بـەهۆی ئـەو کاریگەرییـەی کـە نەتەوەییـەکانی تاراوگـە هەیانـە لەسـەر ئـەو شـێوەیەی کـە نەتەوایـەتی کـوردیی هاوچـەرخ بەخۆیـەوە گرتـووە.نەتەوایـەتی هـەرێمیی، داوای تـەواو سـەربەخۆیی سیاسـیی، چـیدی لەلایـەن گروپـی مـەزنی کوردییـەوە لایـەنگری لێنـەدەکرا. واتـە نەتەوایـەتی کـەلتووریی ، کـە هاوسـەنگی جیۆپـۆلیتیکی هەسـتیاری ناوچـەکە ناشـێوێنێت کـە بۆتـە فـۆرمی بالادەسـتی زۆربـەی بـیروڕای نەتـەوەیی کـوردیی. کـە هاوجووتبوو لەگەڵ داواکارییەکی سیاسی سنووردار بۆ ئۆتۆنۆمی هەرێمیی، دەرفەتی یەکسان، وێـڕای نوێنەرایـەتییکردن لـە دەزگـاو دامـەزراوەکانی دەوڵەتـدا بەئاسـتێکی ڕێژەیی. ڤان برویـنسن، سـەبارەت بـەرۆڵی کـوردە چالاکە سیاسـییەکانی تاراوگـە (لـە ئەوروپاو بـاکووری ئـەمریکا)، یـاخود لۆبیـە کوردییەکـەی لەرۆژئاوایـە، ئـەنجامگیری کردووە کە " ئەوانەی کوردستانیان بەئارەزووی خۆیان یـان بەناچاریی جێهێشـتووە لەوانەیە (بەناڕاستەوخۆیی) بەشدارییەکی زێـدەتریان لەبـەهێزکردنی جووڵانـەوەی کوردییـدا کردبێـت وەك لـەوەی کـە بیانتوانییبایـە ئـەوە بکـەن ئەگـەر لەکوردسـتاندا بمانایەتەوە."[167]

## ٥ . ٥ . ٢ هەڵسەنگاندنی نەتەوایەتی کوردیی

هـەروەك پێشـتر ئامـاژەی بـۆکراوە، گـەر هەوڵـەکانی پابەنـدبوون بـە پێناسـەکانی نەتەوەو نەتەوایەتییەوە بگیرێتەبەر، مەترسی ئەوە هەیە ئەو ئامرازانەی وێناکردن پاشـتر وابکـات لێکدانـەوەی کەیسـە کوردییەکـە ناتـەواوبێت. لێرەشـدا، گونجـاوترین

---

١٦٦ ڤان بروینسن ئاماری چارەك یان تەنانەت سێیەکی دانیشتووانی کوردی داناوە.

167 Ibid.

ڕێباز ئەوەیە کە پێویستی بە "تیۆرێکی دووڕەگ" بۆ نەتەوایەتی کوردیی هەیە.

یەك لەو پێناسە باڵادەستانەی نەتەوە کە لەپێشەوە ئاماژەی بۆکراوە، ئەوەکەی سمسە " ناوی کۆمەڵە خەڵکێکە کە ئەفسانەی هاوبەش‌و یادەوەری مێژوویی‌و کەلتوورێکی بەرفراوانی گشتی، ئابوورییەکی هاوبەش‌و مافو ئەرکی شەرعی هاوبەش بۆ هەموو ئەندامەکان."[168] زۆر بۆ دەوڵەت-نەتەوەی کلاسیکی گونجاوە، و هەروەها بۆ نەتەوەیەکی بەچەشنی نەتەوایەتی کوردیی لەبارنییە. وەك گروپێکی ئیتنی، ئەم دانیشتووانە گەورەیەی کوردان پێکدێنن خاوەنی کەلتووری جیاوازن، تێکەڵی هەرێمی (بەڵام نەك لەگەڵ جووڵەی نێوخۆیی بێ لەمپەر) هەروەها هەست‌و ئینتیمایەکی بەرچاو بۆ گروپەکە. کەموکورتی بۆ ئەوەی لەوانەیە زیاتر تایبەتمەندیی نەتەوەیەك بن بەشێوەیەکی تایبەت بریتییە لە پەیوەندی سیاسی دەرەکیی، مافی یەکسانی هاوڵاتی، هەروەها ئەگەری پێکەوەگرێدانی ئابووریی بۆ سیستمێکی هاوبەش کار.[169] هەرچەندە، ئەگەر لێکدانەوەیەکی سیاسی کەمتری زاراوەکە بەکاربێنین، هەروەها تیشکێکی زیاتر بخەینە سەر مانای گەل وەك نەتەوە، مرۆ بەئاسانی دەتوانێت ئەنجامگیریی ئەوە بکات کە کوردان یەکێك نین لە نەتەوانەی لەهەرێمە کۆلۆنییەکاندا خولقاون.

گرنگە تێبینی بکرێت کە بەشدارییکردن لە هەرێمێکی مێژووییدا، کە لەزۆربەی پێناسەکاندا مەرجێکی بنەڕەتیی نەتەوە، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی مانای ئەوە نییە کە ئەو تاکانە خۆیان بە ئەندامی هەمان نەتەوە لەقەڵەم بدەن. زیاتر لەوەی یەکخستنی ڕەگەزێکە، هەروەك زۆرجار دەردەکەوێت، ئەوە دەتوانێت کاریگەرییەکی بەرچاوی ناکۆکی هەبێت لەکاتێکدا کێبڕکێیەك لەسەر ئەو پارچە زەوییەدا هەیە. ئەمە زۆر بەروونی لەململانێی ئیسرائیلی-فەلەستینی دا دەردەکەوێت، بەڵام هەروەها دەتوانرێت بەسەر کوردو عەرەبی عێراقیش لەکەرکوك پیادەبکرێت، زۆرینەی دانیشتووانەکەی لەبنەڕەتدا کوردن، بەڵام بەوهۆیەوە کە شارەکە وردە وردە تەعریب کراوە هەردوو نەتەوەکە نەیانتوانیوە لەیەك نەتەوەدا ئاوێتەبن،

168 Smith, A. D. (1991), P. 14.
169 Id. (1992)

بەڵام لەبری ئەوە داوای فەردییان بەرزکردۆتەوە- هەریەکەیان بەتوندی دژی ماڤی مێژووی ئەوی دیکەیانە لەو خاکە پڕنەوتەدا.[170] لەوەش زیاتر، لەتێکڕای تایبەتمەندییەکانی نەتەوەیی، لەوانەیە ئەندامانی نەتەوەی کورد زۆر بەروونی لەدوانیاندا هاوبەشبن، کە بریتین لە خاك‌و کەلتوور. لەکاتێکدا سەبارەت بەئاینیش، هەموو کوردان موسوڵمانی سونی نین،[171] هەروەها لەڕووی زمانەوە ، زۆر لەکوردانی شانازییکەر بەخۆوە هەن کە بەتورکی پەیوەندیی دەکەن و هەر تەنیا تورکیی. هەروەها ئەوانە هەن کە لە دیاسپۆرا دەژین، کە وازیان لە کوردییبوونی خۆیان نەهێناوە هەرچەندە کە چیدی هاوبەشی خاکیان لەگەڵ برا کوردەکانیاندا نییەو لەوانەشە کەلتووری خۆیان گۆڕیبێت. ئەو نموونانە سەبارەت بە نەتەوەی کورد بەڕوونی پێشانیدەدات کە سیماگەلێکی بابەتی هاوبەشی دیاریکراو بەس نییە کاتێك پێناسەی نەتەوەیەك دەکەین- رەگەزە خودییەکانی هۆشیاری نەتەوەیی گرنگ‌و بنەڕەتییە. پێدەچێت باشترین رێگە بریتیبێت لەبەدوکەوتنی جێپێی کانۆڤانس، بۆ پەسەندکردنی رەتکردنەوەکەی سەبارەت بە کورتە پێناسەیەکی چەمکی نەتەوە، ئەو زیاتر داوای " وەسفێکی فینۆمینۆلۆجیکی" دەکات،[172] کە بۆ کەیسە کوردییەکە گونجاوترە.

نەتەوایەتی کوردیی، وەك ئایدیۆلۆجیی جووڵانەوە، بەشێوەیەکی روون لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا دەرکەوت. ئەوە ئەم ئایدیایەی نەتەوە بوو کە ببێتە قەوارەیەکی سیاسی سروشتی‌و هەروەها بنەمایەك کە پایەی دەوڵەت‌و حکومەتی لەسەر بچەسپێت، ئەوەی هانی پشکووتن‌و پەرەسەندنی ئایدیۆلۆجی نەتەوەیی کوردییدا — کەلەڕاستییدا بەتەواوی دیاردەیەکی هاوچەرخە. بەڵام ئایا ئەوە دروستە کە خەڵکی کوردی پێش سەدەی بیستەم تەنیا بە گروپێکی پێش —نەتەوەیی یان نەتەوەیەکی پۆتێنسال، بەگوێرەی زاراوەناسییەکەی کانۆر؟ ئەگەر وەرچەرخان لە گروپێکی ئیتنییەوە بۆ نەتەوەیەك پێویست بە ویستێکی خودهۆشیارییانە بکات بۆ

---

١٧٠ ئەمە لەلایەن ئەو کوردانەوە روونکراوەتەوە کە لەبنەڕەتدا خەڵکی کەرکوکن‌و لە ئێران دەژین. (مارتی ٢٠٠١).

١٧١ بڕوانە باسی سێیەم، سێکشنی ٣. ٣ سەبارەت بە ئاین .

172 Canovan (1996b), pp. 75-76.

ئۆتۆنـۆمی، ئەمـە لەوانەیـە ئـەو کەیسـە بێـت کـە نزیکـەی بـۆ سـەدەی شـازدەیەمو حەڤدەیەم دەگەڕێتەوە، کاتێك کوردان بەشێوەیەکی سیاسی لەچوارچێوەی میرنشینە کوردییەکاندا ڕێکخراوبوون.[173]

ئـەم میرنشـینانە کەوتبوونـە ناوچـە سـنوورییەکانی نێـوان ئیمپراتۆرییـەکانی عوسمانیو سەفەوییەکانەوە،[174] خاوەنی ئۆتۆنۆمییەکی بەرچاوبوونو بەهۆی شوێنی سـنووریی بـەڵام سـتراتیجییان ببوونـە سەرچـاوەی هێـزو دەسـەڵاتێك کـە ئیمپراتۆرییەکان هەردەم لەهەوڵی ئەوەدابوون بەلای خۆیاندا کەمەندکێشیان بکەن تـاکو ئاسایشـی سنوورەکانیان مسۆگەربکەن. لەئاکامی بـەزینی فارسـەکان لەجـەنگی چاڵدێران ساڵی ١٥١٤، بەشی زۆری کوردستان کەوتە بندەستی عوسمانییـەکان، وێـڕای ئەوەی کە ژمارەیەك میرنشین لەژێر ناوچەی نفوزی ئێرانییەکاندا مانەوە.[175] شاکانی سەفەوی خوازیاربوون لەڕێگەی ئەو فەرمانڕەوایانەی لەناوەندەوە دەنێرانو بەڕیشە فارس یان عەجەم بـوون، حـوکمی ناوچـە کوردییـەکانیان بکەن، لەکاتێکدا سوڵتانە عوسمانییـەکان ڕێبـازێکی پراگماتیانـەیان گرتەبـەر –بێگومـان ئـەوان گرانیـی زۆری سـەپاندنی کـۆنترۆڵێکی ناوەنـدییان بەسـەر ئـەو ناوچـە دووردەسـتانەی ئیمپراتۆرییەتەکە درککردبوو- ئۆتۆنۆمییەکی زیاتریان بەکوردان بەخشی بەوەی کە سەرۆکە خۆجێیـەکانیان وەك فـەرمانڕەوا ڕاژەبکـەن. سیسـتمێکی نـوێ لەناوچـەکەدا بەرپابوو کە لەسەر بنەمای پـاکتی عوسمـانی-کـوردیی ڕاوەسـتابوو، بەهۆیـەوە شـازدە میرنشـین لەلایـەن عوسمانییەکانـەوە دانـی پێـدانرابوو.[176] بەهـەرحاڵ، لـەئاکامی سیاسەتی پراگماتییانەی عوسمانییەکانەوە بێت یان بەهۆی شکستی شێوازی مامەڵەی ئێرانییەکانـەوە ( ئەسـفەهان[177] ناچـاربوو ئـەوە پەسـەندبکات دانـانی فـەرمانڕەوای غەیرە کورد لەناوەندەوە سیاسـیەتێکی ناپەسـەندو بێکەڵکە)، مـیرە فـەرمانڕەواکانی

173 Van Bruinessen (1992) pp. 145-175

١٧٤ بۆ زیاتر سەبارەت بە نەخشەی شوێنی میرنشینە کوردییەکان لە قۆناغە بەراییەکانی هاوچەرخ بڕوانە:
Izady (1992).p. 53.

175 See McDowall (1996) pp. 25-31.

176 Kendal (1993), p. 14.

١٧٧ ئەسفەهان پایتەختی دەوڵەتی سەفەوی بوو، هەروەها بۆ چەندین سـەدە ناوەنـدێکی گرنگـی ئیمپراتـۆری فارسی بوو.

کـورد لەمیرنشـینەکانیاندا وەك میرێکـی سـەربەخۆی واقیعـی فەرمانڕەوایـەتییان دەکرد.

لـەم میرنشـینانەدا، خـەڵکی لەکـەلتووردا بەشـداربوونو لەسـایەی کـەلتوورێکی پێکەوەییـدا فەرمانڕەوایـەتی دەکـران، بەوتەیـەکی دیکـە، میرنشـینە کوردییـەکان توانیبوویـان بەشـێوەیەکی مـاقووڵ ئـەرکی پشـتگیریی نەتـەوەیی پڕبکەنـەوە. ئـەوە لەرۆژانی بەرایی میرنشینەکاندابوون کە داستانی نەتـەوەیی "مـەمو زیـن" لەلایـەن ئەحمەدی خانیەوە (لەساڵی ١٦٩٣-٩٤)دا نووسرا: یەکەمین سەرچاوە کە تێدا نەتەوەی کورد جیا لەفارسو عەرەبو تورك پێشاندرا.[178] میرەکان دەبوو لەرووبەڕووبوونـەوەی ئێرانییە شیعەکاندا لەسەر بنەمای مەزهەبی جەماوەرەکەی خۆیان تەیارکەن، بـەڵام لەبەرامبـەر عوسمانییـەکان سـوودیان لـەجیاوازی ئیتنیـی وەردەگـرت، هەرچـەندە، هەریەك لـەو میرانـە تـەنیا بایـەخیان بـە قەڵەمڕەوەکـەی خۆیـان دەداو لەبەرامبـەر پارچـــەکانی دیکـــەی کوردســـتاندا بایـــەخێکی ئـــەوتۆیان پێشـــان نـــەدەدا، هەستی"نەتەوەیی" لەخەڵکانێکدا قەتیسکرابوو کە لەڕووی جیۆگرافییەوە سنووردار بـوون، ئـەوەی لەلایـەن حەسـەنپورەوە مشـتومڕی لـەبارەوەکراوە، کـە "نەتەوایـەتی دەرەبەگایەتی" لێنـراوە، ئەمـە لـەو دیـاردە جیـاوازە هاوچـەرخە نەتەوایـەتی چینی ناوەڕاست جیاوازە کەلەسەدەی بیستەمدا پشکوتووە.[179]

تەنانـەت ئەگـەر ئـەوەی دواییـان لەکارەکتـەردا ئایدیۆلۆجییـەکی یەکلاکـەرەوەی هاوچەرخ بێت، هێشتا دابەشبوونێکی گرنگ سەبارەت بە ریشەو سروشتی نەتەوەکـە دەمێنێتـەوە. هیـۆ سـیتۆن واتسـۆن جیاکـاری کـردووە لـەنێوان "نەتـەوە کۆنـە بەردەوامـەکان"و ئـەو نەتـەوە نوێیانـەی بـەهۆی هۆشـیارییەوە خولقـاون، ئـەوەی لەلایەن چارلس تیلی یەوە بـە "نەتـەوە بـەدیزاین"- ئـەو جیاکارییـەی هاوکـات بـوو لەگەڵ دەرکـەوتنی ئایـدیۆلۆجیای سیاسـی نەتەوایـەتی.[180] نەتـەوەی کـورد دەتوانرێـت لەگــەڵ پێناســەکەی ســیتۆن-واتســۆندا پێناســەبکرێت کــە "نەتــەوە کۆنــە

178 Hassanpour (1992), P. 56.
179 Ibid. pp. 56-57
180 Seton-Watson (1977), pp. 6-13 and introductory chapter in Tilly (1975) (`Reflections on the history of European State-making', pp. 3-83).

بەردەوامەکانە"کە پێش کۆتایی سەدەی هەژدەیەم بەباشی هەبوون، ئەو کاتەی ئایدیۆلۆجیاو جووڵانەوە نەتەوەییەکان کەوتنە شکلگرتن‌و نەتەوە "دیزاینکراو) ە کەی خۆیان تۆکمەکرد، لەم چوارچێوە هەرێمییەدا لەوێنەیەکی بچووککراوەی نەتەوەی عێراقیدا دەردەکەوێت ( ئەوەی هەروەها لە سەدەی بیستەمدا پێکهات). هەرچەندە، سیتۆن-واتسۆن جیاکاریی لەنێوان نەتەوە کۆن‌و نوێکان لەچوارچێوە ئەوروپییەکەیدا کردووە، بۆچوونەکەی بەسەر نەتەوەی کوردیشدا جێبەجێدەبێت، ئەوەی بەشێوەیەکی وردە وردە لەماوەی چەندین سەدەدا گەشەیکردووە. لەپەیوەست بەتێبینی مێژووناسانەوە لەم پەرەگرافە وەرگیراوەی خوارەوە ڕووندەبێتەوە :

" پرۆسەی پێکهاتنی شوناسی نەتەوەیی‌و هۆشیاری نەتەوەیی لەنێو نەتەوە کۆنەکاندا هێواش‌و ئاڵۆز بووە. شتێکی ڕەمەکی بووەو بەئارەزووو ویستی کەس نەبووە، وێڕای بوونی ڕووداوگەلێکی زۆر، کە لەهێندێك حاڵەتدا بەڕوونی پرۆسەکە خێراتر بووە."[181]

لەڕاستییدا، کاتێك کەیسێکی بەچەشنی ئەوەکەی کوردان لێکدەدەینەوە، زەحمەتە بەتەواوی باوەش بە تێڕوانیینە هاوچەرخەکاندا بکەین کە دەڵێت نەتەوەکان کۆن نین، دیدێکی وا کە کەمتر بەسەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا جێبەجێدەبن تاکو ئەوروپا، لەوێ کە دەوترێت نەتەوە هاوچەرخەکان لەسەدەی هەژدەیەمەوە بەرەوسەر سەریانهەڵداوە. بەلەبەرچاوگرتنی بەڵگەو ئارگیومێنتەکانی سمس،[182] هەموو گەلانێکی خۆ بەنەتەوەزانی وەك کورد نە داهێنراون‌و نە ئەفرێنراون. نەتەوەی کورد نەتەوەیەکی دروستکراو نین‌و دەشتوانرێت وەك (نەتەوایەتی رابردووخواز) ئاماژە بۆ ئایدیۆلۆجییە نەتەوەییەکەی بکرێت. لەوەش زیاتر، سوودوەرگرتن لە بەردەوامییەکەی (هەڵهێنجانی نەتەوە هاوچەرخەکان لەپەیوەندییە ئیتنییە ڕەسەنەکان) هەروەها ڕێبازی ئیتنۆ-سیمبولیکی بۆ نەتەوەکان، ڕوونبۆتەوە کە لەپرۆسەی فۆرمەڵبوونی هۆشیارییانەی نەتەوەی کوردو نەتەوایەتییەکەیدا،

181 Ibid. II 8.
182 As reasoned in The Ethnic Origins of Nations (1986) as well as a previous work: The Ethnic Revival, (1981), Cambridge: Cambridge University Press.

خەسڵەتە ئیتنیکییەکان هۆکارگەلی بەرچاوبوونو هەروەها لەرووی مێژوویشەوە کەوتۆتە پێش تێکۆشانەکانی نەتەوەسازییەزییەوە.[183] ئەم ڕێبازە بەردەوامییە بۆ شرۆڤەکاری نەتەوایەتی کوردیی زیاتر لەگەڵ ڕۆمانتیزمی ئەڵمانیدا دێتەوە تاکو رۆشنگەری فرەنسی، لەکاتێکدا نەتەوەی کوردو خەڵکەکەی هێزی بزۆزی پشت ئەفراندنی دەوڵەتەکەی دەبن، نەك بەپێچەوانەوە.

جۆن ئارمسترۆنگ، لەمشتومڕکردن لەبارەی ئەوەی کە چەمکەکانی "ئیتنیك"و "نەتەوە" پێکەوەگرێدراوییەك پێکدەهێنن، جەخت لەو خاڵە دەکاتەوە کە بێ لەبەرچاوگرتنی شکڵە گۆڕاوەکانیان، ئەوانە وێناو هەستێکی دەستەجەمعین کە بەدرێژایی کات بەردەوامن.[184] ئەمە تێگەیشتنێکی گرنگی قووڵەو شرۆڤەکاریی سمس سەبارەت بەو بابەتە بەهەند وەردەگرێت. پێدەچێت ئەم ئیتنۆگەرایی‌و نەتەوەبوونە بەردەوامە بەباشی بەسەر پشکوتن‌و پەرەسەندنی نەتەوەی کورددا جێبەجێبێت. لەراستییدا، "کۆمەڵگایەکی وێناکراو" لە کوردان، هەروەك ڤان بروینسن مشتومڕی لەبارەوە کردووە" ئیتنیکی بەباشی ناسێنراوی کوردیی بۆماوەی چەندین سەدەیە بوونی هەیە، هەرچەندە، لەوانەیە ناساندنەکەی لەوەکەی ئێستاکە کەمتر گشتگیرترو میللیتر بێت." [185]

ناناوەندگەرایی، لەڕووی ئابووری‌و کارگێڕی‌و کەلتوورییەوە، کە تایبەتمەندی بوونی ئۆتۆنۆمی میرنشینە کوردییەکان بوون لەسایەی عوسمانییەکاندا، ڕێگەی بە پێکهاتن‌و هەروەها هاندانی پەرەسەندنی هۆشیاریی کۆمەڵایەتی سەبارەت بە کوردیبوونی میرنشینەکان دەدا. هەرچەندە، بژاردەی فەرمانڕەوا لەمیرنشینەکاندا لەوانەیە سەبارەت بە ئیتنیکی کوردیی بەئاگابووبن، ئەوەش روون نییە داخۆ ئەو مەسەلەیە لەنێو ڕەشەخەڵکەکەشدا بەشێوەیەکی یەکسان‌و بەهێز هەستیپێکراوە .

گیڵنەر دانی بە بوونی کەلتوورەکان (زۆرجار تێدەپەڕن‌و بەنێویەکدادەچن)و هەروەها قەوارەگەلە سیاسییەکانی هەموو فۆرم‌و ڕەهەندە ماقووڵەکاندا ناوە، بەڵام

183 Armstrong (1982), p. 5.
184 Van Bruinessen (1992b), p. 48.
185 Gellner (1983a), p. 49.

جەختی لەوە کردۆتەوە کە ئەو دووان بەگشتی یەکناگرنەوە. لەدانپێدانانی ئەمەدا، نەتەوەی کورد، هەڵبەتە لە "شێوە سەرەتاییەکەیدا"، لەدەورانی میرنشینەکانەوە هەبووە مانای وەلانانی ئایدیاکەی گیڵنەرە کە بنەما نەتەوەییەکان بەرجەستەی ئاگابوونەوەی نەتەوەکان سەبارەت بە خودهۆشیارییان دەکات، هەروەها بەهەمان شێوە هەر دەرکەوتنێکی ئایدیۆلۆجی هاوچەرخی نەتەوایەتی کوردیی داهێنانی نەتەوەی کورد دەگەیەنێت.

ئاکاری نەتەوەیی کوردیی بەڕوونی لەگەڵ تیۆرەکەی نەتەوایەتی گیڵنەردا نەگونجاوە، کە شرۆڤەکارییە مێژووییەکەی وەسفێکی نموونەیی پشکوتنی نەتەوایەتی لە ئەوروپای بەپیشەسازیکراودا دەکات. لەناوچەیەکی بەرفراوانی ناپیشەسازییدا زەحمەتە بتوانین بەپێی تیۆرەکەی گیڵنەر لێکدانەوە بۆ دەرەکەوتنی نەتەوایەتی بکەین. بەڵکو پێویستە بەتیۆرەکانی هاوشێوەی ئەوەکەی هانس کۆهن، بندکت ئەندەرسۆنو هەروەها ئەنتۆنی گیدنز تەواوبکرێت، ئەوانەی بایەخیان بە رەهەندەگەلە سایکۆلۆجییەکە داوە.

جەختکردنەوە لە رۆڵی یەکلاکەرەوەی بەپیشەسازیبوون لە گشەکردنی نەتەوەکانو نەتەوایەتییدا هەروەك گیڵنەر کردوویەتی، بەوەش سەبارەت بەکارکردنە سەر نەتەوایەتی کوردیی شکست دەخوات. جەختکردنەوە لە رەوشگەلی ئابووری-کۆمەڵایەتی وای لەتیۆرەکەی کردووە هێزی شوناسی ئیتنیکیو تۆکمەیی رەگەزە کەلتوورییەکانی بەکەم بگرێت. هەرچەندە، تیۆرەکەی لەو خاڵەدا دێتەوە کە چۆن هۆکارەکانی مۆدێرنیزە بوونەتە هۆی بەئاگابوونەوەی بونیادە کۆمەڵایەتییە نەریتییەکان، کە شوێنێك دەبەخشێتە گەشەکردنی نەتەوەو شوناسی نەتەوەیی. نکۆڵی لەوەی کە نەتەوەی کورد زادەی گەشەکردنی سەردەمی مۆدێرن بێت لەناوچەیەکی تەکنەلۆجیو ئابوورییدا بێت مانای تووڕدانی سیماکانی دیکەی تیۆرەکەی گیڵنەر ناگەیەنێت. بۆ نموونە، ئەو خواستە بەرفراوانە بەرەو نەتەوایەتی کوردیی، لەوانەیە بەباشی لەو مشتومڕەی گیڵنەرەوە سەرچاوەی گرتبێت سەبارەت بە جوڵە کۆمەڵایەتیو ئابوورییەکان بەهۆی کۆچکردنی هێزی کارەوە هاتەئارا،

بەڵام بیری نەتەوەیی لەلایەن هەمان ئەم هێزانەوە نەهێنرا.

بۆ شرۆڤەکاری نەتەوایەتی کوردیی، لێکدانەوەکەی ئەنتۆنی سمس سەبارەت بە گواستنەوە لە ئیتنییەوە بۆ نەتەوە لەرێگەی تەیارکردنی خەڵکەوە فرە بە کەیسە کوردییەکەوە پەیوەستە. زێدەبوونی کارێگەریی دەوڵەت وەك هێزێکی سیاسی هەڵسوڕا کە دانیشتووانە پاسیڤەکەی پێشووی چالاكو بەسیاسییکرد. ئەمە بەشێوەیەکی پێویست مانای ئەوە نییە کە جووڵانەوەکە بۆ خۆی-لەوانە ئەکتەرو ئامانجەکانی- لەبنەڕەتدا نەتەوەییە. گرنگ ئەوەیە کە ململانێ بەسیاسییکراوەکە (واتە نفوزی زێدەی دەوڵەت)و هەروەها چالاکی بەرگرییکارانە لەشێوەی جیاوازی جووڵانەوەی نەتەوەیی لەدەوری ئەم ململانێیەدا بەشێوەیەکی بەرچاو ئاسانکاریی بۆ گواستنەوەی کورد لەکۆمەڵگایەکی ئیتنیکی بۆ نەتەوەیەك. وێڕای ئەوەی، ئەوە تەنیا ململانێی نێوان فەرمانداروو فەرمانبارەکان لەنێو دەوڵەتەکەدا نەبوو، بەڵکو ململانێی لەنێو خودی کۆمەڵگە ئیتنییەکەش، کە ململانێیەکی نێوخۆییە. هەروەك نەتەوەییەکان جەختدەکەنەوە کە سنووری سیاسییەکان پێویستە لەگەڵ سنوورە کەلتوورییەکاندا هاوجووت بێت، لەکاتێکدا کە سەرکردە سیاسییەکانی جووڵانەوەیەکی ئیتنیی داوای هاوشێوە پێشکەشدەکات، دەتوانرێت بوترێت کە جووڵانەوەکە بۆ جووڵانەوەیەکی نەتەوەیی گواستراوەتەوە. بەوەش ئەم پرۆسەیە بەشێوەیەکی مەزن بەهۆی چالاکییە سەرکوتکارییەکانی دەوڵەتەوە زەمینەی بۆ خۆشکراوە.

نەتەوایەتی کلاسیکی ئەورووپی، هەروەك لەلایەن زۆر لە کۆڵەرانەوە مشتومڕی لەبارەوە کراوە، بەهۆی مۆدێرنەوە هاتۆتەئارا، هەروەها لەگەڵ پشکووتنی کۆمەڵگای مەدەنیو دیموکراسیدا گەشەیکردووە. نەتەوایەتی کوردیی لەگەڵ ئەم گەشەکردنەدا پێچەوانەیەو پێی خۆی لەسەر ئەو سەرکوتکارییە چەقاندووە کە دەوڵەت لەدژی کۆمەڵگای مەدەنی لەناوچە کوردییەکاندا ئەنجامیدەدات. عەباسی وەلی ئەمەی ناوناوە " دیالێکتیکی نکۆڵییکردنو بەرگریی" (بەلەبەرچاوگرتنی نکۆڵیکردنی فەرمی شوناسی کوردیی لەسەپاندنی شوناسی نەتەوەیی جیاوازو بەرگریی کوردیی دژی ئەم سیاسەتە)، ئەوەی بونیادە سیاسییەکەو کارەکتەری نەتەوایەتی کوردیی

پێناسەدەکات.[186]

وەك کۆمەڵگایـەکی نەتـەوەیی، کـە هـەر لەسـەرەتاوە چـالاکانە رێگـەی لـێگیراوە کـە قەناعـەت بـەخولیاکانی بکرێت، نەتەوایـەتی کـوردیی دەکەوێتـە ئـەو پلەبەندییـەی لەلایـەن سـیتۆن-واتسـۆنەوە بـەناوی "نەتەوایـەتی نـاڕازیی" نـاوبراوە.[187] هـەر چارەسەرێك پێشکەشکرابێت بۆ رازییکردنی خولیا کوردییەکان، لەشێوەی فیدراڵیزم، نوێنەرایەتییـەکی رێـژەیی‌و هـەروەها ئۆتۆنـۆمی لـەوەدا شکسـتی هێنـاوە وەڵام بـە پێویستییەکانیان بداتەوە. زۆربەی کات هەستی بەربڵاو لەنێو سەرکردایەتی ئەوەیـە کە بەغدا تەنیا هەوڵی کات دەستخستن دەدات لەرێگەی پێشنیازکردنی هەریەك لـەو کاروهەنگاوانەی سەرەوە، پەسەندکردنی ئەوانە بەشێوەیەکی بەرچاو رەوشی کوردان چـاك ناکـات. چـاوەڕوانی‌و ئارەزووەکـانی نەتەوایـەتی نـاڕازیی ئەوەیـە کـە رۆژێـك سـەربەخۆیی سیاسـی بـۆ خەڵکەکـەی بێنێتـەدی. هـەروەك سـیتۆن-واتسـۆن ئامـاژەی بـۆکردووە، ئـەوە ناڕەزایەتییـە لەناوەنـد کـە لێکدانـەوە بـۆ بوژانـەوەی جووڵانـەوە نەتەوەییەکانی دەکات لەئەوروپای رۆژئاوادا، گەوهەری هـەمان ئـەو ناڕەزایەتییانـەی کە لەلایەن کوردانەوە بۆ حکومەتی ناوەندیەوە دەربڕراوە.

بەپێی تێبینییەك کە ئەنجامگیری کراوە، ئەوە گرنگە کە وێڕای نەبوونی یـەکێتی – میرنشینە (نیمچە) سەربەخۆ کوردییەکان هەرگیز چالاکانە کاریان بـۆ تۆکمـەکردنی نەتەوەی کورد نەداوە- دەسەڵاتی بێگانـە بەشـێوەیەکی سـەرکەوتووانە بـۆ ماوەیـەکی زۆر دوورخراوەتــەوە. هەرچــەندە، دوای دابەشــکردنی کوردســتان لــە ســاڵی ١٩١٨دا، کوردان لەسایەی حوکمی راستەوخۆی دەوڵەتـە ناوەندگەراکانـدا دابەزێنرانـە پێگـەی نەتـەوەی بێدەوڵـەت، کـەبووە هـۆی ناڕەزایەتییـەکی زۆرو رێحـەزە نەتەوەییـەکانی زێـدەترکرد. هەریـەك لـە نەتەوایـەتی دەرەبەگایـەتی‌و نەتەوایـەتی هاوچـەرخی کوردیی هێندێك فۆرمی باڵایان لە ستاتۆیەکی سیاسی سەروەریی پێشانداوە. ئـەوەی پێشـوویان لەمیرنشـینە کوردییەکانـدا دەردەکـەوێت کـە بۆمـاوەی چـەندین سـەدە

186 Vali (1998), 'The nation-state and its "other": Kurdish national identity and the politics of denial and exclusion in Turkey', paper presented at the Kurdological Conference Between Imagination & Denial. Kurds as subjects and objects of political and social processes, May 29- 31, Berlin.
187 Seton-Watson (1971).

لەپێگەیـەکی نیمچـە سـەربەخۆییدا پایـەداربوو، لەکاتێکـدا نەتەوایـەتی کـوردیی هاوچەرخ لە ئەزموونێکی ١٢ مانگی کۆمارەکەی مەهاباددا بەرجەستەبوو.

لەکاتێکدا کە رۆحی نەتەوایەتی هیچ نیشانەیەکی هێوربوونـەوەو داکشـانی تەنانـەت لـەلای نەتـەوە چـاك دامـەزراوەکانیش پێشـان نـەداوە، ئـەوەی کەلەسـەر بنـەما رۆژانەییەکان تێبینیکراوە، بەردەوامی گەشەکردن لـەنێو نەتـەوە سـەرکوتکراوەکاندا چەسپاوترە. ئەمە کـە "بیلیـنگ" نـاوی " نەتەوایـەتی ئاسایی" شوناسـی خەڵکەکـە بەنەتـەوە تۆکمـە دەکـات، چ لەسـەر ئاسـتی هۆشـیاریی یـاخود ناهۆشـیاریی. لـەکاتی قەیرانەکاندا بەئاسانی دەگوازرێتەوە بۆ "hot nationalism / نەتەوایـەتی گـەرم یـان تونـد"، ئـەوەی دەتوانێـت پشـتگیری بانگەشـەیەك بێـت کەلەلایـەن سیاسـیەکانەوە بـۆ هەڵگیرسـاندنی جـەنگێکی نـوێ دەکرێت یـاخود هانـدانی سـەرکردایەتی کەمینەیـەکی سـەرکوتکراو بۆئـەوەی چـەك بەدژی دەوڵەت هەڵگرێت. [188] مرۆ لەسەر ئـەم بنەمایـە دەتوانێـت ئـەنجامگیری بکـات کە نەتەوایەتی کوردیی، کە رەوشەگەلەکە وایلێکردووە "توند"تر بێت تـا "ئاسـایی" (هەرچەندە لەوانەیـە ئەمـە بـەهۆی گۆڕانـەوە بووبێـت) بەدڵنیاییـەوە بەزینـدوویی دەمێنێتەوەو لە پێکهێنانی هۆشیاربوونەوەی نەتەوەیی خەڵکی کورد.

بـەقامك خسـتنەر سـەر رووخسارە زیانبەخشـەکانی نەتەوایـەتی کـوردیی، پێویسـتە رووە باشەکەشی ئاماژەی پـێ بـدرێت، ئەگـەر بـەکورتیش بێـت، دەشـێت نەتەوایـەتی ئاسـایش بـۆ ئـەو خەڵکـە زامنبکـات کـە لـەخاکی خۆیـان ریشەکێشـکراون، لەکاتـە دژوارەکاندا پێوەی پابەنـد بـن. ئـەوە شـتێکە کـە بـڕوای پـێ بکرێـتو ئینتیمـای بـۆ هەبێت. بۆ ئەو کوردانەی (کەبڕوا وایە ژمارەیان زۆر بێت) کـە هەسـت بـە هەڕەشـە دەکـەن بـەهۆی کاریگـەریی بـەهێزی دراوسـێکانیانەوە، نەتەوایەتییەکـەیان وەك هێزێکی ئەرێیی راژە دەکات،

188 Billig (1995), pp. 43-49.

## ٥ . ٥ . ٣ ریزبەندی نەتەوایەتی کوردیی

هەروەك ئاشكرابوو بەهۆی ئەو مشتومڕە گشتییەی سەبارەت بە ڕێبازی نەتەوایەتی كرا، كە نەتەوایەتی بەشێوەیەكی ئاسایی وەك وەڵامدەرێك بە كۆمەڵێك هەلومەرج دەردەكەوێت. لەو سۆنگەیەشەوە كە هەلومەرجەكان بەبەردەوامی لەسیاسەتی كوردیدا گۆڕاوە، نەتەوایەتی كوردیی تایبەتمەندی چەند جۆرێك لەو نەتەوایەتییانەی وەرگرتووە كە لەباسی دووەمدا هاتووە. لەكاتێكدا جۆرە جیاوازەكانی نەتەوایەتی كە لێكدراونەتەوە بەتەواوی جۆری جیاواز نین، دەتوانرێت چەندین جۆر لەلایەن جووڵانەوە نەتەوەییەكانەوە پێشانبدرێت، لەهەمان كاتدا یاخود بەشێوەیەكی یەك بەدوای یەك، هەروەك لەكەیسە كوردییەكەدا دەردەكەوێت. (شرۆڤەكاریەكەی خوارەوە ڕەنگدانەوەی ئەو ریزبەندییە كە پێشتر كراوە، لەڕووی نەزمی دەركەوتنی جۆرە جیاوازەكانی نەتەوایەتییەوە كە دانراون.)

بەدڵنیاییەوە نەتەوایەتی كوردیی یەكێك نییە لە نەتەوایەتی دەوڵەت. ئەو نموونە بەراییەی ئینگلتەراو فەرەنسا كە لەماوەیەكی درێژدا بەئاراستەی دەوڵەت-نەتەوە گەشەیكردووە، هەروەها كوردیش وەك گەلێكی خۆ بە نەتەوەزان نەیتوانیوە بگاتە ئاستی نەتەوەی خاوەن دەوڵەت. ئەوە نكۆڵی لێنەكراوە كە لەگەوهەردا ژمارەیەكی زۆر لەدانیشتووان هەیە كە لەڕووی كەلتوورییەوە هاوشێوەن، بەڵام لەجیاتی ئەوەی ئەم ڕەگەزە هەڵكشێت كەچی بەتێپەڕینی كات داكشاوە، ئەویش زیاتر بەهۆی دابەشكردنی كوردستان بووە. سیمایەكی گرنگی نموونە بەراییەكانی دەوڵەت- نەتەوە بریتییە لەو نەتەوایەتییەی كە وەفاداریی سیاسیی بنەڕەتییە، لەكاتێكدا لەكوردستان، هێشتا وەفادارییە خێڵەكییەو ئاینییە-كۆمەڵایەتییەكان دەسەڵاتی باڵایان هەیە. هەرچەندە كوردان پێكهاتەی گەوهەری كوردستان پێكدەهێنن، بەڵام ئەوە بەشێوەیەكی ئۆتۆماتیكی مانای ئەوە نییە كە دەوڵەتێكی كوردیی كەمتر كراوەیە بۆ ڕاپەڕینو ناڕەزایەتی ركابەرە بیانییەكان، بەوەش نموونە بەراییەكەی دەوڵەت-نەتەوەی فەرەنسیو هەروەها نەتەوایەتی دەوڵەت بۆ دیمەنە سیاسییە كوردییەكە گونجاو نییە.

کارەکتـەری ئایـدیۆلۆجی نەتـەوەیی کـوردیی بەشـێوەیەکی مـەزن لـەماوەی سـەدەی رابـردوودا گـۆڕاوە، ئـەو پەرەسـەندنەی لـەوەدا خـۆی بینییـەوە کـە چـەند جۆرێـك لەنەتەوایەتی بگرێتەخۆ، کە لەوانەشـە لەئاینـدەدا جـۆری زیـاتری تێـدا بپشکوێت. سیمای وێناکراوی ئایندە بریتییە لە نەتەوایـەتی یـەکگرتووخواز ئەگـەر جوولانـەوە نەتەوەییـە کوردییـە جیاوازەکـان بنکـەکانی خۆیـان بـەرفراوان بکـەن، ئەمـە ئـەو پرسەیە کە لە باسی داهاتوودا دەچینەوەی سەری.

لەگەڕانەوە بۆ رابردوو، کاتێك کوردان لەڕووی سیاسییەوە بێداربوونـەوە، بـڕوا وایـە کە یـەکێك لەدەربڕینـە بەراییـەکانی نەتـەوەیی بریتیبێـت لـە جیابوونـەوە، ئـەوەی کـــەدەتوانرێت لەبنەڕەتـــدا درك بکرێـــت وەك جوولانـــەوەی جیاخوازانـــە دژی ئیمپراتۆری عوسمانی (هەروەك زۆر لە نەتەوایەتییەکانی بالکانو هەروەها ئەوانـەی عەرەبو ئەرمەنییەکان). زۆر بەگشتی، کاتێك هێندێك فـۆرمی نەتەوایـەتی کـوردیی پێی لەسەر ئەو بنەمایە داگـرت کـە کـوردان دەبێـت دەوڵـەتێکی کـوردیی پێکبهێـنن، ئەوەی مانای هەڵوەشاندنەوەی ئەو دەوڵەتە خاوەن سەروەرییانەن کە هەن بۆئـەوەی ئایدۆلۆجییەکــە ســەرکەوتووبێت. بــەوەش کــوردان دەگلێنــە نێــو نەتەوایــەتی جیاخوازەوە.

لـەرۆحی زۆر لـە کۆلۆنییـەکانی پێشـوو لەئـەفریقاو ئاسـیا کـە دژی داگیرکـارە ئەوروپییـەکانیان راپـەڕین، جوولانـەوەی نەتـەوەیی کـوردیی، یـان بەشـێکی، باسـیان لەکوردسـتان کـردووە وەك خـاکێکی داگیرکـراو لەلایـەن عـەرەبو تـورکو فارسـەوە، ئـەوەیان پێشـانداوە کـە دەبێـت کـورد بـاوەش بـە نەتەوایـەتی رزگـارییخواز یـان سەربەستیخوازدا بکات، ئەو چەشنە  نەتەوایەتییە جەخت لەوە دەکاتەوە کە پێگەی کوردستان لەحاست هەرێمە ناوەندییەکانی عێراقدا وەك کۆلۆنییەك وایەو گرانە بێ مـەرج پەسـەندبکرێت. کـوردە نەتەوەییـە رادیکاڵـەکان بانگەشـەی ئـەوە دەکـەن کـە دەســەلاتی بــەردەوامی ســەرکردایەتی خێڵــەکی لەپەیوەندیانــدا بەدەوڵەتــەوە بەرجەستەی دیاردەیەکی کۆلۆنیالی دەکات. بژاردەی خێڵەکیی بـەوە تۆمـەتبارکراون " کـە هاوکارییـان بۆتـەهۆی بـەردەوامبوونی ئیسـتیغلالکردنی کۆلۆنیـالی کوردسـتان

لەلایەن بۆرجوازی تورك و عەرەب و فارسەوە."[189] دیدێکی یەکجار ساکارە، بەڵام هێشتا لەگەڵ هاوشێوەیی دیاریکراودا لەگەڵ چالاکییە کۆلۆنیالییەکانی پێشوو لەئەفریقاو ئاسیادا. "کۆلۆنیالیزمی نێوخۆیی" بەغدا لەنووسینەکانی میشاڵ هیچەردا نموونەکەی دەبینرێتەوە. تیۆرەکەی بە ئاماژەکردن بە رەوشی وابەستەی بونیادیی، دەڵێت کە لەگەڵ هاتنی مۆدێرنەدا، پێدەچێت هەرێمە ناوەندییەکان بووبنە هەرێمی زاڵ، لەکاتێکدا ئەو نایەکسانییەی لەلایەن ئەو پەرەسەندنە نوێیانەوە هاتونەتەئارا ناوچە کەنارییەکانیان هێناوەتە ئاستێکی نزمتر. ئەمەش بێزاری دژی ناوەندو پەرەسەندنی رێچەزێکی نەتەوەییانەی لێکەوتۆتەوە، ئەگەر ئەو هەرێمانە لەکارەکتەریاندا نەتەوەیی بووبن. لەتیۆرەکەی هیچەردا، ئینگلیزەکان ناوەندیان پێکدەهێنا، لەکاتێکدا هەرێمە کەنارە نەتەوەییەکە بریتیبوو لە سکۆتلاند، والاس و ئێرلەندای باکوور.[190] ئەمە دەتوانرێت بەئاسانییەکی رێژەییەوە وەربگرێت بۆ ناوچە سونییە عەرەبییە ناوەندییەکەی عێراق وەك "coloniser' /داگیرکار" و کوردانیش وەك "colonised / داگیرکراو."

هەرچەندە، جووڵانەوەی کوردیی، لەبنەڕەتدا لە جووڵانەوە نەتەوایەتییە رزگارییخوازەکانی ئەفریقای سالانی ١٩٥٠کان و ١٩٦٠کان جیاوازە، لەوەدا کە ئەفریقییەکان پێویستیان بەوەبوو خۆیان وەك نەتەوەیەك دابهێننەوە بۆئەوەی کۆتی کۆلۆنیالیزم لەخۆیان دامالن. کوردستان بەشێوە نەریتییەکەی ملی بۆ داگیرکاریی کەچ نەکردبوو، بەڵام وێڕای ئەوەش هێشتا رەگەزێکی نەتەوایەتی رزگارییخواز هەبوو هێندەی کە هاتنی دەوڵەت-نەتەوە وەك کۆتێکی فەرمانڕەوایەتی بیانی لەقەڵەمدەدرا هەموو ئەوەش مانای بێبەشی کۆمەڵایەتی و مەعنەوی بۆ نەتەوەی کورد. لەوەش زیاتر، نەتەوایەتی دژە کۆلۆنیالی رزگارییخوازی ئەفریقی بەشێوەیەکی سەرەکی خەباتی دژ بە خودی دەوڵەت-نەتەوە نەبوو، بەڵکو زیاتر

189 Van Bruinessen (1992a), p. 45.
190 Michael Hechter (1975), Internal Colonialism. The Celtic Fringe in British National Development, 1536-1966, London: Routledge & Kegan Paul.

خەباتی بۆ یەکسانیی، داپەروەریی، مافەکانی مرۆڤ، کەرامەت، پەرەپێدان‌و ئازادیی دەکرد لەبەرامبەر خۆسەپێنی زاڵدا، ئەو بابەتانەی هەروەها لەدەربڕینە نەتەوەییەکانی کورددا بەرچاون. هەرچەندە، نەتەوایەتی کوردیی، تەنیا لەسەر بنەمای نارەزایەتی ملکەچبوون دژی دەسەڵاتی بێگانە رانەوەستاوە، بەڵکو زیاتر لە خواستی داماڵینی داگیرکاریی فارس‌و تورك‌و عەرەب هەیە کە کوردە نەتەوەییەکانی یەکخستووە. هەستە نەتەوەییەکانی نێو کوردان ئەوە پێشاندەدەن کە نەتەوایەتییەکەیان بەئاشکرا پێش هەر دەوڵەتێك کەوتووە کەپێدەچێت دایانبمەزراندایە،[191] لەکاتێکدا نەتەوەی کورد نزیکەی دامەزراوەی رەگەزەکانی ئاین، زمان‌و کەلتووری هاوبەشی هەیە.

هەروەك کەیسەکەی نەتەوایەتییەکانی ئەفریقی‌و ئاسیایی‌و ئەمریکیی وابەستە بە ئەوروپا، کە " بەهێزی هێزەکانی مێترۆپۆڵ لانیکەم گرنگن بۆ پشتگیریی جووڵانەوە یان جووڵانەوەکانی نەتەوەیی لەدیاریکردنی چارەنووسی کۆلۆنییەك،"[192] پێدەچێت نەتەوایەتی کوردیی رزگارییخواز تارادەیەکی زۆر سەرکەوتن‌و شکستەکەی قەرزاری بەهێزبوونی دەسەڵاتە "کۆلۆنیاڵ"ەکانی عێراقی‌و ئێرانی‌و تورکی بێت. کوردان لە پێناسەکردنی خۆیاندا وەك نەتەوایەتییەکی سەرکوتکراو هێرشدەکەنە سەر ئیمپریالیزمی عەرەب – سیاسەتی بەغدا سەبارەت بەدرێژکردنەوەی دەسەڵات‌و نفوزی خۆی نەك زیاتر لەرێگەی پەیوەندییە سیاسییەکان هێندەی لەرێگەی هێزی سەربازیی لەسەراسەری کوردستانی ناوەندییدا. هەرچەندە، هەوڵێکی بەو چەشنەی جووڵانەوەی نەتەوەیی کوردیی بۆ رزگاریی کوردستان بەراوردکارییەکی کەم یان هەر هیچ بەراوردێکی نییە لەگەڵ هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆرییە مەزنە ئەوروپییەکاندا لەساڵانی ١٩٥٠کان‌و ١٩٦٠کاندا، ئەوەی کە تارادەیەکی زۆر یان کەم هەڵوەشانەوەیەکی خۆبەخشانەبوو. هەروەها مرۆ ناتوانێت خەباتی نەتەوایەتی

---

١٩١ هەستێگەلێك لەلای بەشێکی بەرفراوانی کوردان دیارە کەبەشێوەیەکی فەرمی‌و نافەرمی راوێژیان پێکراوە، تەنانەت لای زۆربەی ئەوانەش کە کاری سیاسی ناکەن، لەناوەوەو لە دەرەوەی نیشتیمانەکەیان.

192 Orridge (1981), p. 48.

کوردیی بخاتە تای تەرازووەوە لەگەڵ نەتەوەییە ئەفریقییەکانی خاوەن عەقڵی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم کە لەنێو خەڵکدا هانی هەستی خۆبەدوورگرتنی هاوبەشیان لەحوکمڕانە سپیپێستەکانیان دەدا، زیاتر لە هەستی گەڕانەوە بۆ ریشەیەکی هاوبەش، هەرچەندە، پاشماوەی ئەم جۆرە نەتەوایەتییە رزگارییخوازییە هەیە تائەوکاتەی لاوازییەکی بەرچاو لەهەستێك هەیە سەبارەت بە یەکێتی نێوخۆ لە نەتەوایەتی کوردییدا لەنێوەندی هەستێکی بەهێزی بێزاریو دوژمنایەتی لەحاست فەرمانڕەوا بیانییەکان. لەو هەستەدا، کوردستانێکی سەربەخۆی پێش-داگیرگەیی لەوانەیە رووبەڕووی گرفتە توندەکانی یەکێتی نێوخۆیی ببێتەوە، هەروەك زۆر لە داگیرگە وابەستەکانی پێشتری ئەورووپی. وێڕای ئەوەش، وادەردەکەوێت کە ئارگیومێنتی سەرەکی لیبراڵ سەبارەت بە ئازادیو هەروەها داوای ساکارانە سەبارەت بەحکومەتێکی نوێنەرایەتی زیاتر ئارگیومینتێکی نەتەوەیی بێت بۆ خەڵکی کوردستانی لەمێژەوە سەرکوتکراو.

دوای پێکهاتنی دەوڵەت-نەتەوەی مۆدێرن لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، پرۆسەی تواندنەوەو گرتنەخۆی تورکیو ئێرانیو عەرەبی دەستیان بەسەر بەشێکی بەرچاوی کوردانـدا گرت، کاتێك ئیتنۆ-نەتەوایەتی لەسالانی ١٩٧٠کانـدا وەك دیاردەیەکی مۆدێرن سەریهەڵدا، ئەو دیاردەیە هەروەها کوردانیشی گرتەوە، لەئاکامی ئەوەی کە "کارە سەرکوتکارییەکان ئاراستەی دەربڕینەکانی هەستی نەتەوایەتی کوردیی کرابوو (لەلایەن حکومەتی ناوەندییەوە) ئەوەش زیاتر کاریگەریی بەهێزکەری هەبوو تاکو نەهێشتنی."[١٩٣] بەوەش دروستە بوترێت کە نەتەوایەتی کوردیی بەدڵنیاییەوە رەگەزگەلێکی "atavistic behaviour / ئاکاری پێشینەیی" هەیە، کە یەکێکە لەنیشانەکانی نەتەوایەتی ئیتنیی. نەتەوەییە کوردەکان نەناسراو نین کە پشت بە ئاکاری پێشینەکانیان لەرابردووی دووردا ببەستن، کە زۆربەی جار جەنگاوەرێکی خێڵەکییە. هەروەك زێدە ئاشکراتر لەکەیسەکەی کوردانـدا بینراوە زیاتر لە زۆربەی نەتەوایەتییەکی دیکە، ئیتنیکی هاوبەش بەتەنیا هاوبەستەگی کۆمەڵایەتی ناخولقێنێت، ئەو راستییەی پێدەچێت هانی نەتەوەییە ئیتنیکیستەکان بدات هەوڵی

193 van Bruinessen (1998), p. 39

بەدیهێنانو تۆکمەکردنی یەکێتی لەڕێگەی هێزەوە لەبری پەسەندکردنی گەوهەری نەتەوایەتی ئیتنیکی. گرانی چارەسەرکردنی ئەو گرفتانەی لەگەڵ ئیتنۆ-نەتەوایەتی کوردیدا سەریانهەڵداوە (هەروەك تەواوی نەتەوایەتییە ئیتنیکییەکان) رەنگدانەوەی سروشتی ئاڵۆزی شوناسی فرەرەنگی کوردانە، و دواتر مشتومڕی لەبارەوە دەکرێت.

بۆئەوەی کوردانی باکووری عێراق سەربەخۆیی بەدەستبێنن، پێویستە نەتەوایەتی کوردیی تایبەتمەندی نەتەوایەتی مەدەنی بگرێتەخۆ، بۆئەوەی سەرکەوتووانە شوێنی کەمینە ئیتنیکیو زمانییەکان لەنێوخۆیدا بکاتەوەو بیانکاتە بەشداربووی بڕوا سیاسییە نەتەوەییەکە. بنیاتنانو تۆکمەکردنی دیموکراتییەکی بنەڕەتی، پێویستە حکومەت رێگەی بەوەبدات سەروەریی لەخەڵکەوە سەرچاوەبگرێت، -ئەوەی هێزی سەرەکی نەتەوایەتی مەدەنییە. ئەمەش سەرلەنوێ خەباتی سەرەکی جووڵانەوەی کوردیی فۆرمەڵە دەکاتەوە، بۆئەوەی ئەو بیرۆکەی پێشوو فراوانبکات کە پێیوابوو نەتەوەی (کوردیی) دەبێت تەنیاماڵی کوردان بێت، بەشێوەیەك ئەوانەش بگرێتەخۆ، کە بەگوێرەی نەتەوەخوازە بەجۆشەکان، کەمی پێویستییە یەکلاکەرەوەکانیان هەیە. بەوتەیەکی دیکە، پێویستە "رێگرێك نەبێت بۆ ئینتیما). ١٩٤

دوای ئەوەی کوردە نەتەوەییە خاوەن عەقڵییەتە لیبراڵە سەربەخۆکان پێدەچێت خوازیاربن سیما کەموێنەکانی نەتەوایەتییەکەیان بگوازنەوە، هەروەك لیبرالیزم دەخوازێت پێویستە مرۆڤ لە مافە جیهانییەکان بەهرەمەندبێت. کوردان دەبێ لە پێکهاتنو پابەندبوون بەنەتەوایەتییەکی مەدەنییەوە سەرکەوتووبن، دەبێ ببنە نموونە لەناوچەکە. لەبری ئەوەی لەسەر ئەو گریمانەیە هەڵسوڕێن کە شوناسی تاکە کوردەکان بەشێوەیەکی تایبەت بەهۆی ئەندامێتی نەتەوەییانەوە پێناسەدەکرێت هەروەها کەسایەتییان بەتەواوی لەنێو ئەو نەتەوەیە نغرۆ بکرێت- هەروەك لەلایەن لێکدانەوە ئەندامییەکانی / "organic nterpretations of nationalism

194 Fine (1999), p. 150.

نەتەوایەتی"یەوە[195] دەکرێت – کۆکردنەوەی تایبەتمەندی کەلتووری کوردیی‌و خەبات بۆ سەربەخۆیی شەخسیی هەرتاکێك دەبێت دەتوانرێت هەوڵی بۆ بدرێت.

وێڕای ئەوەی کوردان لەوشوێنەدا کە تێیدا نیشتەجێن زۆرینە پێکدەهێنن، بەڵام لەو دەوڵەتانەی تێیدان دەبێت بە کەمینە لەقەڵەم بدرێن، ئەو ڕەوشەی کاریگەریی لەسەر نەتەوایەتی کوردیی هەبووە کە هێندێك تایبەتمەندی جووڵانەوەیەکی نەتەوایەتی کەمینە بگرێتەخۆ. بەدرێژایی مێژووی پڕ توندوتیژیی کوردستان، بەرگری بەکۆمەڵ لە نیشتیمان بابەتێکی سەرەکی ململانێی‌و خەباتە، کە ڕەنگدانەوەی سیمای کلاسیکی سیاسەتی ناوەندگەراییە. لەڕاستییدا، خەبات لەپێناوی خاك بەسەر پەیوەندییەکانی نێوان حکومەتی ناوەندیی‌و جووڵانەوەی کوردییدا زاڵ بووە.[196]

ئەزموونی مێژوویان سەبارەت بە نەهامەتی‌و سەرکوتکردنیان لەلایەن دەوڵەت خاوەن دەسەڵاتەکانەوە زیاتر ڕەگەزێکی ناوەندیی لەدەربڕینە نەتەوەییە کوردییەکاندا پێکدەهێنێت، هەروەها میراتی کەلتووریی ناوازەی گەلی کورد لەلایەن کوردە نەتەوەییەکانەوە بەرگریی لێدەکرێت‌و بڵاودەکرێتەوە. کوردانی عێراق مێژوویەکیان هەیە لەبەرگری دژی گەشەکردنە ناوەندییەکان‌و سەرکەوتووانە لەحاست هەوڵی زۆری گرێدانی دەوڵەتدا خۆڕاگریان کردووە. بەشدارییکردن لەدەسەڵات لە سیستەمی سیاسی ناوەندی هاندەرێك بووە بۆ گرێدانی ناوچە کوردییەکان بە دەزگای دەوڵەتی عێراقەوە، بەڵام فۆرمولەیەکی بەم چەشنەی بەشداریی دەسەڵات هێشتا (ساڵی ٢٠٠٢/و) نەهاتۆتەدی.

تێگەیشتن‌و درککردن لەنێو دانیشتووانی کورددا سەبارەت بەوەی هەرێمەکەیان بەشێوەیەکی سیستماتیك لەلایەن حکومەتە یەك بەدوایەکەکانەوە لەبەغدا ئیستغلال دەکرێت‌و دادەدۆشرێت (هەڵاواردنی بونیادی، هەروەك ویلیەم ناوی ناوە) لەلایەن کوردە نەتەوەییەکانەوە هاندراوە، بۆ ئەوەش خەڵکیان بەلای ئەو باوەڕەدا کەمەندکێشکردووە کە ئایندەیان بەشێوەیەکی نادیاریکراو گەشەسەندو

---

195 Tamir (1993), p. 79.

١٩٦ بۆنموونە، پرسی کەرکوك لە ڕێکەوتننامەی نابەردەوامی ئازاری ١٩٧٠دا.

سەرکەوتووانەتر دەبێت ئەگەر سەربەخۆیی بەدەستبێنن. ئەوان مشتومڕ دەکەن[١٩٧] و دەڵێن، ئەمە وەختێك روودەدات کە پەرەسەندنو گەشەکردنی ئەرێیی لەنێو خودی نەتەوەوە بێنرێتەئارا، ئەو رەوشەی ئێستا راستبکەنەوە کە لەدەرەوەی نەتەوەوە نکۆڵی لێدەکرێت.

لەگەڵ ئەو گۆڕانە دیمۆگرافییانەی کە لەئاکامی راگواستنی زۆرەملێی دانیشتووان‌دا بەسەر باکووری عێراق هاتوون، کوردان چەندین هۆکاریان هەیە تاکو بترسن‌و لەبەرامبەر ئەو راگواستنەی بەغدا هانیدەدات بەرگری بکەن. رێحەزی وەستانەوە بەڕووی نیشتەجێبوونی "بیانی" لەکوردستان‌دا، کەبەشێوەیەکی پێچەوانە کاری کردۆتە سەر زۆرینەی کوردان لە ناوچە بەرهەمهێنە نەوتییەکان‌دا، بەڵگەیەکە بۆئەوەی نەتەوایەتی کوردیی رووخسارگەلێکی نەتەوایەتی کەمینەی گرتۆتەخۆ، ئەوە بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەرێگەی راگواستنی هاوشێوەی دانیشتووانەوە بوو کە کوردان ترسی ئەوەیان لێنیشت هەژموونی خۆجێیی خۆیان لەدەستبدەن، نزیکەی بەهۆی ئەو قازانجە ستراتیژییەی بەعسییەکان بەدەستیانهێنابوو کەمکرایەوە، ئەوەی بە بنیاتنانی چەند وێستگەیەکی بەکارهێنانی هێزی ناوکی سەربازی لەچەند شوێنێکی ناوجەرگی کوردستان‌دا بەرجەستەبوو.[١٩٨]

کوردان بەدرێژایی چەندین ساڵە نارەزایەتی خۆیان بەباشی بەرجەستە کردووەو لەبەر تیشکی ئەو کەلتوورە خودییە توندوتیژە بەردەوامە کە باڵی بەسەر عێراق‌دا کێشاوە، لەسایەی ئەو خولیای سەدام نەخشەی بۆ کێشاوە، پێدەچێت خولیا نەتەوەییەکانی کورد وەك ئەوەی لەنارەزایەتیی توندوتیژی ئیتنیی کەمینەدا بەرجەستەبووە مەحاڵ بێت تاکو سەربەخۆی تەواو نەیەتەدی.

هەروەك لەسەرەوە باسکراوە، رۆشنبیرانی کورد دیسکۆرسێکی مێژوویان بنیاتناوەتەوە، بۆئەوەی بەشێوەیەکی گەورە کوردان بگێڕنەوە سەر پێگەی دروستو

١٩٧ بیرۆکەیەك کە لەوتووێژێکدا لەگەڵ چالاکێکی سیاسی کوردی عێراقی لەسنەی کوردستانی ئێران (کە نەیوست ناوی بێت) لەبەرواری ١٩ی مارتی ٢٠٠١بەروونی دەردەکەوێت، مشتومڕی سەبارەت بە حەتمیەتی درێژخایەنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی کرد لەئاکامی ئەم رێکخستنە ئۆتۆنۆمییەی ئێستاوە.

198 Kenneth R. Timmerman, (1992), The Death Lobby: How the West armed Iraq, London: Fourth Estate Limited

راستەڕێی مێژووی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بەڵام زۆر لەوانەیە وەك هەولێكیش بێت بۆ رونكردنەوەی ئەو نایەكسانییە كەبەهۆی ستەمێكی مێژوویی سەرەكییەوە هاتۆتەئارا. جووڵانەوەی نەتەوەیی كورد لەعێراق بەبەردەوامی رەوایەتی سیاسی رژێمی لەبەغدا خستۆتە ژێر پرسیارەوە، هەروەها وەك زۆربەی كەمینە نەتەوەییەكانی دیكە، تێكۆشانی سیاسی بەدژی دەوڵەت ئەنجامداوە بەو هیوایەی بەشداریی لە بنەمایەكی نوێی رەوایەتیدا بكات كە تێیدا یاریزانێكی سەرەكیی بن.

نەتەوایەتی كەمینە دیاردەیەكی شرۆڤەكاری ساكار نییە. لەچوارچێوەی كۆلۆنیالیزمدا، بۆ نموونە، نەتەوایەتی بەتەواوی چەمكێكی نائالۆزە (بەدابەشكردنی جیهان بۆ داگیركارو داگیرگە)، بەڵام لەكۆمەڵگەی كەمینەدا ئالۆزتر دەبێت، كاتێك ئاماژە بە شوناسی كەلتووریو هەروەها ناوازەبوون دەدات، ئەوەی زۆرجار بەهۆی ئەو جیاكارییە زمانییانە بەهێز دەبێت كە دانیشتووانەكە یەكدەخاتو دەبێتە ئیلهامبەخشی جووڵانەوەیەكی نەتەوەیی.

لەكاتێكدا نەتەوایەتی كوردیی لەگەڵ زۆربەی ئەو ریزبەندییە نەتەوایەتییانەدا هاوجووتە كە پێشتر دانراوە، دەبێت وەك "سوپەر ئایدۆلۆجیی" یەك ببینرێت.[199] لەگەڵ توانایەكی گەوهەریی بۆ تەیاركردنی دانیشتووان، تواناییەك كە نابێت بەكەم بگیرێت. هەرچەندە، بۆئەوەی لەجیهانی پۆست مۆدێرنەدا سەركەوتوو بێت، پێویستە مامەڵە لەگەڵ هێندێك پرسی وەك :" چۆن نیشتیمانخوازی مەدەنی لەگەڵ كۆسمۆپۆلیتانیزم، و شانازییكردنی نەتەوەیی لەگەڵ رێزگرتنی نەتەوەكانی دیكە، و ئینتیمای نەتەوەیی لەگەڵ مافو ئازادییەكانی تاكدا كۆبكاتەوە."[200] ئەو ئاستەنگەی تێپەڕاندنی زەحمەتە، بریتییە لە سروشتی مللانێكەرو پێكدژی نەتەوایەتی كوردیی.

ئاستەنگێكی دیكەی بەردەم نەتەوایەتی كوردیی، كە لێرەدا پێویستە ئاماژەی بۆ بكرێت بریتییە لە نەتەوایەتیە هەرێمییەكان، هەروەها چۆن خولیا كوردییەكان لەسیستمێكی هەرێمیدا جێگیر دەكرێت بێ هەراسانكردنی دراوسێ بەهێزەكان. ئەمە

199 Concept borrowed from Tagil (1995b), p. 24.
200 Fine (1999), p. 149.

لەباسی داهاتوودا باس دەكرێت.

## باسی شەشەم: كوردستانی عێراق لەسەر شانۆی هەرێمیی

### ٦ . ١ هاوكاریو ركابەری لەسەر شانۆی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست

لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتێكی نوێدا، كارو هەڵسوڕانی دەوڵەتەكانی دیكە، بەتایبەت دەوڵەتــە دراوســێكان، بگــرە زلهێزەكــانی جیهــانیش، گرنگــی مــەزنیان لەســەر پەرەســەندنەكەیدا دەبێـت. لەبەرچـاوگرتنی دینامیكییـەتی پەیوەندییـەكان لـەكاتی هەڵســەنگاندنی كوردســتانی عێــراق (هــەروەك لــە شــێوەی ١. ٧ : دینامیكییــەتی پەیوەندییــەكان لەســەر كوردســتانی عێــراق، بەپێكەوەبەســتنی هــەردوو وڵاتــانی هــەرێمیو جیهــانی) فــرە بایەخــدارە بــۆ تێگەیشــتنی ئاكامــە بەرفراوانــەكانی دامەزرانــدنی قەوارەیــەكی نیمچــە-ســەربەخۆی سیاســی كــوردیی لەهەرێمەكــەدا. هەروەها بەردەوام ئەو كەیسەی كە دابەشـبوونی سـنوورەكانی (سیاسـیو كـەلتووری) نـاوەكی لـە دەرەكـی جیادەكاتـەوە، تەمومژاوییـە. ناوچـەی خودحـوكمڕانی بـاكووری عێراق بەشێوەیەكی دیاریكراو نەتەوە وەك دەوڵەت نییە، بەڵام لەو كاتەوەی خـودی

**هــەمان بیرۆکــەی قەوارەیــەکی ئۆتۆنــۆمی کــوردیی لەکوردســتانی عێــراق لەلایــەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە درك کرابوو، کاریگەری لەلایەن دەوڵەتە دراوسێکانەوە پڕ بــوو لــە مەبەســتو دژواری. لەناوچــەیەکی نــاجێگیری وەك رۆژهــەڵاتی ناوەڕاســتدا، ئاسایشی دەوڵەتێك بەشێوەیەکی کرداری بەهۆی پێناسەکردنی نائاسایشی دەوڵەتێکی دیکــەوە پێناســەدەکرێت، ئــەوەی کاتێــك بــۆ دەوڵەتــە هەرێمییــەکان لێکبدرێتــەوە بەشێوەیەکە ئاسایشی ئــەوان دەبێتــە نائاسایشی کــوردان. لــەوەش زیــاتر، نائاسایشی ململانێــی دەســەڵات بەرهەمــدێنێت، کــە دەگمــەن نییــە جــەنگی لــێ نەکەوێتــەوە.[201] دەوڵەتانی هەرێمی بۆئەوەی ئاسایشی خۆیان زامنکەن ناچارن ئەوە پەسەندبکەن کە بــاکووری عێــراق ببێتــە پــنتی ناوەنــدی زۆر لــە خولیــاو بایەخــە ســەرەکییەکانیان، ئەوەی سیاسەتگەلێکی هێناوەتەئارا کە ئەم باسە هەوڵی شرۆڤەکاری دەدات.**

**بــۆ هێنــدێك شــرۆڤەکاران، ئــەو شــەڕەی ســاڵانی ۱۹۹۰کــانی نێــوان پــارتیو یــەکێتی لەبنەڕەتدا دەبێت وەك ململانێیەکی خێڵەکی لۆمــەبکرێت. کارەکتــەری جــەنگاوەری رەســەنی کــورد بەشــێوەیەکی دیــار لەلایــەن خــودی کوردانــەوە بەباشــی جــەختی لێکراوەتــەوە (بەتایبــەت لــەماوەی پێکــدادانی چوارســاڵەکەی ســاڵانی ۱۹۹۰کــان بەرجەستەبووە)، بەڵام بەبێ هاندانو ورووژاندنی لەلایەن دەوڵەتانی دراوسێوە ئــەم ململانێیە پێدەچوو کورترو کەمتر توند بووایە.**

**تیــۆری کلاسیکی هاوســەنگی هێــز، کــە جــەخت لــە پێویستی مامەڵــەکردنی دەوڵــەت دەکاتەوە لەگەڵ هەڕەشە دەرەکییەکان کە لە دەوڵــەتانی دیکــەوە دێــن[202]، بــەس نییــە کاتێــك لــەئاکاری دەوڵــەتانی هــەرێمیو سیاســەتەکانیان لەحاســت بــاکووری عێــراق دەپێچینەوە. تەنیا ئەوە پێویست نییە بۆ هاوسەنگی لەبەرامبەر دەوڵــەتان رێگــە لــە**

---

201For a relevant discussion on this, see Buzan, (1983), People, States and Fear: The National Security Problem in International Relations, Brighton: Wheatsheaf.

202 See Kenneth Waltz's Theory of International Politics (1979), Reading, Mass.: Addison- Wesley.

سەرهەڵدانی خولیای ناکۆك (واقیعی یان پۆتێنسالی زاڵ) بگیرێت، بەڵکو هەروەها بۆ زامنکردنی ژیانو مانەوەی خودی دەوڵەت پێویست بە هێورکردنەوەی کەسو گروپەکان دەکات لەژینگە سیاسییە خۆجێیەکەدا. بۆ رەوشگەلێکی بەم چەشنە، هاوسەنگی بایەخی یەکسانی هەیە لە ئاستی خۆجێیو هەروەها سیاسەتی نێودەوڵەتییدا، تیۆرەکەی ستیڤن داڤید لەبارەی "Omnibalancing/ هاوسەنگی گشتگیر" گونجاوە. هاوسەنگی گشتگیر پێشنیازی ئەوە دەکات کە "لەوە زیاترە تەنیا هاوسەنگی بێت لەبەرامبەر هەرەشەکان یاخود هێزو سەرکردەکانی دەوڵەتان...بە وەستان لەریزی نەیارو دوژمنە لاوەکییەکان بۆ ئەوەی سەرچاوەکانیان لەسەر دوژمنە سەرەکییەکان چڕبکەنەوە"، بەوتەیەکی دیکە، " سەرکردایەتییەکی هەرەشەلێکراو دەبێت ریزبەندی لەگەڵ هەرەشەیەکدا بکات بۆ وەستان لەبەر هەرەشەکانی دیکە."[٢٠٣] ئەمە پێدەچێت بەشێوەیەکی گونجاو لەبەرچاوگرتنی بایەخی دەوڵەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست روونبکاتەوە.

ئەو هاوسەنگییەی لەلایەن سوریاو تورکیاو ئێرانەوە لەساڵانی ١٩٩٠کاندا هێنرایە ئارا بەوردی خاڵی هاوسەنگی گشتگیر روونمدەکاتەوە. ئەو دەوڵەتانە جگەلە هەرەشەی کوردیی، مەسەلەیەکی کەمی هاوبەش پێکەوەیان کۆدەکاتەوە: ئەوەی لەباکووری عێراقەوە سەرچاوەدەگرێت بەڵام بەهۆی رەگەزی نێوخۆیی کوردییەوە لەهەریەك لەو دەوڵەتانەوە تۆکمەدەکرێت. ئەم جۆرە ئاکاری هاوسەنگییە لەلایەن تیۆری هاوسەنگی هێزەوە لەبەرچاونەگیراوە. سروشتی هەرەشەی ئاڵۆزو فرەڕوو مانای ئەوەی کاتی رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ گورزە هەرەشەیەك لەچەند سەرچاوەیەکەوە، " هەرەشە کەمەکە دەبێت هێوربکرێتەوە لەپێناو بەرگریکردن لە هەرەشە سەرەکییەکە."[٢٠٤] بەوەش، هاوسەنگی گشتگیر دەتوانێت هاوسەنگەرییەکەی بارزانی لەگەڵ سەدام لەساڵی ١٩٩٦دا لێکبداتەوە — ئەوەی کەیسی رازیکردنی

203 David (1991), p. 235.
204 Ibid. p. 245.

دوژمنایەتییـە لاوەکییەکـە پێشاندەدات( لەوێـدا یـەکێتی نیشـتیمانی شـوێنی بەغـدا وەك دوژمنە سەرەکییەکە دەگرێتـەوە) لەکاتێکـدا هـەر لێکدانەوەیـەکی ئایـدیۆلۆجی بۆ کارەکەی پێدەچێت چەسپاوو بڕواپێکەر نەبێت.

## ٦ . ١ . ١ هاوکاری ئێران و تورکیا و سوریا

"یك شتر در خانه همه میخابد"[٢٠٥]

لەپاش ڕووداوەکانی دوای جـەنگی کوێـت لەسـاڵی ١٩٩١دا، سیاسـەتێکی گشـتی کـوردیی لەئێران‌و سوریاو عێراقدا زاڵبـوو، ئـەوەی تـەواوی مەبەسـت‌و ئامـانجی بریتیبـوو لـە ڕێگرتن لەکوردان تاکو لەسـەر شـانۆی هـەرێمی پێـی خۆیـان بچەسـپێنن. هەڵوێسـتی نابنیاتی ئەو دەوڵەتانە پاش ئەوە بەهێزبوو کە خەڵکی کورد بۆ یەکـەمجار لـەمایۆی ١٩٩٢دا هەڵبـــژاردنێکی گشـــتیان ئەنجامـــداو ئەنجومـــەنێکیان پێکهێنـــا، جگـــە لـــە حکومـەتێکی هـەرێمی بـۆ بـەڕێوەبردنی کاروبـاری هەرێمـە ئۆتۆنۆمەکـە. لـەپاش هەڵبژاردنـە پارلەمانییەکـە، ڕووداوەکـان لـەباکووری عێـراق بـە گومـانێکی زۆرو نارەحەتییەوە چاودێریی دەکرا، بەشێوەیەك جارێکیان ڕەفسەنجانی سەرۆك کۆمـاری ئێران ڕایگەیاند نابێـت چـاو لـەو هەڵبژاردنانـە بپۆشـرێت ئەگـەر بێتـو ببێتـە هـۆی هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی عێراق. [٢٠٦]

ئەنکەرەو سوریاش دوای تـاران کـەوتن لەپێشـاندانی ناڕەزایـەتی دژی هـەرکارێك کـە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی لەباکووری عێراق لێبکەوێتەوە. کاتێـك ڕووبەڕووی ئەگەری دانپێدانانی نێودەوڵەتی بۆ خولیاکانی کـورد بوونـەوە، دەوڵەتـە

---

٢٠٥ حوشترێك لەبەردەرکی ماڵی هەر کەسێکدا خەوتووە– میتافۆرێکی تـەواوە ئـەو شـێوازە وەسـفدەکات کـە کێشەی کوردی پێ دەرکدەکرێت لەلایەن وڵاتانێکەوە کە کوردیان گرتۆتەخۆ.

206 Tehran Times, 17-18 May 1992 (author unknown).

**هەرێمییەکان ئاشکرایانکرد کە ئەوان تائەوپەڕی دەڕۆن تاکو لەوە دڵنیابن کە سنووره نێودەوڵەتییەکان سازشی لەسەر نەکرێت.**

**وێڕای ئامانجی روونی راگەیەندراوی کوردان بەوەی لەچوارچێوەی پێکهاتەی عێراقدا هەڵدەسوڕێن،[٢٠٧] تورکیاو ئێرانو سوریا سڵەمینەوە لەوەی کە ئەوان وەك ئەگەری دامەزراندنی دەوڵەتێکی خاوەن سەروەریی کوردیی لەباکووری عێراق دەبیینن، هەروەها درکیان بەوەکرد کە ئەو پەرەسەندنە هەڕەشەیەکە بۆسەر ئاسایشی نەتەوەییان. وێڕای ناکۆکی مێژوویی‌و بەرژەوەندییە پێکدژەکانی ئەم وڵاتانە، پەرەسەندنەکان لە باکووری عێراق هێندە بەبایەخ بوو کە وایکرد لەرێگەی هاوپەیمانییەکی هەرێمییەوە چاودێری هەوڵە کوردییەکان بۆ دەوڵەتسازی بکرێت. لە هاوڕیزییەکی نائاساییدا، وەزیرانی دەرەوەی تورکی‌و ئێرانی‌و سوری کۆبوونەوە، پرۆتۆکۆڵێکی ئاسایشیان بڵاوکردەوە، کە دەڵێت ئەوان لەدژی خۆبەڕێوەربردنی کوردیی لەباکووری عێراق هاوکاری دەکەن.[٢٠٨] ئەم چەشنە هاوکارییە هەرێمییە شتێك بوو کەهەمیشە کوردان لێی دەترسان،و هەمیشەش ئەگەری روودانی هەبوو. وەك وێناکردنی کاروهەڵسوڕانێکی ئاسایشی دروست، هەوڵێك بۆ دامەزراندنی هاوکارییەکی هەرێمی هاتەئاراو دانیشتن‌و کۆبوونەوەی سێقۆڵی وەزیرانی دەرەوەی ئێران‌و تورکیاو سوریا لەسەرەتای ١٩٩٠کاندا هەر شەش مانگ جارێك دەکرا، کە لەوکاتەدا لەلایەن وەزیری دەرەوەی ئێرانەوە عەلی ئەکبەر ولایەتییەوە**

---

٢٠٧ هەرچەندە زۆربەی تایبەتمەندییە پێویستەییەکانی دەوڵەتی تێدایەو کۆنترۆڵی تەواویشی هەیە بەسەر سنوورەکانیدا (هەروەها لەبەرئەوەی دەتوانرێت ناوی pseudo state / ساختە دەوڵەتی لێبنرێت، کوردستانی ئازاد بەپێچەوانەی چیچان‌و سۆماڵ‌و کۆمارە تورکییەکەی باکووری قوبرس سەروەری خۆی رانەگەیاندووەو پێدەچێت بەجدیی هاندەرێکی بۆکردنی ئەمە نەبێت. بۆ مشتومڕێکی تایبەت بە ساختە دەوڵەت بڕوانە:

Kolossov, Vladimir and O'Loughlin, John (1999), 'Pseudo-States as Harbingers of a New Geopolitics: The Example of the Trans-Dniester Moldovan Republic (TMR)' in Newman, David Boundaries, Territory and Postmodernity, Frank Cass: London, pp. 151-176.

208 Pope, H. MEI, No 438, 20 November 1992.

**دەستیپێکرد. لەگەڵ یەکەمین پرۆتۆکۆڵی ئاسایشی کە لەنۆڤەمبەری ١٩٩٣دا لەئەنکەرە مۆرکرا،[٢٠٩] شوێنی ئەم کۆبوونەوانە لەنێوان ئەنکەرە/ئەستەمبوڵ، دیمەشقو تاراندا جێگۆڕکێی پێدەکراو مەسەلەی ئەگەری هەڵوەشانەوەی عێراقیان وەك خەمێکی هاوبەش تاوتوێدەکرد.•**

**ئێران هاندەری ئەم جۆرە گفتوگۆیانە بوو، بەڵام زێدە هەستی بە بێئومێدی دەکرد کاتێك وەك ناوبژیوان لەنێوان تورکیاو سوریادا خۆی دەبینییەوە، ئەو دووانەی کە لەسەر مەسەلەی ئاو کێشەیان بوو، وێڕای کێشەی پەکەکە (کەلەلایەن ئەوەی دواییانەوە پشتگیری دەکرا). ئێران هەوڵی دەدا ناکۆکییەکانی تورکیا-سوریا تێپەڕێنێت، بەڵام پرسی باکووری عێراق بە بەردەوامی دەخرایە پشتەوە، دواجار ئێرانییەکان هەستیانکرد کە هەوڵەکانیان ناتوانێت هاوکارییەکی هەرێمی سەبارەت بەو پرسە بێنێتەدی.[٢١٠]**

**تێنو تاوی هاوپەیمانییەکە لەکاتی هەڵگیرساندنی شەڕی نێوخۆی نێوان پارتیو**

---

209. Olson (2001), p. 16.

• ئەگەرچی هەریەك لەدەوڵەتی ئێرانو تورکیا سەرەتا لەترسی شەپۆلی پەنابەرانو تێکچوونی ئاسایشو ئارامی نێوخۆی وڵاتەکانیانو ناچەکە رۆڵێکی ئەرینیان لەهاندانی رۆژئاوا هەبوو بۆ دەرکردنی بڕیاری ٦٨٨، بەڵام لەدوای شکستی دانوسانی کوردو بەغداو بەستنی کۆنگرەی سەلاحەدینو دەرکەوتنی ئاسۆی دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستانو کارکردن بۆ گۆڕینی رژێمی بەغداو هێنانەئارای حکومەتێکی دیموکراتی فیدراڵی، وڵاتانی هاوسێ سڵەمینەوەو کەوتنەخۆ بۆ گرتنەبەری رێگەی هاوبەش بۆ دژایەتی ئەم پرۆسەیە. کۆبوونەوە سێ قۆڵییەکانی (ئێران، تورکیاو سوریا) لەناوەڕاستی مانگی نۆڤەمبەری ١٩٩٢–٢٣ی ئوتی ١٩٩٤ پێنج کۆبوونەوەی گرتەخۆ، خاڵە سەرەکییەکانی رێکەوتنەکان: پێداگرتن لەسەر یەکپارچەیی خاكو بەرهەڵستیکردنی دابەشبوونی عێراقو رەتکردنەوەی فیدراڵی، رێگرتن لەپەرەسەندنی هەرێمی کوردستان بەرەو قەوارەیەکی نەتەوەیی تۆکمە، رەتکردنەوەی گۆڕینی نەخشەی سیاسی ناوچەکەو گۆڕینی سنووری ناوچەییەکان بەهۆی پرسی کوردەوە، بەکارنەهێنانی کارتی کوردی لەلایەن هەریەك لەو دەوڵەتانەوەدژ بەوی تر، هەماهەنگی ئاڵوگۆڕی زانیاریو دژایەتیکردنی پەکەکە. لەراستیدا، نزیکبوونەوەی پەیوەندییەکانی تورکیاو ئیسرائیل لەلایەكو ناکۆکی توندی نێوان تورکیاو سوریا لەلایەکی دیکە، بەریەککەوتنی بەرژەوەندیی ئەو سێ هێزە ناوچەییە لەهەرێمەکەو پەیوەندی لابەلایان لەگەڵ پارتە کوردییەکان زەمینەی ئەو کۆبوونەوە سێ قۆڵییانەو هەماهەنگی نێوانیانی لاوازکرد.

210 As explained by Dr. Jawad-e Zarif, Tehran, 2000

یەکێتی تووشی لاوازی بوو، هەروەها لەساڵی ١٩٩٥ەوە ئیدی دانیشتنی سێ قۆڵی دیکە نەبەسترا. تورکیا بۆ حاڵەتێکی سیاسی تەمومژاوی پاشەکشەی کرد، لەکاتێکدا تورکیاو ئێران خەریکی ئەوەبوون دووبەدوو پێکەوە گفتوگۆ لەو مەسەلەیە بکەن لەنێو هاوکاری زێدەیان بۆ لایەنە دژبە یەکەیەکانی جەنگی نێوخۆی کوردستان، لەململانێیەکی بەردەوامیشدا سەبارەت بەکێشانی هێڵی بواری نفوزیان لەناوچەکەدا.

## ٦ . ١ . ٢ کێبڕکێی هەرێمی لەپێناو بەدەستهێنانی نفوز لە "کوردستانی ئازاد" دا

وڵاتانی دراوسێ لەپێناو بەدەستهێنانی نفوز لەباکووری عێراق (بەتایبەتی هێزە هەرێمییە سەرەکییەکان:ئێران و تورکیا) بەشێوەیەکی بەرچاو لەو پشێوییەدا بەشداربوون کە لەناوەڕاستی ساڵانی ١٩٩٠کانەوە ناوچەکەی گرتەوە. بەرژەوەندی سەرەکی هەریەك لەو وڵاتانە لەکوردستانی عێراق بۆ ئەو دڵەڕاوکێیەیان دەگەڕێتەوە سەبارەت بەوەی دانیشتووانە کوردەکەی خۆیان بکەونە ژێر کاریگەریی ئەو پەرەسەندنانەی لەودیوی سنوور روودەدەن.

بۆهەر رژێمێك، تاڕادەیەکی زیاتر یان کەمتر درککردن بە "جووت هەڕەشە" لە دوژمنکارییەکی دەرەکی لەهێزێکی هەژموونگەراوە بەرجەستە دەبێت، بەلاّم هەروەها لە یاخیبوونێکی نێوخۆییەوە کەلە بنەمایەکی نەتەوەیی شۆڕشگێڕانەوە سەرچاوە دەگرێت. دەشێت هەڕەشە کوردییەکە لەهەردوو ڕووە درك بکرێت: دەوڵەتێکی سەربەرخۆی کوردیی لەباکووری عێراق دەتوانێت هەڕەشەیەکی دەرەکیی بێت بۆ سەرخاکی ئێرانو تورکیا. هەروەها لەوانەیە ئەو سیناریۆیەش هەبێت کە کوردانی ئێرانیو تورکیی لەچاوەڕێی براکوردەکانی باشوور/رۆژهەلاّتیان نەوەستن، بەڵکو شۆڕشێکی نێوخۆیی هەڵگیرسێنن تاکو داوای سەروەری کوردستانی ئێران و تورکیا بکەن. بەوەش، پەرەسەندنەکانی باکووری عێراق، کیشەی کورد، لەوانەیە هەڕەشەیەکی دەرەکی بێنن هەروەها گرفتێکی نێوخۆییش بۆ تورکیاو ئێران

بەشێوەیەکی سەرەکیی پێکبهێنێت.

بـۆ وڵاتـانی هەرێمەکـە، عێراقێکـی یـەکگرتوو وەك پرسـێکی دانوسانلەسـەرنەکراو دەمێنێتـەوە، لەکاتێکـدا ئاکامـەکانی لابردنـی رژێمەکـەی سـەدام حسـێن لەدەسـەڵات لەوانەیــە ڕووداوێکــی دڵخۆشــکەرنەبێت کــە رامــانی لــەبارەوە بکرێــت، هــەروەها جەختکردنـەوەی بـەردەوام لەپێویسـتی رێزگـرتنو پاراسـتنی یـەکێتی خـاکی عێـراق دەکرایــەوە. ترسـی گـەورەی تورکیـا لـەوەدا بەرجەسـتەدەبوو کـە ئەگـەر عێـراق هەڵبوەشێتەوە کوردان دواکانی خۆیان سەبارەت بە سەربەخۆیی بەرنـەپێش، ئـەوەی بۆ دەوڵەتی سوریای هاوسێش دەبێتـە ئـەوەی بەحکومەتگـەلێکی لایـەنگری ئـەمریکا دەورەبـدرێت. دەوڵـەتی سـعودیەی عـەرەبی وەهـابیش لەوانەیـە نیگـەرانی ئـەوەی هەبێت کە عێراقی باشووری شیعە لەلایەن ئێرانەوە قوتبدرێت،[211] لەکاتێکدا ئـەوەی دواییـان لەوەدەترسا رژێمێکـی نـوی لەبەغـداد بێتەسـەرکار کـە هاوپـەیمانی تونـدی لەگەڵ واشنگتۆندا هەبێت.

لەماوەی کۆبوونەوە سێقۆڵییە هەرێمییەکانی ساڵانی ١٩٩٢و ١٩٩٣دا، نارەزایەتییـەکانی INC ئــای ئــێن ســی ( کــۆنگرەی نیشــتیمانی عێراقــی-ئۆپۆزســیۆنێکی عێراقــی هاوبەستە تارادەیەکی مـاقووڵ لەوکاتـەدا) هـەروەها بیسـترا، لـەنێو خواسـتگەلێك بـۆ دامەزرانـــدنی حکومـــەتێکی دیمـــوکراتی لەبەغـــدا. وەزیرەکـــانی دەرەوە تێکرایـــان بێزاربوون لەو ناجێگیرییەی کە درکیان دەکرد خەریکە باڵ بەسەر باکووری عێراقدا دەکێشـێت، نیگەرانییــەك کــە گریمانــەی ئــەوەبوو رەنگدانــەوەی بایــەخیان بێــت سەبارەت بەئەزموونی کوردستانی عێراق کە سەرکەوتنی بچەسپێتو ئاکامەکانیشی بەســەر دەوڵەتــەکانی خۆیانــدا بشــکێتەوە. هەرچــەندە، پشــێوی، بەشــێوەیەکی

---

٢١١ وێڕای ئاراسـتەی گشـتی سیاسـەتی دەرەوەی ئێران، کارمەنـدانێکی دیـاریکراوی ئێرانـی هـانی هێنـدێك لەگروپی شیعەی عێراقییان دەدا کەلەئێران نیشتەجێبوون تاکو کاربکەن بۆ جیاکردنەوەی باشـووری شـیعی لـە دەوڵەتی عێراق ، بەو مەبەستەی ناوچەکە بکەنە پارێزراوێکی ئێرانی، ناوچەیەکی ئـارام بـۆ عەرەبـە شـیعەکان، هاوشێوەی ئەوەی لەباکوورە کوردییەکەی وڵات دامەزرابوو. بۆ نموونە بڕوانە:
Eamad Mazouri, 'The Viability of an Independent Kurdish State', www.KurdishMedia.corn, June 26 2001.

ناڕاستەوخۆ لەلایەن هەمان ئەو حکومەتانەوە بڵاودەکرایەوە کە وەزیرەکانی دەرەوەیان داوای وەستانی ئەو پشێوییەکان دەکرد. بۆ نموونە، پەکەکە بەپشتگیری دیمەشق ورد ورده خۆی لە ناوچە هەرەباکوورەکانی هەرێمە ئۆتۆنۆمەکەدا دامەزراند، ئاکامی ئەوەش بۆ کوردستانە ئازادە دیموکراتە ساواکە دژوارو پڕپشێوی بوو. لەوەش زیاتر، ئەگەر شوێنگرتنەوەی رژێم لەبەغدا بەواقیعی هەوڵی بۆ بدرێت، هەروەها ترس لەوەی کە دێت واینەکرد ئەو ویستە زاڵ بێت کە سەدام لەتەختەکەی لابرێت، کۆماری ئیسلامی رێگەی لەرۆیشتنی بەقاچاخی نەوتی عێراقی لە ئاوە هەرێمییەکانییەوە دەگرت، ئەو چالاکییەی کە بەهۆی داهاتە زەبەلاحەکەیەوە بەشێویەکی مەزن بەشداری لە هێشتنەوەی رژێمە سێکیولارەکەی سەدام لەدەسەڵاتدا کرد.

هەروەك پێشتر ئاماژەی بۆکرا، دەوڵەتە هەرێمییەکان بۆماوەیەکی زۆر وەك ئامرازێکی سیاسی دەرەکی سوودیان لە بەسیاسییکردنی شوناسی کوردیی کردووە. شوناسێکی نەتەوەیی کوردیی لەلایەن عەرەبە بەعسییەکانو تورکیای کەمالیستو ئێرانی خومەنیزمەوە نکۆڵی لێکراوە، تێکڕایان ئەو شوناسەیان بە مەترسی دەزانی بۆ سەروەریی نەتەوەییان. نەبوونی یەکشێوەیی لەشوناسی نەتەوەیی کوردییدا کە بەفرەڕەنگی دەناسرێتەوە، لەلایەن هەلپەرستە سیاسییەکانی پایتەختە هەرێمییەکانەوە قۆزرایەوە، لەهێنانەئارای سیاسەتی جۆربەجۆر کە شوناسە جیاوازەکانی کورد بەئامانج بگرێت، لەکاتێکدا رادەی فشارو نفوزی دەرەکی لەوانەیە بەباشی ئاستی ئاگاهی ئیتنی، ئاینیو هەروەها خێڵەکی دیاریبکات، بۆ نموونە یەك لەوانە دەتوانێت لەناوچەیەکی تایبەتدا کار لەسەر شوناسی خێڵەکی بکات، یاری بەکارتی ئاینیو بە کەسانێکی فرە رێزلێگیراوەوە، یاخود جەختێکی گەورە بکاتە سەر سیما ئابوورییەکان کە چینە باڵادەستەکەی کۆمەڵگای کوردیی کەمەندکێش بکات- هەموو ئەو سیاسەتانە لەلایەن وڵاتانی دراوسێوە سوودی لێوەرگیراوە.

پێدەچێت هێزە دەرەکییەکان توانیبێتیان کاریگەرییەکی دیکەیان بەسەر کوردستانی عێراقەوە هەبووبێت، لەرووی سیاسەتی زمانییەوە. ئەگەر هەموو رێگرییەکان

**لەسەر زمانی کوردیی لەتورکیا هەڵگیرا، لەوانەیە، هاوجووت بێت لەگەڵ ئەو پێشکەوتنەی لەلایەن رۆشنبیرانی قسەکەر بە کرمانجی لە دیاسپۆرای کوردییدا هاتۆتەدی، ئەمە کاریگەرییەکی قووڵی درێژخایەنی دەبێت لەسەر سیاسەت لەکوردستانی عێراق، تا ئەوڕادەیەی کە کرمانجی ( و هەروەها قسەکەرانی) دەتوانن ئەو بانگەشەیە بەدەستبێنن (هەروەها بانگەشە بکەن) کە لەبەرامبەر سۆرانییدا خاوەنی سەنگو پرستیژێکی مەزنترن لەگەمەی سیاسییدا.** [٢١٢]

**ئەمێستا بەرەو تێڕوانینێکی نزیکتر بۆ هەر یەك لەم وڵاتانە دەچین کە پەیوەستە بەم گەنگەشیەوە لەبارەی کوردستانی عێراقەوە لەچوارچێوە هەرێمییەکەیدا. ئێران بایەخێکی گەورەتری پێدەدرێت، بەهۆی ئەو راستییەی کە ئێران ئەو هێزە هەرێمییەیە کە مامەڵەی لەگەڵ کوردانی عێراق زۆر لێی نەکۆڵراوەتەوە لەکۆتایی جەنگی ئێران-عێراقەوە. لەکاتێکدا شتێکی زۆر لەبارەی تورکیاو کارەکانی لەناوچەکەدا نووسراوە،** [٢١٣] **هەڵسوڕانە زۆر نوێکانی کۆماری ئیسلامی بەهەمان رادە بایەخی پێنەدراوە. لەوەش زیاتر، بەلەبەرچاوگرتنی ئەو بەرەوپێشچوونەی ئێران لەم چەند ساڵە کەمەی رابردووداو هەوڵەکانی بۆ کۆتایهێنان بە دابڕانیو چوونەوەنێو کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، پێدەچێت ئەو وێناکردنە گونجاوبێت کە ئێران لەئایندەدا بگاتە پێگەیەکی رابەری لەجیهانی ئیسلامییدا- ئەو توانا شاراوەیەی زامنی رێکخستنێکی وردی سیاسەتە هەرێمییەکانی دەکات. لەپاش باسکردنی ئێرانو تورکیا، بایەخی دەوڵەتە هەرێمییەکانی دیکە دیکەش(یەکەمو کۆتا دانەیان عێراق خۆیەتی) لەبەرچاودەگیرێت سەبارەت بە سیاسەتەکانیان لەحاست کوردستانی ناوەندیی.**

212 Hassanpour (1992) touches upon such a scenario: see p. 437.

٢١٣ ئەمەش زادەی رێبازی چاودێریکارانەی ئەنکەرەیە بۆ پەرەسەندنەکان لەباکووری عێراق، زیاتر لەوەی پەیوەست بێت بەشەڕەکەیەوە دژی پەکەکە. ئەوان هەرگیز لە چەقی رووناکییەکە بەدوور نەبوون لەوکاتەوەی قەیرانەکانی بەهاری ١٩٩١وە هەر جووڵانەوەیەکی سەربازی تورکیو بەیاننامەیەکی سیاسی لەکلاوڕۆژنەی ئەو مەسەلەیەوە سەرچاوە دەگرێت.

## ٦ . ٢ هێزە هەرێمییە سەرەکییەکان

بەهۆی ئەو سنووردارییە توندەی کەلەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە بەسەر عێراقدا سەپێنرابوو سەبارەت بە باکووره کوردییەکەی، ئێران و تورکیا وەك هێزگەلێکی سەرەکیی لە باکووری عێراق لەپاش جەنگی کوەیت دەرکەوتن. لەگەڵ رۆیشتنی هێزەکانی سەدام حسێن لەوناوچانە، تاران و ئەنکەرە کەوتنە خۆچەسپاندن لەناوچە خودحوکمڕانەکە کە نائامادەگییەکی کوردیی تێدا بوو، ئەوەی لەناوەڕاستی ١٩٩٠کانەوە، بەشێوەیەکی کاریگەر لەنێوان دوو ناوچەی نفووزی ئێرانیو تورکیدا دابەشبوو. وەك یاریزانێکی سەرەکی لەناوچەکە، نفوزی تاران و ئەنکەرە لەسەر ئاراستەی پەرەسەندنە سیاسییەکەی باکووری عێراق چڕبووە کە لەدەیەی رابردوودا گرتبوویەبەر، هەروەها ئەوەی لەئایندەشدا دەیگرێتەبەر.

### ٦ . ٢ . ١ ئێران

وێڕای ئەوەی کەلتووری ئێرانیی فارسیی لەرۆژهەڵاتە ناوەڕاستە عەرەبییەکە جیاوازە، بەشدارییی لەمێژوو، بیروبڕوای ئاینی، جیۆگرافیش بەشێوەیەکی کەمتر نییە، هۆکاری بایەخدار پێکدەهێنن لەوەدا کەبۆچی رووداوەکانی ئێران کاریگەرییەکی بەرچاویان لەسەر سیاسەتەکان و سیاسەت هەیە لەسەراسەری ناوچەکە. پێگەیەکی ستراتیژیی بەو چەشنەشی ئێرانی تێدایە وا بەباشی کەوتۆتەوە کە رۆڵێکی بنەڕەتی لەئایندەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بگێڕێت. لەدەمی هەڵبژاردنی محەمەد خاتەمی ریفۆرمیست وەك سەرۆکی ئێران لەساڵی ١٩٩٧دا، وڵاتەکە گۆڕانکاری گرنگی بەخۆوە بینی لەڕووی پەرەسەندنی دیموکراتییەوە بەبەراورد بەوڵاتانی عەرەبی دراوسێ (وێڕای ئەو پاشەکشەیەی دواتر تووشی ریفۆرمیستەکان بوو). بەوەش پایەی نێودەوڵەتی وڵاتەکە بەشێوەیەکی بەرچاو بەرزبۆوە، پێگەشی لەجیهانی ئیسلامیدا بەهێزبوو بەهۆی مامەڵەی سەرکەوتووانەی تاران لەبەڕێوەبەردنی سەرۆکایەتی ئێران بۆ "OIC/ رێکخراوی کۆنفرانسی ئیسلامی"

لەنێوان ساڵانی ١٩٩٧-٢٠٠٠دا. لەوەش زیاتر، سەبارەت بەهەڵبژاردنە لۆکاڵییەکانی شارەوانییەکان کە لە یەنایەری ١٩٩٩دا ڕێکخرا، ئێران نموونەیەکی لەریفۆرمی سیاسی لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پێشاندا، ئەوەی شایەنی تێبینیکردنە بریتییە لە دەسەڵات لەئێراندا، کە بەپێچەوانەی زۆربەی دەوڵەتە هەرێمییەکان، بەدەست گروپێکی تایبەت یان تاکێکەوە یان دەزگایەکەوە نییە. ئەو دەوڵەتە دەسەڵاتگەرایەی عێراقی سەدامی پێکدەهێنا وەك نموونەیەك وەربگیرێت، ڕەوتگەلێك کە لە ململانێیەکی توندداپوون سیستمە سیاسییەکەی ئێرانیان پێکدەهێنا.[٢١٤]

سیاسەتی دەرەوەی ئێران هەر لەکاتی گۆڕینی ڕژێمەوە لەساڵی ١٩٧٩دا بەقۆناغی جیاوازدا تێپەڕیوە. یەك لەدروشمەکانی شۆڕشی ئیسلامی سەبارەت بە پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتانی دیکەدا بریتیبوو لە "لاشەرقیە لاغەربیە جمهوریە ئیسلامیە" واتە نە رۆژهەڵاتو نە رۆژئاوا کۆمارێکی ئیسلامی، پەیامێك کە هەڵگری مەبەستێك بوو لەلایەن کۆمارە نوێیەکە بەوەی پشتگیری هیچ زلهێزێکی جیهانی نەکردووەو نایکات – بەوتەیەکی دیکە، سیاسەتێکی بێلایەنی بەڕێوەدەبات. هەرچەندە، بەتێپەڕینی ساڵانێكو پاش ئەوەی کۆماری ئیسلامی بەتەواوی پێی خۆی لەخاکی فارسدا چەقاند، ئەم سیاسەتە بەشێوەیەکی سروشتی گەشەیکرد. بەتایبەت دەریای قەزوین لەگەڵ کەنداوی فارس گریمانەی بایەخێکی گرنگیان لەسیاسەتی دەرەوەی ئێراندا هەبوو.[٢١٥] لەساڵانی ١٩٩٠کاندا، کۆماری ئیسلامی هەوڵیدا ڕێگەی ئەوتۆ

---

214 Cf. Makiya (1999), pp. 3-45 and 73-109.

٢١٥ ئەم بیرۆکەیە لەوتارێکدا ڕوونکراوەتەوە لەلایەنە:

R. K. Ramazani , 'Iran's Foreign Policy: Both North and South', Middle East Journal, Vol. 446, No. 3, Summer 1992, pp. 393-412.

لەوەش زیاتر، وەزیری دەرەوەی پێشووی ئێران دکتۆر عەلی ویلایەتی لەسیمینارێکیدا لەساڵی ١٩٩٦ وتی " کۆماری ئیسلامی ئێران لەو قەناعەتەدایە کە ئاسایشەکەی لەپاراستنی ئاشتیو ئارامی هەرێمەکەدایەو لەم چوارچێوەیەشەوە سیاسەتەکانی لەهەمبەر کەنداوی فارسو وڵاتانی دراوسێو ئاسیای ناوەندی دەباتەپێش.

بڕوانە:

The inaugural speech by Dr. Velayati at the seminar 'Security and Foreign Policy in Central Asia and the Caucasus', held at the IPIS, Tehran, January 14-16, 1996. For the text of the speech, see 'The constructive role of the

بگرێتەبەر کە لەو دابڕانەی رزگارکات کە لەدە ساڵی رابردوودا بەسەریداهاتبوو، هەروەها خواستێکی روون هەبوو بۆ گێڕانەوەی پێگەی پێشووی وەك هێزێکی هەرێمی. بەپێی وتەی ئیحتیشامی، "جەختکردنەوەیەکی جیۆپۆلیتکی" نوێ روونبۆتەوە،[216] لەڕاستییدا:

"کۆماری ئیسلامی توانایەکی ئەوتۆی نیشانداوە کە دوورکەوێتەوە لەوەی ئەکتەرێکی سەرەکی هەرێمی بووە، کە لەساڵانی ١٩٨٠کاندا لەپێگەیەکی وادابووە، هەروەها بەرەو ئەوەی ببێتە هێزێکی سەرەکی هەرێمی لەساڵانی ١٩٩٠کاندا."[217]

لەکاتی سەرۆکایەتی محەمەد خاتەمیدا، ئەو هەوڵانەی لەسیاسەتی دەرەوەدا دەدرا ئامانجی ئەوەبوو دژواری لەهەرێمەکەدا کەمبکاتەوە، سەرکەوتن و روونی چۆنێتی بەڕیوەبردنی ئەم سیاسەتە ئەوترسەی سەبارەت بە خولیا فراوانخوازییەکانی ئێران و بڵاوکردنەوەی ئایدیا ئیسلامییە شۆڕشگێڕییەکانی کەمکردبۆوە – وتارێك کەلەلایەن سەرۆکی پێشتر رەفسەنجانی ناجێگیربوو، هەربۆیە ئەو لەو هەوڵانەیدا شکستیخوارد کە دەیدان بۆ لابردنی گومانی عەرەبە دراوسێکانی ئێران سەبارەت بە مەبەستی بنەڕەتی تاران.

کاردانەوەی بایەخی ئێران سەبارەت بە نموونەی هەڵوەشاندنەوە، کە لەچەند شوێنێکی جۆراوجۆر لەپاش کۆتایی جەنگی سارد بەربڵاوبوو، یەك لە پرسە سەرەکییەکانی سیاسەتەکانی ئێران سەبارەت بەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست بریتیبوو لە مەترسی هەڵوەشاندنەوەی عێراق و چارەنووسی کورد لەکوردستانی عێراقدا،[218] ئەوەی کە تێوەگلانی ئێرانی تێدا بەردەوام بوو، هەر لەوکاتەوەی کوردان خەباتی خۆیان دژی بەعسییەکان لەبەغدا دەستپێکردبوو. لەڕاستییدا، کێشەی کورد هەمیشە سەرچاوەی دڕدۆنگی نێوان عێراق و ئێران بوو، بەڵام وەك گراهام فولەر ئاماژەی بۆ کردووە، "کارتی کوردی" تاڕادەیەکی زۆر کاریگەرانە لەلایەن ئێرانەوەوە

Islamic Republic of Iran in maintaining regional security', Amu Darya 1,2 (1997), pp. 183-189.

216 Ehteshami (1995), p. 160.

217 Ibid. p. 145.

218 See Table 2 in Lotfian (1998-1999).

بەکارهاتووە تاکو عێراق :

بـەگوێرەی قـەبارەی دانیشـتووانو پێگـەی دانیشـتووانی کـورد لەناوچـە سـەرەکییە نەوت بەرهەمهێنەکاندا، بـەکارهێنانی ئێـران بـۆ کوردانی عێـراق زۆر زیـاتر لەسـەر عێراق کەوتووە وەك ئـەوەی بەپێچەوانەوە : بـەکارهێنانی کـوردانی ئێـران لەلایـەن عێراقەوە." [219]

هەروەك لەباسی یەکەمی ئـەم تێـزەدا ئامـاژەی بـۆ کـراوە، هاوکـاری ئێرانییـەکان بـۆ کوردی عێراق لەسەرەتای ساڵانی ١٩٧٠کانـدا یـەکجار زۆر بـوو- ئـەو کاتـەی کـە ئێـران بەقورسی لەژێر کاریگەری واشینگتۆندا بـوو- لەگـەڵ هاوکـاری سـەربازی لـە١٩٧٤-٧٥دا گەیشـتە بـەرزترین ئاسـتی کاتێـك جـەنگێکی بـەربلاو لـەنێوان کـوردانو بەغـدادا لەگۆڕێـدابوو. ئـەم یارمەتییـە سـەربازییە بنەڕەتییـە لـەناوکاو پـاش رێکەوتننامـەی جەزائیری مارتی ساڵی ١٩٧٥ بڕا. لەماوەی جەنگی ئێران-عێراقدا، تاران هانی کوردانی ئـەو دیـو سـنووری رۆژئـاوای دەدا کـە رووبـەڕووی دەسـەڵاتدارانی عێراقـی ببنـەوە، ئەوەی وایکرد ژمارەیەك لە یەکەکانی سوپای عێراقـی بەشـەڕی کوردەکـانی خۆیـەوە سـەرقاڵ بێـت. لـەوەش زیـاتر، کیمیابیـارانکردنی تۆقێنـەری شـاری هەڵەبجـە کـە بەشێوەیەکی مەزن بەجیهان ناسێنرا بەهۆی بەهای پرۆپاگەندەییەوە بوو بۆ ئێران، ئـەوەی دەیویسـت رووی راسـتەقینەی دوژمنـە دڵڕەقەکـەی دەربخـات بـەهێنانی رۆژنامەوانانی بیانی بۆناوچەکەی بۆئەوەی تۆماری کارەساتەکە بکەن.

لەپاش کۆتایی جەنگی ئێران-عێراق، داگیرکاری عێراق بۆ کوێتو کاریگـەری لەسـەر باقی دیکەی ناوچەکە، سیاسەتی ئێران لەهەمبەر کـوردانی بـاکووری عێـراق گـۆڕانی بەسـەرداهات، بوارەکـەی زیـاتر روونبـۆوە کاتێـك لەسـاڵانی ١٩٩٠کانـدا پەرەسـەندنی بنـەڕەتی روویانـدا. ئـەم گۆڕانـەی سیاسـەتی ئێرانـی تاڕادەیـەکی دیـاریکراو رەنگدانەوەی ئەو وەرچەرخانە بوو کە لەشانۆی نێوخـۆی سیاسـی ئێرانـدا لـەماوەی نیوەی دووەمی دەیەی رابردوو هاتەئارا.

---

219 Fuller (1991), p. 45.

## ٦ . ٢ . ١ . ١ چالاكییه یەكلایەنەكانی ئێران لەكوردستانی عێراق

لەقەیرانەكەی بەهاری ١٩٩١دا، پەیوەندییەكانی كوردی عێراق لەگەڵ حكومەتی ئێراندا، كە لەسەرەتای ماوەی كۆڕەوەكەی مارتو نیساندا بە هاوكارییەكی دوولایەنە دەناسرایەوە، بەخێرایی بەرەو تێكچوون رۆیی لەئاكامی ئەوەی كوردان چوونە نێو دانوسانەوە لەگەڵ حكومەتی عێراق. لەپرۆسەكەدا، كوردان زیاترو زیاتر بەلای توركیاو هێزە رۆژئاواییەكاندا بایاندایەوە. تاران بەدیدێكی ئەرێییەوە سەیری ئەم پەرەسەندنەیان نەكردو چەندین هەنگاویان گرتەبەر بۆ دابڕینی كوردان لەباكووری عێراقدا. هەرچەندە، پێدەچێت لەلایەن ئێرانییەكانەوە درككردنێك هەبووبێت كە بەهێشتنەوەی سنوور بەكراوەیی، دەتوانن لەپێگەی هێزدا بمێننەوە لەبەرامبەر كوردانی عێراقو ئامادەگییان لەخاكی عێراقدا. ئێران توانیبووی سوود لە كارە بازرگانییەكانی سنوور وەربگرێت بە بێ گوێپێدان بەوگەمارۆیەی UN بەسەر عێراقدا سەپاندبووی.

پێكهاتەی دەوڵەت لەباكووری عێراق هەرزوو بووە شوێنێك بۆ حەوانەوەی زۆر لە رێكخراوە سیاسییە هەرێمییەكان، ئەوانەی سەرنجی چەندین دەزگای هەواڵگری ئاسایشی نەتەوەیی جۆربەجۆریان راكێشاوە. هەرچەندە، بەشی هەواڵگری پاسدارانی شۆڕشی ئیسلامی بەخێرایی لەپاش دامەزراندنی هەرێمە ئۆتۆنۆمەكەدا خۆیان دامەزراند.[٢٢٠] ئێرانییەكان سوودیان لەلاوازیی دەسەڵات بینی لەناوچەكەو هەوڵی بەرفراوانیاندا پێگەی دوژمنەكانیان لەناوچە خودحوكمڕانییەكەدا لاواز بكەن. هێزی چەكداری ئێرانی بەتوندی لەهاوینو پایزی ١٩٩٣دا تێوەگلان لە"كوردستانی ئازاد"داو هێرشیان كردەسەر شارو گوندە كوردییەكانی خوارو هەروەها سەرو هێڵی ٣٦ی دژەفڕین، واتە ئەو ناوچانەی لەژێردەستی هەریەك لە بەغداو گروپە كوردییەكاندا بوون.[٢٢١] هەڵمەتو پەلامارەكان لەسەر گروپە ئۆپۆزسیۆنەكانی

220 As frankly stated by Dr. Velayati, Tehran, 2000.
221 Olson (1994), p. 58.

موجاهیـدینی خـەلق‌و حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێـران چـڕکرابۆوە، ئـەوەی دواییـان لەناوچـە کوردییـە کۆنترۆڵکراوەکـەدا هەڵدەسوڕا، ئـەو ناوچـانەی لەلایـەن یەکێتییەوە بەڕێوەدەبرا،•

پێدەچێت ئێـران ئـەم هەڵمەتـە سـەربازییانەی ساڵی ۱۹۹۳ی لەسـەر ئـەو گریمانەیـە ئەنجامـدابێت کـە ئـەو پەلامارانـەی لەلایـەن حیزبـی دیموکراتـەوە ئاراسـتەی ئێـران کراون لەراستییدا لەلایەن واشـنگتۆنەوە هانـدراون بـۆ شـێواندنی حکومـەتی ئێـران. ئەمـە دەتوانرێـت دژی هاوسـۆزی ئـەمریکی دابنرێـت بـۆ گروپـە ئۆپۆزسـیۆنەکانی ئێرانـی کـە بـەڕووی رەوایـەتی رژێمـی ئیسـلامی لـەتاران وەسـتابوونەوە. ئیـدی مەسـەلەکە بـەو شێوەیە بـوو، ئـەوەی دەریدەخست کـە ئێـران خۆویستانە پـەنا بـۆ پەلاماری سەربازی دەبات‌و قەوارە کوردییە ئۆتۆنۆمەکە دەکاتە ئامـانج ئەگـەر تـاران ئەو هۆکارانەی لەبەردەستبێت گومان بکات کە سەرکردایەتییەکەی " پشتگیریی یـان چاوپۆشی دەکات لەو پەلامارانەی کە مەبەستی ترساندن، بەڕووداوەستانەوە یـاخود هەڕەشە دەکرێنە سەر بەردەوامی ژیـانی حکومـەتی ئێرانـی." [222] هـەروەها لەوانەیـە ئێـران ویسـتبێتی هێـزی خـۆی بـەڕووی هەوڵـەکانی واشـینگتۆندا پێشـانبدات کـە

---

• ئێران بەدرێژایی دەیـەی ۱۹۹۰کـان سیاسـەتێکی پێکـدژو تـاکتیکی سـەبارەت بـەکوردو هـەرێمی کوردسـتان پیـادەکردووە، جگەلـە فرەلایـەنی بڕیارسـازی لـەئێران بەتایبـەت سـەبارەت بـە هـەرێمی کوردسـتان (سـوپای پاسداران‌و وەزارەتی ئیتلاعات)، گۆڕانی خێرای هاوکێشە سیاسییەکان و مەترسی لە پەرەسەندنی نفوزی هێزە نەیارە هەرێمی‌و جیهانییەکانی (وەك تورکیاو ئەمریکاو ئیسرائیل‌و هـەروەها بەعسـی عێـراق)، جگەلـە ئەگـەری بوژانەوەو دەرفەتقۆزتنەوەی هێزە ئۆپۆزسیۆنە کوردییە ئێرانییەکان (حیزبی دیموکرات‌و کۆمەڵە) بۆ پێکهێنانی هەڕەشە لەسەر ئێران، هەموو ئەمانە ئراستەکەری تاکتیکەکانی ئێران بوون، ئـەو دەوڵەتـەی سـەرەتا لەرێگـەی قەرارگای رەمەزان‌و دواتر بنکەکانی پەیوەندییەوە سیاسەتەکانی خۆی بخاتەگەڕ. شایەنی باسـە ئێـران شـەڕی ناوخۆی باشووری کوردستانی قۆزتـەوەو گـەرمیکرد، لەهـەمان کاتـدا یارمـەتی زیـاتر لـەهێزێکی کـوردیی دەدا، سەرەتا بزوتەوەی لـەباوەش گـرت‌و لەهەڵەبجـەوە هاوکـاری پـارتی دژی یـەکێتی دەکـرد، دوای نزیکبوونـەوەی پارتی‌و تورکیاو دواتریش پارتی بەعس، ئێران بەلای یەکێتیدا بایدایەوە، یەکێتیش ئامادەبوو دۆستایەتی ئێـران پەسـەندبکات و هـەردوولا لـەئوتی ۱۹۹٤ رێکـوتنێکی سیاسـی، ئـابووری دوولایەنـەیان بەسـت کەسـەرەتای هاوپەیمانییەکی ستراتریژی نێوانیان بوو ئەوەی بەلانسی ئێرانی تاڕادەیەك لەناوچەکە بەرزکردەوە.

222 Ibid.

دەیوست جێپێیەکی دیکە لە هەرێمەکەدا بەدەستبێنێت، لەکاتێکدا ئێرانییەکان دامەزراندنی هەوڵەکانی فریاگوزاریان دەبینی کە ئەمریکییەکان لەباکووری عێراق ڕێبەرایەتیان دەکرد.[٢٢٣]

بۆئەوەی بەشێوەیەکی گونجاو چاودێرییەکی نزیکی ڕووداوەکان لەسەر زەوی بکات، وا پێویست بوو بۆ ئێران کە چالاکانە لەکاروبارەکانی کارگێڕییە کوردییەکە لەناوچە خودحوکمڕانەکەوە بگلێت. ئەمەش بەشێوەیەکی سەرەکی لەڕێگەی بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانی کوردستانەوە دەکرا. هەرچەندە، پارتی دیموکراتی کوردستان بەدرێژایی ساڵانی ١٩٨٠کان هاوکارییەکی گرنگی لەگەڵ تاراندا هەبوو بەدژی حیزبی دیموکراتی کوردستان،[٢٢٤] یەکێتی نیشتیمانی حیزبێکی کوردیی عێراقی بوو کە بەشێوەیەکی بنەڕەتی پەیوەندییەکی ماقووڵی لەگەڵ تاراندا هەبوو. حیزبەکەی تاڵەبانی هەر لەساڵی ١٩٨٦ەوە بەفەرمی لەئێراندا بوونی هەبوو، کاتێك مەکتەبێکی پەیوەندییەکانی لەکرماشان کردەوەو ساڵێکیش دواتر ڕێگەی پێدرا مەکتەبێکی سەرەکی لەپایتەخت بکاتەوە. لەنێوان ساڵانی ١٩٩٢و ١٩٩٤دا هیچ نوێنەرایەتییەکیان لەتەواوی ئێراندا نەبوو، ئەوەی ڕەنگدانەوەی ئەو هەلومەرجە ئاشتییانەیە بوو کە لەناوچە خودحوکمڕانەکەدا لەوکاتەدا بەرقەراربوو، بەڵام بەشێوەیەکی بەرچاو لەساڵی ١٩٩٤ەوە بەرەوسەر (شەڕی براکوژی لەباکووری عێراق هەڵگیرسا) یەکێتی نیشتیمانی مەکتەبێکی سەرەکی لەتاران و چەند دانەیەکی لاوەکیشی لە ناوچە سنوورییەکانی ئێران-عێراقدا هێشتەوە.[٢٢٥]

کاتێك لەساڵی ١٩٩٤دا پەیوەندییەکانی نێوان یەکێتی نیشتیمانیو ئێران دەستیپێکردەوە، یەکێتی ناچاربوو چاو لەو فشارە گەورەیەی وەلی نیعمەتەکەی بپۆشێت کە گروپە کوردییەکانی دانیشتووی باکووری عێراقی کردبۆ ئامانج. ئێران

223 Id. (2001), pp. 14-15.

224 As examined by Sheilchmous (1999), p. 57.

٢٢٥ چاوپێکەوتن لەگەڵ چالاکێکی سیاسیی زۆر ناسراوی کورد ( رەتیکردەوە ناوی بهێنرێت) لەتاران لە فێبرایەری ٢٠٠٠.

هاوکاری لەگەڵ یەکێتیدا وەك دەرفەتێك دەبینی بۆ یەکلاکردنەوەی حیسابی خۆی لەگەڵ کوردە سەربەگۆبەندەکانی خۆیدا، بەتایبەتی حیزبی دیموکرات. بۆ نموونە، کوردانی عێراق ناچارکران ئێستگەی رادیۆی گروپە سیاسییە کوردییە ئێرانییەکان دابخەن کە کەوتبوونە ناوچەکەیانەوە.[٢٢٦] وێڕای ئەوەی، پێویستی بۆ هاوسەنگی هاوپەیمانی پارتی- تورکی (دواتر روونکراوەتەوە) پێدەچێت هۆکارێکی بەهێزبێت بۆ تاران کەپەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ یەکێتیدا پەرەپێبدات. هەروەها، ئەوەی هێزە هەرێمییەکان نیگەرانبن لەبالآدەستی تاکە حیزبێك بەسەر ئەوانی دیکەدا، لەوانەیە بەبایەخوەرگرتنی ئەم مەسەلەیە رۆڵی لەبەشێکی بڕیارەکەی تاراندا بینیبێت تاکو پەیوەندییەکانی لەگەڵ یەکێتیدا پتەوبکات. هەرچەندە، ئەم پەیوەندییە بەجۆرێك نەبوو لە لێکگیربوون خاڵی بێت. بۆ نموونە، ئێران لەشەڕی یەکێتیو بەزاندنی بزووتنەوەی ئیسلامی لەکۆتایی ساڵی ١٩٩٣و سەرەتای ١٩٩٤دا نارازیی بوو، لەکاتێکدا بزوتنەوە پارەو چەکیان لەلایەن ئێرانەوە پێدەدرا.[٢٢٧] تاڵەبانی رۆڵێکی کاریگەری لەلاوازکردنی کوردە ئیسلامیستە عێراقییەکاندا هەبوو، ئەو شەڕەی بووەهۆی هەڵگیرساندنی ململانیی چەکداری درێژخایەنی پارتی- یەکێتی.

کاتێك شەڕی نێوخۆی کورد لەساڵی ١٩٩٤دەستیپێکردو بەچڕی بەردەوامبوو، چەندین ئەکتەر، بەتایبەت وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، هەوڵی ناوبژییان لەنێوان لایەنە شەڕکەرەکاندا دا، بێئەوەی سەرکەوتنێکی زۆر بەدەستبێنن. لەئۆکتۆبەری ١٩٩٥دا، ئێران هەوڵێکی ناوبژیوانی دا بەڵام شکستیخوارد. لەیەنایەری ١٩٩٦دا هەوڵێکی نوێی ناوبژیوانی درا.[٢٢٨] پێدەچێت ئێران هەستی بەپێویستی بەرووداوەستانەوەی نفوزی ئەمریکاو هاوسەنگکردنی کردبێت تاکو خۆی وەك هێزێکی هەرێمی وێنابکات. هەرچەندە، سروشتی تێوەگلانی ئێران گۆڕا کاتێك

226 Natali (1999), p. 37.
227 Olson (1994), pp. 62-63.
228 Dr. Velayati, Tehran, 2000.

هێزێکی سەربازیی پاسداران لەژوئیەی ١٩٩٦دا سنووریان تێپەڕاندو رژانە قوڵایی ئەو خاکەی لەژێر دەسەڵاتی یەکێتی نیشتیمانیدا بوو. ئەمە سەردانێکی کورت بەڵام روونی سەربازیی ئێرانی بوو بۆ راوەدونانی پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات، کە ئامانج لێی دەستبەسەرداگرتنی سەرکردایەتی حیزبی دیموکرات بوو لە کۆیە.[229] ئێرانییەکان رێگەی ئەنجامدانی هەڵمەتو پەلاماری سەربازییان لەو ناوچانەوە پێدرا کە لەژێر دەسەڵاتی هێزەکانی تاڵەبانیدا بوو، بەڵام لەکاتێکدا کە پارتی هاتنەناوەوەی هێزە چەکدارە ئێرانییەکانی بۆنێو "کوردستانی ئازاد" رەتکردەوە کە گەڕان بەدوای گەریلادا گریمانەیەکی شاراوەبوو،[230] دەبێت پەلامارەکەی ئێران کەمتر سەرکەوتوو لەقەڵەم بدرێت. هەرچەندە، ئێران تەنیا شتێکی بەدیهێنا، ئەویش ئەنجامدانی نفوزێکی سەربازیی زیاتر بوو لەکوردستانی عێراقدا. مەبەستی ئەم کارە سەربازییە پێدەچێت ئاشکرابێت، بەڵام ناتوانرێت لەوەش بەدەربێت کە ئامانجی سەرەکی پەلامارەکە لەوانەیە وێرانکردنی بنکەی سەرکردایەتی حیزبی دیموکرات نەبووبێت. کۆماری ئیسلامی زیاتر بایەخی بەلاوازکردنی کارگێڕییە کوردییەکەی باکووری عێراق دەدا، هەروەها بەئەنجامدانی پەلاماری سەربازییش، ئێران دەریدەخست کە ئەوان دەتوانن هەرێمە ئۆتۆنۆمە کوردییەکەی عێراق داگیربکەن هەرکاتێك هۆکارگەلێك بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە ببیننەوە.

## ٦ . ٢ . ١ . ٢ سیاسەتی هەرێمی ئێران لەوەرچەرخاندا : کاریگەرییەکانی لەسەر باکووری عێراق

ئێران لەسایەی سەرۆك خاتەمیدا نیشانەگەلێکی ئەرێیی پێشاندا سەبارەت بەخواستی گرتنەبەری سیاسەتێکی دەرەکی فرە هاوسەنگتر بەئامانجی چاککردنی

---

229 Dr Rashid, London, 1999.
230 Dabrowska, MEI, No 532, 16 August 1996.

**ریشەیی پەیوەندییەکان لەگەڵ وڵاتانی دراوسێدا. ئەمە چەند ئاکامێکی دیاریکراوی لێکەوتەوە، هەرچەندە دەبێت جەخت لەوە بکرێتەوە کە دەسەڵاتی سەرۆك فرە سنووردارە، بەتایبەتی لەبواری سیاسەتی دەرەوەدا،[231] کە رێبەری باڵا، خامەنەئی، بەرجەستەی ناوەندی بەهێزترین دەسەڵات دەکات لەکۆماری ئیسلامیدا، ئەوەی هێڵە گشتییەکانو سیاسەتە تایبەتییەکانی دەکێشێت.[232] وێڕای ئەمەش، تۆکمەبوونی بەرژەوەندییەکانی ئێران لە هەرێمە ئۆتۆنۆمە کوردییەکە لەساڵی ١٩٩٧دا گۆڕانی بەرچاوی بەسەرداهات، کاتێك محەمەد خاتەمی بەسەرۆك هەڵبژێردرا.[233]**

**لەماوەی سەرۆکایەتی عەلی ئەکبەر هاشمی رەفسەنجانی لەساڵانی ١٩٩٠کاندا، پشتگیریی لە سیاسەتی دەستخستنەناوەوەو تێوەگلانی چالاکانە لەکوردستانی عێراقدا دەکرا، ئەوەی بووەهۆی تێوەگلانی سەربازیی لەهەرێمە کوردییەکەی عێراق. بەپێچەوانەوە، حکومەتەکەی ئێستا کەمتر سیاسەتی رووبەڕووبوونەوەی گرتۆتەبەر، هەروەها ئاماژەی ئەوەتۆی پێشانداوە کە بەرژەوەندی لە بەکارهێنانی**

---

٢٣١ سەبارەت بەسیاسەتی دەرەکی، ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی ئێران کە بەڕیارێکی هەموارکراو لەساڵی ١٩٨٩دا دامەزرێنرا بۆهەماهەنگی تێکڕای ئاژانسە جۆربەجۆرەکانی بەرپرس لەئاسایشی دەرەکیو نێوخۆیی، رێخستنو پێکهێنانی ئەجێنداکان. بۆ ئەرکەکانی ئەو ئەنجومەنە:

three institutions' constitutional powers', Iran Focus, March 2000 (Esfand - Farvardin 1378/9) Vol. 14, No. 3, and chapter XIII of Constitution of the Islamic Republic of Iran.

٢٣٢ ئەم دووانەیەی دەسەڵات بەرجەستەی ئاڵۆزیی سیاسەتسازیی دەرەکی ئێران دەکات، تێگەیشتنێکی قووڵ بۆی پێویستی بە زانیاری قووڵ هەیە سەبارەت بە بونیادی سیاسەتی نێوخۆی دەوڵەت هەیە، بۆ پێشەکییەکی نایابو شرۆڤەکاری ئەم بونیادانەی دەسەڵات، بڕوانە:

Wilfried Buchta (2000), Who Rules Iran? The Structure of Power in the Islamic Republic, Washington DC: The Washington Institute for Near East Policy and the Konrad Adenauer Stiftung.

٢٣٣ "جەختکردنەوە لە ئاسایشی سنوورەکانی ئێران لەرێگەی فراوانکردنو پتەوکردنی هاوکارییە دوولایەنەو فرە لایەنەکان لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ" یەکێك بوو لە ئەولەوییەتە سەرەکییەکانی سیاسەتی دەرەکی حکومەتی ئێران. بۆ رێبەرو ئەولەویەتەکانی سیاسەتی دەرەکی ئێرانی لەسایەی خاتەمی دا:

The Viewpoints, Positions, Guidelines and Priorities in the Grand Strategy of Hojjatoleslam va al-Muslemin Mohammad Khatami for Socio-economic, Political and Cultural Development, prior to the Presidential elections in May 1997 — See Table 1 in Lotfian (1998-1999).

پەیوەندییەکانیدایە لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانی بۆ ئەوەی پەیوەنـدی لەگـەڵ حیزبـی دیمـوکراتی کوردسـتانی ئێرانـدا دابمـەزرێنێت. هەواڵگـەلێك هـەبوون سـەبارەت بـە هەوڵەکانی ئێران بۆ دانوسان لەگەڵ گروپە سیاسییە کوردییە ئێرانییەکان کە گوایـە لەسلێمانی بەناوبژیوانی یەکێتی بەڕێوەدەچوو. [٢٣٤]

لەوەش زیاتر، هەڵوێستی فەرمی ئێران لەحاست کوردانی عێراق لەماوەی چوار ساڵی رابردوودا بە تۆنێکی ئاشتەواییانە جیادەکرایەوە، لەگەڵ فۆکوسکردن لەسـەر ئـەوەی وا لە پارتیو یەکێتی بکرێت لەگەڵ یـەکتردا هاوکـاری بکـەن. [٢٣٥] ئەمـەش هـاوکۆکبوو لەگەڵ سیاسەتی گشتی دەرەوەی ئێرانـی سـەبارەت بـە ئاشـتەواییو ئاساییکردنەوەی پەیوەندییەکان. گۆڕانی گشتی لە داڕشتنەوەی سیاسـەتی دەرەوەی ئێـران دەتوانرێـت لـەو مامەڵەیەیـدا ببینرێـت لەگـەڵ دامـەزراوە دەوڵەتییـە کوردییەکـەی لـەباکووری رۆژئاوای سنوورەکەیدا بوو. تاکو ئەو کاتەی کوردانی عێراق هـانی جووڵانـەوەی دژە ئێرانـی نـەدەن یـاخود رێگـەی سـەربەخۆیی نەگرنەبـەر، تـاران بەتونـدی دژایـەتی کارگێڕییــە کوردییەکــە ناکــات. ئەگــەر هێــرشو پــەلامار نەکرێتەســەر ئێــران، ئێرانییەکانیش لەرێگەی پاسدارەکانیانەوە دزە ناکەنـە ناوچـەکەو راوەدوی کـوردانی ئێرانی کەون. [٢٣٦]

خودی کوردانی عێـراق دانیـان نـا بـەوەدا کـە لەڕاسـتییدا ئێـران ئەمێستا سیاسـەتی خۆی گۆڕیوەو هەنوکە هەڵوێستێکی هەیە کە فرە لەوەکەی سەرەتاو ساڵانی ١٩٩٠کـان جیاوازە. ئەوە دروستە کە ئێران بەهەمان جۆشی پێشووەوە رێـز لـە یـەکێتی خـاکی عێـراق دەگرێـتو هـەوڵی پاراسـتنی دەدات، بـەڵام جیاوازییەکـەی ئێسـتا ئەوەیـە کـە کارگێڕییــەکی ئێســتا ئامــاژە بەبایــەخێك نــادات بــۆ دەســتێوەردانی راســتەوخۆی

---

234 For instance, see Bill Samii, (2000), 'Tehran works with Kurdish parties', RFE/RL Iran Report, Vol. 3, No. 32, 21 August and Shamal 'Aqrawi, Al-Zaman, 30 March 2000.

235 Outlined by Dr. Araghchi, Tehran, 1999.

٢٣٦ "لەراستیدا، حکومەتی ئێرانی خۆشحاڵە ئەگەر ئەوان هێرش نەکـەن،... لەکاتێکدا تورکیـا دەیـەوێت تـۆ ببیت بە بەشێك لە رێکەوتنێك بڵێت من تاکو دوا کەس شەڕ لەگەڵ پەکەکەدا دەکەم." دکتۆر رەشید، لەندەن، ١٩٩٩.

سیاسـەتە کوردییـەکانی عێـراق، هـەروەك ئـەو حاڵەتـەی کـە چـەند سـاڵێك پێشـتر بەڕێوەدەچوو.[٢٣٧]

هـەر لـەم چوارچـێوەیەدا جێگـەی بایەخـە ئـەوە راڤـە بکـەین کـە چـۆن شوناسـی موسوڵمانێتی کاریگەریی لە سیاسەتسازی ئێران هەبووە سەبارەت بە ناوچە کوردییە خودحوکمڕانەکەی عێراق. شوناسی موسوڵمانێتی لەبەرامبەر بەرژەوەندی نەتەوەیی پرسێکی ئاڵۆزترە، هەروەها لەکاتێکدا کە دان بـەوەدا نـراوە کـە ئیسلام "رەگـەزێکی بنەڕەتییە لەسیاسەتی دەرەوە(ی)دا"[٢٣٨] بەرژەوەندییـە نەتەوەییـەکان حـەز دەکرێـت لەپێشـتر بـن.[٢٣٩] بەتایبـەت هێنـدەی پەیوەنـدی بـە کوردسـتانی عێراقەوەیـە. ئەگـەر قەوارە ئۆتۆنۆمـە کوردییەکـە هەمیشـە وەك هەڕەشـەیەك ببینرێـت، ئـەوە نـەك بـۆ کۆمـاری ئیسـلامی بـەڵکو بـۆ ئێـران – ئـەوە مەسـەلەی خـاكو پاراسـتنی سـنوورە.[٢٤٠] لەسـاڵانی ١٩٩٠کانـدا ئاراسـتەیەکی گشـتی هـەبوو بـۆ دامـاڵینی سیاسـەتی دەرەوە لـە ئایـدیۆلۆجیا،[٢٤١] هـەروەها ئێـران بەشـێوەیەکی ئاشـکرا سـەلماندوویەتی کـە رێبـازێکی نائایدیۆلۆجی لەهەمبەر ناوچە کوردییە خودحوکمڕانەکەی باکووری عێراقدا هەیە. دکتۆر کەمال خەرازی وەزیـری دەرەوەی ئێـران، لەوتەیەکیـدا لەبەرامبـەر ٥٢هـەمین دانیشتنی ئەنجومەنی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٢٢ی سێپتەمبەری ١٩٩٧دا لـە نیـۆرك بەپەرۆشـەوە قسـەی لـەبارەی پتـەوکردنی مافـەکانی مـرۆڤ کـرد کاتێـك بنـەما جیهانییەکانی کۆمەڵگای مەدەنی پوختەکرد:

---

237 Ibid.
238 Ehteshami (1995), p. 144.
239 As expressed by Dr. Jawad-e Zarif in Tehran, 2000: 'national interests come first in reformers' view of truism', but at the same time stressed that ideological considerations in the Islamic world always work in the background. For more on Iran's foreign policy that in the 1990s largely ceased to be ideological, see Oliver Roy's analysis about the Shiite factor in Iran's foreign policy, pp. 183-193 in his The Failure of Political Islam (1994), London: I.B. Tauris.
240 A point stressed by Dr. Araghchi, Tehran, 1999.
٢٤١ بۆ باڵادەستی سیاسەتی نەتەوەیی ئێران بەسەر ئایدیۆلۆجیدا بڕوانە:
David Menashri in his Post-revolutionary politics in Iran. Religion, Society and Power, (2001), London: Frank Cass, pp. 227-37.

"ئەوە روونو ئاشكرایە كە پێویستە بنەڕەتیترین مافەكانی مرۆڤ لەپێشتر بن وەك مافی ژیان، مافی خۆدیارییكردنی چارەنووسو مافی گەشەكردن، هەروەها پێویستە ئاورێكی تایبەت لە پێشێلكردنی بەكۆمەڵو بەرنامەڕێژیان بدرێتەوە."[242]

ئەم قسانەی وەزیری دەرەوە لەوانەیە بەباشی لێكبدرێتەوە وەك ئەوەی كە كۆماری ئیسلامی پشتگیری لەخولیای خۆدیاریكردنی چارەنووسی كوردان دەكات. هەرچەندە، وەك ئەوەی پێشتر بەچەندین شێوە پێشاندرا، تۆكمەبوونی خۆدیارییكردنی چارەنووس لەباكووری عێراق بەزەحمەت لەگەڵ مەیلی كۆماری ئیسلامیدا دەهاتەوە، ئەوەی هەمیشە جەختی لەسەر ناڕەزایەتیو بەرووداوەستانی دامەزراندنی دەوڵەتێكی سەربەخۆی كوردیی لەهەرێمەكەدا دەكردەوە- ئەوەی ئەگەری هەر بانگەشەیەك بوو بۆ لایەنگری لە خۆدیاریكردنی چارەنووسی كوردیی.[243]

لەسەرەتای ١٩٩٠كاندا، كۆماری ئیسلامی ئێرانو هەروەها عەرەبستانی سعودی هەوڵی دامەزراندنی گروپە سیاسیە ئیسلامییەكانیان لە هەرێمە ئۆتۆنۆمە كوردییەكەی عێراقدا دەدا، هەروەها كێبڕكێی نێوان ئەم دوو هێزە هەرێمییە دەتوانێت بەراوردبكرێت بە ركابەری پێشوویان لەسەر ئەجێندای ئیسلامی لەئەفغانستان.[244] هەرچەندە، ئەم بزوتنەوە ئیسلامیە نوێیانە، كە بەپارەی ئێرانو سعودیە هەڵتۆقیون، نەیانتوانی خۆیان بەچەسپاوی لەباكووری عێراقدا دابمەزرێنن، چونكە ئەو پشتگیرییەی لە كوردەوە بەدەستیانهێنا كەمبوو. هەروەك راشكاوانە لەلایەن وتەبێژی یەكێتییەوە لە لەندەن دەربڕرا،" ئەوانە گروپی سیاسیی بالادەست نین".

ئەم گروپە نوێیانە نەیانتوانی كار لە بیروبڕوای ئاینی كوردانی عێراق بكەن، بەتایبەتی لادێییەكانی دانیشتووی گوندەكان.[245] بەوەش هەوڵە ئایدیۆلۆجییە

242 For this quote and his full speech, see the website of the Iranian Foreign Ministry:
http://www.salamiran.orgaraninformation/Govemment/Foreignistatement.html

243 For instance Adnan Catlayan in TDN, February 12 1994.

٢٤٤ بۆ زیاتر سەبارەت بەو گروپە نوێیانەی لەلایەن سعودیەو ئێرانەوە پارەیان دەدرێتێ بڕوانە:
Sheikhmous (1999), pp. 59-60.

245 As stated by Mr. Rahman, London, 1999.

ئێرانییە هاندەرە ئیسلامییگەراکان بەشێوەیەکی بەرفراوان شکستیخوارد، هەروەها ئەوە زێدەڕۆییە بوترێت کە ئاین هێزی سیاسی باڵادەست لەساڵانی ١٩٩٠کان لەکوردستانی عێراق.
سەرنجێك لە تێڕوانینی ئێرانییەکان لەهەمبەر هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت زیاتر پرسی ئایدیۆلۆجی لەبەرامبەر بەرژەوەندی نەتەوەییدا ڕووندەکاتەوە. تاران تاکو قۆناغی کۆتاییش هیوای دەخواست قەوارەی سیاسییەکەی یەکێتی سۆڤێت بەچەسپاوی بمێنێتەوە، کە ئەوەی ئاشکرادەکرد بەرژەوەندییە سیاسییە نەتەوەییەکان لە ئایدیۆلۆجیا ئاینییەکە لەپێشترە، وێڕای بوونی هەموو ئەو وتارە زۆرو زەوەندانەی بەئاراستەی پێچەوانە دەدران. ئەوەی ئێران زۆری لێدەترسا ئەوەبوو "شەیتانی گەورە" ببێتە تەنیا زلهێز لە ئاسیای ناوەندیی‌و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەڕووی دارمانی یەکێتی سۆڤێتدا – لێرەشەوە، ئێران پەرۆشبوو کە مۆسکۆ ببینێت دەسەڵاتی خۆی لەئاسیای ناوەندیدا بپارێزێت. هەروەك ئەو حاڵەتەی لەقۆناغی پەهلەوی‌و زۆرترین ماوەی سەدەی بیستەمدا بەرقەراربوو، ئێران سیاسەتی دەرەوەی خۆی لەسەر ڕۆژئاواو باشوور چڕکردبۆوە (واتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست‌و کەنداوی فارس)، لەگەڵ خواستی "سڕکردنی" هەلومەرجەکە لە سنوورەکانی باکوورو ڕۆژهەڵاتیدا. هەرچەندە، لەکاتێکدا کۆمارە نوێیەکان لەسنوورەکانی باکوورەوە دەرکەوتن، ئێران پێویستبوو هەوڵەکانی سەرلەنوێ لەو ناوچەیە چڕبکاتەوە، هەرچەندە، ئەوە نادروستە ببینین لەباوەشگرتنی ئیسلامییە توندڕەوەکان هێزێکی پاڵنەرە لەپشت دپلۆماسییەتی ئێرانییەوە لەقەفقاس‌و ئاسیای ناوەندی. هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی باڵادەستی سیاسی لەڕێگەی هێرشێکی ئاینییەوە لەساڵانی ١٩٩٠کان، واز لەساڵانی ٢٠٠٠کان بێنە، پێدەچێت گونجاو نەبووبێت، بەتایبەت دانیشتووانی ئەو ناوچەیە لەڕووی ئاینییەوە سەر بەئاینزای سوننی ئیسلامن. زیاتر لەوانەیە سیاسەتی ئێران بە بەرگریکارانە ئاماژەی بۆ بکرێت، هەوڵی ڕێگرتن لەوەی نەتەوایەتی ئیتنیکی جێپێ لەناوچەکەدا بەدەستبێنێت، و بەرەو خاکی ئێران سەرکات، هەروەها بۆ شکستپێهێنانی خولیا هەژموونیکە

**تورکییەکان لەقەوقاس‌و ئاسیای ناوەندی.**

**هەروەها سەبارەت بە بارودۆخەکەی کوردستانی عێراق، پەیوەندی دۆستانەی ئیسرائیلی-تورکی بووەهۆی دڵەڕاوکێی ئێران،[٢٤٦] ئەو بانگەشەی ئەوەیکرد کە پەیوەندییەکی نزیکی بەو چەشنە زیانێکی گەورە بە هەموو خەڵکی موسوڵمانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست دەگەیەنێت.[٢٤٧] کاریگەرییەکانی هاوپەیمانییەکی بەم چەشنە دەتوانرێت لەسەر هاوسەنگی هێز لەباکووری عێراق دەربکەوێت، مەسەلەی ئامادەگی ئیسرائیل لەناچەیەکی هاوسنووری ئێران بەقورسی سەنگی خۆی لەسەر عەقڵی داڕێژەرانی سیاسەتی دەرەوەو سیاسەتی ئاسایشی کۆماری ئیسلامی هەبوو. نیگەرانییەك سەبارەت بەهەوڵەکانی ئیسرائیل هەبوون کە خۆی لەوڵاتەکانی دەوروبەری ئێران جێگیربکات، ئەوەی کوردستانی عێراق لەم سیاسەتەدا ئامانجێکی بنەڕەتی بوو.[٢٤٨] جێگری وەزیری دەرەوەی ئێران بۆ کاروباری ئاسیا بەئاماژەدانێکی راشکاوانە سەبارەت بەکاروباری باکووری عێراق وتویەتی:**

**" من پرسی ناتۆو پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئیسرائیلدا وەردەگرم، وێڕای بابەتە پەیوەندیدارەکان، وەك مەسەلەی زۆر گرنگ، کە دەبێت وەك پەرەسندنێکی نوێ‌و دیاردەیەکیش ببینرێت.[٢٤٩]**

**تاران گرفتی کوردی لەباکووری عێراق وەك بەشێك لەگرفتی عێراق دەبینێت، هەرچەندە، لەمامەڵەکردنی لەگەڵ هاوسێکەی رۆژئاوایدا، تاران هەستی بەپێویستی جیاکاری پرسە جیاوازەکان لەیەکتری کرد. لەدەرەوەی چەندین پرسگەلی تایبەت بەعێراق، سەرەکیترینیان کە گرفتەکانی پاش جەنگ بوون، بەتایبەت دیلەکانی جەنگ بوون، کێشەی سنوورو دیاریکردنی رێرەوە ئاوییەکان، هەموو ئەوانە دەبێت چارەسەربکرێن پێش ئەوەی هەوڵی گفتوگۆیەکی جدیی سەبارەت بە پرسی کورد**

---

٢٤٦ نەك تەنیا ئێرانییەکان، بەڵکو عەرەبەکانیش دەنگی ناڕازیاندا بە زێدەبوونی هاوکاری نێوان تورك‌و ئیسرائیلییەکان. بەتایبەت لەسۆنگەی پشتگیری فەرمی ئەمریکییەکانەوە. بڕوانە: Asharq al-Awsat, 5 May 2001.

247 As mphasized by Dr. Velayati, Tehran, 2000.

248 Dr. Jawad-e Zarif, Tehran, 2000.

249 Aminzadeh (1999) p. 18-19 (italics added).

بدرێت.[250] پرسی قەوارە ئۆتۆنۆمە کوردییەکە لەباکووری عێراق زیاتر دەبێت لەنێو چوارچێوەی ئایندەی دەوڵەتەکەی عێراقدا چارەسەر بکرێت، کە لەگەماڕۆی نەتەوە یەکگرتووەکان ئازاد بێت. هەڵسەنگاندێکی بەم چەشنە بەشێوەیەکی سروشتی ملکەچی ئەو گۆڕانکارییە سەرەکییە بوو کە پەرەسەندنی لەکوردستانی عێراقدا بەئاراستەی جیابوونەوە دەیبزواند.

ئەو تێڕوانینەی لەلایەن خاتەمییەوە دەربڕرا ڕێگەی پێنەدرا لە سیاسەتسازیی کۆماری ئیسلامیدا زاڵبێت، هەرچەندە، زەمینەیەکی گەشبینانە هەیە کە لەسێ ساڵی داهاتوویدا لەسەرۆکایەتی میراتێکی بەردەوامی ریفۆرمخوازی بەرهەمدێنێتو گەشەی پێدەدات لەسیاسەتی ئێرانیدا لەسەر ئاستی نێوخۆییو هەرێمیو هەروەها نێودەوڵەتیش. وتارەکانی خاتەمی بیرێکی ژیرانەی سیاسی پێشاندا گەر وەربگێڕێت بۆ سیاسەتی کۆنکرێتی، لەوانەیە سەبارەت بەکێشەی کورد گۆڕانێکی ریشەیی بێتەئارا. بەگەواهی ئەم کۆمێنتەی کە لە پایزی ١٩٩٩دا لەسەردانەکەی بۆ فرەنسا وتی:

لەکاتێکدا مێژووی سەدەی بیستەم لەسەر هێزی شمشێر راوەستابوو، دوای خۆی براوەو دۆڕاوی جێهێشت، میحوەری سەرەکی سەدەی داهاتوو دەبێت دیالۆگ بێت، ئەگەر نا ئەوا شمشێرەکە دەبێت گوێزانێك کە هیچ کەسێك نامێنێتەوە کە لێی بێ زیان بێت.[251]

## ٦ . ٢ . ٢ توركیا

هەروەك لە یەکەمین باس سەبارەت بە مێژووی سیاسی کوردستانی عێراقدا پێشاندرا، لەماوەی ساڵانی ١٩٨٠کاندا ئێران ئەو هێزە هەرێمییە بوو کە بەشێوەیەکی سەرەکی کوردان مامەڵەیان لەگەڵدا دەکردو لەلایەن ئەوەوە ئیستیغلال

---

250 Dr. Sariolqalam, Tehran, 1999.

٢٥١ خاتەمی لەوتارێکی ناوازەیدا "دیالۆگ" ی پێشکەشکردووەو دژی "هێز"یش هۆشیاری داوە : AFP, October 29, 1999.

دەكران. هەرچەندە، لەدەیەی دادێ، ئێران ڕۆڵێكی كەمتر ڕوونی لە پەرەسەندنەكانی كوردستانی ناوەندیدا گێڕاوە، لەكاتێكدا ئەو دەوڵەتەی كە وەك هێزێكی دەرەكی زۆر دیار لەهەرێمە ئۆتۆنۆمەكەدا دەركەوتبوو، توركیا بوو. كاریگەری سیاسی توركیا گرنگییەكی تایبەتی لە باكووری عێراقدا هەیە، لەكاتێكدا توركیا ئەندامی ناتۆیەو دەتوانێت وێنای سەپاندنی ویستی واشنگتۆن بەسەر كوردانی عێراقدا بكات.

لەسەرەتای سالآنی ١٩٩٠كاندا، توركیا دەبوو ئاوڕ لەچەند قەیرانێكی لەناكاوی دراوسێكانی بداتەوە. لەسنووری ڕۆژئاوایەوە جەنگی بەلقان هەبوو لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی یۆگۆسلاڤیای پێشوو، لەسنووری ئەوسەر، لەبەری ڕۆژهەڵاتەوە، كێشەی ناگۆرنۆ-قەرەباغ لەنێوان ئازەربایجانو ئەرمینیا هەڵگیرسابوو، لەكاتێكدا لەباشوور، توركیا لەگەڵ ئەو بارودۆخە ناجێگیرەدا لەململانێدابوو كە عێراقی تێوەگلابوو. هەربۆیە سروشتییە ئەمە ترسێك بورووژێنێت سەبارەت بەسەركردنی ئەو نائارامییە ئیتنیكیانە بۆ هەرێمەكانی نێو توركیا. لەڕاستییدا، جەختكردنەوەی توركیا لە پاراستنی یەكێتی خاكی عێراق ڕەنگدانەوەی نیگەرانی توركیا بوو سەبارەت بەكاریگەرییە نائارامیهێنەكانی جووڵانەوە ئیتنیكیو نەتەوەییەكان بوو لەسەر توركیاو ژینگە هەرێمییەكەی.[252]

لەپاش داگیركردنو خستنەسەری كوێت بۆ عێراق، توركیا بەشێوەیەكی تایبەت وازی لەسیاسەتە نەریتییەكەی خۆی هێنا كە تێوەنەگلان بوو لەململانێییەكانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستو بوو بە بەشدارێكی سەرەكی لە هاوپەیمانییەكەی دژ بەعێراق لەماوەی جەنگی كوەیتدا،[253] كە ئاكامەكانی لەلایەن ئەنكەرەوە بەوردیی چاودێری كرا. سەرۆك ئۆزال بیركردنەوەیەكی بەرزەفڕانەی مەزنی لەحاست چارەسەركردنی گرفتی كوردیی توركیا پێشاندا، پاڵنەری بوونی ئەم چەشنە هزرە داهێنەرانەیە لەنێو هەرە سەركردە باڵاكانی توركی نكۆڵیكار لەكوردان بەئاشكرا پەیوەستە بە كێشەی كوردیی لەعێراقو پەرەسەندنەكان لە هەرێمە ئۆتۆنۆمەكە، ئەوەی پێویست

252 Sayari (1994), pp. 186-187.
253 Ibid. p. 176.

بەجەختکردنەوە لە هزری ئۆزال دەکاتەوە لەم چەند پەڕەیەی خوارەوەدا.

### ٦ . ٢ . ٢ . ١ سیاسەتی کوردیی تورکیی لەپاش جەنگی کوەیت

پێشنیازی یەکێتی ئەوروپا لەئەپرڵی ١٩٩١دا سەبارەت بە دامەزراندنی ناوچەی ئارام لەباکووری عێراق کە نەتەوە یەکگرتووەکان سەرپەرشتیاری بکات، وەك پێشتر تێبینیکراوە، بیرۆکەیەك بوو لەلایەن سەرۆکی تورکییەوە پشکوتبوو. تورگوت ئۆزال یەکەمین دەوڵەتمەدار بوو کە بەفەرمی لەبارەی پەناگایەکەوە بۆ کوردانی عێراقی قسەبکات، کە زۆربەیان پەنایان بردبووە بەر سنوورەکانی تورکیا یان لەهەوڵی ئەوەدابوون. پێدەچێت ئەم پلانە پەیوەست بێت بەو جووڵە لەناکاوو چاوەڕواننەکراوەی ئەنکەرە لە١٢ی ئەپرڵدا، کە تێیدا هێندێك یاسای دژەکوردی تێدا هەڵوەشێنرایەوە، بوونی ١٢ ملیۆن کوردی تورکیی لەلایەن دەوڵەتی تورکییەوە بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش دانیپێدانراو کۆتو بەندە کەلتوورییەکانی تورکە چیاییەکانی پێشوو بەکەمی شلکرایەوە.[254]

سەرۆکی کۆچکردوو ئۆزال دەستپێکەرو بەهێزکەری دەستپێشخەرییە نوێیەکانی تورکیا بوو لەبواری سیاسەتی دەرەوەدا. لەپاش جەنگی کوەیت چاوەڕوانییەکی گەورە دەکرا لە رۆڵی تورکیا لەو رەوشە نوێیەی لەهەرێمەکەدا سەریهەڵدابوو. لەوانەیە ناچاوەڕوانکراوترین سیاسەت گۆڕین ئەو کرانەوە ریشەییەی کۆتوبەندەکانی بەکارهێنانی زمانی کوردیی بوو، سەربەستکردنی یاسای زمان ی ساڵی ١٩٨٣، کەبەشێوەیەکی بەرچاو هەموارکرایەوە. ئەو بڕیارەی کە رێگەی بە کوردانی خودی تورکیادا گوزارش لە کوردبوونی خۆیان بکەنو هەروەها ئەنکەرە بەناوی پەنابەرانی کوردەوە قسان بکات نابێت بە تێگەیشتنێکی لەناکاوی نەهامەتییە کوردیی لەقەڵەم بدرێت. زیاتر، ئەوە زادەی سیاسەتی ئەمری واقیع بوو، هاندەری زێدەتریشی بریتیبوو لەبەرژەوەندییەکانی وڵاتەکە لەئەندامەتی یەکێتی ئەوروپادا، لەوانەیە ئەو ئارەزووەش هاندەربێت کە وەك ئەندامێکی

254 Berglcvist, SvD, 10 April, 1991.

رێــزداری نــاتۆ دەرکــەوێت. لــەوەش زیــاتر، ئەنکــەرە ترســی لــەوەبوو کــە پەرەسـەندنەکانو هاتنـەناوەوەی ژمارەیـەکی زۆر لـەکوردانی عێـراق بۆنێـو تورکیـا ببێتەهۆی لەدەستدەرچوونی کۆنترۆڵو کەوتنەوەی ئالۆزیی، ئەو حەشـەماتە گـەورە ورووژمهێنـە کـە دەتوانێـت هاوسـۆزیی لەگـەڵ پەکەکـەدا هـەبێتو پشـتگیریی پـێ ببەخشێت تاکو بتوانێت لەسەر خاکی تورکیا جۆرە پێکهاتەیەکی سیاسی پێکبهێـنن، سیناریۆیەکی نادڵخوازانەی بـەو چەشـنە کـە دەبێـت بەهـەموو تواناکەوە لەلایـەن حکومەتی تورکیاوە رێگەی لێبگیرێت. هەرچـەندە، کاتێك کـە هێـزە رۆژئاواییـەکان دواتر لەبەهاری ١٩٩١دا دەستیان بەپێکهێنانی ئەوەکرد کە پاشتر بەرەو قەوارە نیمچە سەرەبەخۆکە لە "کوردستـانی ئـازاد" هـەنگاوی نـا، زۆر لـە کەسایەتییە لیبراڵـەکانی لەدامــــەزراوەی تورکییـــدا، بـــەخودی ئۆزالیشـــەوە، لەوانەیـــە هەســـتیان بـــە ساردبوونەوەیەك کردبێـت، هەرچـەندە، سـووربوون کـە کاریگـەریی تـورکی لەهـەر ناوەنگەلێکی بڕیارسازیی هەستی پێبکرێت.

زۆر پێدەچـێت ئـۆزال بیرۆکـەی ناوچـەی ئـارامی لـەو سـۆنگەیەوە دەسـتپێکردبێت کاتێـك درکـی بـەوە کـرد کـە دەشـێت تـەنیا چارەسـەربێت بـۆ رێگـرتن لـە رێپێـدانی سەدەها هەزار پەنابەر کە ئاودیوی سـنوورەکانی تورکیـا بـن. ئەنکـەرە گومـانی لـەوە هـەبوو کـە بەغـدا دواچارەسـەری کێشـەی کـورد لـەوەدا دەبینێتـەوە کـە کـوردان لـەدەرەوەی خـاکی عێـراق بـن، ئـەو پرۆسـەیەی ئاکـامێکی کارەساتباراوی بـۆ تورکیـا لێدەکەوێتەوە. لەبەرئەوە، ئەوە مەسـەلەیەکی بنـەڕەتی بـوو بـۆ تورکیـا کـە کـوردان لەنێو خاکی عێراقدا بمێننەوە، لەکاتێکدا ئەنکەرە لە دووبارەبوونەوەی رووداوەکـەی سـاڵی ١٩٨٨دەترسـا، کاتێـك ژمارەیـەکی مـەزن لەپەنابـەرانی کـوردی عێراقـی دوای بۆمبارانکردنی هەڵەبجە رژانە نێوخـاکی تورکیـاوە. لەوکاتـەدا رۆژئـاوا، پـاش ئـەوەی بایەخە بەراییەکانی کەمبوونەوە، تورکیایان بە هاوکارییەکی کەمـەوە جێهێشت کـە ئەنکەرە بەپێویستی لەقەڵەمبـدات بۆئـەوەی بـەگونجاوی مامەڵـە لەگـەڵ رەوشـەکەدا بکات.

هـەروەها پێدەچـێت ئـۆزال هەلومەرجـە بێوێنەکـەی خسـتبێتە نێـو دیدگایـەکی بـــەرفراوانترەوە، ڕەوشـــەکەی وا لێکدابێتـــەوە کـــە دەرفـــەتێکی ناوازەیـــە بۆبەرجەستەکردنی خولیای تورکیا بـۆ بەدەسـتەوەگرتنی ڕۆڵـی ڕێبەرایـەتی لەهـەر گەنگەشـەیەکی ئاینـدەیی سـەبارەت بەکێشـەی کـورد، واتـە ئـەو ڕۆڵـی سـەرەکی لەسیاسەتی هەرێمی بەدەست دێنێتو ئـەو بنبەسـتەش دەشـکێنێت کـە بۆماوەیـەکی درێژ پەیوەندییەکانی کوردیی-تورکیی پێدەناسرایەوە. لەسـەر ئاسـتی هـەرێمی، ئـەو چەشنە دەستپێشخەرییەی تورکیا بۆ پاراستنی مافە کوردییەکان — لەپێشنیازکردنی حاڵەتی فیدراڵی بۆ کوردانی باکووری عێراق- هەروەها دەتوانێت ئەو مانایە بدات کە خواسـتێکە بـۆ هـەوڵی دەستبەسـەرداگرتنی ناوچـە سـتراتیژییە پڕنەتەوتییـەکانی باکووری ئەو وڵاتە لەمەودای دووردا، بەوتەیەکی دیکە، گێڕانـەوە ویلایـەتی موسـڵ. دەرکـەوتنێکی ئـەو چەشـنە خولیـا نوێبـووەوە هەژمونگـەرا تورکییـە لەهەرێمەکـەدا پێدەچێت سەرچاوەی هاندانی تورکیی بێت بۆ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی تاکو کۆنترۆڵی بەغدا بەسەر بەشێکی گەورەی کوردستانی عێراقدا هەڵپەسێرن. ژێنراڵە مەزنەکانی تورکیا لەوانەیە هیوایان لەسەر ئەوە هەڵچنیبێت بە دامەزراندنی ناوچـەیەکی ئـارام لەکوردسـتانی عێـراق دەرفـەتی پێکەوەگرێـدانی ویلایـەتی موسـڵ، واتـە بـاکووری عێراق، بە کۆماری تورکیاوە بێننەئارا.[٢٥٥] تەنانەت لەمایۆی ١٩٩٥دا، سەرۆك دەمیرئێل لەبارەی ڕێککردنەوەی سنوورو هێنـانی بـاکووری عێـراق، ویلایـەتی موسـڵ، بـۆ ژێـر کۆنترۆڵی تورکیا قسەی کرد، ئـەو پێشـنیازە بەتونـدی لەلایـەن هەریـەك لەعـەرەبو ئێرانییەکانەوە وەك یەك دژایـەتی کـرا. هێشـتا لای تورکیـا ئـەو هەسـتە هـەبوو کـە موسڵ بەراستیی هی ئەوانەو کۆماری نوێی تورکیا لەهەمبەر بریتانییەکاندا لەساڵی ١٩٢٥ لەپێگەیـەکی لاوازدا بـووەو نـەیتوانیوە بەشـێوەیەکی بـەهێز دەعـوا لەسـەر بانگەشـەی ڕەوایـەتی هـەرێمی ئـەو ناوچـەیە بکـات، ئـەوەی ناتوانێـت ئـەو ڕاسـتییە بسـڕێتەوە.[٢٥٦] خواسـتی فراوانخـوازی ڕۆڵـی تورکیـا لـەڕووی جیۆپۆلیتیکـەوە لـە

255 Daniel Pipes examines this issue in his "Hot Spot: Turkey, Iraq and Mosul", Middle East Quarterly 2, Sept 1995, pp. 65-68.

256 What an annexation of Northern Iraq could mean for Turkey is elaborated on by Heinrich Lummer in his 'Das Verhaltnis zwischen irkischen Kurden und tiirkischer Regierung' ['Relations between the Iraqi Kurds and

ناوچــەکانی قــەفقاس‌و ئاســیای ناوەنــدیی (کــە ئەنکــەرە بێگومــان وەك ئەگــەرو توانایەکی بەهێزی بۆ کاریگەریی ئابووری‌و سیاسی دەبینی)، هەروەها تێڕوانینێکی هەموارکراو سەبارەت بەوەی کە چۆن پرسی ئاسایشی نەتەوەیی پەیڕەوبکرێت، لەوەش زیاتر لەوانەیە رەگەزی باکووری عێراقیشی خرابێتەسەر.

دەستپێشخەرییە داهێنرانەکەی ئۆزال لەسەر پرسێکی هەستیاری بەو چەشنە بەچاکی لەسەر ئاستی تەواوی وڵات پێشوازی لێنەکرا،و بەهۆکاری ناتوانایی‌و ساکاری رەخنەی لێگیرا، بەوەی دژی بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی تورکیا کاردەکات‌و هانی رێحەزە جیاخوازییەکان دەدات. نەریتی دامەزراوەکانی دەوڵەت بەئاشکرا لەگەڵ خواستە نوێیە بەرزەفڕە پێکدژەکانی ئۆزالدا ناکۆکبوون‌و بەیەکیاندا دەدا. کاتێك سەرۆك دەستپێشخەرییە چاوەڕواننەکراوەکەی خۆی راگەیاند، پێشنیازیکرد رادیۆو تیڤی بەکوردی پەخش بکەن، دەمیرێلی سەرۆك وەزیران بەناڕەزایەتییەوە وەڵامیدایەوە وتی ئەوە کارێکی نادەستوورییە، ئەو سەرنجەی دامەزراوەی سەربازیش بەشداربوو تێیدا.[257] بەو پێیەش پێدەچێت ئۆزال وەك لایەنگرێکی تەنیای سیاسەتێکی دەرەوەی بزۆزو پێشکەوتوو مابێتەوە، ئەوەی هەروەك هەنگاوە پێشنیازکراوەکانی دیکەی لەلایەن کەمالیستەکانەوە کەوتە بەر رەخنەی جدیی، ئەوانەی بەرگریان لە یەکپارچەیی‌و لەدابەشبوون نەهاتووی دەوڵەت دەکرد.

ئۆزال کە لەناکاو لەمارتی ١٩٩٣دا کۆچی دواییکرد،[258] لەوانەیە بیری لەرێبازێکی گونجاو کردبێتەوە بۆ چارەسەرکردنی گرفتی کوردیی لەقۆناغگەلێکداو توانیویەتی کە وێنای کۆمارێکی تورکیی بکات بەزیاتر لە کارەکتەرێکی تورکیی-کوردییەوە. بێگومان ئەو پێشبینی گۆڕانێکی جیۆپۆلیتیکی خێرای لەهەرێمەکەدا کردو درکیکرد کە ئەگەر زمانی کوردیی لەو هەلومەرجە هەستیارە قەیراناوییەدا ئازاد نەکرێت،

---

the Turkish Government] in Kurdisches Forum in Deutschland (1999), Irakisch-Kurdistan: Status und Pespektiven. Ergebnisse einer Internationalen Tagung 1999 in Berlin [Iraqi Kurdistan: Status and Perspectives. Proceedings from an International Conference in 1999 in Berlin], Berlin: Awadani, pp. 81-84.

257 McDowall, MEI, No 397, 5 April 1991.

258 Id. (1996), P. 437.

دواتر تورکیا رووبەڕووی گرفتی زێدە دەبێتەوە. هەرچەندە، شایەنی باسە، دەستپێشخەرییە وێناکراوەکەی سەرۆك لەناوچەیەکدا کە سیاسەتی نێوخۆ لەگەڵ دارشتنی سیاسەتی دەرەوەیدا تێکەڵو ئاوێتەنو بە رێکارێکی ئاماژەییو ناپابەندو نارۆشن دەناسرێتەوە. ئەو ئەگەرگەلێکی راگەیاند بەمەبەستی بەدەستهێنانی باشترین ئەگەر لەکاتی بڵاوبوونەوەو سەرکردنی پەرەسەندنەکان، بەوەش وایکرد ئامادەکاری هێڵی گەڕانەوە ناپێویستبێت.

## ٦ . ٢ .٢. ٢ چالاکییە یەکلایەنەکانی تورکیی لە کوردستان

بۆ کوردانی عێراق، هەر لەسەرەتای هەڵسوڕانیان لەئۆتۆنۆمییە سیاسییەکەدا، راکێشانی سەرنجی ئەرێیی تورکیایان بە گرنگییەکی بنەڕەتی دەزانی، لەکاتێکدا هاوکاری تورکی بەشێوەیەکی رەها بنەڕەتیی بوو بۆ بوژانەوەی ئابووری لەهەرێمە خودحوکمڕانەکەدا. پرسێك کە گرفتئامێز بێت بریتیبوو لە بوونی پەکەکە لە "کوردستانی ئازاد". بەتایبەتی پارتی دیموکراتی کوردستان، دەسەڵاتداری نەریتی لەناوچەی هەرەباکووری کوردستانی عێراق لەلایەن گروپە کوردییە تورکییەکانەوە بەکارهێنراو ناچارکرا بکەێتەکارو شەڕ لەگەڵ براکوردەکانیدا بکات بۆئەوەی دڵی دراوسێ بەهێزەکەی باکووری رازیکات.• بەوەش تورکیا توانی پوازێك لەنێوان کوردی

• محەمەد حاجی مەحمود لەبەرگی چوارەمی "رۆژمێری پێشمەرگەیەگ ١٩٧٦-١٩٩٦" دا سەبارەت بە پەیوەندیو نزیکبوونەوەی تورکیا لەحیزبە کوردییەکانی باشوور دەڵێت:" لە ٢/٢ سەردانی وەزارەتی دەرەوەمان کردو کۆبوونەوەمان لەگەڵ مدیری سیاسیو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەوەزرارەتی دەرەوەی تورکیا کردو چاومان بەدوکەسی کە کەوت...قسەمان لەسەر وەزعی کوردو تورکیاو ناوچەکە کردو ئەوان هەر کێشەیان (PKK) بوو شەری دەکەن یان پەیوەندی دوو قۆڵیش هەمووی لەسەر لێدانی (PKK) وەستابوون...کابرای تورك...ووتی...ئێمە جلو پێڵاو و مەتارەو چەكو فیشەكو ئازووقەو بەتانیو هەمو شتێ (١٠) هەزار کەسمان تەسلیم بەپارتیو یەکێتی کردووەو مانگی (٣٠٠) هەزار دۆلاریش هەرلایەك (١٥٠) هەزاریان ئەدەینێ ووتی ئەوە چوار مانگە رێك دەیا دەینێ هەروەها ووتی هێزی پارتی بەقەناعەت شەڕ دەکات کاك مەسعود بەڵام هێزەکانیان شەڕکەرنین وە هێزی یەکێتی هێزەکانیان شەڕکەرن بەڵام بەقەناعەتەوە شەڕناکەن وە ووتی بارزانی داوای لێ

تورکیاو کوردی عێراقدا داکوتێت کاتێك حیزبە کوردییەکانی عێراقی ناچارکرد پێکەوە شەڕ دژی براکوردەکای باکووریان بکەن لەپێناو زامنکردنی ڕێگەی سەرەکی بازرگانی لەگەڵ تورکیا.

لەئۆکتۆبەری ١٩٩٢دا، تورکان بڕیاریاندا ئەرکی سەرکردایەتی هێرشێکی سنووردار دژی پەکەکە بگرنەئەستۆ کەلەلایەن کوردانی عێراقەوە دەستپێکرابوو. ژمارەیەکی زۆر لە سەربازانی تورکی پڕچەك کشان بەرەو سنوورەکانو ئاودیو بوون. پاش چەند هەفتەیەك شەڕکردن ڕێکەوتننامەیەك لەنێوان پەکەکەو حکومەتی هەرێمی کوردستاندا مۆرکرا.[259] هەرچەندە، پەلاماری فرۆکە جەنگییە تورکییەکان هەر زوو بەشێوەیەکی ناوبەناو دەستیانپێکردەوە بەئامانجی راوکردنی گەریلاکانی پەکەکە، بەڵام هەروەها ئاماژەیەکیش بوو بۆ کوردانی عێراق کە خەون بەدانپێدانانێکی گەورەتری هەرێمیو نێودەوڵەتی نەبینن. لەم نێوەندەدا، سوپای تورکیا خەریکی سوودوەرگرتن بوو لە ململانێکانی باکووری عێراق وەك بیانوویەك بۆ چەسپاندنی بوونی خۆی لەناوچەکەدا. هەروەك ئۆڵسن نووسیویەتی:" دوای هەڵمەتەکەی ساڵی ١٩٩٢، تورکان زیاتر لە ٥٠٠٠سەربازیان لەباکووری عێراق جێگیرکرد، وێڕای ژمارەیەکی بەرچاو لە ئەندامانی دەزگای ئاسایشو هەواڵگری(میت/و)."[260] هەرچەندە، ئەم ئامادەگییە، زیاتر وەك ورووژێنەرێك درککرا، و راژەی بە زێدەبوونی ناجێگیریی ململانێو دژوارییە هەرێمییەکان کرد.•

---

کردووین کە ئەو پارەو بەشەی یەکێتیش بدەین بەوان واتە پارتی ئەتوانێ هەموو سنورەکان لەجیاتی یەکێتیش جێگاکان بپارێزێت." بروانە : سلێمانی ، ٢٠٠٩، ل ١٦٢–١٦٣.

259 Laizer (1996), p. 68.

260 Olson (2001), p. 14.

• تورکیا زیاتر لەتێکڕای دەوڵەتە هەرێمییەکان لەدەیەی ١٩٩٠کاندا فشارو کاریگەریی سیاسەتی دەرەکی هەرێمی لەسەر باشووری کوردستان هەبوو، تورکیا پێگەی ستراتیژیی خۆی سەبارەت بەحکومەتی هەرێمو بوونی لەبازنەی ناتۆو هاوپەیمانێتی ئەمریکا قۆزتەوە تاکو چەندە بۆی دەکرێت کار بۆ لەناوبردنی جووڵانەوەی کوردیی لەباکوورو ڕێکخراوی پەکەکە بکاتو ڕێگەی گەشەکردنی نێوخۆو بەنێودەوڵەتیبوونی کێشەی کورد لە باشووری کوردستان بگرێت. تورکیا لەماوەی شەڕی نێوخۆدا بەئاشکرا بووە بەشێك لەململانێیەکەو لەدژی پەکەکەو هەروەها یەکێتی، بەتەواوی توانای سیاسیو سەربازییەوە پشتگیری پارتی کرد، ڕۆڵێکی گەورەیان

لەساڵی ١٩٩٥دا، تورکیا ئامانجی وێرانکردنی "یەکجارەکی" بنکەکانی پەکەکەی لەباکووری عێراق ڕاگەیاند، و لەمارتدا، بۆئەوەی زۆرترین وێرانکاریی بەگەریلاکان[٢٦١] بگەیەنێت، ٣٥,٠٠٠ سەربازی تورکی بەتۆپخانەوە کرد بە باکووری عێراقدا.[٢٦٢] ئەمەش ڕەوشێکی بێمانای لێکەوتەوە، لەکاتێکدا فڕۆکەی هاوپەیمانەکان بەبەرزایی ٣٠,٠٠٠ پێ بەسەر ناوچە ئارامەکەدا دەفڕین تاکو ڕێگە لەسوپای عێراقی بگرێت کە هێڵی ٣٦ ببەزێنێت، لەولاوە فڕۆکەی تورکی لەبەرزایی ٥٠٠٠ پێوە، بۆمبی بەسەر ئەو گوندانەی کوردستاندا دەباراند کەلەژێر پاراستنی هێزە هاوپەیمانەکاندا بوو.[٢٦٣] لەهەمان کاتدا، ئەمەو هەموو هەڵمەتە سەربازییە تورکییەکانی دیکە بەشێوەیەکی پارادۆکس ئاسانکارییان بۆکرا تەنیا لەو سۆنگەیەوە کە تورکان ڕاستەوخۆ پەیوەستبوون بە هێشتنەوەی ناوچەی دژەفڕین لەباکووری عێراق. یەکێتی ئەوروپاو هەروەها وڵاتە یەکگرتووەکان داوایان لەتورکیا کرد ماشێنە زەبەلاحەکانی کوشتن لە ناوچە کوردییەکانی عێراق بکێشێتەوە، لەهاویندا، سوپای تورکی ئاوڕی لەداواکانی ڕۆژئاوا دایەوە، ناوچەیەکی وێرانو خەڵکێکی سڤیلی تۆقێنراوی لەپاش خۆی جێهێلا.

هێرشە تورکییە بەرفراوانەکان لەوەدوور بوون سەرکەوتن بەدەستبێنن. خۆکۆکردنەوەی سوپای تورك لەباکووری کوردستان بەچەند هەفتەیەك پێش

---

لەشکستهێنانی ڕێکەوتنی پاریسدا هەبوو کە تەکانێکی گەورەی بەکێشەی کورد دەدا، ئەوان لەڕێگەی دەستبەسەرداگرتنی ڕێگای بازرگانی، بێدەنگکردنی ئەمریکا سەبارەت بە ئۆپەراسیۆنەکانیان لەباشووری کوردستان، بوونی تورکمانەکان، ئامادەگی هەمیشەیی لەسەرجەم دانیشتنو دانوسانەکانی نێوان پارتیو یەکێتی، بوونی بنکەی ئەنجەرلیكو پارێزەرانی دابینکردنی حەوانەوە، خۆنزیککردنەوە لەعێراقو دابینکردنی ڕێگە بۆ ڕۆیشتنی نەوت ..هتد هەموو ئەمانە بەباشی باڵادەستی تورکیایان لەناوچەکەدا هێنایەئاراو دەسترۆیشتنی تورکی زۆر لەوەی ئێرانو سوریا زێدەتربووە.

261 Pope, N., MEI, No 497, 31 March 1995.

٢٦٢ وەك بەراوردێك، ئەمە هێزێکی گەورەتربوو لەوەی کە لەساڵی ١٩٤٧ەوە لەلایەن تورکانەوە بۆ داگیرکردنی قوبرس تەرخانکرا.

Pamuk, Kurdistan Rapport, May 1995.

263 Kutschera, The Middle East, November 1995.

هاتنەناوەوەیان، کاتی تـەواوی بـە پەکەکـەدا یەکـە چـەکدارەکانی خۆیـان لـەباکووری کوردستان دووربخەنەوە، دوو لەو ناوچە پەلاماردراوەی لەشکری تورك کەبـەقوولایی ٤٠ کم و بەدرێژیی ٢٩٠ کم بوو.[٢٦٤] ئـەو بنکانـەی پێشمەرگە(گـەریلا/و) کـە لەلایـەن تورکیاوە بانگشەی وێرانکردنی تـەواویان دەکـرا بەشـێوەیەکی سـەرەکیی بریتیبـوون لـەو ئەشـکەوتانەی کـە بـۆ هـەلگرتنی چـەكو خـۆراك لـەنێو شـاخە کوردییەکانـدا بـەکاردەهێنـرانو لەهـەرکاتێکی دیکـەدا دەتـوانـرا لەلایـەن گەریلاکانـەوە بەکـەمترین مانـــدووبوون بنیادبنرێنـــەوە.[٢٦٥] هەرچـــەندە، دەبێـــت جـــەخت لـــە ســـیماگەلە سیاسییەکانی داگیرکارییەکە بدرێتـەوە، تائـەو کاتـەی تورکـان بەئاشـکرا خوازریـاری گەیاندنی ئەو پەیامـەبوون بـەجیهانی دەرەکـی کـە دەوڵـەتێکی سـەربەخۆی کـوردیی لەهەرێمەکەدا پەسەند ناکرێت. هەرچەندە، ئەوەش گرنگـە ئامـاژەی بـۆ بکرێـت کـە نە هێزە هەرێمییـەکانو نـە نێودەوڵەتییـەکان خولیاکانی تورکیـان بـۆ دامەزرانـدنی ناوچـەیەکی لەمپـەر لـەباکووری عێـراق هاوشـێوەی ئەوەکـەی ئیسـرائیل لەباشـووری لوبنان پێکیهێنابوو،پەسەند نەدەکرد.

داگیرکـاری تـورکی لـەمایۆی ١٩٩٥دا بـۆ بـاکووری عێـراق چـەندین پـەلاماری دیکـەی بـەدواداهات بۆسـەر بارەگاکـانی پەکەکـە لـە کوردسـتانی ئـازاد. وێـڕای ئـەو بـاوەڕە چەسـپاوەی ئەنکـەرە کـە پەلامارەکـەی بـەهاری ١٩٩٦دا هـەموو گـەریلا کـوردە تورکییەکانی قەلاچۆکردووە، هێشتا ژمارەیەکی گەریلای کەم لەناوچەکە ماونەتەوە، هەربۆیە حکومەتی تورکی بەپێویستی دەزانی جار لەدوای جـار، هێزەکـانی ڕەوانـەی ناوچە کوردییە ئارامەکە بکاتەوە. بەگوێرەی سەرچاوە فەرمییـە تورکییـەکان، هـەر لەسەرەتای ساڵانی ١٩٨٠کانەوە ٥٧ پەلاماری سەربازی کراوەتە سـەر بـاکووری عێـراق، ئەو ژمارەیەی کە بڕوا وایە زیاتر لە ئامارێکی خۆپارێزانەبێت.[٢٦٦]

ئیتنیـــك ڕەگـــەزێکی گرنگـــە لەشـــکلگرتنی سیاســـەتی دەرەوەی تورکیـــا. جگـــە لـــە

---

264 Serrill, Time, 24 April, 1995.
265 Zaman, The Middle East, April 1995.
266 66.'A Plethora of Reports Rattles Nerves', Briefing (Ankara), June 8, 1998, P. 7 – a reference provided by Gunter (1999), p. 126.

بەرژەوەندیگەلێکی زۆر کە لەکۆمارە نوێیەکەی تورکیادا لەپاش قۆناغی سۆڤێتەوە سەریهەڵداوە، تورکمانەکانی عێراق بەشێوەیەکی جدیی جێگەی بایەخی تورکیا بوونو لەلایەن ئەنکەرەوە وەك شێوازێکی کاریگەریکردنە سەر سیاسەت لەهەرێمە ئۆتۆنۆمەکەدا سوودیان لێوەرگیراوە. لەبەرئەوەی تورکمانەکان کەمینەن، ئەوانیش وەك سەرچاوەیەکی ئیلهامو سەرکردایەتی دەیانڕوانیە کۆماری تورکیا. لەحاڵەتی پشکوتنی دەوڵەتێکی کارای کوردیی لەباکووری عێراقدا، ئەنکەرە بەدڵنیاییەوە سوود لەرەگەزی تورکمانەکان وەردەگرێت بۆئەوەی ئامادەگی سیاسی خۆی لە "ویلایەتی موسڵ"دا بەهێزبکات، وەك ئەوەی بۆخۆیان ناویان لێناوە.

سیستمی چاودێری ئاسمانی ئۆپەراسیۆنی پرۆڤاید کەمفۆرت/ دابینکردنی حەوانەوەو بەدواداچوونی هەڵمەتەکانی چاودێری (وەك لەباسی دواتردا قسەی لەبارەوە دەکرێت) زیاتر لەتورکیا جێگەی مشتومڕ بوو. ئەنکەرە پشتگیریی خۆی دابینکردبوو، بەڵام هەڵمەتەکانی فریاگوزراری وەك شمشێرێکی دوو ڕوو تەماشا دەکرا. لەکاتێکدا کە تورکیای لە لەشەپۆلی کۆڕەوێکی دیکەی پەنابەران لەباکووری عێراقەوە دەپاراست بەرێگرتن لەهاتنەناوەوەی سوپای عێراق بۆ هەرێمەکانی باکوور، هەروەها ئەو ترسەشی دەهێنایەئارا کە بوونی قەوارەیەکی سیاسی ئۆتۆنۆم لەوانەیە ناوکی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی پێکبهێنێت، لەوەش زیاتر، پاش ئەوەی روونبۆوە کە پەکەکە بەو ئاسانیو خێراییە توانیویەتی بنکە لە هەرێمە ئۆتۆنۆمەکە دابمەزرێنێتو لەوێوە هێرشبکاتە سەر تورکیا، ئەوە تێکڕا ئۆپەراسیۆنەکەی خستەژێر پرسیار. وێڕای ئەوەش هێشتا چاودێری هاوپەیمانەکان تاکو کۆتایی ساڵی ١٩٩٦ بەشێوەی نیوە ساڵانە لەپارلەمانی تورکی درێژدەکرایەوە، کاتێك دەنگی نارەزایەتی لەدامەزراوەی دەوڵەت فرە بەهێزبوو.[٢٦٧] یەك لەو قازانجانەی کە هەلومەرجە بێوێنەکەی پێشکەشی تورکیای کرد ئەوەبوو کە لەگەڵ پوچکردنەوەی دەسەڵاتی ناوەندی عێراق بەسەر باکووری وڵاتەکەدا، بەشێوەیەکی

267 Braconier, SvD, 31 July, 1996.

ڕێـژەیی، تورکیـا هـەرکاتێك ئـارەزووی بکردایـە دەسـتی بـۆ ئەنجامـدانی پـەلاماری سەربازی بۆ باکووری عێراق کراوە بوو. هەموو ئـەو شـتەی بەغـدا دەیتـوانی بیکـات دەنگهەڵبڕینو ناڕەزایەتی بوو لەحاست پێشێلکردنی یەکێتی خاکەکـەی. هەرچـەندە، ئۆپەراسیۆنی درێخایەنی هاوپەیمانـەکان لەیەنایـەری ١٩٩٧دا، کۆتاییهاتو شـوێنی بـە سیستمێکی چاودێری کەمتر گشتگیر گیرایەوە، کە بەپێی ئەو سیستمە هێزە تـورکیو ئــەمریکیو بریتانییــەکان بەتــەنیا رووبــاڵی ئاسمانیــان دابینــدەکرد، و رەگــەزە گرنگەکانی بەندی دابینکردنی هاوکارییە مرۆییەکانی لێ لابرا. [٢٦٨]

هەرچەندە، تورکیا بە چاککردنی وردە وردەی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ عێـراق، سـەربەخۆیی خـۆی لەواشـینگتۆنو تەلئـەبیب سـەبارەت بـە پێکهێنـانی سیاسـەتی دەرەوە پێشاندا، کە دەشێت هاوپەیمانی لەگەڵ ئەو دووەی دیکەدا بخاتەژێر پرسـیار. ئەنکـەرە بەچـاککردنی پەیوەندییـەکانی خـۆی بـە رژێمـی سـەدامەوە جـەختی لـە نیگەرانی قووڵی خـۆی سـەبارەت بـە پەرەسـەندنی بـەردەوامی قـەوارە کوردییەکـەی باکووری عێراق بەرەو سەربەخۆیی دەکردەوە- ئەو نیگەرانییەی کە نە ئەمریکاو نە ئیسرائیلیش دەیانتوانی کەمیبکەنەوە.

## ٦ . ٢ . ٣ پەیوەندییەکانی ئێرانی-تورکی سەبارەت بە باکووری عێراق

بەلەبەرچـاوگرتنی دوو هێـزی سـەرەکی دەرەکی بـۆ هەرێمـە ئۆتۆنۆمـە کوردییەکـە، پەیوەندییــەکانی نێــوان ئێــرانو تورکیــا کاریگەرییــەکی بەرچــاوی بەســەر پەرەسەندنەکانەوە هەبوو لـەباکووری عێراقـدا. لەراسـتییدا، دوای تێڕوانینێکـی ورد ڕووندەبێتـەوە کـە پرسـی هەرێمـە ئۆتۆنۆمـە کوردییەکـە جێگەیـەکی ناوەنـدی لـە بایەخە سەرەکییەکانی ئەو دوو وڵاتـە پێکهێنـاوە. لەکاتێکـدا فۆکوسـی سـەرەکی لـەم باسەدا پەیوەستبووە بە تێوەگلانی ئێران لەکوردستانی عێراقدا، لێرەدا سەبارەت بـە پەیوەندییــەکانی ئێرانــی-تــورکی بەشــێوەیەکی ســەرەکیی لەروانگــەی ئێرانییــەوە

---

268 Hilterman (1997).

تێیدەڕوانین.

یەکێك لە قازانجە جیۆپۆلیتکییەکان کە ئێران بەسەر تورکیادا هەیبوو سەبارەت بە کوردستانی عێراق ئەوەبوو کە ئێران لەپێگەیەکی باشتردابوو کە مامەڵە لەگەڵ پرسی کوردیدا بکاتو دەیتوانی جووڵەیەکی ئاسانتر بەرەو جۆرە چارەسەرێکی ئۆتۆنۆمی ماقووڵ بکات.[٢٦٩] ئەمەش هەروەها رەنگدانەوەی توانای ئێران بوو بۆ گلانە نێو گەنگەشەیەکی بنیاتنەر سەبارەت بە ئایندەی کوردانی عێراق، پەرەسەندنێکی ئەرێی سیاسیی نێوخۆیی لەئێراندا فەراهەمکردو لەسایەی کاریگەری سەرۆك خاتەمیدا بەردەوامبوو هەروەها رێحەزە نەرێییەکانی لەلایەن کۆنسێرڤاتیڤەکانەوە هانیدەدرا کەوتبووەژێر.

بەو پێیەی ئێران لەبنەڕەتدا وڵاتێکە لەکەمینەکان پێکدێت، هەربۆیە لێبوردەیی گشتی ئێران لەهەمبەر گروپە کەمینەکان لەچوارچێوەی هەرێمیدا بەشێوەیەکی رێژەیی رازیکەربوو. هەرچەندە، پێچەوانەی ئەمە دروستە کاتێك تاران هەست بەهەڕەشەی حاڵەتەکە بکات. ژمارەیەکی بەرچاوی ئازەرییە تورکەکان لەباکووری رۆژئاوای ئێران دەژینو بەباشی بەکۆمەڵگای ئێرانەوە گرێدراون،[٢٧٠] بەڵام لەکاتی هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤێتو دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی ئازەربایجان، نیگەرانی ئێران لەمەڕ پشکوتنی جووڵانەوەیەکی بەهێزی جیاخوازی ئازەری لەباکووری رۆژئاوا بەشێوەیەکی مەزن زێدەببوو. نیگەرانییەکی بەم چەشنە بەدڵنیاییەوە کاریگەربوو کاتێك پارێزگاکە لەسەرەتای ١٩٩٠کانەوە بۆ ئازەربایجانی رۆژهەڵاتو رۆژئاوا دابەشکرا، بۆئەوەی چاودێریو کۆنترۆڵی ئەم رێحەزە بکات.[٢٧١]

تاران نیگەرانییەکی دیاریکراوی لەحاست ئامادەگیی سەربازیی بەردەوامی زۆر ئاشکرای تورکی لەعێراقی لاوازدا (وێڕای دڵنیاکردنەوەی تورکیا سەبارەت بەتەنیا وەڵامدانەوەی ئەو هەڕەشانەی لەلایەن پەکەکەوە دەکرێن) هەروەها ترس سەبارەت

269 E.g. Fuller (1991), PP. 46-47.

270 This is examined in Mehrdad Izady's article 'Persian carrot and Turkish stick: contrasting policies targeted at gaining state loyalty from Azeris and Kurds', Kurdish Times, Vol. 3, No. 2, Fall 1990, pp. 30-47.

271 This issue is dealt with by Touraj Atabalci, Azerbaijan. Ethnicity and Autonomy in Twentiethcentury Iran, (1993), London: St Martin's Press.

بــەوەی ئامـــادەگیی تـــورکی کاردەکاتـــە ســـەر بەرژەوەندییـــە جیۆســـتراتیژیو جیۆپۆلیتیکییەکانی ئێران لەئازەربایجانو کەنداو. ترسێکی بەم چەشنە بەهۆی ئەو راستییەوە بوو کە وێڕای بوونی رەگەزی کوردیی، پرسی ئازەرییە تورکەکانیش لەکۆماری ئیسلامیدا هەبوو کە دەسەڵاتدارانی ئێرانی نیگەران کردبوو. لەنێوان ئەم دوو گرفتەی کەمینەیەدا لەئێران پەیوەندی هەیە، یەك لەوانە بەتوندی بەرجەستەی تورکیاو داڕشتنی سیاسەتە دەرەکییەکەی دەکات. کۆبوونەوەی هەوڵەکانی تورکیا لەقەفقاسو ئاسیای ناوەندیو هەروەها بوونی دەوڵەتی سەربەخۆی ئازەربیجانو کاریگەریی لەسەر دانیشتووانی ئازەری لەپارێزگانی باکووری رۆژئاوی ئێران پرسگەلێك بوون دەسەڵاتدارانی تارانیان خستبووە دڵەڕاوکێ.[٢٧٢] لەیەکەم ئاماژەدا، پێدەچێت پەیوەستێکی ئاشکرا لەنێوان ئەم پرسانەو پەرەسەندنەکانی باکووری عێراقەوە نەبێت. هەرچەندە بەپێی راڤەکردنێکی ورد، مرۆ دەتوانێت درك بە نموونەی تێکەڵبوونی ئەو پرسانەو رووداوەکان بکاتو هەروەها هۆکارەکانی دەتوانێت هەڵکشانو داکشانی پەیوەندییەکانی ئێرانی-تورکی سەبارەت بەپەرەسەندنەکانی باکووری عێراق درك بکات.

داڕمانی یەکێتی سۆڤێت فەزایەکی سیاسی گشتی هێنایەئارا کەتێیدا جووڵانەوە ئیتنییە جیاخوازەکان پشکوتنو گەشەیانکرد. ئەوەی ئازەربایجانی ئێران هەستێکی جیاخوازی بەهێز بەرهەمبهێنێت لەوانەیە بۆ مێژوویەکی دوور دەگەڕێتەوە، بەڵام لەساڵانی ١٩٩٠کاندا وادەردەکەوت روودانی کەمتر چاوەڕواننەکراو بێت، لەکاتێکدا بوونی دەوڵەتێکی سەربەخۆی ئازەربایجان هاندانێکی هێنایەئارا بۆ خولیای پەیوەستبوون بە برا ئازەربایجانییە خاوەن سەروەرییەکانیان.[٢٧٣] ئەگەر هەڕەشەیەکی بەم چەشنە بۆ یەکێتی خاکی ئێران توندبێت (ئەو پەرەسەندنەی کە

---

٢٧٢ بۆ دیدێکی روون سەبارەت بەهەرێمەکەو پێگەی هەریەك لە ئەرمینیاو ئازەربایجان لەپەیوەندی لەگەڵ ئێران ( و تورکیا) بڕوانە شێوەی ٢. ١. ١ : کوردستان لەچوارچێوەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

.٢٧٣ بۆ شرۆڤەکارییەکی هاوچەرخ سەبارەت بە شوناسی ئیتنیو جووڵانەوەی کەمینەی ئازەری ئێرانی بڕوانە:
Touraj Atabaki (2001), Azerbaijan. Ethnicity and the Struggle for Power in Iran, London: I.B. Tauris.

بێگومان خولیای جیاکردنەوەی کوردستانی ئێران دێنێتەئارا)، ئەوا ئێران تورکیا بەوە تۆمەتباردەکات کە هێزێکی پاڵنەرە لەپشتی ئەو پەرەسەندنانەو بەگوێرەی ئەوەش کاردانەوەی دەبێت. هەروەك فولەر ئاماژەی بۆکردووە، سەرچاوەی سەرەکی ئێران بۆ تێکدانی تورکیا زۆر بەتایبەتی بریتیدەبێت لە هاندانی چالاکانەو هاوکاریکردنی کوردە جیاخوازەکانی تورکیا.[274] لەڕاستییدا، هەڕەشە نێوخۆییەکان " گوێزەرەوەیەکی نموونەییە بۆ پێشخستنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتە دەرەکییەکان"و "دابینکردنی یارمەتی بۆیان دژی گروپە چەکدارە یاخییەکان...بەشێوەیەکی ڕێژەیی ئامرازێکی هەرزانو کاریگەرە بۆ جەختکردنەوە لەدەسەڵاتی هێزێك."[275] بەم شێوەیە ئێران فشاری خستەسەر تورکیا بەدابینکردنی بنکە بۆ پەکەکە لەسەر خاکی ئێران، یان بەهاندانی ڕێحەزە ئیسلامییەکان لە سیاسەتی نێوخۆی تورکیادا. لەراستییدا، هەردووکیان تیکەڵی یەکتر بوون لەکاتێکدا " گەورەترین هەڕەشە بە رووی لە تورکیادا خودی پەکەکە نەبوو، بەڵکو هاوکاریی نێوان پەکەکەو ئیسلامییەکان بوو." [276]

نموونەیەك، کە خزمەت بە بەرجەستەکردنی فرە هەستیاری ئێران دەکات سەبارەت بە پەیوەندی نێوان گرفتی کوردیی لەئێرانو کێشەی ئازەربایجانەکەی، هەروەها هاوسەنگی دیالێکتیکی نفوز لە کوردستانی عیراقدا، بریتییە لە ململانێ سەربازییەکە لەسەر ناگۆرنۆ-قەرەباغ کە ئەرمینیاو ئازەربایجانی بۆماوەیەکی درێژ لەبەرامبەر یەك راگرت. ئەوەی کە ئێران لەسەرەتادا لانیکەم پشتگیری سیاسی خۆی بەخشییە ئەرمینیا – زۆر لەوانەیە هەوڵێك بووبێت بۆ هاوسەنگی تورکیاو وتاری پان تورکیستی باکۆ. تورکیا بەشێوەیەکی چەسپاو لەپشت باکۆوە راوەستابوو، ئەوەی لە پشتگیری ئەمەریکاشی بەدەستهێنابوو کە هاوبەشی تورکیا بوو لە ناتۆدا. ئێران وتاری پان تورکیستی ئازەربایجانی وەك بەرسینگگرتنێکی ناپێویستی سەبارەت بە دانیشتووانە ئازەرییە تورکەکەی لەقەڵەمدەدا، هەروەها هۆکارگەلێکیشی بۆ ترسان

274 Fuller (1994), p. 36.
275 David (1991), p. 241
276 Olson (2001), P. 34.

هەبوو لەوسۆنگەیەوە کە هەژانێکی نەتەوایەتی کوردیی وادەکات ئازەرێکانی ئێران بەشێوەیەکی مەترسیدار لەلایەن نەتەوایەتی تورکییەوە کاریان تێبکرێت. گەر سیناریۆیەکی بەم چەشنە بهاتایەتەدی، دەتوانرێت وا وێنای تورکیا بکرێت کە ئەو دەرەفەتە بۆ کۆنترۆڵکردنی ناوچە کوردییەکان لەباکووری عێراق وەك هەوڵێك بۆ دامەزراندنی ناوچەیەکی ئاسایشی بەرامبەر بەدانیشتووانە ئازەرییە تورکەکەی ئێران بقۆزێتەوە. بۆ رێگرتن لەم خەونۆکەیە، ئێران خۆی لەبیرۆکەی برایەتی موسوڵمانان بەدوورگرتو بووە هاوسەنگەری ئەرمەنییە کریستیانیەکان لەدژی وڵاتی ئازەربایجانی موسوڵمان.[٢٧٧]

یەك لەهۆکارە سەرەکییەکانی مەترسی ئێران کە لەناوەڕاستی ١٩٩٠کاندا سەریهەڵدا بریتیبوو لەهاوپەیمانی تورکی-ئیسرائیلی، هەروەها ئەو مەترسییەی کە تەنانەت پەیوەندی نزیکی نێوان ئەو دووانە هەروەها دەبێتەهۆی زێدەبوونی پەیوەندییەکانی نێوان باکۆو تەلەئەبیب. تاران لەو بڕوایەدابوو کە هاوپەیمانی تورکی-ئیسرائیلی دەروازەیەك بۆ ئیسرائیل بەرەو قەفقاسو بەتایبەتی بۆ ئازەربایجان دەکاتەوە. هەروەك لەلایەن رۆبەرت ئۆڵسنەوە دەربڕاوە،" دوا شت ئێران بیەوێت بریتییە لە دەستێوەردانی ئیسرائیل، لە هاوکاریی لەگەڵ تورکیا، لەئازەربایجانو هەروەها لەکێشەی ئازەربایجانەکەی ئێران خۆیدا."[٢٧٨] ئەمەش دەمانگێڕێتەوە بۆ یادەوەرییەکانی سیاسەتی عوسمانی سەبارەت بەئازەربایجان، ئەوەی " لە ئێراندا مەترسی تورکیزمی وەك خەتەرێکی سەرەکیی بۆ یەکپارچەیی دەوڵەت هێنابووەئارا."[٢٧٩] لەکاتی لایەنگری تورکیا لەهەر سیاسەتێکی دوژمنکارانە بەم ئاراستانە، ئێران دەتوانێت لەرێگەی بەکارهێنانی کارتی پەکەکەوە وەڵامبداتەوە، لەوەش زیاتر، رەوتی ئیسلامیست لەتورکیا هانبداتو هەروەها لەمەسەلەی هاوپەیمانیش لەگەڵ سوریا، کاریکاتە سەر پەرەسەندنەکانی بەرەی رۆژئاوای تورکیا، هەروەك کێشەی قوبرسو پەرەسەندنەکان لەدەریای ئیجەدا. لەم

---

277 Id. (1994), p. 59
278 Id. (1998b), p. 19.
279 Swietochowski (1994), p. 121

رووەوە، پەیوەندییەکانی یۆنانی-ئەرمەنی-ئێرانی کە لەماوەی سالانی ١٩٩٠کان زۆر بەهێزبوو جێگای بایەخە. هەرچەندە، لەبەرتیشکی ریفۆرمی سیاسەتی دەرەوەی یۆنانیو هەروەها گرتنی عەبدوللا ئۆجالان لەلایەن تورکیاوە، ئەم هاوکارییە پەیوەستێکی کەمتر هەلدەگرێت. دوای وتنی ئەوە، گرنگە کە چاو لەو راستییە نەپۆشرێت کە:

" پێدەچێت پەیوەندییەکی نزیك لەنێوان سیاسەتەکانی ئێرانو تورکیای رۆژهەلاتی دەریای سپی ناوراستو هەروەها قەفقاسو ئاسیای ناوەندی هەبێت کەلەلایەن زۆربەی چاودێرانەوە دانیپێدانراوە. تەنیا ناوچەیەك کە هەریەك لەو دوو ولاتە تێیدا هێندێك توانای مانۆریان هەبێت بریتییە لەباکووری عێراق ئەوەش ئەو هۆکارەیە وادەکات کێبرکێ لەپێناو پێگەو دەسەلاتدا لەوێ زۆر توندبێت."[280]

مەترسی ئێران لە هاوکاری تورکی-ئازەری و ئەگەری ئاکامی ناراستەوخۆو جدیی بۆسەر ئێران پێناچێت بێپاساو بێت. عەلیێڤی سەرۆکی ئازەری لەسەردانێکیدا بۆ تورکیا لەمارتی ٢٠٠١دا، داوای دامەزراندنی بنکەیەکی سەربازیی تورکی کرد لەئازەربایجان. هەرچەندە، بەرپرسە بالاکانی ئازەریجان پێشتر هەمان داواکارییان هەبوو، بەلام ئەوە یەکەمین جار بوو راگەیاندنێکی وا لەلایەن خودی سەرۆکەوە بکرێت.[281]

بەلەبەرچاوگرتنی وێنەی گەورەی ئەو بایەخە جیۆپۆلیتیکیو جیۆستراتیجییەی رووبەرووی ئێرانو تورکیا ببۆوە، ئاشکرا دەبێت کە چ شتێك بەرژەوەندییەکانی هەر دوو ولات لەباکووری عێراقدا ئاراستە دەکاتو چۆن پەرەسەندنەکانی هەرێمە کوردییە خودحوکمرانەکە کاردەکاتە سەر پەیوەندییە دوولایەنەکانیان. تیمێکی بالای ئاسایشی تورکی کە لەلایەن جێگری وەزیری ناوخۆی تورکیاوە سەرۆکایەتی دەکرا لە ئەپرلی ٢٠٠١دا بۆ گفتوگۆی ئاسایشی لەگەل بەرپرسانی ئێرانیدا گەیشتنە تاران. ئەم گفتوگۆیانە لەبارەی "هاوکاری هاوبەشو تاوانە دەرەکییەکان"ەوە بوو (وێرای ئاماژەیەکی روون بە کارە زیانبەخشەکانی پەکەکە)، کە ئاکامەکەی چوونی

280 Olson (1998b), p. 20.
281 Tehran Times, 17 March 2001 (author unknown).

تانتانی وەزیری ناوخۆی تورکی بوو بۆ تاران‌و لەوێ بیرخستنەوەکی لێکتێگەیشتنی لەگەڵ هاوپێگە ئێرانییەکەیدا، موسەوی لاری، مۆرکرد. بیرخستنەوەکە بەتایبەت "کارە دیاریکراوەکانی تیرۆریزم" ی کردە ئامانج‌و کۆمسیۆنێکی بالاّی ئێرانی-تورکی دامەزرێنرا کە ئەرکی چاودێری هەڵمەتە هاوبەشەکان لەهەریەك لەخاکی ئەوی دیکەیاندا بگرێتە ئەستۆ.[282] پەرەسەندنێکی بەم چەشنە مانای ئەوەیە کە ئەم دوو زلهێزە هەرێمییە جەخت لەپەیوەندی دۆستانەی نێوانیان دەکەنەوە، سیاسەتێکی بەو چەشنە کەباشترین راژەی بەرژەوەندییەکانیان دەکات. هەرچەندە، ئەم دوو هێزە تەنیا ئەو وڵاتانە نەبوون کە بەرژەوەندییان لەکاروبارەکانی ناوچە خودحوکمڕانە کوردییەکەی عێراقدا هەبوو، ئەم بابەتی دادێ، تێدا قامك دەخەینە سەر زۆر لە رووخسارە پەیوەندیدارەکانی بەرژەوەندی ئەکتەرە هەرێمییەکانی دیکە لەهەرێمەکەدا.

## ٦ . ٣ ئەکتەرە گرنگەگانی دیکە

### ٦ . ٣ . ١ عێراق

"ئەوانەی بەشێکن لەوڵاتێکی وەك عێراق فرە رێزلێگیراوو شەرەفمەندانەترن لەوانەی لەبەشێکی بچووکی دامـاودا ژیان دەگوزەرێنن...ئەوە تەنیا کەسە کەم عەقڵەکانن کە لەپێناو گوێچەمێکی راوەستاودا دەریایەکی مەزنی پاکژ جێدەهێڵێن، ئەو گوێچەمەی کەلەلایەن بێگانەوە دەستی بەسەرداگیراوە، ئەوانەی کە هەرکاتێك ئارەزووکەن ئاویشیان لێدەبڕن." سەدام حسێن ، قسەکردنێك لە تیڤی عێراقیەوە، ژوئیەی ٢٠٠١.

ئەو قسەیەی سەرەوە لەلایەن سەرۆکی عێراقەوە ئەو بێهیواییە روونەدکاتەوە سەبارەت بەو حاڵەتە ناوازەیە هەبوو کەتێیدا بەشێکی بەرچاوی وڵاتەکە لەدەرەوەی کۆنترۆڵی دەسەڵاتی ناوەندیدا مابۆوە. عێراق لەئاکامی جەنگی دژ بەکوەیتدا،

282 See for instance Iran News, 10 and 12 May 2001 and Iran Daily, 12 May 2001.

بەتوندی لەڕووی توانای پیادەکردنی دەسەڵاتو نفوزی بەسەر باکووره کوردییەکەدا لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە کۆتوبەند کرا. توانایەکی مانۆڕی هێندە مەزنی ئێرانو تورکیا سەبارەت بە ناوچە خودحوکمڕانەکە پێشانیدەدات کە رۆڵی بەغدا لەپاش کێشانەوەی دەزگا کارگێڕییەکانی لەکوردستانی عێراق لەکۆتایی ساڵی ١٩٩١دا، بەرادەیەکی وا کەمبۆوە کە عێراق نەیدەتوانی بەهەمان ئاست کێبڕکێ بکات هەروەك ئەوەی دراوسێکانی رۆژهەلاتو باکووری خەریکی پیادەکردنی دەسەڵاتی خۆیان بوو لە "کوردستانی ئازاد"دا. بەوەش، عێراق، وێڕای ئەوەی ئەو چوارچێوە جیۆگرافییە (بەشێوەیەکی دیالێکتیکی سیاسییەش) بوو کە کوردانی عێراقی لێوە هەڵدەسوڕان، وێڕای ئەوەی ئەکتەرێکی گرنگە لەم شرۆڤەکارییەدا، وەك کەمدەسەڵاتێك مامەڵەی لەتەکدا دەکرێت.

وەڵامدانەوەی عێراق لەحاست نەتەوایەتی کوردیی خۆی لەنێوان جینۆسایدو راگواستنی بەکۆمەڵو تواندنەوەو هەروەها رەگەزگەلێکی ئەرێیی وەك ئۆتۆنۆمییەکی دیاریکراوی کەلتووریو ناناوەنگەراییەکی سیاسی کە شایەنی درككردنە، دەبینێتەوە. هەموو ئەم ستراتیژییانە بەشێوەیەك یان ئەوی تر لەمانگە پڕگێژاوەکانی پاش قەیرانی کەنداودا دەردەکەوێت. وێڕای لەدەستدانی کۆنترۆڵ بەسەر سێ پارێزگاکەی باکوور لەپاش ناچارکردنی هێزەکان بەپاشەکشە لەکوەیت لەساڵی ١٩٩١دا، عێراق خوازیار نەبوو سەبارەت بەپەرەسەندنەکانی هەرێمە ئۆتۆنۆمەکەی کوردستانی ناوەندی لەدواوە بمێنێتەوە. بەغداش، هاوشێوەی دوو هێزە سەرەکییە هەرێمییەکەی دیکە، لەنزیکەوە چاودێری کوردانی دەکرد. هەرچەندە، سوپای عێراقو حکومەتەکەی، بەپێچەوانەی ئێرانو بەتایبەتی تورکیا، و بەهۆی ئەو کۆتوبەندەی لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە خرابووە ئەستۆی، بەتوندی دەستێوەردانی لەکوردستانی ئازاددا سنووردارکرابوو، ئەو دەیزانی لەبەرامبەر هەر دەستوەردانێکی لە باکووردا چ تۆڵەسەندنەوەیەکی توند چاوەڕێی دەکات.

لەقۆناغێکی بەراییدا، کە هێشتا گەڕانەوەی ئاوارە کوردەکانی عێراقی زۆری مابوو تەواو بێت، سەدام حسێن هەوڵی دەستپێشخەرییەکی کردو بانگی نوێنەرایەتی کوردی کرد بۆ بەغدا کە پێکهاتبوون لە نوێنەرانی پارتیو یەکێتی بەمەبەستی

دانوسان سەبارەت بە ئایندەی کوردستانی عێراق.[283] ئەمە هەروەها هاوجووتبوو لەگەڵ ئەو مشتومڕانەی کە لە نەتەوە یەکگرتووەکاندا سەبارەت بە چۆنێتی ئەفراندنو پاراستنی دۆخێکی ئارام بۆ کوردان لەنێو عێراقدا دەگوزەرا. گفتوگۆکانی بەغدا لەسەر بنەمای ڕێکەوتننامەکەی ساڵی ۱۹۷۰ بوو،[284] سەرەتا پێدەچوو بەرهەمداربێت، و ڕاگەیەندرا کە سەرۆك سەدام حسێن وەك بنەما ڕازیبووە پلانە ئاشتییەکەی پێشوو جێبەجێبکرێت. هەرچەندە، پرسی سنوورەکانی هەرێمە ئۆتۆنۆمەکە بەچارەسەرنەکراوی مایەوە، ئەوەی بووەهۆی هەڵپەساردنی دانوسانەکان لەهاوینی ۱۹۹۱دا لەلایەن کوردانەوە. بڕینی پەیوەندییەکانی کوردی-عێراقی ئەو وەڵامەی عێراقی لێکەوتەوە کە بریتیبوو لە کێشانەوەی تەواوی دەزگا خزمەتگوزارییەکانی لەبەشی باکووری وڵاتەکە لە ئۆکتۆبەری ۱۹۹۱دا، بۆئەمەش، بەغدا کوردانی خستەژێر گەمارۆیەکی ئابوورییەوە.[285] ئەمە دۆخێکی وای لێکەوتەوە کە کوردان خۆیان لەهەلومەرجێکی زۆر سەختی ئابووریو گوزەراندا بینییەوە کە جووت گەمارۆکە هێنابوویەئارا، گەمارۆی نەتەوە یەکگرتووەکان بەسەر عێراقداو هاوکات گەمارۆی عێراقیش بەسەر کوردستانی عێراقدا.

سەدام حسێن کەدەستی بەکوردانی خۆیدا نەدەگەیشت، ستراتیجی پشتگیریکردنی گروپە کوردییە-تورکییەکانی لەدژی ئەنکەرە گرتەبەر. پەکەکە کە بەشێوەیەکی بەرفراوان هەرێمە ئۆتۆنۆمەکەدا خەریکی هەڵسوڕان بوو، پێدەچوو لەلایەن بەغداوە بەکاربهێنرێت بۆ فشارخستنە سەر تورکیا تاکو سنوور بەڕووی کوردستانی ئازاددا داخات، ئەوەش کوردی عێراقی بەتەواوی دادەبڕی. لەکاتێکدا کە هەڵبژاردنێکی ئازادو دادپەروەر لە هەرێمە ئۆتۆنۆمەکەدا بەڕێوەچوو، ئەو کاردانەوەیەی بەهۆی چالاکیگەلێکی (ناشەرعی) بەم چەشنە هاتەئارا، لەلایەن عێراقەوە ورووژانێکی توند بوو. بەوەش کاتێك پاشتر پرۆسە دیموکراتییەکە لەنێو شەڕێکی دژواری کوردییدا دارِمارا، بەشێوەیەکی ئاشکرای سەدامی دڵخۆشکرد. بەدرێژایی ساڵی ۱۹۹٤، INC کۆنگرەی نیشتیمانی عێراقی کەوتە ناوبژیوانیو گەیشتنە چەند ڕێکەوتنێك، هەرچەندە، ئەو ڕێکەوتننانە هەڵگیرسانەوەی شەڕی

---

283 Mallet, FT, 26 April, 1991.

٢٨٤ هەروەك لە باسی یەکەمدا سێکشنی ٢. ٣، ١ دا ئاماژەی بۆکراوە.

285 Laizer, (1996), p. 46.

براکوژی بەدوادا دەهاتەوە. ئەو رێکەوتنە کورتخایەنانـە تەنانـەت سـەدام حسێنیشی هێنابووە سەرخەت، بەوەی یارمەتی بەغدای بۆ دامرکانەوەی ململانێیەکە پێشنیاز کردبـوو.[٢٨٦] بـەو خەیاڵـەی دەسـەڵاتی ناوەنـدی بـۆ بەشـەکانی بـاکووری وڵاتەکـە بگێرێتەوە.

هەرچەندە، سوپای عێراق رێگەی چوونە نێو ناوچەکەی پێنـەدەدرا، بـەڵام لەسـەر بانگەشەیەکی چاوەڕواننەکراوی مەسعود بارزانی یەك لەسەرکردەکانی کورد، لەئوتی ١٩٩٦دا بەرەو هەرێم کشا. پارتی کە نەیدەتوانی سەرکەوتووانە لەبەرامبەر هێزەکانی یەکێتی هاوسـەنگی رابگرێـت کـە لەلایـەن هێـزی سـەربازی ئێرانییەکانـەوە پاڵپشـتی دەکـرا، داوای یارمـەتی سـەربازی عێراقـی کـرد، کـە هەلومەرجەکـەی لەکۆمـەڵگای نێودەوڵـەتی ئـاڵۆزکرد کـە چـۆن کاردانەوەیـەکیان هـەبێت. هەرچـەندە، فشـاری نێودەوڵەتی وایکرد کە عێراق پاش سێ رۆژ بکشێتەوە، بەڵام تەنیا هاتنەناوەوەیەکی کورتخایەنی وا بەسبوو بـۆ ئـەوەی ئامانجگـەلێکی دیـاریکراو بـەدیبێنێت. ئامـانجێکی سـەرەکی داگیرکـاری عێراقـی بێگومـان بریتیبـوو لـە وێرانکردنـی INC کـە بنکـەی لەکوردسـتانی ئـازاد بـوو، هـەروەها پـەلاماری خێـرا، بـەڵام کاریگـەری عێراقـی لەڕاستییدا گورزێکی توند بوو لەگروپە ئۆپۆزسیۆنەکانی عێراقی. ئەوان ناچاربوون لە هەرێمەکە هـەڵبێنو هەواڵـەکانیش باسـی ئیعـدامکردنی بەکۆمـەڵی زیـاتر لـە ١٠٠ ئەنـدامی INC یـان دەکـرد.[٢٨٧] هـەروەها هاوپەیمانێتییـە کورتخایەنەکـە راژەی بـە پێویسـتییەکانی بەغـدا کـرد کـە رێگـەی لولـە نەوتـەکانی نێـوان عێـراقو تورکیـا بەکراوەیی بهێڵێتەوە. سـەبارەت بـە پێویسـتییەکانی پـارتیش دواتـر لـەهاوینی ١٩٩٦، ئـەوان لاوازبـوون، وێـڕای ئـەوەی یـەکێتی بەپشـتی ئێـران بـەخێرایی لەباشـوورەوە لەناوچـەکانی بندەسـتی پارتیـدا پێشـڕەوی دەکـرد، بـارزانی رووبـەڕووی پلانێکـی تورکیی بووەوە کە پەکەکە هاندەرەکەی بوو سەبارەت بە فراوانکردنـی سـنوورەکانی بۆ ١٥میـل لـە بـاکووری عێـراق (بەرێکـەوت ئەوناوچـەیەی لـەژێر کـۆنترۆڵی پارتیـدا بوو)، هاوشێوەی زۆنە ئاسایشییەکەی ئیسرائیل لەباشووری لوبنان. بەگوێرەی وتـەی ئۆڵسن، ریسکی ئەوە هـەبوو کـە " تورکـان هـەوڵی سـنووردارکردنی پـارتی بـدەن بـۆ

---

286 Jarrah, MEI, No 492, 20 January 1995.
287 SvD, 8 September, 1996, (author unknown).

تەنیا بوونێکی رەمزی."[288] شتێکی وا کە هاتنەناوەوەی کورت بەڵام بەهێزی بەغدا لەوانەیە یارمەتی رێلێگرتنی دابێت.

لەم شرۆڤەکارییانەو ئەوانەی پێشوودا پێشاندراوە کە حکومەتی ناوەندی عێراقی بەبەردەوامی وای بەپێویست زانیوە کەبۆئەوەی لەدەسەڵاتدا بمێنێتەوە دژ بە هەرەشەی ئۆتۆنۆمییەکەی کوردان بوەستێت، ئەو رێحەزەی پێدەچێت بەردەوامی بەوەبدات کە باکووری عێراق بۆ باوەشی رژێمێکی عەرەبی سەرکوتکەر لەبەغدا بگەڕێتەوە. تێوەگلانێکی سەربازی بەو چەشنە چەندین جار پێویستی بەرووبەڕووبوونەوەی ئێران کرد وەك پشتگیریکارێکی سەرەکی کوردانی عێراق. ئێران بەتەنیا هەڕەشەیەکی بەرچاو بەڵام ئاسان جڵەگیرکراو بوو بۆ عێراق. ئەوەی وایکردبوو هێزەکانی ئێران بەشێوەیەکی مەترسیدار بەریان پێنەگیرێتو عێراقییەکان لەجەنگی ئێران-عێراقدا ببەزێنن ئەوە نییە کە رۆژئاوا بەشێوەیەکی بنەڕەتی پشتگیری عێراقیان نەکردووە، بەڵکو هێزی ئێرانی لەگەڵ هەڕەشەیەکی گەورەی نێوخۆیی هاوجووتبوو کە لەلایەن کوردانی عێراقەوە پێشخرابوو. بەوەش، پێدەچێت هەڕەشەیەکی دەرەکی فشاربەر بێت گەربێتو فاکتەرێکی نێوخۆیی کاربکاتە سەر قەبارەی هەڕەشە دەرەکییەکە، کە جارێکی دیکە خاڵی هاوسەنگی گشتی گێڕایەوە.

ئەوکاتەی لەساڵی ١٩٩١دا کوردستانی عێراق لە قاڵبی عێراق دابڕا، بەغدا بۆچەندین جار کوردانی بانگێشتکرد سەرلەنوێ گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی ناوەندیدا بکەنو ملکەچی دەسەڵاتی سەدام حسێن بن.[289] سەرۆکی عێراق بەبەردەوامی باسی لە" رەوشە نائاساییەکەی قەوارە ئۆتۆنۆمەکەی باکوور کرد، ئەوەشی خواست کە ئەو هەرێمە دابڕاوە بگێڕنەوە ژێر کرنترۆڵی بەغدا. لەژوئیەی ٢٠٠١دا، سەرۆکی عێراقی بەشێوەیەکی بەرفراوان قسەی لەبارەی خەڵکی ناوچە خودحوکمڕانەکە کرد لەبەردەم ئەنجومەنی تەشریعییەکەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی سەربە خۆی.[290] سەرۆك سوور بوو لەسەر ئەوەی کە ئەگەر کوردان لە باکوور بڕیار لەئایندەی نەتەوەییو

288 Olson (2001), p. 20.
289 E.g. AFP, 10 March 2000.
290 All the following quotes are from Iraq News, 16 July, 2001, 'Saddam Threatens Kurds, Iraq
TV, July 15', (FBIS Translated Excerpt).

سیاسییان بدەن " بژارەیان هیچ شتێکی دیکە نییە جگەلە بژارەیەکی نەتەوایەتی عێراقیی رەسەن...لەبەرئەوەی کاروباری ژیانی گەلەکەمان لەعێراق یەکێکە، جا چ عەرەب بن یان کورد." لەوەش زیاتر، توانای ئەو بۆ " چارەسەرکردنی هەر دۆخێك کە زیانی بەعێراق گەیاندووە" ئاماژەیەکی شاراوە بوو سەبارەت بەپرسی کورد، هەروەها سەدام بەبەردەوامی جەختی لەوەدەکردەوە کە نیشتیمانپەروەری عێراقی هەمیشە وەك گرنگترین بنەما دەمێنێتەوە، لەکاتێکدا" بەسرە هی خەڵکی کوردە هەروەك سلێمانیش هی خەڵکی نەجەفە." بەگوێرەی قسەی سەرۆك، یەکێتی وڵاتەکە لەڕاستییدا خزمەتکرا کاتێك سێ پارێزگاکەی سەرەوە لەساڵی ١٩٩١دا بەناو لە جەستەی عێراق جیاکرانەوە، کاتێك "ویستمان گەلی کورد لەرێگەی تێەڕین ئەم ئەزموونەدا ئەوە درك بکەن کە کێ بەرجەستەی ویژدانو عەقڵو سیاسەتەکانیان دەکات." بەو پێیەش، پێدەچێت گومانی تێدا نەبێت کە رژێمی سەدام حسێن چاوەڕێی دەرفەت بکاتو ئەو دەمە دەکەوێتەکار کە بەدروستی دەزانێت.

## ٦ . ٣ . ٢ سوریا

رۆڵی سوریا لەپەرەسەندنە سیاسییەکانی باکووری عێراق بەشێوەیەکی تایبەت بەرچاو نەبوو، وڵاتەکە، وێڕای شوێنی جیۆگرافی هاوسنووری لەگەڵ هەرێمە ئۆتۆنۆمەکە، رۆڵی ئەکتەرێکی لاوەکی دەگێڕا. هەرچەندە، کاریگەریی خۆشی هەبوو، لەکاتێکدا لەناوەڕاستی ١٩٩٠کاندا، ناو بەناو تەنیا رێگەی هاتنو چوون بوو بۆ هەرێمە داخراوەکەی کوردستانی ئازاد.

لەناوەڕاستی ١٩٩٠کاندا، مەسەلەی ئاو یەکێك بوو لەسەرەکیترین پرسە سیاسییە گرنگەکان بۆ دیمەشق، ئەوەی وای لەسوریا کرد پەنا بۆ کارتی کورد بەرێت کە پەکەکە بوو، بەمەبەستی ناچارکردنی ئەنکەرە تاکو هەڵوێستێکی نەرمتر لەحاست بەشداریکردن لەئاوی فوراتدا بگرێتەبەر. ئەوەندەی پەیوەستە بەمەسەلەی ئاوەوە، کێشەی کوردیی هەرێمی هێندە لەسیاسەتی سوریادا بەرجەستە نەبوو. هەرچەندە، سوریا لەرووی جڵەوکردنی کێشەی کوردانی خۆیدا، لەپێگەیەکی ئەوتۆدا بوو بەشێوەیەکی زیاتر ئازادانە لەئێرانو تورکیا یاری بەکارتی کورد بکات. پشتگیرییەکی ئەوتۆی سوریا لەپەکەکە بەشێوەیەکی سروشتی کاری

لەپەرەسەندنەکان لەباکووری عێراقدا کردو ئەو پشتگیرییە بووەهۆی ناجێگیری لەناوچەکەدا، بەلاّم هیچ تێوەگلانێکی راستەوخۆی سوریا لەناوچە خودحوکمڕانەکەدا نەگەیشتە ئاستێکی بالاّ. پێدەچێت سوریا لایەنگری لەهاوکاری نێوان پەکەکەو پارتی کردبێت، وەك ئۆڵسن دەڵێت" بەئومێدی دابینکردنی دەروازەیەك لەکوردستانی عێراقەوە لەنێوان سوریاو ئێرانی (هاوپەیمانە درێژخایەنەکەی)."[291]، دیدێکی وا کە تورکیا بەهەرحاڵ بەشداری تێدانەکرد.

پێدەچێت سوریا وەك هێزێکی نێوەنجی لەسیستمێکی هەرێمی دزەتیاکراودا بناسێنرێت، ئەوەی ئیحتیشامیو هینەبووش دەیکەن (ئەم پێناسەیە هەروەها ئێرانیش دەگرێتەوە)، ئەوان پێشانیانداوە کە سوریا بەهێزێکی نێوەنجی لە سیستمی جیهانیدا ریزبەند دەکرێت بەلاّم لە سیستمی هەرێمیدا وەك ئەکتەرێکی سەرەکی بەرجەستەدەبێت. لەڕاستییدا، سوریا "بەوە لە هێزگەلە هەرێمەییە لەخوارترەکان جیادەکرێتەوە...کەناوەندی هاوسەنگی هێزە هەرێمییەکان پێکدەهێنێت."[292] نموونەیەك بۆ روونکردنەوەی ئەمە بریتییە لە دواکاری بەشداربوون لەو هەوڵەی لەچوارچێوەی هاوکارییەکی هەرێمی لەپاش دامەزراندنی قەوارە ئۆتۆنۆمە کوردییەکەی ساڵی ١٩٩١دا هاتەئارا. هەرچەندە، لەکۆتایی ١٩٩٠کاندا، زیاتر لەئاکامی بەهێزبوونی هاوپەیمانی نێوان تورکیاو ئیسرائیلەوە (هەروەها ئەو رۆڵەی کە لەوێدا لەلایەن ئەمریکاوە بینرا)، پێگەی تورکیا بەشێوەیەکی بەرچاو لاوازبوو، بەشێوەیەك لە ئۆکتۆبەری ١٩٨٨دا ناچاربوو عەبدوڵلا ئۆجالان دەربکات بۆئەوەی رێگە لە راگەیاندنی جەنگ لەلایەن تورکیاوە بگرێت. چەند مانگێك پێشتر، سەرۆك حافز ئەسەد خۆی گەیاندە تاران وەك هەوڵێك بۆ چالاککردنەوەی پەیوەندییەکانی وڵاتەکەی بەکۆماری ئیسلامییەوە،[293] تاکو ئامادەکاریی بۆ ساتە فرە سەختەکان بکەن، بەلاّم کێشەی ئێران لەگەڵ تالیبانی دراوسێ[294] ئەوەی گەیاند دیمەشق چاوەڕێی پشتگیرییەکی دەرەوە نەکات کاتێك خۆی لە بارێکی سەختدا سبارەت بە

291 Olson (2001), p. 25.

292 Ehteshami and Hinnebusch (1997), pp. 6-7.

293 Olson (1998b), p. 19.

٢٩٤ کوشتنی هەشت دیپلۆماتە ئێرانیو رۆژنامەنووسەکە لە کۆنسولخانەی ئێرانی لەمەزارئەلشەریف لەلایەن هێزە پێشڕەوییەکانی تالیبانەوە هەردوو وڵاتەکەی لەپایزی ١٩٩٨دا لەلێواری جەنگ نزیك کردەوە. بڕوانە:
Barzin, MEI, No 583, 18 September 1998.

**پەیوەندییەکای لەگەڵ ئەنقەرە ببینێتەوە.**

**دیمەشق بە لەدەستدانی کارتی پەکەکە، هەروەها مانۆڕە سیاسییەکەی پێشووی لەدژی دراوسێ بەهێزەکی باکووری لەدەستدا، لەئاکامی ئەوەش پێگەکەی وەك هێزێکی نێوەنجیو ئەکتەرێکی سەرەکی لەهەرێمەکەدا کەوتەژێر پرسیار. لەراستییدا، هاوجووتە لەگەڵ ئەنجامگیرییەکی ئۆڵسن دا کە " ئەوە زیان بەتوانای سوریا دەگەیەنێت کە ببێتە یاریزانێکی سەرەکی لەباکووری عێراقو سوودبەخشی سوریا بۆ ئێران وەك هاوپەیمانێك لەرۆژهەلاتی دەریای سپی ناوەڕاست کەمدەکاتەوە."[295] دەتوانرێت هەولی سوریا بۆ چاککردنی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ عێراقدا،[296] وەك هەوڵێك بۆ گێڕانەوەی بەشێك لە نفوزە هەرێمییە لەدەستچووەکەی ببینرێت، سیاسەتگەلێکی بەم چەشنە لەوانەیە کاریگەریی لەسەر رەوشەکەی کوردستانی عێراق هەبێت.•**

## ٦ . ٣ . ٣  ئیسرائیل

**ئیسرائیل کە بەقەبارە بچووكو لەڕووی سیاسییەوە سەنگێکی قورسی لەسەر شانۆ**

---

295 Olson (2001), p. 157.

٢٩٦ لەساڵی ١٩٩٧دا سنوورەکان سەرلەنوێ کرانەوە. ئەوە دووەمین سەرۆکی حکومەتی عەرەبی بوو لەدوای ١٩٩١ەوە سەردانی عێراق بکات ( پاش ئەردەن لە نۆڤەمبەری ٢٠٠٠دا)، سەرۆك وەزیرانی سوریا، محەمەد مستەفا میرۆ لەسەرەتای ئوتی ٢٠٠١دا گەیشتە بەغدا، وێڕای ئەوەی کە یەکەمین سەرەك وەزیران بوو لەماوەی ٢٠ ساڵدا سەردانی عێراق بکات. AP, August 11 2001

• سوریا لەساڵانی ١٩٨٠کاندا لەئاکامی دوژمنایەتی لەگەڵ بەعسی عێراق ببووە ناوەندی هێندێك لە هێزە ئۆپۆزسیۆنە عێراقییەکانو پەیوەندیشی بە پارتە کوردییەکانەوە هەبوو، بەتایبەت یەکێتی نیشتیمانی. سوریا لەساڵانی ١٩٩٠کاندا، لەسونگەی تێڕوانینی وشکە قەومیانەوە، دژ بەدامەزراندنی حکومەتی هەرێمو فیدراڵی وەستایەوەو لەگەڵ ئێرانو تورکیا کەوتە هاوکاری، بەڵام بەهۆی ناکۆکی لەگەڵ تورکیاو کاریگەری مەسەلەی ئاوو پەیوەندی تورکیا–ئیسرائیل، تاڕادەیەك کشایەوەو زیاتر هەوڵی راکێشانی پەکەکەی بۆلای خۆیدا، سوریا دژی رێکەوتننامەی واشینتگتۆنی نێوان پارتیو یەکێتیو پرۆسەی ئەردەنی بۆ فیدراڵی عێراق لەسێپتەمبەری ١٩٩٥و کۆنگرەی نیۆرك لەئۆکتۆبەری ١٩٩٩ دا وەستایەوە، مردنی حافیز ئەسەدو سەرقاڵی سوریا بە رووداوەکانی لوبنانو بەرەی رۆئاواوە بواری دەستێوەردانو کاریگەری لەسەر هەرێمی کوردستان کەمکردەوە، بەزێدەبوونی فشاری تورکیاو دەرکردنی ئۆجالان، کارتی پەکەکەش لەدەست سوریا هاتەدەرو هەژمونی خۆی تاڕادەیەکی زۆر لەدەستدا.

هەرێمییەکە هەبوو، بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە پێشوازی لە پارچەبوونی، مەزنترین دوژمنی خۆی، عێراقی دوای جەنگی کوێت کرد. عێراقێك کە هێندە بەهێز نەبێتو دەسەڵاتی ناوەندی بەسەر دەوروبەرا نەڕوات کە پێگەیەکی ئەوتۆ بەدەستبێنێت بۆ دوژمنایەتی دژی دەوڵەتی جوولەکە، شوێنێکی گەورەی لەبەرژەوەندییەکانی تەل ئەبیبدا هەبوو. لەراستییدا، پێدەچێت ئیسرائیل تەنیا هێزی هەرێمی بێت کە هەرشتێکی هەبێت لە هەڵوەشاندنەوەی عێراقو دامەزراندنی کوردستانی سەربەخۆ بەدەستبێنێت.[٢٩٧] لەو سۆنگەیەوە چالاکییەکانی ئیسرائیل لەهەرێمە ئۆتۆنۆمەکەدا چاوەڕواننەکراو نەبوو.

هاوشێوەی تێوەگلانی وڵاتانی دیکە لەهەرێمە ئۆتۆنۆمەکە، سیاسەتی ئیسرائیل نە ڕوونو نە ئاشکرابوو، بەڵام ئەوەی کە هەرێمە خودحوکمڕانە کوردییەکە لەباکووری عێراق بەشێوەی فرەرەهەند سەرنجی ئیسرائیلی راکێشا مەسەلەیەکە گومانی تێدا نییە. پاڵپشتیکردنی جووڵانەوەی نەتەوەیی کورد لەباکووری عێراق دواجار بەرجەستەی سیاسەتی لاوازکردنی عێراقو دوای ئەویش عەرەب دەکات. جگە لەم خواستە ئاشکرایانە بۆ ئیفلیجکردنی عێراق، یان لانیکەم کەمکردنەوەی توانای بەعسییە عێراقییەکان لەڕووی سیاسیو سەربازییەوە، هۆکاری دیکە بۆ بەرژەوەندی ئیسرائیل لەهەرێمەکە لەوانەیە بریتیبێت لە هێنانەدی چوونەناوەوە بۆ کەنداوی فارسو سەرچاوە نەوتییەکەی، بۆ ئەو مەبەستەش ئاسانترین خاڵی دزەکردن بریتیدەبێت لە کوردستانە نیوە سەربەخۆکەی عێراق. عێراق بەدڵنیاییەوە خاڵێکی لاوازبوو بۆ ئەوەی لێوەی دزەبکاتە کەنداوی فارس، بەتایبەتی لەکاتێکدا کە ئەردەن پەیوەندی نزیکی بە ئیسرائیلەوە هەیە.

پرسی باکووری عێراق پەیوەستێکی ئاشکرای بەپەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو ئیسرائیلەوە هەبوو، هەروەها لەگەڵ زێدەبوونی باڵادەستی نفوزی ئیسرائیل، ئەوەی کە ئاکامی بەرفراوانی لێکەوتەوە. لەگەڵ فراوانکردنی پەیوەندییەکانی نێوان تورکیاو ئیسرائیل، ئەوەکەی دواییان بەئاسانی لەڕێگەی دەزگای ئیستیخباراتی تورکییەوە (میت) دەیتوانی بەوردی چاودێریو هەروەها بەگونجاوی کاربکاتە سەر

٢٩٧ هەروەها پێدەچێت روسیاش ئەم پەرەسەندنەی پێ باش بووبێت، لەسۆنگەی ئەو پشتگیرییە سۆڤێتییەی بووەهۆی هێنانەئاراو پشتگیریکردنی کۆمارە کوردییە ئێرانییەکەی مەهابادی ساڵی ١٩٤٦.

پەرەسەندنەکانی هەرێمە ئۆتۆنۆمەکە. بەوتەیەکی دیکە، ئیسرائیل بەدڵنیاییەوە ئامادەگی هەیە بەڵام لەوانەیە بەڕاستەوخۆی نا.

ئیسرائیل بەدرێژایی ساڵانی ١٩٦٠کانو ١٩٧٠کان یارمەتی کوردانیانـدا،[٢٩٨] هەروەها لەدوای دامەزراندنی هەرێمە ئۆتۆنۆمەکەی کوردستانی عێراق لەساڵی ١٩٩١، دەزگای هەواڵگری مۆساد بەپێی هەموو ئەگەرەکان خۆی لەوێ دامەزراندووە، هەرچەندە، لەناوەڕاستی ١٩٧٠کانەوە، پەیوەندی فەرمی پێکنەهێنراوە. بیرۆکەیەکی ستراتیژی بەو چەشنە بۆ یەکەمین ساڵەکانی دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسرائیل دەگەڕێتەوە. یەکەمین سەرۆکی ئیسرائیل، بن گۆریۆن، لایەنگری پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ غەیرە عەرەبەکانی ناوچەکە دەکردو لەساڵانی ١٩٦٠کاندا، پەیوەندییەکی باش لەنێوان ئێرانییەکانو ئیسرائیلییەکان هەبوو، وێڕای پەیوەندییەکانی کوردیی-ئیسرائیلی.[٢٩٩] هەرچەندە، پاش ئەو گۆڕانە حەتمییەی لەپەیوەندییەکاندا هاتەئارا لەپاش شۆڕشە ئیسلامییەکەی ساڵی ١٩٧٩، سیاسەتی ئیسرائیلی بۆ ناجێگیری ئێران داڕێژرایەوە، هەروەك ئەوەی خواستی ناجێگیری وڵاتانی عەرەبیشی هەبوو. پێویستە لێرەدا جەخت لەوە بکرێتەوە کە لەڕووی ئایدیۆلۆجییەوە لەبەرژەوەندی ئیسرائیلدا بوو کە وڵاتێکی موسوڵمان هەڵوەشێت، هەرچەندە، کاتێك ئایدیۆلۆجی کەوتە بەرامبەر بەرژەوەندییە نەتەوەییەکان، هەروەك ئەوەی سەبارەت بە داڕشتنی سیاسەتی دەرەوەی ئێران لەحاست کوردستانی عێراق مشتومڕی لەبارەوەکرا، زۆرجار بەشی دۆڕان دەبێت.

بەوەش کۆماری ئیسلامی ئێران بووە بەشێك لەستراتیجی دژە-موسوڵمانی ئیسرائیل، هەروەها شانبەشانی ئامانجی بەشداریکردن لە نەهێشتنی رژێمی ئێستای عێراق، تەلەبیب پێدەچێت هەروەها هەرێمە کوردییە خودحوکمڕانەکە (وێڕای ناوچە تورکنشینەکانی قەفقاسو ئاسیای ناوەندی) وەك بنکەیەك بەکاربێنێت کە لێیەوە چاودێریو هەڵسەنگاندنی پەرەسەندنەکان لە ئێرانی دراوسێ بکرێت. ئەم سیاسەتی

---

٢٩٨ بۆ باسکردنێکی لێکدانەوەییو سەرنجراکێش سەبارەت بە چالاکییەکانی ئیسرائیلی لە کوردستانی عێراق لەماوەی ساڵانی ١٩٦٠کانو ١٩٧٠کان بڕوانە باسی ٧ و ٨ لە:
Jonathan Randal, (1998), Kurdistan. After such knowledge, what forgiveness?, London: Bloomsbury. See also McDowall (1996), p. 320.

299 Ofra Bengio has written extensively about this in her The Kurdish Rebellion in Iraq, (1998), Tel Aviv (publisher unknown).

ناجێگیرکردنەی ئیسرائیل  پێویستە وەك لەبەرامبەر پێشینەیەکی ئەو پەیوەندییە سێکوچکەیە ببینرێت کە لەساڵانی دوایدا لەنێوان هەریەك لە ئەمریکاو تورکیاو ئیسرائیل پەرەیانسەند.[300] "کارتی کوردیی" لەم هاوپەیمانیەتییەدا فرە گرنگە، لەسۆنگەی ئەو توانایەی کەوەك ئامرازێکی سیاسی دژی عێراق بەکاربهێنرێت بەڵکو هەروەها دەشێت لەدژی کۆماری ئیسلامیش. لەئێستادا، کەپەیوەندییەکی باش لەنێوان تورکیاو ئیسرائیل هەیە، سیاسەتەکانی ئیسرائیل سەبارەت بە پەرەسەندنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ غەیرە عەرەبدا بۆ تورکیادا تەرخانکرا، بۆ نموونە، رۆڵی ئیسرائیل لە دۆزینەوەو قۆڵبەستکردنی عەبدوڵلا ئۆجالانی سەرۆکی پەکەکە لەکۆتایی ساڵی ١٩٩٩دا.[301]

لەکاتێکدا کە ئیسرائیل لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەدوای وەبەرهێنانەوە بوو، تورکیاو پرۆژە گاپەکەی دەرفەتێکی باشیان فەراهەمکرد، بەڵام لەبەرامبەر ئاو، تەلئەبیب هاوکاری خۆی بۆ شەڕی تورکیا دژی پەکەکە پێشکەشکرد. ئیسرائیل بەهۆی تێوەگلانێوە لەکێشەی کوردیی تورکی، خۆی خستە نێو گێروگرفت لەپاش گرتنەکەی ئۆجالان لەفێبرایەری ١٩٩٩دا، ئەوەی کە دەزگا هەواڵگرییەکانی ئەمریکاو ئیسرائیل بەجدیی بەشداریانکرد. کاتێك باڵیۆزخانەکانی ئیسرائیل لەسەراسەری ئەوروپا لەلایەن کوردانی تووڕەو خرۆشاوەوە کرانە ئامانجو سێ لەخۆپێشاندەرانی کوردیش لەکۆنسوڵخانەی ئیسرائیلەوە لەبەرلین تەقەیان لێکراو کوژران، "ئاکامێکی چاوەڕواننەکراوی بەوشێوەیەی چاککردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا"[302] هەستێکی پەژارەو بێبڕواییان لەتەلئەبیب هێنایەئارا، ئاکامێکی بەو چەشنە بۆ دەوڵەتی جوولەکە کە چاوەڕواننەکراوبوو. هاوپەیمانی لەگەڵ تورکیا وای لەئیسرائیل کرد کەوەك ئەکتەرێکی هەنوکەیی ئامادەبێت لەسیاسەتی کوردیدا ، هەروەها پێدەچێت ئیسرائیل زۆری هەبێت لەو رۆڵە نوێکراوەیەی بیباتەوە تاکو

---

300 See for instance Jonathan Marcus' analysis 'Middle East's 'phantom alliance'', BBC, February 18, 1999.

٣٠١ بەهۆی هاوپەیمانی سەربازیی بەهێزیانەوە، ئیسرائیلو تورکیا بەردەوام هەوڵیان بەیەکتری داوە سەبارەت بە گروپە چەکدارەکان، ئەو هاوکارییەی یارمەتی مۆساد پێشاندەدات بۆ شوێنپێهەڵگرتنی ئۆجالان. بڕوانە بۆ نموونە:

AP, February 18 1999, and AFP, 19 February 1999 .

302 Robins (2000), p 77.

ئەوەی لەدەستیبدات.[303]

## ٦ . ٣ . ٤ روسیا

وەك زلهێزێكـی پێشـوو بـەڵام هێشـتا هێزێكـی سـەرەكی لەهەرێمەكـەدا، نفـوزو بەرژەوەندییـەكانی روسـیا لەرۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا گرنگـە. روسـیا پەیوەندییـەكی باشی لەگەڵ ئێران، عێراقو سوریادا هەیـە- هـەموو ئـەو وڵاتانـەی كـە دانیشـتووانی كوردیـان تێدایـە. پرسـی دەریـای قـەزوینو هـەروەها سـامانە گازییەكـەی لەگـەڵ بەرژەوەندییە جیۆسـتراتیژییەكان بەدڵنیاییـەوە گـرنگن، هـەروەها لەگـەڕان بـەدوای نوێكردنـەوەی رۆڵـی خـۆی لەرۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا، روسـیا هەرێمـە ئۆتۆنۆمەكـەی باكووری عێراقی پشتگوێ نەخستبوو.

بۆ روسیا، كـارتی كوردی لەسـەرەتادا بـەكوردانی توركیـاوە پەیوەسـتبوو، بـەڵام وەك رووداوەكـان دەریانخسـت، شـانۆی بنـەڕەتی سیاسـەتی پەیوەسـت بـە كوردانـەوە بریتییبوو لە كوردستانی ناوەندیی. لەكاتێكدا توركیـا لـەڕووی سـەربازیو هـەروەها سیاسییەوە لەسەرەتای سـاڵانی ١٩٩٠كـادا پشـتگیری لەخـەباتی چیچانییەكان كـرد بـۆ سـەربەخۆی لـەدژی روسـیا. مۆسـكۆش هـەمان هاوكـاری بـۆ پەكەكـە دابینكـرد- واتـە كـارتی چیچـانی لەبەرامبـەر كـاتی كـوردیی وایكـرد روسـیا بـەرەو بـاكووری عێـراق كەمەندكێش بكـات.[304] سیاسـەتی دەرەوەری روسـیا (نـزیككردنـەوەی دووركەوتـەكان/ ئاماژەیەكـە بـۆ هەوڵـەكانی روسـیا بـۆ گێڕانـەوەی هـەژموونی روسـی بەسـەر قەڵـەمڕەوەكانی پێشـووی یـەكێتی سـۆڤێتی لـە ئاسـیای ناوەنـدییو قـەفقاس) دەتوانرێت وەك پەیوەستبوون بە باكووری عێراقەوە ببینرێت لەڕێگەی پشـتگیری[305]

303 103.This is discussed at length by Olson (2001), pp. 152-55.

304 Id. (1998a), p. 6. Olson further discusses this in his book of 2001, pp. 180-181.

305 This concept is examined in Maxim Shashenkov's Security issues of the ex-Soviet Central Asian Republics, (1992), London: Brasseys' (for the Centre for Defence Studies). Tiouline also deals with this issue in his 'Russian Diplomacy: the Problems of Transition' in M. Mozaffari (ed.), Security Politics in the Commonwealth of Independent States (1997), London: Macmillan, pp. 35-52, as does Philip Roeder (1997), 'From

روسییەوە بۆ پەکەکە.

ئاماژەیەك سەبارەت بە بایەخی مۆسكۆ لەگرنگیپێدانی بەرفراوان بە كێشەی كورد بریتییە لە وتەی ژێنرالێکی روسی لە بەهاری ١٩٩٦دا:

پێویستە دەوڵەتێکی سەربەخۆی كوردیی دابمەزرێت. گەر ئێمە بتوانین ناكۆكییەكانی نێوان ئەرمینیاو ئازەربایجان بەلادا بخەین‌و بیانهێنینە پاڵ خۆمان، دەتوانین چەك لەئەرمینیاوە بۆ كورد دابین بكەین: بەیارمەتیدانی كورد، ئێمە یارمەتی خۆمان دەدەین...توركیا لەچوارچێوەی ناتۆدا بەهۆی فرۆكەهەڵگرەكانییەوە لەدەریای رەش دەتوانێت دەست بەسەر قەفقاسدا بگرێت. سوپاس بۆ كوردان دەتوانین رێگە لەمە بگرین.[٣٠٦]

سیاسەتی پێشگیریگردنی چالاكانە لەخولیا فراوانخوازییەكانی توركیا لەكۆتایی ساڵی ١٩٩٦دا ئاشكراتربوو، كاتێك تانسۆ چیلەری وەزیری دەرەوەی توركیا لەسەردانێكیدا بۆ مۆسكۆ لەسەر "پرۆتۆكۆڵی هاوكاری دژی تیرۆریزم" رازیبوو كە ئامانجی وەستاندنی پشتگیری سەربازی هەردوو وڵاتەكە بوو بۆ چیچانییەكان‌و كێشەی نەتەوەیی كورد."[٣٠٧] نیشانەیەكی دیكەی وازهێنانی روسیا لەكارتی كوردی بۆئەوەی هەوڵەكانی لەهەنگاوی هاوكاری سەبارەت بە نەوتی حەوزی قەزوین‌و سەرچاوەكانی گاز چڕبكاتەوە، ئەو كاتەبوو كە مۆسكۆ لەساڵی ١٩٩٨دا پێدانی ماڤ پەنابەریێتی بە عەبدوڵڵا ئۆجالان رەتكردەوە.[٣٠٨]

لەسەر مەسەلەی عێراق بەگشتی، روسیا بۆماوەیەك رایگەیاند كە هەنوكە گونجاوە گەمارۆ لەسەر عێراق هەڵبگیرێت،[٣٠٩] ئەوەی مۆسكۆ وێنایدەكات دەبێت لەژێر چاودێری نێودەوڵەتی‌و بەهەماهەنگی لەگەڵ بڕیارەكانی ئەنجومەنی ئاسایشی

---

Hierarchy to Hegemony: The Post-Soviet Security Complex', in David Lake and Patrick Morgan (eds.), Regional Orders: Building

306 Quoted in Olson (2001), pp. 182-83.

307 Bid. –p-. 186

308 An analysis of which is provided by Olson (2001), pp. 201-3.

٣٠٩ روسیا لەسەرەتای ١٩٩٤ەوە دەستیكرد بە پێشاندانی پشتگیری خۆی بۆ عێراق، هەروەك روونكراوەتەوە لەلایەن:

Anthony cordesman and Ahmed Hashim (1997), Iraq. Sanctions and Beyond, Boulder, Co: Westview Press pp. 206-7.

نەتەوە یەکگرتووەکاندا بێت.[٣١٠] مۆسکۆ پەرۆشی بوژانەوەی هاوکاری پێشووی روسی-عێراقی بوو، مۆسکۆ داوای وەستاندنی ئەو پەلامارە ئاسمانیانەی دەکرد کە لەلایەن فرۆکە جەنگییەکانی بریتانیاو ئەمریکاوە لەباکوورو باشووری وڵاتەکەدا ئەنجامدەدران، هەروەها پشتگیری لەلابردنی ناوچەی دژەفڕین کرد. سەبارەت بە کوردانی عێراق، روسەکان لایەنگریان لەسیاسەتێکی کورددۆستانە نەکرد. هەروەها لەسەردانێکی باڵیۆزی روسیا بۆ باکووری عێراق لەکۆتایی ساڵانی ١٩٩٠کاندا، ناوبژیوانی خۆی لەنێوان بەغداو کورداندا پێشنیازکرد، کە زۆر لەوانەیە کە لەسەر داوای سەرۆکی عێراق ئەنجامدرابێت.[٣١١]

## ٦ . ٣ . ٥ گروپە کوردە سەرەکییە غەیرە عێراقییەکان

پرسی هەمیشە ئامادەی پێکدادانی بەرژەوەندییەکان لەسەر ئاستی نێوخۆیی کوردی گرفتگەلێکی لەخۆگرتبوو کە بۆ کوردانی عێراق بەڕێوەبردنی زەحمەت بوو. پەیوەندییە نێوخۆییە کوردییەکان بەدرێژایی مێژووی کورد گیرۆدەی سەختیو دژواری بوو. بەگەڕانەوە بۆ ساڵانی ١٩٦٠کان، مەلامستەفا بارزانی بۆ تەیارکردنی تەواوی رێکخراوە کوردییەکان لەسەراسەری کوردستاندا هەڵدەسوڕا تاکو وەك "سەرچاوەیەکی ستراتیجی" بەکاریانبێنێت، لەکاتێکدا ئەو دەبوو هەمان کات کۆنترۆڵی گروپە جۆراوجۆرەکان بکات لەگرتنەبەرو تۆکمەکردنی ئەجێندای سیاسی تایبەت بەخۆیانو بەرسینگگرتنی کوردی عێراق لەمەسەلەی سەرکردایەتیکردنی جووڵانەوەی نەتەوەیی کوردییدا.[٣١٢] ئەم رکابەرییە هێشتا بەشێکی بەرچاوی

---

٣١٠ لەژوئیەی ٢٠٠١دا، بۆ نموونە، (مۆسکۆ) ڤیتۆی خۆی سەبارەت بە بڕیارێکی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لەبارەی گەمارۆی دیکەی نوێوە دژی عێراق، ئەمە پێدەچێت بێ پەیوەندی نەبێت بەوەی روسیا لەلایەن عێراقەوە مامەڵەی نەوتی بە دۆخێکی قازانجبەخش پێشنیازکرابێت لەکاتی هەڵگرتنی گەمارۆکە. بڕوانە:
e.g. Hussain Hindawi, UPI, 10 July 2001 and Jordan Times, July 16 2001.
311 Gunter (1999), p. 97.
312 Discussed by Ferhad Ibrahim in his paper 'The Dynamics of Kurdish-Kurdish Relations and their Relevance for Developments in the 1990s: PKK, PUK and KDP' presented at the Kurdological Conference Between Imagination & Denial. Kurds as subjects and objects of political and social processes, May 29-31, Berlin 9 (1998).

**سیاسەتی کوردییە.•**

**لەکاتی پەرەسەندنەکانی دەیەی پاش قەیرانی کوەیت، ڕەهەندێکی نوێ بووبە سەرباری تێکڕای ئالۆزییەکانی گرفتی کوردی لەعێراق، تاکو سەرەتای سالآنی ١٩٩٠کان، ململانێی "دوو جەمسەریی"ەکەی دوو هێزە نەیارە سەرەکییەکە کە پارتیو یەکێتی بوون، لەگەڵ گەیشتنی پەکەکە بۆ کوردستانی ئازاد، بۆ ململانێیەکی سێ لایەنە وەرچەرخا،[٣١٣] لەکاتێکدا حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران ئەو دەرەفەتەی قۆزتەوە کە لەئاکامی بۆشایی دەسەڵاتی ناوەندی لەباکووری عێراق هاتبۆئارا، ئەوەی وایکرد ململانێیەکە درێژبێتەوە بۆ چوارلایەنە.**

**لەکاتێکدا کوردانی ناوچەی ئارام دەبوو چەندە دەتوانن پەیوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ تارانو ئەنکەرەدا بپارێزن، بەریەککەوتنی سیاسی لەگەڵ لەگەڵ هەریەکە لەکوردانی ئێرانیو تورکی شتێکی خۆلێلانەدراو بوو. هەرچەندە لەسالآنی ١٩٩٠کاندا، پەکەکە لەهاوشێوە ئێرانییەکەی بەهێزترو دامەزراوتربوو. لەکاتێکدا هەریەك لەپەکەکەو کوردانی عێراق "هەریەکەو خۆیان بە هێزی رابەری جووڵانەوەی رزگارییخوازی کورد لەقەڵەمدەدا."[٣١٤] پارتی کرێکارانی کوردستان هەرگیز دانی بەدەسەڵاتی حکومەتی هەرێم لەهەولێر نەدەنا، ئەو هەڵوێستەی کە لەوانەیە بەپێی قسەی شێخموس "یان بەهۆی تەنگەتیلەییو دەمارگیریی حیزبایەتیو پێنەگەیشتوویی یاخود ...پەکەکە لەلایەن ئێرانو سوریاوە هاندراوە بۆ**

---

• دکتۆر مەحمود عوسمان لەل٢٨–٢٩ی نامیلکەی "هەڵسەنگاندنی رەوشو هەرەسهێنانی شۆڕشی کورد، دەرسو پەندەکانی" لەژێر سەردێڕی "پەیوەندیە کوردستانیەکان" دەڵێت:" سەرکردایەتی بارزانی بەهۆی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیو کورت بینی سیاسیو باوەڕنەهێنانی بەگیانی نەتەوایەتیو توانای خۆیی گەلی کوردەوە ئەو تەکتیکەی بەجۆرێکی ترسناك تێپەڕاند. بۆنموونە ژمارەیەك تێکۆشەری نیشتیمان پەروەری کوردستانی ئێران بەداوای دەسەڵاتدارانی ئێران تەسلیم کردنەوەو بەشێکی تریان بەدەستی ئەم سەرکردایەتیە شەهیدکران، لەوانە سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لەبەر هەمان هۆ...هتد. لەکاتێکدا ئەوانە پەنایان بۆ شۆڕش هێنابوو. هەروەها ئەم سەرکردایەتیە چەند مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی رەوانەی ناو ئێران کرد تاهاوکاری هێزەکانی ئێران بکەن بۆ سەرکوت کردنی هەندێ چالاکی چەکداری خەباتگێڕانی کوردستانی ئێران. ئەم ڕووداوانە خاڵی وەرچەرخاندن بوون لەپەیوەندییەکانی شۆڕشدا کەلەگەڵ ئێران شێوەی نۆکەرایەتی وەرگرت.".

313 Kutschera, The Middle East, November 1995.

314 Id. (1994).

ئالۆزکردنی دۆخەکەی کوردستانی عێراق.[315] لەحاست ئەم دۆخەدا، کوردانی عێراق خوازیار نەبوون خودحوکمڕانێتێکەیان بخەنە مەترسییەوەو لایەنگری لەپەکەکە بکەن‌و بەچەك رووبەڕووی سوپای تورك ببنەوە. بۆ بێلایەنکردنی پەکەکە، لانیکەم لەڕووی سەربازییەوە، پارلەمانەکەی هەولێر پلانی هەڵمەتێکی سەربازی بەکۆمەڵی کوردی عێراقی دانا، پەکەکە لەکوردستانی عێراقدا خرایە دۆخێکی بەرگریکارانەوە، بەڵام عەبدوڵڵا ئۆجالان لەماوەی ساڵی ۱۹۹۳دا پێشکەوتنی هێنایەدی کاتێك پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی نیشتیمانیدا بووە پەیوەندییەکی دۆستانە. لەکاتێکدا ململانێکانی نێوان پارتی‌و یەکێتی بۆ جەنگێکی بەرفراوان تەقییەوە، پەکەکە نزیك لەیەکێتی مایەوە.[316]

جەنگی ناوخۆی کوردستانی عێراق لەناوەڕاستی ۱۹۹۰کاندا، وایکرد پەکەکە پێگەی خۆی لەناوچەکەدا پتەوبکات. ئەوەش کینەو بێزاری تورکانی بۆ قەوارە ئۆتۆنۆمەکەی کوردستان هێنا، ئەوەی وەك پێشتر قسەی لێکراوە، لە بەهاری ۱۹۹۵دا لەسەر ئاستێکی بەرفراوان روویدا. هەرچەندە، پارتی‌و هەروەها یەکێتیش زۆرجار پەکەکەیان بە رێکخراوێکی تیرۆرستی لەقەڵەمدەدا کەنابێت سەربەستانە لەخاکی کوردستانی عێراقدا هەڵسوڕێت. ئەوە پارتی بوو کە بەکۆنترۆڵکردنی ناوچەکانی هەرەباکووری هەرێمە ئۆتۆنۆمەکە گرفتەکە لەقازانجی خۆی چارەسەرکات، واتە سنوورەکانی تورکیا. ئەمەش بووەهۆی پێکدادانی خوێناوی لەگەڵ پەکەکە لەچەندین بۆنەدا.

کاتێك کوردانی عێراق دواجار رازیبوون کۆتایی بە جەنگەکەیان بێنن، پەکەکە زیانمەندی یەکەم بوو، یەکێتی نیشتیمانی بەگوێرەی رێکەوتننامەی واشینگتۆن لەساڵی ۱۹۸۸دا، بنکەو بارەگای کۆنە هاوپەیمانەکەی لەبەشەکانی باشووری هەرێمە ئۆتۆنۆمەکە داخست. هەروەها تەنانەت ئەفسەرانی تورکیش رێگەیان پێدرا بەمەبەستی پشکنینی ئاکامی ئۆپەراسیۆنەکە بچنە ئەو ناوچانەی لەبندەستی یەکێتی نیشتیمانیدا بوون.[317] هێشتا رێکەوتننامەی واشینگتۆن چارەسەری کێشەی

---

315 Sheilchmous (1999), p. 62
316 bid. Pp. 63-64.
317 Owen Bowcott, The Guardian, February 14 1999.

پەکەکەی لەنێوان هەردوو هێزە کوردییە عێراقییە دوژمن بەیەکەکەی نەکردووە.[٣١٨] هەڵوەشانەوەی بەودواییەی پەکەکە پاش گرتن‌و زیندانیکردنی سەرکردەکەی عەبدوڵڵا ئۆجالان لەساڵی ١٩٩٩دا کاریگەری خۆی لەسەر پەرەسەندنەکانی کوردستانی عێراق هەبوو. لەپاش خۆڕادەستکردنەوەی زۆربەی میلیشیاکانی جووڵانەوەکە بەفەرمانی عەبدوڵڵا ئۆجالانی بەندکراو. گروپێك کە مابوونەوەو لەچەند هەزار جەنگاوەرێکی پەکەکەی خۆڕاگر لەسنوورەکانی کوردستانی تورکی-ئێرانی-عێراقیدا بەرجەستەی جووڵانەوەیەکی رادیکاڵانەی راستەقینەیان دەکرد، سووربوون لەسەر سەپاندنی ئامانجەکانیان بەهەر نرخێك بێت، بە پایەندبوون بەو بنەمایەی کە مەبەست پاساوی ئامرازەکانە. لەلایەکی دیکەوە، وەڵامی حکومەتی تورکیا بۆ ئەندامانێکی پێشووی پەکەکە کە بۆ مافی کەلتووری کوردانی تورکیادا لەرێگەی خەباتی سیاسییەوە تێدەکۆشان دووبارەکردنەوەی ئەو بالۆرەیە بوو کە حکومەت مەبەستی نییە دانوسان لەگەڵ پەکەکەدا بکات. لەبری ئەوە هێزە تورکییەکان هەوڵەکانی خۆیان توندکردەوە بۆ هەڵپەساردنی پارتی کرێکارانی کوردستان، هەروەها ئۆپەراسیۆنی سەربازی کە پارتی‌و یەکێتیش لەگەڵ سوپای تورکی تێوەگلابوون، بەشێوەیەکی بەرفراوان لەسەر خاکی کوردستانی عێراق، تا پێی خستە سەدەی نوێوە بەردەوامبوو.[٣١٩]

حیزبی دیموکراتی کوردستان لەبەر هۆکاری جیۆپۆلیتیکی پەیوەندییەکانی زیاتر لەیەکێتی نزیکتربوو تاکو پارتی، لەسۆنگەی ئەو پێشبینییەوە کە پارتی بۆماوەیەکی درێژ لەساڵانی ١٩٨٠کان لەگەڵ هێزە ئێرانییەکان لەتاران شەڕی لەگەڵ چەکدارە یاخییەکانی کوردستانی ئێران کردووە. دواتر یەکێتی نیشتیمانی کوردستان هاوسۆزانە لەقەڵەمڕەوەکەی خۆیدا شوێنی حەوانەوەی بۆ سەرکردایەتی حیزبی دیموکرات دابینکرد، ئەوەی کە هەروەها بنکەکانی خۆی لەوێ

---

٣١٨ پارتی دیموکراتی کوردستان بانگەشەی ئەوە دەکات کە یەکێتی نیشتیمانی شکستیهێناوە تاکو بەشێوەیەکی گونجاو تەواوی بارەگاکانی پەکەکەی لەسلێمانی دابخات، بەگوێرەی قسەی کاك رەحمان " ئەوان تەنیا ئاڵاکان دادەگرن‌و خەڵکەکە هێشتا لەوێن." (لەندەن، ١٩٩٩).

319 As for instance in the late summer of 2001, see Reuters, 27 August, 2001.

دامەزراند.[320] هەرچەندە، ئەو پارێزگارییەی لەلایەن یەكێتییەوە پێشكەشكرابوو سنووری خۆی هەبوو، كاتێك پاسدارانی ئێرانی پەلامارە سەربازییەكەی خۆیان لەسەرەتای ١٩٩٠كاندا بۆ نێو خاكی باكووری عێراق ئەنجامدا، حیزبی دیموكرات جارێكی دیكە خرایە ژێر رەحمەتی لەشكری ئێرانەوە.•

دوای راڤەكردنی هەڵسوڕانی ئەم یاریزانە هەرێمیانە لەسەر شانۆی هەرێمی، ئەمێستا لەسەر ئاستی جیهانی تیشك دەخرێتە سەر ئەكتەرەكان، هەروەها هەوڵێك دەدرێت بۆ راڤەكردنی ئەوەی كە چۆن سیاسەتەكانی ئەم چەشنە هێزە نێودەوڵەتیو پێكهاتانەی وەك یەكێتی ئەوروپا، ئەمریكاو هەروەها نەتەوە یەكگرتووەكان لەسەر شانۆ كوردییەكەی باكووری عێراق شكڵیانكرتووە.

## باسی حەوتەم: كوردستانی عێراق لەبواری ململانێی نێودەوڵەتییدا

### ٧ . ١ دینامیكیەتی پەیوەندییەكان

هەروەك لەباسی پێشوودا سەلمێنرا، جێگیریی هەرێمیو پاراستنی سیستمی دەوڵەت ئامانجی بنەڕەتی زۆربەی ئەكتەرەكانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە. هەر ململانێیەكی

320 As explained by Mr. Valadbeighi, Tehran, 2001.

• د.حوسێنی خەلیقی لەم بارەیەوە دەڵێت:" باسی هێرشی سوپای ئێران بۆ سەر بنكەی دەفتەری سیاسی حیزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران لە كۆیە، بە دەسكیسی گۆیا بەناچاری، یەكیەتی نیشتیمانی كوردستان ، لای من هێندە سەختو دژوارە، كە سەروەدەرناكەم، چلۆن، بیخەمە بەرچاو؟ كام سۆزی نیشتیمانپەروەری، رێگا دەدا، دۆستێكی ستراتیژیكی، هاوخوێنو هاودەردو هاومێژوو و هاوخاكو هاوچارەنووسو هاوڕەگەز، وەپێشی سوپای سەرسەختی رۆڵەكانی نەتەوەكەی بكەوێو ١٦٠ كیلۆمیتر بەسەر خاكی ئازادكراوی كوردستاندا، كوێركێشی بكاو بیهێنێ، كەوكوژ، وەك هێلكەی پاككراو، دۆستە هاوچارەنووسو تاڕادەیەك میوانەكەی، بخاتە ژێر چنگی خوێناویو رێگای پێبدا بە تۆپو كاتیۆشاو چەكی دیكە، هێلانەی كاتیو پەناگای سازكراو بۆ ئاوارەكانی ئازادی، لە خاكی ژێر دەستی خۆیدا ، بداتە بەر هێرش؟!" بڕوانە: ژانو ژیان، لێكدانەوەی لێكدابڕان، بەرگی پێنجەم، ١٩٩١-٢٠٠٩، چاپی یەكەم، ئۆپسالا، ل ١٨١.

سیستمشێوێنەر لەهەرێمەکەدا لەوانەیە زیاتر راژەی بەژەوەندییەکانی کورد بکات تاکو بەرژەوەندی پاشماوەکانی زلهێزەکانو کۆمەڵگای نێودەوڵەتی یاخود هێزە هەرێمییەکان. لەوەش زیاتر، سیاسەتی نێوخۆیی وڵاتانی دەوروبەری ناوچە خودحوکمڕانە کوردییەکەی عێراق زۆرجار کاریگەری راستەوخۆی لەسەر هەرێمە ئۆتۆنۆمەکە هەیە. وەك پرسێك لە پەیوەندییە ململانێئامێزەکانی نێوان تورك‌و فارس‌و عەرەبدا بەرجەستەدەبێت، چارەسەرکردنی هەمیشەیی لەوانەیە بەشێوەیەکی گران لەسەر پێشکەوتنی پەیوەندییەکانی نێوان ئەم وڵاتانە راوەستابێت، بەهاوجووتبوون لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی هێزە جیهانییەکان. هەروەك مێژوو گەواهی دەدات، هەر چارەسەرێك شایەنی دەستێوەردانە ئەگەر دراوسێکان یاخود وڵاتە کاریگەرەکانی دیکە لەناکۆکیدابن.

سەبارەت بەکوردستانی عێراق وەك خاڵێکی چەسپاو، شێوەی ٧ .١ : دینامکییەتی پەیوەندییەکان بەسەر کوردستانی عێراقدا- هەوڵێکە بۆ دیاریکردنی هێڵە هەنوکەییەکانی دژواری‌و هاوکارییەکان لەهەرێمەکەدا، وێڕای جەختکردنەوە لەسەر بەرزونزمی بەردەوام لەپەیوەندییەکاندا. هەروەك پێشتر ئاماژەی بۆکرا، پەیوەندییە هەرێمییەکان لەڕێگەی پێکهاتەی راوەستاوی هاوپەیمانی‌و سیاسەتە چەسپاوەکانەوە بەرجەستە نابێت. هێڵکارییەکە پەیوەندییە نێوکوردییەکان لەناوەڕاستدا وەردەگرێت (لێرەدا تەنیا دوو ئەکتەرە سەرەکییەکە لەسیاسەتی کوردستاندا لەبەرچاوگیراوە) کە بە هێزە هەرێمی‌و جیهانییەکان دەورەدراون. لەکاتێکدا پارتی‌و یەکێتی وەك یەك هەوڵی پتەوکردنی پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ ئێران‌و تورکیادا دەدەن، وێڕای هێشتنەوەی دیدێکی باشی دیمەشق لەحاست هەرێمە خودحوکمڕانە کوردییەکە، بەغداش وەك هاوبەشێکی دانوسانکەر هەرگیز لەمەیدانەکە دوورنەخرابۆوە. هەرچەندە، وەك هێڵکارییەکە دەریدەخات هەموو ئەم پەیوەندییانە بەشێوەیەکی هەستیار هاوسەنگن‌و بەئاسانیش بەهۆی ململانێوە تێکدەچن. ئیسرائیل بەدڵنیاییەوە یاریزانێکی هەرێمییە، بەڵام بەوهۆیەوە کە

سنوورێکی بەهەرێمە ئۆتۆنۆمەکەوە نییە هەربۆیە راستەوخۆ کاریگەریی ناکاتە سەر پەرەسەندنەکانی ئەوێ، دەوڵەتی جولەکە لەم شێوەیەدا وەك هێزێکی دەرەکی وێناکراوە، هەروەك ئەمریکاو روسیا. هۆکارێکی دیکە بۆ پێگەی دەرەکی ئیسرائیل ئەوەیە کە ئەو پەیوەندییەکی راستەوخۆی لەگەڵ پارتیو یەکێتیدا نییە، هەروەها لەم هێڵکارییەدا تەنیا پەیوەندی لەگەڵ یەك دەوڵەتی هەرێمیدا هەیە ئەویش تورکیایە. یەکێتی ئەوروپا رێگەی ئەوەی پێدراوە رۆڵێکی بێلایەنی هەبێت.

هەروەها هێڵکارییەکە پێشانیدەدات کەچۆن ئەمریکا وەك ئەکتەرێکی دەرەکی لەرێگەی پەیوەندیو کاری هاوکارییانە لەگەڵ ئەکتەرگەلێکی هەرێمی وەك تورکیاو ئیسرائیل نفوزو کاریگەری لەسەر پەرەسەندنەکانی باکووری عێراق هەیە. ئەم هاوپەیمانێتیە زۆرجار پێگەی تورکیا لەهەمبەر کوردانی عێراق بەهێز دەکات، بەڵام هەروەها دەردەکەوێت کە ئەنکەرە ناوبەناو دەکەوێتە بەر فشاری ئەمریکا کە خواستی واشینگتۆن بەسەر کوردانی عێراقدا بسەپێنێت. پەیوەندییەکانی سوری-ئەمریکی دوورە لە دۆستایەتییەوە، بەڵام ئەوە ئێرانو عێراقە کە ئەمریکا پەیوەندی دوژمنکارانەی لەگەڵیاندا پاراستووە – هەردووکیان بەدوای پێگەیەکی زاڵدا وێڵن لەهەرێمەکەدا. لەهەمان کاتدا، روسیا ( کە خولیای چوونەوە ئاستی یەکێتی سۆڤێتی پێشووی لەسەردایە) پەرۆشی رووبەڕووبوونەوەی سیاسەتەکانی ئەمریکایە لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستداو چالاکانە هەوڵی هاوسەنگکردنی ئامادەگی ئەمریکا دەدات، فرە بەتایبەتی لەحەوزی دەریای قەزوینو دەوروبەری. هەروەك پێشتر روونکراوەتەوە، هاوتەریبییەکی ئاشکرا لە رەوشەکەی باکووری عێراقدا هەیە، هەروەها گرنگی ستراتیجی ناوچە کوردییە خودحوکمڕانەکە تاکو ئاستێکی دیاریکراو لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە چۆن بتوانێت بەشێوەیەکی باش قازانجبەخش بێت بۆئەوەی کاریگەری لەهەرێمە بەرفراوانەکە هەبێتو کۆنترۆڵی سەرچاوە سروشتییە گرانبەهاکان بکات.

هەروەك شێوەی ١. ٧ بەئاشکرا پێشانیدەدات، هەرێمە ئۆتۆنۆمەکەی کوردستانی عێراق بەشێوەیەکی بەرفراوان بە ناجێگیری سیاسی دەناسرێتەوە، هەروەها

بەرجەستەی رەوشێك دەكات كە ململانێ لەناوەند ئەوانەی  دەورەبەر زێدەتر دەوروژێنێت. نموونەیەكی زۆر لەبەردەستدان كە پشتگیری لەم تیۆرە دەكەن: بەكورتی، شەڕی نێوان پارتو یەكێتی لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٩٤دا ڕاژەی بە هاتنەناوەی پەكەكە كرد بۆناوچە خودحوكمڕانەكە، كە بووەهۆی چەندین پەلاماری سوپای تورك بۆسەر هەرێمە ئۆتۆنۆمەكە. ئێران لەساڵی ١٩٩٦دا هاتە نێو باكووری عێراق بەمەبەستی ڕاوەدونانی كوردانی حیزبی دیموكرات كە لەنێو قەڵەمڕەوە كوردییەكەی عێراقەوە هەڵدەسوڕان. لەوەش زیاتر، كاتێك پارتی پێویستی بەپاڵپشتی بوو بۆ وەستانەوە بە ڕووی هاوكارییە سەربازییەكانی ئێرانی بۆ یەكێتی نیشتیمانی، سوپای عێراق بانگێشت كرا بۆ هاتنەناوەوە- ئەوكارەی بەغدا كە پاشتر سزادارا، كاتێك واشینگتۆن لەرێگەی بۆمبارانی باشووری عێراقەوە تۆڵەی لەبەغدا كردەوە. پەرەسەندنە سیاسییەكان لەكوردستانی عێراق هیچ كات لەوەدا شكستی نەهێنا كاریگەرییان لەناوچەكانی دەوروبەر هەبێت، هەربۆیە تێبینیكردنی بەدواداچوونی دینامیكییەتی پەیوەندییەكانو هەڵكشانو داكشانیان لەنێوان دژواریو هاوكاریدا سەرنجڕاكێشە. مرۆ لەوانەیە تەنانەت ئەو ئەنجامگیرییەش بكات كە كوردستانی عێراق بەو پێكهاتەیەی ئێستایەوە ململانێئەنگێزە.




شێوەی ١. ٧ : دینامیکیەتی پەیوەندییەکان بەسەر کوردستانی عێراقدا

تێبینی: یەکێتی ئەوروپی EU یاریزانێکی بێلایەنەو ئەکتەری هاوسەنگی نێوان ئەمریکاو و روسیایە.

## ٧ . ٢ زلهێزە باڵادەستەکەی مابۆوە

لەوکاتەوەی سەرۆك ودرۆ ویلسۆن لەپاش یەکەمین جەنگی جیهانی "چواردە بەندەکە"ی خۆی پێشکەشکرد، کە بەڵێنی ئۆتۆنۆمییەکی کوردیی لەخۆگرتبوو، کوردان سەیری ئەمریکایان دەکرد چارەسەرێك بۆ ئەو ستەمو زۆردارییە

پێشکەشبکات کەلەرابردووەوە بەسەریاندا هاتووە

سیاسەتسازی ئـەمریکا سـەبارەت بەپرسـی کـوردیی لـەعێراق بەشـێوەیەکی تایبـەت سەرنجڕاکێشـە کاتێـك هەڵسـەنگاندن بـۆ سیاسـەتی کـوردیی لـەماوەی چـوار دەیـەی رابردوو دەکرێت. رۆڵی ئەمریکا لەیاخییبوونەکـەی سـاڵانی ١٩٧٠کـانو راپەڕینەکـەی ١٩٩٠کـان فاکتـەرێکی بەرچـاوبوو، ئەوەنـدەی کـە هاوکـاری بنـەڕەتی لەسـاڵی ١٩٧٥دا کشێنرایەوەو لەساڵی ١٩٩١یش چ یارمەتییەکی سەربازی نەهات. لەدوای ساڵی ١٩٧٥ەوە تاکو ساڵانی ١٩٩٠کان کوردان بەدەگمەن دانیـان پێـدانراوە، کاتێـك ئـەمریکا پێویسـتی بـە بنکەیـەکی هێـز بـوو لەرۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا. ئـەو پەیوەندییـە باشـەی پێشـتر لەگەڵ ئێرانـدا هـەبوو بـەهۆی شۆڕشـی ئیسلامییەوە لەسـاڵی ١٩٧٩دا کۆتـایی پێهـات، بـەوەش سـەنگەرێکی سیاسـیو سـەربازی ئەمریکاییـەکان لەناوچـەکەدا لەنێوچـوو. لەپاش ئەمە، واشینگتۆن بەشێوەیەکی مەزن پشـتگیری عێراقـی کـرد، پەیوەندییـەك کـە کاریگەرییـەکی دیـاریکراوی تێـدا ئەنجامـدرا لەبەرامبـەر پشـتگیرییەکی دارایـی بنـەڕەتی بـۆ جەنگەکـە لەگـەڵ ئێرانـدا. لـە کـاتی گـەڕان بـەدوای جێپێیـەکی ئۆپۆزسـیۆنی لەهەرێمەکـە، بـاکووری عێـراق شـوێنێکی نموونـەیی بـوو بـۆ هێـزە هەرێمییەکان، هەروەها تاکو ساڵی ١٩٩٦ لەلایەن ئەمریکاوە سوودی لێوەرگیرا کاتێـك واشینگتۆن ئۆپەراسیۆنە ئیستخباراتییە مەزنەکەی خۆی لەناوچە خودحوکمڕانەکـە کێشایەوە.

## ٧ . ٢ . ١ سیاسەتی ئەمریکا سەبارەت بە باکووری عێراق

لەکۆتایی جەنگی کوەیت، ئەمریکا خۆی لەنێو خەڵکی عێراقـدا ناشـرین کـرد کاتێـك لەوەدا شکستیخوارد رێگە لەعێراق بگرێت ئەو یاخیبوونە چەکدارییە تێکبشکێنێت کە بـەدەم داواکـەی ئـەمریکاوە چوون سـەبارەت بـە رووخانـدنی رژێمـی دیکتـاتۆری بەعس. گۆڕینی سیاسەتسازی ئەمریکا سەبارەت بەپرسـەکە مەسـەلەیەکی بەرچـاوە. سیاسەتی حکومەتی ئەمریکا بـەخێرایی گۆڕانی قـووڵی بـەخۆوەبینی: پێشـگیری لـە

هەڵوەشاندنەوەی عێراق شوێنی گیرایەوە بەئامانجێکی بنەڕەتی بۆ لابردنی سەدام حسێن لەدەسەڵات. بانگەشەی ئەوەکرا کە پشتگیری چالاکانەی راپەڕینە چەکدارییەکە دەبووە دەستێوەردانێکی بێپاساو لەکاروباری نێوخۆی عێراق، ئەوەش سەردانەواندنی ئەمریکا بۆ هەڵمەتە سەربازییە عێراقییەکە دەردەخات.[٣٢١]

لەپاش راگەیاندنی بڕیاری ٦٨٨ لەلایەن " UNSC / ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، واشینگتۆن سەرکردایەتی " Operation Provid0e Comfort OPC)/ ئۆپەراسیۆنی پرۆڤاید کەمفۆرتی/دابینکردنی حەوانەوەی گرتەئەستۆ، وەك قەڵغانێکی پاراستن بەمەبەستی دابینکردنی یارمەتی پەنابەرەکان ( ناوی مۆدێلێکی ئەرێییە بۆ هەنگاوێکی نەریتی بۆ رەواپێدانی دەستێوەردان). هەرچەندە، ئەم دەستپێشخەرییە، زۆر کەمو زۆر درەنگیش بوو، هەروەك فریلیك دەڵێت " ئەو هاوکارییانەی گەیشتن هێندەی بۆ بەهێزکردنی هاوپەیمانی ئەمریکا بوو لەگەڵ حکومەتە دۆستەکان ئەوەندە بۆ یارمەتیدانی پەنابەرەکان نەبوو."[٣٢٢] ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بەفەرمی بڕیاری لەسەر ئەم دەستێوەردانە مرۆییە لەباکووری عێراقو بەقازانجی پەنابەرە کوردەکان نەدابوو. هێزە رۆژئاواییەکان، سەبارەت بەبڕیاری ٦٨٨ وەك دامەزراوەیەکی شەرعی لەسەر دەستپێشخەری خۆیان دەستێوەردانیان کرد، ئەنجومەنی ئاسایشیش هەرگیز شەرعییەتی دەستێوەردانەکەی لەبەرچاو نەگرت.

هاوپەیمانی ئۆپەراسیۆنی پرۆڤاید کەمفۆرت لەناوەڕاستی ژوئیەی ١٩٩١دا لەباکووری عێراق کشایەوە، هەروەها وێڕای خۆپارێزی پێشووی واشینگتۆن لەدەستوەردانە کاروباری نێوخۆی عێراقەوە، وڵاتە یەکگرتووەکان کەوتە پشتگیریکردنی بیرۆکەی هێنانەئارای زۆرنی دژەفڕین لەباکووری عێراق، لەکاتێکدا بەشێکی هۆکارەکانی بۆ

---

٣٢١ زیاتر، پێدەچێت بەهۆی ترسی واشینگتۆنەوە بێت لە هەڵوەشانەوەی عێراق لەنێوەندی دەرکەوتنی ئیسلامی رادیکاڵ لەنێو شیعەکانی عێراقی کەلەلایەن ئێرانەوە پاڵپشتی دەکران. بڕوانە:

Faleh `Abd al-Jabbar's 'Why the Intifada failed' in Fran Hazelton (ed.) (1994), Iraq Since the Gulf War. Prospecs for Democracy, London: Zed Books, pp. 97-117.

322 Frelick (1993), pp. 33-34.

ناوچەی دژەفڕین دابینکرد، ئەوەی جێگەی مشتومڕبوو ئەو بوو کە بڕیاری ٦٨٨، هەروەك لەلایەن نەتەوە یکگرتووەکانەوە لێکدرابۆوە ڕەوایەتی بەدەستێوەردانی سەربازی لەباکووری عێراق دابوو لەپێناو پاراستنی کوردان لەدەست ئەو "ستەمکارییەی بەهەموو شێوەکانییەوە لەلایەن دەسەڵاتدارانی عێراقەوە ئەنجام دەدرێت".[٣٢٣] هەرچەندە کارکردن لەسایەی بڕیاری ٦٨٨، نەزمێکی ئاسایشی نوێ-ئۆپەراسیۆنی چەکوشی ئامادە کە Operation Poised Hammer (OPH) ئۆپەراسیۆنێکی چاودێری ئاسمانییە لەنێو ڕەخنەگەلێکی زۆری ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەرو هێڵی ٣٦ەوە دامەزرا.[٣٢٤] ئەم ناوچەی دژەفڕینە بەهاوکارییەکی بەرتەسکی تورکیا پێکهات، ئەو چاودێری ئاسمانییەی لەخاکی ئەوەوە ئەنجام دەدران. لەدیدی نارەزایەتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ کارەکانی واشینگتۆن لەباکووری عێراق، شایەنی تێبینیە تاقە زلهێزەکە لەتێپەڕاندنی ئەوە دووربوو لەهەر بەریەککەوتنێك لەگەڵ ڕێکخراوە جیهانییەکان، بەتایبەت لەپاش قۆناغی جەنگی ساردا. ئەمریکا زۆرجار ئەو وێنایەی دەبەخشی کە لەکاتێکدا واشینگتۆن بڕیارسازە، نەتەوە یەکگرتووەکان لەباشترین حاڵەتدا، دەبێت وەك پارلەمانی ئەمریکا هەڵسوڕێت.[٣٢٥]

پشتبەستن بە ڕێپێدانی تورکی هەر لەسەرەتاوە ئۆپەراسیۆنی چەکوشی ئامادەی لاوازکرد، لەکاتێکدا "سیاسەتی ئەمریکای لەحاست کوردانی عێراق ملکەچی بەرژەوەندییە خۆجێیەکانی تورکیا کرد".[٣٢٦] لەڕاستیدا، هەروەك وەزیری پێشووی دەرەوە تێبینیکردووە " ئەمریکا بنەما دژەکانی خۆی لەحاست سەدام لەسەر

---

323 Paragraph 4 of UNSC Resolution 688, 5 April 1991. For the full text of all UNSC Resolutions, see the UN Documentation Centre at http://www.un.org/documents/.

324 O'Balance (1996), p. 193.

٣٢٥ پەیوەندی دڕدۆنگانەی نێوان ئەمریکا- نەتەوە یەکگرتووەکان لەلایەن بترۆس غالی سکرتێری گشتی پێشووی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە ڕوونکراوەتەوە لەکتێبەکەی :

Unvanquished. A U.S. — UN. Saga, London: I.B. Tauris (1999).

326 Whitely (1995), p. 145.

دامەزراوەگەلێکی لەرزۆك دارِشتبوو، چونکە ئەو لەگەڵ تورکیادا نەگەیشتبوونە هیچ تێگەیشتنێکی سیاسی سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی لەباکووری عێراق." [٣٢٧] ئەم نەزمە بەقازانجی ئەنکەرە بوو ئەو توانایەی بەخشییە ژێنرالّەکانی تورك کە سەبارەت بە ئۆپەراسیۆنێکی سەربازی دیاریکراو هەلومەرجەکان بسەپێنن.

بەشێوەیەکی سەرەکی بەهۆی هاوکاری کورتخایەنی پارتی لەگەڵ بەغدا، [٣٢٨] ئۆپەراسیۆنی چەکوشی ئامادە لەدیسەمبەری ١٩٩٦دا کۆتایی پێهێنرا. ئەو راستییەی کە بارزانی ویستی خۆی چەسپاندو سەدامو سوپاکەی بۆ ناوچە خودحوکمرانەکەیان گێرِایەوە گورزێکی گەورەی وەشاندە ئەو هاوپەیمانییەی پاراستنی کوردانی لەئەستۆگرتبوو، ئەو پاساوەشی دا بە واشینگتۆن بۆئەوەی ئاستی ئۆپەراسیۆنەکە کەمبکاتەوە، هەروەك ئەوەی ماوەیەکی زۆر لەلایەن هاوپەیمانە تورکییەکەیەوە مشتومرِی لەبارەوە دەکرا. چارەنووسی ئۆپەراسیۆنی چەکوشی ئامادە پێناچێت پەیوەندی بەو شکستەی ئەمریکاوە نەبێت لەبارەی گرتنەبەری کاری جدیی بۆ زامنکردنی بەرژەوەندییەکانی لەسەر زەوی کاتێك سوپای عێراق لە ئوتی ١٩٩٦دا ناوچەکەی داگیرکردەوە، هەروەها عێراقییەکان گرفتی کەمیان هاتەپێش لەدۆزینەوەی ئۆپۆزسیۆنە عێراقییەکە کە لەهەولێر جێگیربوونو ئەمریکا پشتگیری دارایی دەکردن.

ئۆپەراسیۆنی چەکوشی ئامادە لەیەنایەری ١٩٩٧دا بەسیستمێکی چاودێری دیکە شوێنی گیرایەوە،" Operation Northern Watch / ئۆپەراسیۆنی چاودێری باکوور" ئەوەی بواری فرِینی لەسەر پێداگری ئەنکەرە سنووردارکردو ئەنجامدانیشی کەوتەئەستۆی ئەمریکیو تورکەکانو بەشدارییەکی سیمبولیکی ئەوروپییەکان، کە بریتانیا بوو. [٣٢٩] چ لەسەر شێوە هەنوکەییەکەی یاخود ئەگەری گۆرِینی بۆ سیستمێکی دیکەی چاودێریو پاراستن لەباکووری عێراق، چاوەرِێی ئەوە دەکرێت پابەندبوونێکی بەم چەشنە تاکو

---

327 Kissinger, H., The Daily Telegraph, 8 October, 1996.

٣٢٨ هەروەك لە باسی یەکەمدا ئاماژەی بۆکراوە، لە سێکشنی ١. ٥. ٣ دا.

329 Gunter (1999), p. 88.

ماوەیەکی دیکە بەردەوام بێت، ئەمەش لەلایەن پێداگری بەردەوامی واشینگتۆنەوە سەبارەت بە لێکدانەوەی بۆ جێبەجێکردنی بڕیاری ٦٨٨ جەختی لەسەر دەکرایەوە.[٣٣٠]

ڕووداوەکانی ساڵانی ١٩٩٠کان بەروونی دەریدەخەن کە ئەمریکا سەبارەت بەکێشەی کورد خۆی لەگەڵ تورکیادا گونجاندبوو، بەشێوەیەك جیاکاری دەکرد لەنێوان "کوردانی باش" (بەئاماژەدان بەکوردانی عێراق)و "کوردانی بەد" (بەئاماژەدان بەوانەی تورکیا). بەهۆی دوژمنایەتی ئەمریکا بۆ ڕژێمەکەی سەدام حسێن،و چاودێری بەردەوامی پاراستنی ئاسمانی بەسەر کوردستانی ناوەندیدا، کوردانی عێراق لەبڕێکی دیاریکراوی پشتگیری ئەمریکا بەهرەمەند بوون. هەرچەندە، بەدرێژای ساڵانی ١٩٩٠کان، واشینگتۆن یەکێك بوو لەو وڵاتە فرە کەمانەی پشتگیری چوونەناوەوەی سوپای تورکیان بۆ باکووری عێراق دەکرد، ئەو دەستێوەردانە دەرەکییەی کە بەئامادەگی ئەمریکییەکان بەڕێوەدەچوون، ئەو ئەمریکییانەی لەبنەڕەتدا بەگریمانەی پاراستنی کوردان لەوێ بوون. بەم جۆرە جێبەجێکردنە بانێك‌و دووهەوایەی ناوچەی دژەفڕین، کوردانی عێراق هەروەك پێشتر بڕوادەکرا، پارێزراو نەبوون. وێڕای ئەمەش، لەبەرامبەر یارمەتیدانی تورکیا بۆ گرتنی ئۆجالان لەساڵی ١٩٩٩داو هەڵوێستی چەسپاوی لەسەر تۆمەتبارکردنی ئەو سەرکردە تیرۆرستەی کورد،[٣٣١] تورکیا بەدڵنیاییەوە چوونەناوەوەیەکی زیاتری بۆنێو بنکەی ئاسامانی ئینچەرلیك لەباشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا زامنکرد، کە لەوێوە چاودێرییە ئاسمانییەکانی بەسەر باکووری عێراقدا ئاراستە دەکرد.[٣٣٢]

واشینگتۆن لەماوەی ناوەڕاستی ساڵانی ١٩٩٠کاندا چەند کۆنفرانسێکی ئاشتیان

---

330 Ibid. p. 108.

٣٣١ هەرچەندە واشینگتۆن نکۆڵی لە"تیۆەگلانی ڕاستەوخۆی" خۆی کرد لە بەدیلگرتنی ئۆجالانی سەرۆکی پەکەکەدا، بەڵام واشینگتۆن دانی بە تێوەگلانی خۆی لە "کاری دپلۆماسی گشتگیر"دا نا بۆ زامنکردنی قۆڵبەستکردنی ئۆجالان‌و گواستنەوەی بۆ تورکیا. بڕوانە:

See Arshad Mohammed for Reuters, February 16 1999. 

332 See MEI, No 594, 26 February 1999.

ڕێکخستو هەوڵی ئاشتەوایی نێوان بارزانیو تاڵەبانیان دەدا، بەڵام تاکو سێپتەمبەری ١٩٩٨ وەستانێکی هەمیشەیی شەڕو کوشتار بەدینەهات. ئەم هەوڵە ئاشتەواییەی ئەمریکییەکان لەنێوان بارزانیو تاڵەبانیدا دەتوانرێت بۆ ئەو خواستەی واشینگتۆن بگەڕێنرێتەوە کە لەهەردوو سەرکردەکە بەرەیەکی یەکگرتووی نوێ بۆ بەرووداوەستانەوەی رژێمی سەدام حسێن پێکبێنن.

## ٧ . ٢ . ٢ سیاسەتی "dual containment / دووانە جڵەوگیری" و کوردانی عێراق

ڕەگەزێکی سەرەکی واشینگتۆن لە سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بریتیبوو لە "دووانە جڵەوگیری" سەبارەت بە هەریەك لە عێراقو ئێران (ئەو دوو دەوڵەتەی لەناوچەکەدا بوونو هەڕەشەیان لەسەر بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا پێکدەهێنا)، ئەو سیاسەتەی کوردانی عێراق سیمایەکی سروشتی بوون. هەرچەندە، وڵاتە یەکگرتووەکان هەر لەناوەڕاستی سەدەی بیستەمەوە لە سیاسەتی جڵەوگیرییەوە گلابوو ( ئەوکاتەی بەرجەستەترین سیمای سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لەپاش ساڵی ١٩٤٥ بریتیبوو لە جڵەوگیری لە کۆمۆنیزم)، پیادەکردنی "دووانە جڵەوگیری" قۆناغێکی نوێی لەسیاسەتسازی دەرەوەی ئەمریکادا لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێشاندا کە " 'offensive / هێرشبەرانە" بوو لە بێلایەنکردنی ئێرانو عێراقدا – بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی چەشنی وەك گەمارۆی ئابووری، گەمارۆی چەكو هەروەها دابڕینی سیاسی".[333] هەنگاوەکانی پێشوو لەپێناو هەوڵدان بۆ هاوسەنگکردنی ئەم دوو هێزە هەرێمییە لەبەرامبەر یەکتردا کە هەردووکیان سەرەڕۆ بوون پێویستی بەئاستێکی بەرزی توانای سەربازی بوو بەرادەیەك یەکێکیان بنیاتنرابوو لەپێناوی هاوسەنگکردنی ئەوی دیکەدا. ئەو سیاسەتەی ئەمێستا بە شکڵێکی نوێ شوێنی گیراوەتەوە، کە جڵەوی هەردوو هەڕەشەکەی ئێرانو عێراق پێکەوە دەگرێتو

333 Drake (1994).

ئـەوەش زەمینـە بـۆ پتـەوبوونی ئاشـتی نێـوان ئیسـرائیلو دراوسـێ عەرەبـەکانی خۆشـدەکات، ئـەو سیاسـەتەی کـە گریمانـە دەکرێـت هـەروەها لەگـەڵ بڕیارەکـانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان هەماهەنگ بێت.

ئـەم سیاسـەتە بـێ خـەوش نـەبووە، لەکاتێکـدا عێـراق بەتونـدی گـەمارۆی بەسـەردا سەپێنـرابوو ئەوکاتە سیاسـەتی دووانـە جڵەوگیری خرایـە بـواری جێبەجێکردنـەوە. ئێران بەبەراورد بە دراوسـێیەکەی بەشـێوەیەکی بەرچـاو گەشـەیکرد، ئـەوەی زیـاتر ئـەمریکای تۆقانـد، رێکخسـتنەوەی ئـەم حاڵەتـە ناڕازیکـەرە- بـەدیاریکراوی ئـەو ناهاوسەنگییەی بەقازانجی ئێراندا کەوتبۆوە- وڵاتە یەکگرتووەکان قەدەغەکارییـەکی توندی بازرگانی لـەمایۆی ١٩٩٥دا جێبـەجێکرد، "D'Amato Law / یاسـای دامـاتۆ " بۆئـەوەی ئێـرانیش بەهـەمان شـێوەی عێـراق دابڕێـت. بەوتەیـەکی دیکـە، وڵاتـە یەکگرتووەکان کاری بۆ دامەزراندنی هاوسـەنگییەکی هێـز کـرد کـە ئاسـتی ئێـرانیش دابەزێنێتە ئەو دۆخەی عێراقی تێدابوو.

ئەوەی جێگەی پرسیارە داخۆ وڵاتـە یـەکگرتووەکان لـەکارو هـەنگاوەکانی خۆیـدا بـۆ پاراستنی جێگیری هەرێمی وتارێکی دروستی گرتۆتەبەر. ئێران هەرچەندە، لەعێراق بەهێزتربوو، بەڵام پێناچێت توانای ستراتیجی پێویستی لەبەردەستدا بێت بۆئـەوەی ببێتـە مەترسییەکی ئاشـکرا لەسـەر بەرژەوەندییـەکانی ئـەمریکا لەناوچـەکەدا، بـێ لەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە سیاسەتە رادیکاڵەکانی بەچ شێوەیەك دەبن.

مرۆ دەتوانێـت بـەقازانجی سیاسـەتی "دووانـە جڵـەوگیری" مشـتومڕبکات، لەکاتێکـدا نفوزی ئێرانی لەباکووری ئەفریقاو رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی عەرەبی لەم ماوەیـەدا روو لـە داکشـانە. هەرچـەندە، هەڵسـەنگاندنێکی بـەم چەشـەنە پێدەچـێت بیرۆکەیـەکی نادروست بێت، چونکە بە سەرنجێکی ورد دەردەکەوێت کە زیاتر ئاکامی گۆڕانێکە لە ئەولەویەتە ستراتیجییەکانی تاراندا، بەشێوەیەك ئەولەویەتی سیاسەتسازی دەرەکیو ئابووری خۆی ئاراستەی ئاسیا کردووە، دوور لەناوچە عەرەبییەکان.

ئەم سیاسەتەی وڵاتە یەکگرتووەکان سەبارەت بە دووانـە جڵەوگیری ئێـرانو عێـراق نەسـەلمێنرا کـە لەپێشکەشـکردنی چارەسـەر بـۆ ئـەو گرفتانـەی لەناوچـەی کەنـداو

رووبـــەڕووی ئـــەمریکا بوونـــەوە، رازیکـــەربێت. تەنانـــەت سیاسەتســـازە باڵاکـــانی حکومەتیش لەئاستی بـەرزدا دانیـان بـەوەدانا کـە بەجدیی پێویست بەگرتنەبـەری ڕێبـازێکی وردتـر دەکـات.[٣٣٤] هەرچـەندە، وێـڕای رەخنـەکردنی نێوخـۆیو دەرەکـی، دووانـە جڵـەوگیری بـۆ ماوەیـەکی دیکـەش بـەردەوامبوو، وێـڕای ئـەوەی سیاسـەتەکە زۆربـەی کاریگەرییـەکانی (هەرچـەندە سـنوورداریش بـوو) پێشـووی لەدەسـتدابوو. جـۆرج دەبلێـو بـۆش، بـەو دواییـە قەدەغـەکردنی بازرگـانیو وەبـەرهێنانی بەسـەر ئێراندا نوێکردەوە،[٣٣٥] بـەڵام کۆمـاری ئیسلامی لەپرۆسـەکەی پێـداگری چەسـپاندنی خـۆی لـە کەنـداوی فارسـدا بەهـەموو مەبەسـتو ئامانجێـك لەرێگـەی باشـکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ عەرەبستانی سعودیو زۆر لەوڵاتانی دیکەی کەنداو خۆی لـە جڵەوگیرییە سیاسییەکەی ئەمریکا دەربازکرد.

هەرچـەندە، کارگێڕییـەکی ئێسـتا چـەمکی "دووانـە جڵـەگیری" بـەکارناهێنێت، ئـەو هەروەك کارگێڕییەکـەی پێشـووی سـەرۆك کلینتـۆن پێـوەی پابەنـدە. سـەرۆك بـۆش لەوتارێکیـــدا لـــە کۆتـــایی یەنایـــەری ٢٠٠٢دا، ئامـــاژەی بـــە ســـێ وڵات کـــرد وەك هەڕەشەیەکی بەردەوام لەسەر سیستمی نێودەوڵەتی، کـە دووان لەوانـە بۆماوەیـەکی درێژ بوو لەڕێگەی سیاسەتی دووانە جڵەوگیرییەوە کرابوونە ئامانج.[٣٣٦]

دووانە جڵەوگیری بەشێکی زۆری چوارچێوەی سیاسەتەکانی ئەمریکای لەناوچـەکەدا دابینکردبوو لەوانە هەلومەرجی کورد لەباکووری عێراق. بۆ نموونە، کاتێك ئەمریکا درکیکـرد کـە ئێـران هـەوڵی دەربـازبوون لـەو دابڕینـە هەرێمییـە دەدات کـە دووانـە جڵـەوگیری بەسـەریدا سـەپاندبوو، بـۆ نموونـە لەرێگـەی ناوبـژیوانیکردنی ئـەو ئاشتییەی لەنێوان لایەنە کوردییەکاندا لەهاوینی ١٩٩٥دا هاتبۆدی، واشینگتۆن هەستا بـە دژەمانۆڕێـك بـۆ کەمکردنـەوەی نفـوزی ئێرانـیو لـەئوتی ١٩٩٥دا گفتوگۆیـەکی

334 Brzezinsky, Scowcroft and Murphy (1997).
335 This law, the Iran Libya Sanctions Act, was widely expected to have come to an end in August 2001 as reported by Beverly Rudy, among others: 'Fresh thinking on Capitol Hill', MEED, 6 April 2001
336 George W. Bush's State of the Union address can be found at: http://www.time.comitime/2002/stateoftheunion/index.html.

ناسەرکەوتووانەی ئاشتی لەئێرلەندا ڕێکخست، ئەمە ئەو کۆبوونەوەیە بوو کە دواتـر پـاش سـاڵێك لـە لەنـدەن درێـژەی پێـدرا، کـە لـەڕووی دیالێکتیکـەوە دەشـێت وەك ڕەتدانەوەیەکی ئەو داگیرکارییە کورتخایانـەی ئێرانییەکانـەوە بووبێـت بـۆ بـاکووری عێراق لە ژوئیەی ١٩٩٦دا. لە وەڵامی ملهوڕی عێراقیو پێشێلکردنی هێڵی ٣٦ی پـانی لەئوتی ١٩٩٦داو کاریگەری ئەمە لەسەر شێواندنی جڵەوگیرییەکەی. ئەمریکا لەمانگی داهـاتوودا هەسـتا بەپـەلامارێکی جـدیی موشـەکی دژی ئامانجـە سـەربازییەکانی لەباشـووری عێـراق. هەرچـەندە، سروشـتی لاوەکـی ئـەم پـەلامارە واینـەکرد لـە سـەرکەوتنی بەرچـاوی ئۆپەراسـیۆنە سـەربازییە عێراقییەکـە کەمبکاتـەوە. ئـەو ڕاستییەی کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نـەیتوانی پشتگیری بـۆ کـاری سـەربازی دژ بـە بەغـدا لەهاوپەیمانـەکانی پێشـوویەوە بەدەسـتبێنێت، بەتایبـەتی لـەجیهانی عەرەبیدا، زیاتر وەك سەرکەوتنێکی گەورە بـۆ بەغـداو ڕسـواییەکی دیپلۆماسـیش بـۆ ئەمریکای زلهێز تەماشاکرا.

دەتوانرێـت بەشـێکی شکسـتی دووانـە جڵـەوگیری بـۆ پەرەسـەندنەکانی کوردسـتانی ناوەندی بگەڕێنرێتەوە. هەروەك لەسەرەوە باسکرا، تورکیا ناچاربوو هاوکاری ئێـران بکـات بۆئـەوەی شایسـتەی تـەواوی خـۆی لەحاسـت پەکەکـەو نەتەوایـەتی کـوردیی بگێڕێتەوە. لێرەشەوە جیۆپۆلیتیکی ئەنکەرە پێویستی بە جڵەوکردنی پەکەکە بـوو، ئەمـەش ڕێگـەی بـە ئێرانـدا درزبکاتـە سیاسـەتی دووانـە جڵـەوگیری کـە لەلایـەن ئەمریکاوە بۆ سنووردارکردنی سەپێنرابوو.[337] دەبوو واشینگتۆن ئەوە پەسەند بکات کـە سیاسـەتە جیۆسـتراتیژییەکانی لەلایـەن هێزێکـی ئاسـت نێـوەنجی هەرێمییـەوە تەگەرەی دەخرێتەبـەر کـە لەگـەڵ کێبڕکیکـارە هەرێمییەکەیـدا سـەبارەت بـە پرسـی کورد بڕیاری هاوکاری داوە.

جیهـانی ئەمڕۆکـە جیهانێکـە کـە تێیـدا جەمسـەرگیری فـرە مەترسـیدارەو دابـڕین تەنانەت دەتوانێت بەئاسانی ببێتە پەرەسـەندنی پێچـەوانەی زێـدەتریش. بۆئـەوەی سیاسەتی دابڕین کاریگـەربێت پێویسـتی بـە کۆمـەڵگای نێودەوڵـەتی هەیـە بۆئـەوەی

337 Olson (2001), p. 21.

بەشێوەیەکی چەسپاو یەکگرتوو بێت کە خۆی لەخۆیدا فرە زەحمەتە. باشترین چارەسەر لەوانەیە هەوڵبێت بۆ تێکەڵکردنی هەنگاوی توندتر بەشێوەیەکی ئەمڕۆ کە لەوانەیە بڕەو بە دوو مۆدێلی جیاواز بدات: بڕیاردان لەگەمارۆکان بەڵام خۆدواخستن لەجێبەجێکردنیدا، کە دەتوانرێت وەك لەمپەرو ترسێنەر بەکاربهێنرێت، وێڕای هەموو ئەوانەش، "لەجیهانێکی بەجیهانیبوودا گەمارۆ تەنیا کاریگەرییەکی سنوورداری دەبێت."[٣٣٨]

## ٣ . ٧ یەکێتی ئەوروپی ( EU )

یەکێتی ئەوروپی ئارەزووی جەختکردنەوەی شوناسی خۆی لەسەر شانۆی سیاسی نێودەوڵەتی هەبوو، هەروەها، هەروەك لەباسی یەکەمدا پێشاندرا، ئەوە ئەوروپییەکان بوون کەلەلایەن بریتانیاوە سەرکردایەتی دەکران،[٣٣٩] لەسەر پێشنیازە تورکییەکە کاریان کرد، ئەوەی کە لایەنگری لە دامەزراندنی هەرێمێك لە باکووری عێراق کرد کە لەژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکان پاش کۆڕەوەکەی بەهاری ١٩٩١. ئەمەش ڕەنگدانەوەی دانپێدانانی ئەو ڕاستییە بوو کە لەپەیوەندییە جیۆپۆلیتیکیو جیۆستراتیژییەکاندا زۆر بنەڕەتییە بۆ یەکێتی ئەوروپا کە بەردەوام پەیوەندی بەزۆر لە پرسەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هەبێت. لەکاتێکدا ئەم ناوچەیە بۆ ئەوروپییەکان دوورەدەست نییە، بەڵکو ناوچەیەکە کە لەڕووی مێژووییو هەروەها ئابووریشەوە بە ئەوروپاوە پەیوەستبوو.

---

338 Schafer (1996).

٣٣٩ بەو پێیەی عێراق لەپاش یەکەمین جەنگی جیهانی بووە مانداتی بریتانی، بریتانیا پەیوەندییەکی تایبەتی بە دەوڵەتی عێراقەوە ژێر مانداتی خۆیەوە هەبوو، ستیڤن پێلیتیر بەڕوونی ڕۆڵی مێژوویی بریتانیای لە مامەڵەکردنی کوردانی ویلایەتی موسڵدا کردووە، کە دوای بووە باکووری عێراق. بڕوانە: (1984), pp. 58-68.

## ٧ . ٣ . ١ بەرەو سیاسەتێکی دەرەکی هاوبەش – ململانێو سازش

چوارچێوەی دامەزراوەیی یەکێتییەکە لەبنکەیەکی پتەوی ڕەوایەتیو دەسەڵات بێبەشە کە پرۆسەیەکی سیاسی نەتەوەیی ئاسایی لەسەر ڕاوەستابێت، هەروەها کارەکتەرە فرەکەلتووریو فرەئاستەکەی بەدرێژایی ساڵانی پێکهاتنی لەمپەرێك بوون لەبەردەم جێبەجێکردنی لەسەر ئاستی ئەوروپادا. ئەو دوو دامەزراوەیەی یەکێتی ئەوروپی، کە ڕۆڵێکی دیار دەگێڕن بریتین لە کۆمسیۆنەکەو ئەنجومەنی وەزیران. ئەوەی پێشوویان پێشنیازەکان ئامادە دەکات، لەکاتێکدا ئەوەی دواییان وەك یانەیەك بۆ دانوسانو یاسادەرکردن ڕاژە دەکات. پارلەمانی ئەوروپی تەنیا هێزە کەتایبەتە بە پرۆسەی سیاسەتسازی، بەڵکو ئەو توانایەشی هەیە کە کاریگەری بکاتە سەر ئەو بژارە سیاسییانەی لەسەر ئاستە بەرزەکان بڕیاریان لێدەدرێت.[٣٤٠]

بەرژەوەندیو بەرژەوەندی خودی فاکتەرگەلێکی گرنگن لەپرۆسەی سیاسی یەکێتی ئەوروپیو هەروەها چەمکی بەرژەوەندی ئەوروپی فرە پراگماتیانەو نەرمڕۆیە. هەمیشە ناکۆکییەکی بەرچاو هەیە سەبارەت بەوەی کە کام جۆری بەرژەوەندی گرنگییەکی زێدەتری هەیەو چۆنو بۆچی بەرژەوەندییەکان بەشێوازگەلێکی دیاریکراو پێناسەدەکرێن. بەرژەوەندییە هەرێمییە ئەوروپییەکان لەبەرژەوەندییە نەتەوایەتییەکانی وڵاتانی ئەندامەکانی پێکدێت، هەروەها بەهۆی سروشتو کارەکتەری جیاوازیانەوە، ناتوانرێت بەهەمان شێوەی بەرژەوەندییە نەتەوەییە نەریتییەکان پێناسەبکرێن. شانۆی سیاسەتی ئەوروپی سیمبولی ململانێیەکی مەجازییە لەنێوان بەرژەوەندییە خودییەکانی دەوڵەتانی ئەندامو فشاری بازنەی نفوزە ئەوروپییە خوازراوەکەوە. زۆر بەدەگمەن ئاکامی دیالۆگی سیاسی، هێڵێکی

340 Wallace (1996), pp. 54-57. Moreover, for an account of the European Parliament's position on the Kurds, see Ozan Ceyhun's 'Die EU und die Kurdenfrage' ['The EU and the Kurdish question] in Kurdisches Forum in Deutschland (1999), Irakisch-Kurdistan: Status und Pespektiven. Ergebnisse einer Internationalen Tagung 1999 in Berlin [Iraqi Kurdistan: Status and Perspectives. Proceedings from an International Conference in 1999 in Berlin], Berlin: Awadani, pp. 137-139.

چەسپاوو روونی سیاسەتێکی وای لێدەکەوێتەوە کە ملکەچی رژێمێکی چەسپاوی بەکۆمەڵ بێت." [٣٤١] وادەردەکەوێت کە لەکاتە نادیارە سیاسییەکاندا یان ئەو دەمەی گرفتە نێوخۆییەکانی دەوڵەتێکی ئەندام فرە ئاڵۆز دەبێت کە بەتەنیا بتوانێت خۆی چارەسەری بکات، رێحەزێکی وا دێتەپێش زیاتر لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا پێناسەبکرێت، تێکڕای بەرژەوەندییە ئەوروپییە هەرێمییەکە. [٣٤٢] هەربۆیە بەرژەوەندی گروپێك لەئاستی ئەوروپیدا لەسروشتدا نە بەردەوامەو نە هەمیشەییە.

یەکێتی ئەوروپی بەشێکی گەورەی بازرگانی جیهانی بەڕێوەدەباتو زەبەلاحێکی ئابوورییە. وێڕای ئەوەش، بۆماوەیەکی زۆریش نەیتوانی، یان نەیویست، کە ئەم توانا ئابوورییە راکێشێتە نێو مەیدانی سیاسییەوە، هەربۆیە هێشتا هەر کورتەبالایە." [٣٤٣] ئەم پێکدژییە تاڕادەیەکی دیاریکراو بەهۆی ئەو واقیعەوە لێکدەدرێتەوە کە تاکو ماوەیەکی زۆر نزیکیش، سیاسەتی دەرەکی بەشێکی لەبواری بەرپرسیارێتی یەکێتییەکە پێکنەدەهێنا. هەرچەندە، هەماهەنگییە جاروبارەکانی سیاسەتی دەرەکی دەوڵەتە ئەندامەکان پەرەیسەند بەرەو بێداربوونەوەیەکی گەشەکردووی بەرژەوەندی گشتی لەیەکترگیری پێگەکانو ئەنجامدانی کاری هاوبەش سەبارەت کاروبارەکانی سیاسەتی دەرەکی.

ئەو میکانیزمە نێوحکومییەی " EPC / هاوکاری سیاسی ئەوروپی " پێکدەهێنا، لەسەر کاری تاکلایەنەی ئەوروپی هاتبۆئارا، بەرجەستەی یەکەمین هەوڵی ئەوروپی دەکات کە ئاراستەیەکی گشتی بۆ سیاسەتی دەرەکی دەوڵەتانی ئەندام فەراهەم بکات. EPC بە فۆکوسکردن لەسەر "دیلۆماسیەتێکی خۆپارێزی هێورو درێژخایەن" لەکاتی مامەڵەکردنی لەگەڵ هەلومەرجە دژوارەکان کەموکوڕییەکی بەرچاوی پێشاندا. وێڕای ئەو رێحەزەی بۆ "نمایشکردنی بازنەیەکی کار-کاردانەوە کە تێیدا

341 Wallace (1996), p. 28.
342 Ifestos (1987) elaborates on this: p. 112.
343 Using Wistricht's antonyms: (1994), p. 142.

لەمپەر دەخاتە بەردەم ئەو كارو هەنگاوانەی بۆ هاوكاری دەكرێن."[344] رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گرنگترین ناوچەی سیاسی بوو لەنێو EPC، هەروەك لەجەنگی ئۆكتۆبەری ساڵی ١٩٧٣دا دەركەوت، ئەوەی وایكرد یەكەمین بڵاوكراوەی هاوبەشی خۆی دەربكات. هەڵگیرساندنی جەنگەكە وەڵامێكی EPC ی هێنایەئارا كە لەبنەڕەتدا تەمومژاویو پەرتەوازە بوو. هەرچەندە، دواجار بڵاوكراوەیەكی هاوبەش راگەیەندرا: داوای ئاگربەست، بانگەشەیەكی بۆ ئیسرائیل بەدواداهات كە پاشەكشە بكات بۆ سنوورەكانی پێش ١٩٦٧و رێز لەمافی فەلەستینییەكان بگرێت.[345] ئەم دەستپێشخەرییەی EPC زەمینەی بۆ دیالۆگی دواتری ئیسرائیلی-عەرەبی خۆشكرد كەلەكۆتایی ساڵی ١٩٧٣دا لەسەرداوای عەرەبی دەستپێكرد.
كاتێك EPC ، بەپێی وتەی كریستۆفەر هێڵ، " بەتایبەتی زۆر گونجاو مامەڵەی لەگەڵ قەیرانە نێودەوڵەتییەكاندا نەكردووە،"[346]، لەقەیرانی كەنداودا لەئوتی ١٩٩٠وە بۆ فێبرایەری ١٩٩١پێویستیی بەسیاسەتێكی زێدە گشتگیرتر ئاشكرابوو، كاتێك دەوڵەتانی ئەندام بەشێوەیەكی تاكلایەنە ئەكتیف بوون، بەڵام بەشێوەی دەستەجەمعی سستو پاسیف بوون. بیرۆكەی هەماهەنگكردنی سیاسەتی دەرەكی نەتەوەیی دەوڵەتەكانی ئەندام بۆ ماوەیەكی درێژ مشتوكڕی لەبارەوەكرا تاكو دواجار لەو رێكەوتنەی ساڵی ١٩٩١دا لەسەر یەكێتی ئەوروپی پێكەوە گرێدرا (بەرێكەوتننامەی ماسترێخت دەناسرێت) كە لەساڵی ١٩٩٣دا خرایەكار. بەندی ج جەخت لە دامەزراندنی "CFSP/ سیاسەتێكی دەرەكیو ئاسایشی هاوبەش" دەكاتەوە بەمەبەستی لەقاڵبدانی سیاسەتەكانی دەرەكیو ئاسایشی ١٢ ئەندامەكە (ئێستا ١٥ یە) لە یەك سیاسەتدا. لەبری هەوڵدان بۆ هەماهەنگی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتانی ئەندام هەروەك EPC كردی، CFSP جەختی لەپێناسەكردنی سیاسەتێكی هاوبەش كردەوە. لەئاكامدا، دەوڵەتانی ئەندام ناچاربوون خۆیان لەگەڵ پێگەیەكی هاوبەش بگونجێنن كە سەبارەت بە كاروبارە ئاسایشیو دەرەكییەكان

344 Hill (1992), pp. 135-136.
345 Soetendorp (1999), pp. 101-102.
346 Hill (1992), p. 145.

دەگیرێتەبەر، ئەوەی لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە دیاریدەکرێت.[347]
ئامانجە پێشنیازکراوەکانی CFSP هەروەك لەسەرەتای رێکەوتننامەی ماسترێختدا دانرابوو بریتیبوو لە زامنکردنی بەهای هاوبەش، بەرژەوەندییە بنەڕەتییەکانو سەربەخۆی یەکێتی ئەوروپی، بەهێزکردنی ئاسایشی یەکێتییەکەو دەوڵەتانی ئەندام، پاراستنی ئاشتیو پتەوکردنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، تۆکمەکردنی هاوکاری نێودەوڵەتی، پەرەسەندنو پتەوکردنی دیموکراسیو حوکمی یاسا، رێزگرتنی مافی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان.[348] ئەم ئامانجانە دەبێت بگیرێنەبەر " لە رێگەی دامەزراندنی هاوکارییەکی سیستماتیك لەنێوان دەوڵەتانی ئەندام لەبەرێوەبردنی سیاسەتدا...هەروەها وردە وردە جێبەجێکردنی کاری هاوبەش لەوناوچانەی کە دەوڵەتانی ئەندام بەرژەوەندی هاوبەشیان تێیدا هەیە."[349] ئەوە جێگەی مشتومڕە داخۆ ئەمە چوارچێوەیەکی پتەو پێکدەهێنێت کە بتوانێت پرۆسەیەکی سیاسەتسازی متمانەداری لێوە پێشبکەوێت، هەروەها، لەڕاستیدا، ئەو پێشکەوتنەی سەبارەت بە پەرەسەندنی CFSP هەبوو خاوبوو. ١٥ دەوڵەتە ئەندامەکەی یەکێتییەکە زۆرجار لەوەدا ناکۆکبوون کە کام لەو هەڵوێستو سیاسەتانە زۆر گونجاوترن بۆئەوەی بگیرێتەبەر، هەروەها هاوسازکردنی ئەم تێڕوانینە جۆراوجۆرو هێندێکجاریش پێکدژانە لەپێناو فۆرمەڵەکردنی سیاسەتێکی دروستو بەردەوامی یەکێتی ئەوروپی کارێکی فرە سەخت بوو. وێڕای گرفتەکان، CFSP یەکەی ماسترێخت بۆ خولیا ئایندەییەکانی یەکێتی ئەوروپی ئاماژەی دەستپێکێکی مژدەبەخش بوو.[350]
هەنگاوەکان بەرەو فیدراسیۆنی ئەوروپی بەوریاییەکی زێدەوە نرا لەکاتێکدا هەوڵەکان بۆ کاریگەرییەکی زێدە لەرێگەی کاری هاوبەشەوە پێکدادانی حەتمی

347 For a presentation on the CFSP see http://ue.eu.int/pesedefault.asp.
348 Rummel (1992), p. 326.
349 Ibid.
350 For an interesting discussion on the CFSP see Charlotte Bretherton and John Vogler (1999), The European Union as a Global Actor, London: Routledge, pp. 179-193.

لەگەڵ بایەخەکان بەپاراستنی سەروەریی نەتەوەیی دێنێتەئارا، سیاسەتێکی دەرەکی هاوبەش مانای لەدەستدانی سەروەری دەگەیانـد لەلایەن دەوڵەتانی ئەندامەوە، هەروەها بەوەش یەکێتییەکە لەسەر چەندین ئاست رووبەڕووی چەندین گرفت دەبۆوە لە سیاسەتسازییە دەرەکییەکەیدا. هەوڵدان بۆ گەیشتن بەئاستێکی دیاریکراو کە شایەنی سازش بێت لەکاتی دانوسان لەمەڕ هەڵوێستی هاوبەش سەبارەت بە پرسە گرنگەکان ئەرکێکی سەخت بوو، هەروەها دەشێت ئەو مەسەلەیە سەختتربێت کاتێك هاوکات دەبێت لەگەڵ بوونی ئارەزوویەك بۆ پێناسەکردنی رۆڵی سیاسی بەشێوەیەکی وردترو روونتر. وێڕای لەبەرچاوگرتنی ئەو راستییەی کە دەبێت کاتو هەوڵێکی بەرچاو لەلایەن هەموو دەوڵەتانی ئەندامەوە تەرخانبکرێت بۆئەوەی بگەنە یەکەمین قۆناغ، پشکوتنی دوابەرهەم پێدەچێت ئەوەبێت لەجیاتی قسەکردن بەیەك دەنگ، ئەوروپا جیهێڵرا بێئەوەی بەهیچ شێوەیەك دەنگێکی هەبێت. لەڕاستیدا، لەسایەی هەلومەرجێکی دیاریکراودا، ئەوروپییەکان سەلماندیان کە لێزانترن کاتێك بەجیا هەڵسوڕێن. هەرچەندە، ئەم لێزانییە هەمیشە زادەی رێبازێکی بنیاتی نەبوو. لە رۆژە بەراییەکانی CFSP دا، هەر دەوڵەتێکی ئەندام ئارەزووی ژێربەژێری خۆی هەبوو تاکو وەك لێزانییەك پێشانیبدات لەنەبوونی بەرەیەکی یەکگرتوو سەبارەت بە پرسەکان لەبارەی بەرژەوەندییە ئەوروپییەکانەوە.

وێڕای ئەو راستییەی کە یەکێتی ئەوروپی بە روونی بەیەك دەنگ قسە ناکات، سیاسەتی " دیالۆگی گشتگیرو یەکلاکەرەوە" کە سەبارەت بەئێران گیرایەبەر، پێشانیدەدات کە دەوڵەتانی ئەندامی EU وەك یەکێتی ئەوروپی توانای مامەڵەکردنێکی نێودەوڵەتییان هەیەو هەروەها شایستەیی کارکردنیان بەشێوازێکی یەکگرتوو هەیە. هەرچەندە، راگەیاندنە هاوبەشەکان دوای کۆمەڵێك دانوسانو سازشی گەورە دێن – لەپێشبینی ئاکامی هەر هەولگەلێك بۆ یەکخستنی چەند تێڕوانینێکی بەهێز لە تاقە هەڵوێستێکدا. بەوەش، دەنگی یەکێتی ئەوروپی هەمیشە سەدایەکی زیاتری لەدەنگی دەوڵەتانی ئەندام بەشێوەیەکی تاکلایەنانە نییە.

هەرچەندە، وەك پێشتر لەم تێزەدا جەختی لێکراوەتەوە، ئەوە تەنیا رابردوو نییە کە ئایندە دیاریدەکات، هەروەها ئەکێتی ئەوروپی لەبواری سیاسەتی دەرەکیدا خاوەن تواناو ئیمکاناتێکە کە بەتەواوی پەی پێ نەبراوە.

ئەوەی هاندەرە ئەوەیە کە لەم ماوەیەی دواییدا یەکێتی ئەوروپی پێداگری‌و پێشکەوتنی لەگەڵ CFSP کەیدا پێشانداوە، بۆ نموونە، لەبەهاری ۲۰۰۱دا، یەکێتییەکە بەشێوەیەکی بەهێز بەیەك دەنگ قسەیکردو بەشداری بەرچاوی کرد لە دواخستنی رەوشی دژواری کۆمارە یۆگۆسلاڤیاکەی پێشووی مەکەدۆنیا لەرێگەی پەیوەستبوونێکی درێژخایەن کە بە کۆکردنەوەی " preventive diplomacy and regional integration / دیپلۆماسی پێشگیری‌و پێکەوەگرێدانی هەرێمی" جیادەکرایەوە.[351] لەوەش زیاتر، لەیەنایەری ۲۰۰۲دا، یەکێتی ئەوروپی بەکارهێنانی "گەمارۆدانی ئامانجدار" بەسەر زیمبابۆیدا راگەیشت، کە رۆبەرت مۆگابی سەرۆکەکەی شێوە ئاکارێکی گرتبۆبەر کە لەگەڵ پێودانگە نێودەوڵەتییەکاندا نەدەهاتەوە. هەروەها ئەوروپییەکان هەوڵیاندا کارەکانیان لەگەڵ واشینگتۆندا هەماهەنگ بکەن کە دەرکەوتەیەکی نائاسایی بوو لەهەماهەنگکردنی کاری سیاسی لەلایەن دەوڵەتانی ئەندامی یەکێتی ئەوروپییەوە.[352] ئەم نیشانانە مژدەبەخشبوون‌و رێحەزێکی ئەرێی بۆ پەرەسەندنی زیاتری CFSP دەردەخەن.

## ۲ . ۳ . ۷ یەکێتی ئەوروپی‌و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست

گەشەکردن‌و ئاسایشی ئەوروپای رۆژئاوا بەشێوەیەکی مەزن پشتدەبەستێت بە پەرەسەندنەکان لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. هەرچەندە، ئەوەی گرنگە جەختی لەسەر

---

351 Press release issued following the EU Foreign Minister General Affairs Council meeting on 11 June 2001 on www.eu2001.se.
352 See for instance BBC interview with Foreign Office Minister Peter HaM 27 January 2001 at
http://www.bbc.co.uk/otriintext/20000409_int_2.html.

بکرێتـەوە ئەوەیـە کـە هێنـدێك لەدەوڵەتـە ئەندامـەکانی یـەکێتی ئـەورووپی لـەڕووی ئابوورییـەوە کـەمتر لـەوانی دیکـە لاوازبـن. بـۆ نموونـە، بریتانیـای مـەزن بـەهۆی بەرهـەمهێنانو یـەدەگی نـەوتی دەریـای بـاکوورەوە لەئـەڵمانیاو فرەنسـا کـەمتر پشتبەستووترن، چونکە ئـەوان بەشێوەیەکی بـەردەوام پشـت بـە نـەوتی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت دەبەسـتن. ئەمـەش بەشـێوەیەکی حـەتمی دەبێتـە هـۆی دژواریو نـاکۆکی کاتێـك دێتەسـەر ئـەوەی هەماهـەنگی لەسیاسـەتێکی هاوبەشـی یـەکێتی ئـەورووپی لەهەمبەر هەرێمێك بکرێت.

لەروونکردنەوەی کاری ئایندەی یەکێتی ئەورووپی سەبارەت بەکێشەی کورد، پێویستە ئاماژەیـەك بـە سیاسـەتەکانی پێشووی سـەبارەت بـە هەرێمەکـە بـدەین، لەچەشـنی "دیالۆگی ئـەورووپی-عـەرەبی" کـە لایـەنی عـەرەبی تێیـدا لـە بیسـتو یـەك دەوڵەتـە ئەندامەکەی کۆمکاری عـەرەبی پێکـدێت. لـەنێو چوارچێوەی یـەکێتی ئەورووپییـداو لەگـەڵ توانـای سـەرەکی بـۆ دەرکردنـی بەیاننامـەو دەسـتپێکردنی دیـالۆگ، ئـەم دیسکۆرسـە تایبەتـە لەسـەرەتای ساڵانی ١٩٧٠کانـەوە دەسـتیپێکردبوو بـۆ چاککردنی پەیوەندییەکانی نێوان ئەورووپاو جیهانی عەرەبیو پتەوکردنی تێگەیشتنی هاوبەش. هـەروەها هاوکـاری لـەنێوان ئـەو دوو لایەنـە لـەبوارەکانی گەشـەکردنو بازرگـانیو رۆشـنبیری پتـەوکرا – هێنـدێك تایبەتمەنـدی بنـەڕەتی لەگـەڵ سیاسـەتی دیـالۆگی یـەکێتی ئـەورووپی لەگـەڵ کۆمـاری ئیسلامی ئێرانـی ساڵانی ١٩٩٠کـان هاوبـەش بـوو. دیـالۆگی ئـەورووپی-عـەرەبی لەسـاڵانی ١٩٧٠کانـەوە ئەنجامـدراوە، بـەڵام ناکۆکییـە نێوخۆییـە عەرەبییـەکان، بەشـێوەیەکی مـەزنو لـەئاکامی دەرکردنـی میسـر لـە کۆمکاری عـەرەبی پـاش رێکەوتنامـەی ئاشـتی کـە لـەکامپ دێڤیـد مـۆرکرا، لەدەیـەی داهاتوودا لەدۆخێکی چەقبەستوودا رایگرت. دواجار ئەورووپییەکان هەوڵی گفتوگۆی سـوودمەندو ئەنجامبەخشـیاندا لەگـەڵ رێکخراوەکـانی دیکـەی وەك "    /    GCCئەنجومەنی هاوکاری کەنداو".

وێڕای دیالۆگی ئەورووپی-عەرەبی، رێکەوتننامـەی هاوکـاری دوولایەنـەو چـەندلایەنە هـەبوو، وەك سیاسـەتەکانی هـەرێمی دەریـای سـپی ناوەڕاسـت، وێـڕای پەیوەنـدی

فرەلایەنـەی دەوڵـەتانی ئەنـدامی یـەکێتی ئـەوروپی لەگـەڵ دەوڵەتـە هەرێمییـەکان. وەك " CSCM / کۆنفرانســی ئاســایش‌و هاوکــاری لەهــەرێمی دەریــای ســپی ناوەڕاسـت" ئــەوەی بەتونـدی پەیوەســتە بــە " CSCE / کۆنفرانسـی ئاسـایش‌و هاوکـاری لەئـەوروپا. لەسـاڵی ١٩٩٠دا، لەلایـەن وڵاتـانی بـاکووری ئـەفریقاو هـەرێمی دەرەیای سپی ناوەڕاستدا، بایەخی ناوەندیان بریتیبـوو لـە دامەزرانـدنی سیسـتمێکی جێگیری هاوکـاری هـەرێمی کـە ئامانجەکـەی چەسـپاندنی ئاسایشـی هـەرێمی دەریـای سپی ناوەڕاست بێت.[٣٥٣]

یەکەمین هەوڵگەلێکی یەکێتی ئەوروپی بـۆ فۆرمەڵـەکردنی پەیوەندییـەکانی لەگـەڵ وڵاتە عەرەبییەکانی هەرێمی دەریـای سـپی ناوەڕاسـت بـۆ سـەرەتای سـاڵانی ١٩٧٠کـان دەگەڕێتەوە، کاتێـك EC چـەند ڕێکەوتننامەیـەکی جدیی هاوکاری لەگـەڵ وڵاتـانی باکووری ئەفریقاو ڕۆژهەڵاتی هەرێمی دەریای سپی ناوەڕاست ئەنجامدا، کە ئامـانجی پێکهێنانی مەڵبەندێك بـوو بـۆ بازرگـانی ئـازاد. ئـەم ڕێکەوتننانـە لەسـەر مەسـەلەی گــومرگ بۆســەر کــاڵا بازرگــانی‌و کشــتوکاڵییەکان راوەســتابوو. هــەروەها چــەند بەندێکیشــی ســەبارەت بــە یارمــەتی کۆنفرانســی ئــەوروپی یــەکێتی ئــەوروپی گرتبووەخـۆ.[٣٥٤] بـەبنیادنان لەسـەر ئەمـەش، لەسـاڵی ١٩٩٥دا، پرۆژەیـەکی هاوبەشـی ئـەوروپی- هـەرێمی دەریـای سـپی ناوەڕاسـت دەسـتپێکرد، ١٥ دەوڵەتـە ئەندامەکـەی یەکێتی ئـەوروپی بـە ١٢ دەوڵەتەکـەی باشـووری هـەرێمی دەریـای سـپی ناوەڕاسـتەوە بەســتەوە. بــۆ پاراســتنی ئاشــتی‌و ئاســایش‌و ئــارامی لەناوچــەکە، ئامــانج لێــی دامەزراندنی ناوچـەیەکی سیاسـی‌و ئـابووری نـوێ بـوو لەسـاڵی ٢٠١٠دا کـە نـەك هـەر لەســەر بنـەمای بازرگـانی ئـازادو هاوکـاری بـەهێزی ناوچـەکە لـەڕووی وزەو ئـاوو کۆچکردنەوە، بەڵکو لەسەر ئاستی سیاسەتی هەرێمیش ئەنجامبدرێت.[٣٥٥]

پێدەچێت بۆماوەیەکی درێژ ئەو پرسانەی سیاسەتی دەرەوە کە یەکێتی ئەوروپییان دابەشــکردووە بایــەخێکی زیاتریــان هــەبێت کــە لــەو پرســانەی کــە هەڵوێســتێکی

353 Niblock (1993), pp. 251-255.
354 Islam (1988), p. 69.
355 Marks (1995), p. 2.

یـەکگرتوویان هێناوەتـەئارا. هەرچـەندە، بەپێچـەوانەوە، پەیوەندییـەکانی یـەکێتی ئەورووپی لەگەڵ ئێراندا، هەروەك لەسەرەوە ئاماژەی بۆکراوە، بەشێوەیەکی تایبـەت سەرنجڕاکێشـە، لەکاتێکـدا وێـڕای دەرکـەوتنی نـاکۆکی ناوبـەناوی لەلایـەن دەوڵەتـە ئەندامــە جۆربەجۆرەکانــەوە ســەلماندوویانە کــە یــەکێکن لــەبارەی ئــەو پرســە سەرەکییانەی کە یەکێتییەکـە وایـداناوە هەڵوێسـتێکی یـەکگرتووو هاوبەشـی لەمـەڕ بگیرێتەبـەر. لەڕاسـتیدا، سیاسـەتی یـەکێتی ئـەورووپی لـەتێوەگلانی بنیـاتی لەگـەڵ ئێران، کە بـە "دیـالۆگی یەکلاکـەرەوە" دەسـتیپێکردو دواتـریش گۆڕا بـۆ "دیـالۆگی گشتگیر" لەوانەیە لەئایندەیەکی دووردا بەقازانجی کوردان بشکێتەوە، لەکاتێکدا ئـەم نزیکبوونــەوە دۆســتانەیە هــانی دیموکراســی لــەئێران دەدات، ئــەو پەرەســەندنەی دەشێت کار لەباقی دیکەی هەرێمەکە بکات کە تێیدا کوردان سوودمەندی سەرەکین.

لەڕاسـتیدا کێشـەی کـورد لەلایـەن یـەکێتی ئەورووپییـەوە دانـی پێـدانراوە، هـەروەها بەشـێوەیەکی سـەرەکی لەپەیوەندییـەکانی برۆکسل لەگـەڵ تورکیـادا، کـە ماوەیـەکی زۆرە بەدوای ئەندامبوون لە یەکێتی ئـەورووپادا رادەکـات، کـوردان فاکتـەرێکی گـرنگ پێکـدەهێنن. لەسـاڵی ١٩٩٩دا، یـەکێتی ئـەورووپی پێگـەی کاندیـدی دابـە تورکیـا، بـەو مەرجەی ئەنکەرە داواکارییەکانی سیاسیو مرۆیـی بـۆ ئەنـدامێتی یـەکێتی ئـەورووپی بگونجێنێت، ئەوەی بە پێودانگـەکانی کۆبنهـاگن ناودەبرێـت – پێشـئەوەی دانوسـانی راســتیینە بــۆ بەئەنــدامبوونی بکرێــت. جێبــەجێکردنی برێکــی زۆر لــەریفۆرمی کۆمەڵایــەتی بەپێویســت دەزانرێــت، هــەروەها کاتێــك یــەکێتی ئــەورووپی داوای هەنگاونانی کرد بۆ زامنکردنی دیموکراسی، سـەروەری یاسـا، مـافی مـرۆڤ ، رێزگـرتنی مافو پاراستنی کەمینەکان، کوردان یەکەمین کـەس دەبـن قـازانج بکـەن. لەڕاسـتیدا، بەخشینی مافگەلێکی زێـدەتری کـەلتووری بـەکوردان لـەتورکیا مـەرجێکی پێویسـتە کەلەلایەن یەکێتی ئەورووپییەوە دانراوە بۆئەوەی لەگەڵ ئەنکەرەدا دەست بـەگفتوگۆ بەراییـەکان بکـەن.[٣٥٦] هەرچـەندە، پەیوەندییـەکان لـەگرژی بەدەرنـەبوو. پلانـەکانی یەکێتی ئەورووپی بۆ هاوکاریکردنی دارایی دەرچوونی رۆژنامەیەك بەزمانی کوردیی،

356 Jean-Christophe Peuch, Radio Free Europe, 15 March 2002.

تورکانی تورِەکرد، هەروەها رەتکردنەوەی برۆکسل بۆ لێدانی مۆری رێکخراوێکی تیرۆرستی لە پەکەکە، ئەوەی فشاری تورکیای لەرێگەی بریتانیاو ئەمریکاوە هێنا.[357] هەرچەندە، ئەوە بەهۆی تێوەگلان‌و پێداگری یەکێتی ئەوروپییەوە بوو کە سیاسەتی ٨٠ساڵەی کەمالیسیتی نیشانەگەلێکی گۆڕانگاری تێدا دەرکەوتووە، فێرکردن‌و پەخشکردن بەزمانی کوردیی پێش مۆرکردنی بەڵگەنامەی " رێکەوتننامەی پەسەندکردنی بەشداری" سێ ساڵ بەر لەئێستا، نەدەخرایە بەردەم گفتوگۆ. ئەمێستا ئاستێکی بێ وێنە لەمشتومڕی گشتی سەبارەت بەم پرسە لەگۆڕێدایە، کە تەنانەت ئەو پێشنیازەشی لەلایەن باڵی لیبراڵی دامەزراوەی سیاسی توركی گرتۆتەخۆ کە پێویستە رێگە بە پەکەکە بدرێت بگۆڕێت بۆ پارتێکی سیاسی.[358] لەڕاستیدا، یەکێتی ئەوروپی رۆڵێکی دیاری لەبەرگریگردن لەمافی کوردانداهەبووەو هەروەها سەبارەت بە باکووری عێراقیش، یەکێتی ئەوروپی توانیویێتی وردە وردە تێوەگلانی خۆی بۆ ئەودیو مەسەلەی دابینکردنی هاوکاری فووڵبکاتەوە. رۆڵی برۆکسل بەشێوەیەکی سەرەکی بریتیبوو لە بەخشینی هاوکاری دارایی- لەبنەڕەتدا لەرێگەی " ECHO / مەکتەبی کۆمسیۆنی هاوکاری ئەوروپی" و هەروەها ئاژانسی ئاوەدانکردنەوەی ئەوروپی- بە رێکخراوەکانی NGO ئێن جی ئۆکان کە لەناوچە خودحوکمڕانەکەدا چالاکبوون، لەکاتێکدا خۆی لە هەر دەستپێشخەرییەکی سیاسی بەدوورگرتبوو.

لەعێراقی پاش سەدام حسێن دا، یەکێتی ئەوروپی رۆڵێکی گرنگی دەبێت کە بیگێڕێت زیاتر لەزۆر لەرێکخراوە نێودەوڵەتییەکان یاخود گروپی وڵاتەکان، دەتوانێت خۆی وەك نێوەندگیرێکی راستگۆ لەعێراقی پاش سەدام پێشکەش بکات. یەکێتی ئەوروپی مۆدێلێکە بۆ هاوکاری‌و پێکەوەبەستنی هەرێمی، هەروەها خۆی لەخۆیدا نموونەیەکە بۆ پێکهێنانی ئاشتی. هەرچەندە، پێکەوەبەستنی ئەوروپی هێندێك جیاوازی هەیە لەو چەشنە پێکەوەبەستنە پێویستەی کە دەبێت لە عێراق

357 Nicholas Birch, Christian Science Monitor, March 21, 2002.
358 Mohammad Noureddine, Daily Star (Beirut), March 12, 2002.

لەنێوان کوردو عەرەبدا بێتەئارا.[359] وێڕای ئەوەش، ئەوروپییەکان سوودبەخش دەبن لەڕووی توانای برەوپێدانی ئەزموونەکەیانەوە لەبارەی پێکەوەبەستن لە پرۆسەی هێنانەدی پێکەوەژیانێکی ئاشتییانەی بەردەوامی نێوان دوو گەلە خۆ بەنەتەوەزانەکەی عێراق.

دیالۆگی ئەوروپی-عەرەبی بەتایبەت بۆئەوە دانەمەزراوە کە ببێتە چوارچێوەیەك بۆ چارەسەرکردنی پرسی عەرەب-ئیسرائیل، هەرچەندە، مەبەستیش ئەوەبوو کە وەك یانەیەك بێت بەڕووی بابەتە سیاسییەکاندا. بەهەمان شێوەی کە عەرەبەکان بەهیوابوون دیالۆگ ببێتە هاندەری ئەوروپییەکان تاکو زیاتر بە گرفتی فەلستینەوە پەیوەستبن‌و لێی تێبگەن، دیالۆگی ئەوروپی-کوردیش پێدەچێت زیاتر ئەوروپییەکان لە پرسی کورد نزیکبکاتەوە. لەڕاستیدا، کوردان لەڕووی سیاسییەوە بەدەست نەبوونی یەکێتی نێوخۆییەوە دەناڵێنن، بەڵام وەك فۆکوسێکی بەرایی لەسەر کوردستانی عێراق، پێدەچێت یەکێتی ئەوروپی ئەوە بەسوودبەخش بزانێت چاودێرییەکی زیاتری ڕەوشەکە بکات‌و دەستپێشخەری سیاسی بکات تاکو کوردان وەك یەکەیەکی گرنگ لەیەکتر نزیك بکاتەوە.

گەیشتنە چارەسەرکردنی کێشەیەك بەچەشنی کێشەی کوردو لەناوچەیەکدا بەچەشنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست پێویستی بە ئامادەگی هێزی هاوسەنگکار هەیە لەسەر پێگەی نێوەندگیری یان دانوساندا. واباشترە کە ئەو هێزە سەربەخۆو جیابێت لە لایەنەکانی ململانێیەکە.[360] یەکێتی ئەوروپی بەو پێکهاتە ناوازەیەوە لەبونیادە بان نەتەوەییەکان‌و نێوحکومەتییەکان پێدەچێت دەسەڵاتێکی دامەزراو بێت کە بەباشی بگونجێت لەگەڵ بینینی ڕۆڵێکی ڕێبەرایەتی لەچارەسەرکردنی ململانێکاندا

---

٣٥٩ ئەمە زیاتر لە باسی هەشتەمدا سەبارەت بە ئەگەرەکان ڕوونکردنەوەی زیاتری لەبارەوە دراوە.

٣٦٠ بە پێچەوانەی هەڵوێستی ملکەچانەی ئەمریکا سەبارەت بەم مەسەلەیە، یەکێتی ئەوروپی چەندین بەیاننامەی سەبارەت بەدەستێوەردانی تورکی لەباکووری عێراق لەساڵانی ١٩٩٠کاندا دەرکرد تێیدا جەختی لەوە کردەوە کە دەبێت چارەسەری کێشەی کورد بەشێوەی سیاسی بێت نەك سەربازی. بڕوانە:
See e.g. Press Release Nr: 8136/97, 16-05-1997: Press Release Nr: 6323/95, 11-04-1995; Press Release Nr: 6314/95, 05- 04-1995; Press Release Nr: 6726/95, 09-05-1995 at http://ue.eu.int/Pesc/default.asp?lang=en.

سەبارەت بەعێراق‌و کوردانی.

وەك پێکهاتەیەکی بەرچاو کە هەردوو چەمکەکەی سەروەری‌و فیدرالیزمی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە، کاریگەری یەکێتی ئەوروپی لەگەشەکردندایە، هەرچەندە، بەشێوەیەکی هێواش. سەبارەت بە پێگەی گرنگ‌و ستراتیژی- یەکێتی ئەوروپی بەدڵنیاییەوە رۆڵێکی مەزنتری دەبێت لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بیگێڕێت، هەروەها ئەوەش پێچەوانەی ئەمریکییەکانە، ئەوروپییەکان دەتوانن سوود لە بێلایەنی هەستپێکراویان بکەن سەبارەت بەو کێشانەی کە کارەکتەری تەقێنەرەوەیان لەناوچەکەدا هەیە. هەرچەندە، ئەوە واقیعی نییە کە زلهێزە باڵادەستەکەی ماوەتەوە (واتە ئەمریکا-و) لەهاوکێشەکە دەربهاوێژرێت. لەڕاستیدا، پەیوەندییە ئەوروپی و ئەمریکییە هاوبەشەکان"transatlantic " بەدرێژی لە لوتکەی ئەنجومەنی ئەوروپیدا لە ژونی ٢٠٠١دا مشتومڕیان لەبارەوە کرا، تێیدا رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەك ناوچەیەك بۆ هاوکاری زێدەتر یاخود کاری هاوبەشی سیاسەتی دەرەکی پێناسەکرا. هەروەها جەخت لە تۆکمەکردنی هاوکاری لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکاندا لەو ناوچەیەدا کراوەتەوە.[٣٦١]

ئەم شێوازە کە کوردان گرتیانەبەر بۆئەوەی لەسەر شانۆی جیهانی هەستیان پێبکرێت، کاتێك دۆخە ناکامەکەی عەبدوڵڵا ئۆجالان بووە هۆی تەیارکردنێکی بەرفراوانی کوردان لە دیاسپۆرا، لەوانەیە لەسەر خاکی ئەوروپی زۆر سەرنجڕاکێش بێت. ئەو راستییەی کە یەکێتی ئەوروپی دەرفەتێکی کاریگەرێتی لە ساڵانی ١٩٩٨-١٩٩٩ لەدەستدا کاتێك شکستیهێنا کار لەسەر داواکەی عەبدوڵڵا ئۆجالانی سەرۆکی پەکەکە بکات سەبارەت بە پەنابەری سیاسی‌و هەروەها لەرێگەی کاری هەماهەنگەوە بۆئەوەی بخرێتە بەردەم دادگایەکی بێلایەن لەلاهای. ئەوەش بەدبەختی بوو.[٣٦٢] هەرچەندە، ئەوە رێگە لەیەکێتی ئەوروپی ناگرێت کە زیاتر لە

---

361 Presidency Conclusions, Goteborg European Council, 15-16 June 2001, P. 13.

٣٦٢ یەکێتی ئەوروپی خۆی بەدەرکردنی بەیاننامەیەك بەستەوە کە داوای دادگایەکی عادیلانە بۆ ئۆجالان دەکات پاش ئەوەی گیراو برایەوە تورکیا. بڕوانە:

سـیماگەلە ئایندەییـەکانی کێشـەی کـوردەوە بگلێـت. بەشـداری سیاسـی یـەکێتی ئـەوروپی‌و هـەروەها توانـای بـۆ کاریگـەری زۆرجـار بـەهای خـۆی پـێ نادرێـت. ئەوروپییـەکان هەمیشـە بـەقووڵی لەپرسـی بـاکووری عێـراقـدا تێـوەگلاون، هـەروەها ئەگەر دەوڵەتانی ئەندام سیاسەتەکانی خۆیان هاوسازبکەن، یەکێتییەکە، بەو ئاست‌و پێگەیـەی ئـامرازە سیاسـییەکانی، دەتوانێـت جیاوازییـەکی بەرچـاو لـەئامادەگی سیاسەتی کوردی لەسەر شانۆی هەرێمی بێنێتەئارا، لەوانەیە، یەکێتییەکەو CSFP یەکەی پێویستی بە پێگەیشتنێکی زێدەتر هەیە تاکو درك بەوە بکات کە ئەو هەوڵە زۆرەی پێویسـتە بـۆ بـەدیهێنانی پێگەیـەکی هاوبـەش سـەبارەت بەکێشـەی کـورد لەڕاستیدا پاساوبەخشە. هەروەها پێویستە زامنی ئـەوە بکرێـت کـە ویستی سیاسـی هەیـە بـۆ جێبـەجێکردنی سیاسـەتێك کـە کـار بـۆ بەرزکردنـەوەی ئاسـتی کاریگەرییەکەی بکات لەناوچەیەکدا کە پێگەیەکی گرنگی بەو چەشنەی هەیە.

## ٧ . ٣ . ٣ ڕێبازو پۆتێنساڵی جیاواز: یەکێتی ئەوروپی لەبەرامبەر وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا

ئایـا یـەکێتی ئـەوروپی توانـای رکابـەری ئـەمریکای لـەکاروباری جیهانیـدا هەیـە؟ بەهەمان تێڕوانینی بریسێرتۆن‌و فۆگلەر، کە مشـتومڕیان لـەو بارەیـەوە کـردووە لـە بابەتگـەلێکی دیـاریکراودا رێکخـراوە ئەوروپییەکـە وەك هێزێـك لەگـەڵ وڵاتـە یکگرتووەکـانی ئەمریکادایـە لـە کاروبـارە جیهانییەکانـدا پلەبەنـدی دەکرێـت،[٣٦٣] هەروەها مشتومڕ لەوبارەیەوە کـراوە کـە یـەکێتی ئـەوروپی دەتوانێت‌و پێویستیشـە ڕۆڵی خۆی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بدۆزێتەوە، لەگەڵ جەختکردنەوەیەکی تایبـەت سەبارەت بەکێشەی کورد لەباکووری عێراق.

---

Press Release Nr: 6214/99, 22-02-1999 at http://ue.eu.int/Pesc/default.asp?lang=en. 

363 See their The European Union as a Global Actor, London: Routledge (1999).

گومـانی تێـدا نییـە کـە یـەکێتی ئـەورووپیو هاوپەیمانـەکانی، بەتایبـەت وڵاتـە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، لەهەمان ئەو بەها بنەڕەتییانەدا هاوبەشن کەبەشێوەیەکی گشتی وەك ئاکاری نێودەوڵەتی پەسەندکراو درککراوە- بەڵام ئەوان لەوەدا ناکۆکن کە باشـترین ڕێبـاز کامەیـە بـۆ هێنانـەدی گۆڕانێکی خـوازراو لەمامەڵـەکردن بـۆ لەگـەڵ وڵاتێکدا کە لەگـەڵ ئـەو ڕێسا نەریتییانـەدا نایەتـەوە. بۆنموونـە، یـەکێتی ئـەورووپی مشـتومڕی لەوبارەیـەوە دەکـرد کـە پێویسـتی ئێـران بـۆ وەبـەرهێنانی ڕۆژئـاوایی بریتییـە لەدەرفـەتێکی سیاسـیو وێـڕای ئـەوەی دەرفـەتێکی بازرگانیشـە، چـونکە ئەگەرەکان بەڕووی دیالۆگدا دەکاتەوە، ئەو دیدەی کەلەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانەوە بەرهەڵستی دەکرا. لەئاکامدا، زۆرجار جەخت لەپێویستی یەکێتییەکە دەکرایـەوە بـۆ ئەوەی سیاسەتێکی سەربەخۆ لەوەکەی وڵاتـە یـەکگرتووەکان بگرێتەبـەر کـە لەسـەر بنەمای بەرژەوەندی ئابووریو ستراتیژییەکانی ئەورووپییەکان سەرچاوەی گرتبێـت. لەهەوڵـدان بـۆ خۆدوورخسـتنەوەیان لەسیاسـەتەکانی ئـەمریکا، لەئێسـتاو هـەروەها لەرابردووشـدا، ئەورووپییـەکان زۆرجـار جـەخت لـەوە دەکەنـەوە کـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت /بـاکووری ئـەفریقاو هـەروەها ئـەورووپا بەدرێـژایی مێـژوو رایەڵـەو پەیوەندییـەکی زۆر نزیکتریـان پێکـەوە هـەبووە زیـاتر لەهـەر ناوچـەیەکی دیکـەی جیهان. هەستدەکرێت کە پۆتێنساڵی جێگیریی لەڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا، کـەزۆرجار لەلایەن هەڵوێستو ئاکاری ئەمریکییەکانەوە بەرسنگی لێدەگیرێت، پێویستی بە کارو هەنگاوی دیپلۆماسی مەزنترە بۆ زامنکردنی بەرژەوەندییە درکپێکراوەکانی ئەورووپا، هـەروەها بـۆ پڕکردنـەوەی ئـەو بۆشاییە ناوبـەناوەی لەدیپلۆماسییەتی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاستی ئەمریکادا هەیە.

جیـاوازی بنـەڕەتی نێـوان سیاسـەتەکانی یـەکێتی ئـەورووپیو وڵاتـە یـەکگرتووەکان سەبارەت بـە زۆربـەی پرسـەکانی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاست زادەی لێکدانـەوەی جیـاوازە سەبارەت بـە سروشـتی هەڕەشـە لەبەرژەوەندییـەکانی ڕۆژئـاواو باشـترین ڕێگـەی بـۆ پاراستنی ئەو بەرژەوەندییانە. سیاسەتی ئەمریکا، کاری بۆ کۆتکردنی ئـەو وڵاتانـەی ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت کـردووە کـە دەشـێت هەڕەشـەی ئاینـدەیی لەسـەر وڵاتـە یەکگرتووەکانو ڕۆژئاوا پێکبهێـنن، ئـەوەی خـۆی لـە بنـەماکانی گـەمارۆی ئابووریـدا

بەرجەستەدەکات. یەکێتی ئەوروپی بژارەیەکی تەواو پێچەوانەی سەبارەت بە بابەتەکە گرتۆتەبەر، هەروەها بانگەشەی ئەوە دەکات کە لەوانەیە کاریگەرییەکی گەورە هەستی پێبکرێت لەلایەن ئەو وڵاتەی گەمارۆکە دەسەپێنێت زیاتر لەو وڵاتەی کراوەتە ئامانجو گەمارۆکەی بەسەردا سەپاوە.[٣٦٤] خاڵێکی دیکە کە شایەنی دانپێدانانە ئەوەیە کە پابەندی ئەمریکا بە لوبیە نیۆخۆییەکانەوە دەسەڵاتێکی زۆر بەسەر سیاسەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پیادە دەکات ( وەك گروپە زایۆنییە باش رێکخراوو کاریگەرو دەوڵەمەندەکان ) بەشێوەیەك کە لە سیاسەتسازی ئەوروپییدا هاوتایەکی نییە.[٣٦٥] دەتوانرێت بەشێکی سیاسەتە زۆر هاوسەنگەکانی یەکێتی ئەوروپی سەبارەت بە زۆربەی پرسەکانی تایبەت بەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەم رووەوە مایەی تێگەیشتن بێت.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك تاقە زلهێزێکی باڵا لەپێگەیەکدایە کە دەتوانێت سیاسەتەکانی خۆی جێبەجێبکات بێئەوەی بەشێوەیەك دایانرێژێت کە لەگەڵ سیاسەتەکانی ئەوانی دیکە لەوبوارەدا بێتەوە. ئەم مێنتەڵێتەیە لەوانەیە یەك لەو هۆکارانە پێکبهێنێت کە بۆچی جیاوازییە توندەکانی نێوان ئەمریکاو یەکێتی ئەوروپی دەرکەوتوونو نەك هەر بەردەوامبوون، بەڵکو لەچەندین کەیسدا زێدەتر بوون. ئەوەی بەروونی لەو سیاسەتە پەرتەوازانەدا سەبارەت بە ئێران دەردەکەون، کە بەنموونە وەریبگرین. گەمارۆی ئابووری لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانەوە وەك ئامرازێکی بەهێزی سیاسەتی دەرەوە درککراو هەروەها بۆ ئامانجگەلێکی زیاتری سیاسەتی دەرەوەو ئاسایشی نەتەوەیی بەکارهێنراوە. یەکێتی ئەوروپی کە زیاتر ئەمریکای بێئومێدکرد، پشتگیری ئەمریکای رەتکردەوە لەو گەمارۆ ئابوورییەی پاش شۆڕشی ئێرانی بەسەر ئێراندا سەپێنرا، بە ئاماژەکردن بەوەی کە ناکاریگەربنو ئاکامی پێچەوانەش بەدەستەوەبدەن. سیاسەتەکانی ئەمریکا لەساڵانی ١٩٩٠کاندا زیاتر لەلایەن هەوڵەکانی یەکێتی ئەوروپییەوە رووبەڕووی پێکدژی بووەوە، ئەوەی

364 For an analysis on the 'Atlantic rift', see Michael Cox (1995), US Foreign Policy after the Cold War. Superpower without a mission?, London: Pinter, pp. 70-83.

365 See the general views of Findley (1985).

کاری بۆ پەسەندکردنی ئێران دەکرد وەك ئەکتەرێك لەسیاسەتی نێودەوڵەتییدا.[366] سیاسەتی "دووانە جڵەوگیری" کە لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانەوە پێشخراوە پشتگیریی هەموو دەوڵەتانی ئەندامی یەکێتی ئەوروپی بەدەستنەهێناوە. ئەو راستییەی پێدەچێت تەواوی ئەو سیاسەتە کالآیەك بێت بەبالآی بەرژەوەندییەکانی ئیسرائیلی مەلۆتکەی پارێزراوی ئەمریکا بڕابێت، لەرێگەی نەهێشتنی مەترسییە گرنگە ستراتیژییەکانی دژ بە بەرژەوەندییە نەتەوەییەکانی دەوڵەتی جوولەکە، ئەوەش پێگەی ئیسرائیل لەحاست دراوسێ عەرەبە لاوازەکانی بەهێزتر دەکات، ئەوەی زیاتر ئەروپییەکان دادەبڕێتو دووریاندەخاتەوە. لەدیدێکی بەرفراوانتردا، ئەم هەژموونەی لەلایەن زلهێزە بالآدەستەکەوە بەرێوەدەچێت دەوڵەتانی ئەندامی یەکێتی ئەوروپی تورەکرد، ئەوانەی لەو باوەڕەدابوون کە دابڕینو نائومێدکردنی ئێران لەلایەكو هەڵوەشاندنەوەی زێدەتری عێراق لەلایەکی دیکەوە، ناجێگیرییەکی نائاسایی بەسەر ناوچەکەدا دێنێت. لانیکەم جەختکردنەوە لەپەیوەندی لەسەر چەند ئاستێك دەرفەت دێنێتەپێش بۆ کاریگەری لەسەر لایەکەی تر، ئەوەی کە بوونی نابێت ئەگەر سیاسەتی دابڕین پەیرەو بکرێت.

## ٧ . ٤ نەتەوە یەکگرتووەکان (UN)

لەکاتێکدا کوردان، بەپێچەوانەی فەلستینییەکانەوە، لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بێ دەوڵەتن. دەیانەوێت کێشەکەیان سەربخەن، بەهیوان هەلومەرجی خۆیان چاکتربکەنو لەو بوارەشدا ئومێدێکیان بە نەتەوە یەکگرتووەکانە.[367] بەرەو کۆتایی

---

٣٦٦ لەبەیاننامەیەکی سیاسیدا لە ئوتی ١٩٩٦دا، یەکێتی ئەوروپی "بەنیگەرانییەکی زۆرەوە" تێبینی دەرکردنی یاسای داماتۆری کردووە بڕوانە:
See Press Release Nr: 9535/96, 21-08-1996, at http://ue.eu.int/Pesc/clefaultasp?lang=en.
367 As elaborated on by Hussein Saado: 'Document on the United Nations and the Kurdish Question' in Hochschule Bremen (1989), Documentation of

سەدەی بیستەم، کێشەی کورد لەعێراقدا سەرنجێکی زیاتری بەلای خۆیدا راکێشاوەو لــەڕووی بایــەخی نێودەوڵەتیشــەوە، ئــەوەی کاریگــەری لەبایــەخی رێکخــراوە جیهانییەکانیش هەبووە. لەکۆتایی ساڵانی ١٩٦٠کاندا، وشەی "کورد" لەواقیعدا لەنێو زاراوە سیاسییە نێودەوڵەتییەکانـدا نەناسـراو بـوو، ٣٠ سـاڵ پاشـتر کەوتـە سـەر زارو زمانانی هەمووان. جیهان لەماوەی چوار دەیەی رابردوودا زیاتر لـە جارێك هـەڵاتنی پەنابەرانی کوردی لەبەردەم پێشڕەوی هێزەکانی عێراقی بینیوە. شەش مـانگ پـاش کیمیابـارانکردنی هەڵەبجـە کاتێـك هەڵمەتـە چـڕو تونـدەکانی ئـەنفال گەیشـتبووە دواقۆناغی، ئەو شـەپۆلە پەنابـەرەی هێنـابووە ئـارا کـە بەدەگمـەن لەلایـەن نێوەنـدە نێودەوڵەتییەکانــەوە دانییپێــدانرا. ئــەو کەمسـۆزییە بێزارکـەرەو نائامادەگییــە بــۆ هاوکـاری کـوردان لەسـاڵی ١٩٨٨ لەلایـەن کۆمـەڵگای نێودەوڵەتییـەوە سـێ سـاڵ پاشـتر پێکدژییەکی گەورەی لەگـەڵ ئـەو هـاوارە گـەورە جیهانییـە پێکهێنـا. لەوانەیـە ئـەوە گرنگ نەبێت کە رادەی نەهامەتییەکە تاکو چ ئاستێکە، بەڵکو ئەوەی گرنگە ئەوەیـە کـە لەدەسـت کـێ هەڵـدێن. لەسـەرەتای سـاڵانی ١٩٩٠کانـدا، رەوشـەکە بەشـێوەیەکی سەرنجڕاکێش گۆڕا بوو – کوردانی داماو ئەمێستا لەبـەر پێـاوێکی تـوڕەو قـین لـەدڵ هەڵدێن.

هـەروەك پێشـتر ئامـاژەی بـۆکراوە، ئـەو هێـزە هاوپەیمانییـەی کـە لەسـاڵی ١٩٩١دا کوەیتیان رزگارکرد، پاشتر رەخنەی ئەوەیان لێگیرا بۆچی بـەرەو بەغـدا پێشـڕەوییان نەکردو رژێمەکـەی سـەدامیان نەڕووخانـد، هەرچـەندە، ئـەم نـەبوونی ئـارەزووە بـۆ ئـەوەی "کۆتـای بەکارەکـە بێـنن" گەڕێنرایـەوە بـۆ نـەبوونی رێپێـدانی UNSC ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئەنجامنەدانی ئەو کارە.

پێشـنیازی ئەوروپییـەکان بـۆ دامەزرانـدنی "ناوچـەیەکی ئـارامی" کـوردیی لـەژێر سەرپەرشتی نەتەوە یەکگرتووەکانـدا سـەرەتا لەلایـەن رێکخـراوە نێودەوڵەتییەکـەوە بەوریاییــەوە تەماشـاکرا. بـەڵام وێـڕای ئـەوەی مەسـەلەکە لەسـەر ئاسـتی یاسـای

---

the International Conference on Human Rights in Kurdistan, Bremen (publisher unknown) pp. 171-179.

نێودەوڵەتی مەسەلەیەکی ئاڵۆزبوو، هەروەها ئەو دینامیتە سیاسییە لەناوچەکدا کە ململانێیە هەرێمییەکان رەگەزێکی چەندبارەوەبوو بوو لەپەیوەندی نێوخۆیی دەوڵەتەکان هەروەك لەپەیوەندی خودی دەوڵەتەکانیش، بەلام نەتەوە یەکگرتووەکان بەرووی بیرۆکەکەدا کرایەوە. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو دۆخە ئاڵۆزو پێگە سەختەی کەعێراق راستەوخۆ پاش جەنگی کوەیت خۆی تێدا بینیەوە، ترسێکی رەوا لەلایەن رێکخراوەکەوە هەبوو کە هەتاکو بەدەستێوەردانەوە پابەندبن، پەرەسەندنە نێوخۆییەکان بەو چەشنە سروشت ناجێگیر لەهەرێمێکی نائارامدا توندی جێگیریی سیستمی سیاسیی نێودەوڵەتی لاوازدەکات.

بڕیاری ٦٨٨، کەلەئەپڕڵی ١٩٩١ دا ئەرێ کرا، سەرکوتکاری دانیشتووانی بێدیفاعی عێراقی رسواکردو داوای کۆتایی پێهێنانی کرد، ئەوەی ئاماژەیەکی تایبەتیشی بە کەمینەی کوردان کردبوو. ئەوەش بۆ کوردان فرە بایەخداربوو، چونکە یەکەمین جارە لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە دانپیانانێکی ئاشکرا بەدەستبێنن.[٣٦٨] ئەم بڕیارە نائاساییە لەلایەن گلۆبالیستەکانەوە وەك "گۆڕانێك لەفۆرمی نێودەوڵەتییدا" لێکدانەوەی بۆکرا کە ...رەنگدانەوەی فراوانبوونی دەسەلاتی نێودەوڵەتییە." لەکاتێکدا ریالیستەکان بڕیاری ٦٨٨ یان وەك شتێك دەبینی کە هیچی لە ئاسایی بەدەرنییە،و بەدڵنیاییەوە هیچ پاساوێك بۆ دەستێوەردانی نێودەوڵەتی نیی.[٣٦٩] هەرچەندە، ئەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەو دەسەلاتەی خۆی بەکارهێناوە کە لەبەندی حەوتەمەی جاڕنامەی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە بۆئەوەی هاوکاری کوردان لەباکووری عێراقدا بکات، بێئەوەی مۆڵەتی رێپێدان لەحکومەتی ناوەندی بەدەستبێنێت، شتێك بوو بێگومان پێشتر وێنەی نەبوو. ئەم کارە بەدژی پەرەگرافی حەوتەمەی بەندی دووەکی جاڕنامەکەیە کە دەڵێت:" هیچ شتێك لەم جاڕنامەیەدا رێگە بە نەتەوە یەکگرتووەکان نادات کە دەستوەرداتە

368 The view of Robert Jackson is fully endorsed in that 'the United Nations nowadays best represents the "international community" in formal organisational terms' (1995, p. 64).
369 Lyons and Mastanduno (1995), p. 15.

کاروبارێکەوە کە لەبنەڕەتدا بەشێکە لە باری دادوەریی نێوخۆی هەر دەوڵەتێك." [370]
دواجـار نەتــەوە یــەکگرتووەکان لەڕێگــەی بڕیــاری ٦٨٨ دا لەئــەپڕڵی ١٩٩١دا کەوتــە دانوســـان لەســـەر ڕێکەوتننامـــە مرۆییـــەکان و لەگـــەڵ بەغـــدا بیرخەرەوەیـــەکی لێکتێگەیشـــتنیان مـــۆرکرد کـــە ڕێکخســـتنی هاوکارییـــەکان لەلایـــەن نەتـــەوە یەکگرتووەکانـەوە لەبەرچاوبگرێت بـۆ کوردان و عێراقییـەکانی دیکە کە لـە ماڵو حاڵیـان هـەڵاتبوون.[371] هـەروەها بیرخەرەوەکـە ٥٠٠ کەسێکی پاسـەوانی بێچـەکی بـۆ نەتەوە یەکگرتووەکان دابینکردبـوو بـۆ زامنکرنـی ئاسایشی کارمەنـدانی یارمەتییـە مرۆییـــەکانی نەتـــەوە یـــەکگرتووەکان لـــەعێراق، ئـــەو پاســـەوانانەی هـــەروەها کاریگەرییەکی جێگیری گشتییان لە ناوچەکەدا هەبوو.[372]
بڕیـاری ٩٨٦، زۆرجـار وەك بەرنامــەی نــەوت بەرامبــەر بــەخۆراك ناودەبرێـت کـە لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە  بەڕێوەدەبرا، ڕێگەی بەعێراقدا نەوت بفرۆشێتو خـۆراك بکڕێـت. کـوردان ١٣٪ ی داهـاتی ئـەو نەوتـەی عێراقیـان پێـبڕا. ئاژانسـە فریاگوزرایيــە جۆرەبــەجۆرەکانی نەتــەوە یــەکگرتووەکان کــە لەهەرێمــە کوردییــە خودحوکمڕانەکـــە هەڵدەســـوڕان وەك (HABITAT) ناوەنـــدی نەتـــەوە یەکگرتووەکان بۆ نیشتەجێکردنی مرۆیی، (FAO) ڕێکخـراوی خـۆراكو کشـتوکاڵ، (WFP) بەرنامـەی خـۆراکی جیهـانی، شـوێنی دەسـەڵاتدارێتی عێراقیـان گرتـەوەو دەسـەڵاتی خۆشـیان لەبیرخـەرەوە لێکتێگەیشـتنەکە بەدەسـتهێنا کـە پێشـتر ئامـاژەی بۆکرابـوو. هەرچـەندە، جێبـەجێکردنی ئـەو پرۆژانـەی ئـەوان پێشـنیازیان دەکـرد، پێویستی بە ڕەزامەندی حکومەتی عێراقی بوو، هەرچەندە، بەغدا دەسەڵاتی بەسەر دابەشکردنی کەرەسەو کاڵاکاندا نەدەڕۆیشت .

بەرنامەکە، کە لەسەرەتادا لەبواری جێبەجێکردنی مامەڵەخۆراکییەکان چڕکرابۆوە،

370 The Charter in its entirety is available at http://www.un.org/aboutunicharter/index.html .
371 MacDowall (1996), p. 376.
372 This deployment has been examined by Oliver Ramsbotham and Tom Woodhouse in their Humanitarian Intervention in Contemporary Conflict, London: Polity Press (1996), p. 82.

پاشتر چوارچێوەی هەڵسوڕانی فراوانتربوو تاکو ئەو کاروهەنگاوانەش لەخۆبگرێت کەلەپێناو باشترکردنی ژێرخانی ناوچەکەدابوو، هەروەها باس لەوە کراوە کە لەساڵی ١٩٩٦ەوە بڕی ٤,٤ ملیۆن دۆلاری خستۆتە نێو هەرێمە خودحوکمڕانەکەوە. نەوت بەرامبەر بەخۆراك لەڕێگەی ئاژانسە جۆربەجۆرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە " پارەی چاککردنەوەی بۆری ئاوو ئاوەڕۆکان دابیندەکات...دامەزراندنی تۆڕی کارەباو بەڕێوەبردنی تۆڕی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکان...وێستگای کارەبای بچووك، ترۆمبێل، خانوی نیشتەجێبوون، قوتابخانە، چاکردنەوەی خەستەخانەکان، راهێنانە پزیشکییەکانو هەڵمەتەکانی کوتان." [٣٧٣]

رەخنەی ئەوە لە UNDP گیراوە بەوەی کەبەشێوەیەکی ناپێویست جێبەجێکردنی پرۆژە جۆربەجۆرەکانی بنیاتنانو پەرەسەندنی دواخستووە.[٣٧٤] ئەو رەخنەیەی هەروەها بەرنامەی نەوت بەرامبەر بەخۆراکی گرتیەخۆ سەبارەت بە لاوازیی دابینکردنی هاوکارییە فریاگوزارییەکان بۆ خەڵکە راگوێزراوەکە لەنێوخۆی هەرێمەکە – هەزارەها بنەماڵەی کورد لەو بەشەی کوردستان کە لەبندەسەڵاتی عێراقدابوون کەوتبوونە بەر هەڵمەتی پاکتاوی ئیتنی دەسەڵاتدارانی بەغدا. دەسەڵاتدارانی کوردی عێراقی لەباکووری عێراق کامپیان بۆ ئەو پەنابەرانە کردبۆوە لەکاتێکدا بەرنامەکە ئاماژەیەکی بۆ پێویستییەکانی ئەم توێژە موحتاجەی دانیشتووانی کورد لەخۆنەگرتبوو. دەگونجێت بەشێکی بۆ کەمکردنەوەی رێژەی ئەم نیگەرانییە، لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٢دا، WFP هەڵمەتێکی بەرفراوانی سەرژمێری لەناوچە خودحوکمڕانەکەدا دەستپێکرد، ئامانج لەم سەرژمێرییەی دانیشتووان

---

373 Hugh Pope, 'Iraqi Kurds, Flush With Aid, Lose Desire to Take On Hussein', Wall Street Journal, February 12, 2002.
374 Iraqi Kurdistan Dispatch, 1 February 2002.

بریتیبوو لە ئاسانکاری دابینکردنی یارمەتیو پلاندانان بۆ پرۆژەکانی پەرەپێدان لەناوچەکەدا بەڕووی ئەو گۆڕانکارییە دیمۆگرافییەی بەودواییە روویدابوو.[٣٧٥]

UNSC لەڕێگەی بڕیاری ٦٨٨ەوە، کە ئامانجێکی مرۆیی ئاشکرای هەبوو، خواستی خۆی پێشاندا بۆ نواندنی رۆڵێکی کاریگەر لە کاروبارە نێوخۆییەکانی دەوڵەتێکی ئەندام، ئەگەر پێویست بکات. هەروەها ئەو پێشانیدا کە لەسایەی هەلومەرجێکی نائاساییدا رێکخراوەکە دەتوانێتو پێویستیشە دەستوەربدات، بەئاماژەدان بەوەی سەرکوتکاری دەوڵەت بۆ گروپێکی کەمینە هەڕەشەیەك بۆسەر ئاشتیو ئاسایشی نێودەوڵەتی پێکدەهێنێت، بەڵکو هەروەها لایەنگری دەستێوەردانی وەك ئامرازێك کرد بۆ تاکو زەمینە بۆ کاری هاوکارییە مرۆییەکان برەخسێنێت.

هەروەك بینیمان، لەهەوڵدان بۆ جێگیرکردنو چارەسەرکردنی ململانێی نێو دەوڵەتەکان، هەروەك گرفتە کوردییەکە، نەك تەنیا پێویستی بەوەرچەرخانی دەوڵەتان هەیە لەڕووی پێدانی دەسەڵاتێکی زیاتر بەگروپە بێبەشەکانی نێو دەوڵەتەکەو پێکەوەگرێدانی وردە شوناسەکان لە بونیادی دەوڵەتدا. وێڕای ئەوە، دەبێت گۆڕانیش لە رێکخراوە جیهانییەکەدا رووبدات بەشێوەیەك بگۆڕێت بۆ دامەزراوەیەك کە نە بە تەنیا بۆ دەوڵەتان بەڵکو بۆ ئەو گەلانەشی دەوڵەتەکان پێکدەهێنن. لەو ١٨٩ دەوڵەتەی نەتەوە یەکگرتووەکان پێکدەهێنن تەنیا کەمێکیان لەگەڵ گەلی وەك نەتەوە دێنەوە، هەروەها ئەو جۆرە حاڵەتە نارازیکەرە ئەو خەڵکانە پشتگوێ دەخات کە کە دەوڵەتی تایبەت بەخۆیان نییە یاخود لەوانەیە بۆیان نەیەتەدی. نەتەوە یەکگرتووەکان پێویستی بە پەرەپێدانی میکانیزمێك هەیە

---

375 As reported by Iraq Press on February 5, 2002.

ئامارەکە داتای وردی سەبارەت بە ستانداردی ژیان تێدایە، هەروەها ژمارەی ئەو کوردانەی لەخۆگرتووە کە بەرەو ئەورووپاو ئوسترالیاو ئەمریکا ناوچە خودحوکمڕانەکەیان جێهێشتووە.

بۆئەوەی وا لەخۆی بکات بتوانێت بەرجەستەی چەمکەکەی رۆبەرت جاکسۆن بکات کـە "کۆمــەڵگای مرۆڤەکانــە"[376] - ئـەو گەلانــەی خــۆ بــە نەتــەوە دەزانــن بــەبێ پلاتفـۆرمێکی مــاقووڵ جێهێڵـراون تــاکو بەهۆیــەوە لەسیاســەتی جیهانیداجــەخت لەبوونی خۆیـان بکەنـەوە. زیـاتر لـەوەی کـە رێکخـراوی دەوڵەتـەکان بێـت، هـەروەك ناوەکــە ئامــاژەی بــۆ دەکــات، پێویســتە هەوڵــەکان بۆئــەوە بــدرێت کــە نەتــەوە یەکگرتووەکان بەشێوەیەکی گونجاو بەرجەستەی بوونی نەتەوەکان بکات.

کوفی ئەنانی سکرتێری گشتی ئێستای نەتەوە یەکگرتووەکان لەماوەی یەکەمین خولی بەرپرسیارێتیدا دەستیکرد بە پێداچوونەوەی رێکخراوەکە، ئـەوەی کـە بەشـێوەیەك دایرِژتەوە کە بیکاتە دامەزراوەیەکی کاریگەرترو بەتواناتر لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ جـۆرە نـوێی تەقینـەوەی ململانێکـانی پـاش قۆنـاغی جـەنگی سـارد.[377] هەرچـەندە، خولیاکـانی بـۆ هۆکـارە سروشـتییەکان دەبێـت زیـاتر سـنووورداربکرێت، دارِشـتنەوەی گشـتگیری بونیـادی رێکخـراوە جیهانییەکــە پێویســتییەکی ناچــارییە بــۆ ئــەوەی کاریگەرانــە مامەڵــە لەگـەڵ ئـەو لەمپەرانـەدا بکـات کـە رووبـەڕووی جهـانی ئـەمڕۆ دەبنەوە. سەروەری سیاسی بۆماوەی چەند سەدەیەك ئەو مەرجە بووە "کە گـەلێکی خستۆتە سەر نەخشە."[378] بۆ کوردان برسێتییەکی بەرفراوان بۆ دانپێدانان هەیە، " پێویسـتی بـوون وەك گـەلێکی لەسـەر ئاسـتی جیهـان."[379] کـە ناتوانرێـت بێتـەدی

---

376 A concept used throughout in his 'International Community beyond the Cold War' in Lyons and Mastanduno (eds.) (1995), Beyond Westphalia? State Sovereignty and International Intervention, London: The John Hopkins University Press, pp. 59-83.
377 A lengthy and enlightening article of the Secretary-General and his visions worthy of note is Joshua Cooper Ramo 's 'The five virtues of Kofi Annan', Time, 4 September 2000.
378 Taylor (1993), p. 52.
379 Ibid. p. 53.

تائەوکاتــەی دەوڵــەت –نەتــەوە وەك پســوڵەیەکی خەڵەتێنەرانــەی چــوونە نــاوەوە بمێنێتەوە بۆ بەدەستهێنانی دانپێدانان لەلایەن ئەکتەرەکانی دیکـەی شـانۆی سیاسـی نێودەوڵەتی.ئەگەر لەدەوڵەت جیابکرێتەوە، گەلانی وەك نەتەوە دەبێت دانپێـدانانی پێویستی پێبدرێت لەشێوەی نوێنەرایەتی فەرهـەنگی لـە یانەیـەکی نێودەوڵەتیـدا،[٣٨٠] بۆنموونە، گەر شکڵی پێگەی چاودێری کـوردیی لەنەتـەوە یـەکگرتووەکان وەربگـرین، لەگـەڵ حاڵـەتێکی لـەو چەشـنەی بەفەلەسـتینییەکان بەخشـراوە. ئەمـە سـنووری دەوڵەتەکان ناگۆڕێت، ئەوەی وەك یەکەگەلە بنەڕەتییەکانی رێکخراوە کۆمەڵایەتییـە بەربلاوەکـەی جیهـان دەمێنێتــەوە. هەرچـەندە، لـەنێو سـنوورەکانی دەوڵـەتو لــە دەرەوەشــی، دەبێــت نەتــەوەکان وەك شــایەنین دانپێــدابنرێت، ئــەوەی وادەکــات ئەفراندنی چیدیکەی دەوڵەتێکی دیکە ناپێویست بێت. ئەوەی ماوە ببینرێت ئەوەیە کە داخۆ نەتەوە یەکگرتووەکان، لەو بونیادە ئێستاییەی کە لێی پێکهاتووە، دەتوانێت پێشوازی لەو لەمپەرەی هێنـانی کـوردان بـۆ نێـو خێزانـی جیهانی نەتـەوەکان بکـات هــەروەها راســتەوخۆ مامەڵــە لەگــەڵ پرســێکی بــەو چەشــنی گــەل وەك نەتــەوە لەبەرامبەر دەوڵەت وەك نەتەوە لە هەزارەی نوێدا بکات.

380 As argued by Gidon Gottlieb in his Nation against State (1993), New York: Council on Foreign Relations Press.

## باسی هەشتەم: ئەگەرەکانی داهاتوو

لەکاتی چۆنێتی بەڕێوەچوونو مامەڵەی دەستوەشێنەری مێژووی هاوچەرخ لەگەڵ کوردان لەباکووری عێراق . هەروەها لێکدانەوەی هەلومەرجە هەنوکەییەکەی کە فاکتەرگەلێکی جۆراوجۆری لەبەرچاوگرتووە کە بەدرێژایی ئەم تێزە راڤەکراوە. مێژوو رێحەزێکی بۆ دووبارەبوونەوەی خۆی هەیە، هەروەها لەکەیسەکەی کوردانـدا دووبارەبووونەی مێژوو زیاتر بنەمایە نەك دەگمەن. دەتوانرێت لەوانەدا لۆمەی کوردان بکرێت کە ساکارو کورتبینن کاتێك دانوسانکارە هاوبەشەکانیان یاخود هاوپەیمانەکانیان هەڵدەبژێرن، بەڵام ئەوان ناچاربوون یارمەتی هەرلایەك پەسەند بکەن کە لەوکاتەدا پێشکەشی کردوون. بەوەش چارەنووسیان لەدەست خۆیاندا نەبووە.

لەماوەی سەرەتای سەدەی شازدەیەمو حەڤدەیەمدا (قۆناغی میرنشینە نیمچە سەربەخۆ کوردییەکان) تۆوی دووبەرەکی لەلایەن هێزگەلێکەوە لەنێو کوردانـدا چێنرا کە لەدەرەوەی ناوچە کوردییەکەوە بوون. ئەم میرنشینانە لەبنەڕەتدا چەند دەوڵەتۆکەیەك بوون کە کەمە پابەندبوونێکیان بۆ ناوەند هەبوو، بەڵام بەشێوەیەکی چالاك رێگەی ئەوەیان لێگیرا هێزەکانیان یەکبخەن تاکو خولیاکانیان بۆ کارکردن بەرەو پەرەسەندن بەئاراستەی کوردستانێکی ناوەندگیر مایەپوچبکەن، ئەم سیاسەتە بەهەموو شێوەو مەبەستێکییەوە لەقۆناغی هاوچەرخدا بەردەوام بووە. لەساڵی ١٩٧٥دا، هەروەها لەکۆتایی جەنگی ئێران-عێراق دا ، جووڵانەوەی کوردیی راستەوخۆ لەئەنجامی بەستنی رێکەوتننامەی نێوان دوو هێزە هەرێمییەکە تووشی نەهامەتیو شکست بۆتەوە.

پێدەچێت کوردان لە رووی جیۆپۆلیتیکییەوە تووشی ئەو چارەنووسە بووبێتنەوە کە وەك کارتێکی بنەڕەتی لەلایەن وڵاتانی دەوروبەرەوە بەکاربهێنرێت کاتێك پەیوەندییەکانی نێوانیان دەگەیشتە حاڵەتی دوژمنایەتی. بە بەکارهێنانی

دەستەواژەکەی ئۆڵسن[٣٨١]، " سیاسەتی هەناردەکردنو بەرجەستەکردنی هەڕەشـەکانی نێوخۆیی خودی لایـەك بەشـێوەیەکی سـەرکەوتووانە لەلایـەن هێـزە هەرێمییـەکانی وەك ئێـرانو تورکیـاوە خراوەتـی مەیـدانی کـارو کـردارەوە، هـەروەك لەبەشـی (ج)دا روونکراوەتەوە. پرسـە ئیسلامیو کوردییـەکانی تورکیـاو هـەروەها نیگـەرانی ئێـران سەبارەت بە کەمینە ئازەریو کوردییەکەی، تێکڕا ئەمانە ئاماژەی روونە بۆ باکووری عێراقو پەرەسەندنەکانی ئـەویّ. بـەم مانایـە، کوردسـتانی عێـراق لەپەیوەندییـەکی پێکەوەییدایـــە لەگـــەڵ ئـــەو دەوڵەتانـــەی دەوری هەرێمـــە کیشـــوەرییە خودحوکمڕانەکەیان داوە.

هەر لەکاتی دامەزراندنی دەسەڵاتە خودحوکمڕانـە کوردییەکە لـەباکووری عێـراقدا، هیچ جۆرە نموونـەیەکی هاوپەیمانی بەرجەستە نـەبووە. نـە لەسـەر ئاسـتی خۆجـیّو نــە هــەرێمیش، هەرچــەندە، لەســەر ئاسـتی نێـوان گروپــە سیاسـییە جۆراوجـۆرە کوردییەکان ژمارەیەك هاوپەیمانی گۆڕاو هاتۆتەئارا.[٣٨٢] نموونەیەکی بەرچاو بۆ ئەمە بریتییە لەو هاوپەیمانییەی نێوان پارتیو بزوتنـەوەی ئیسلامی لەسـەرەتای سـاڵانی ١٩٩٠کاندا کە یەکێتی نیشتیمانیان کردبووە ئامانج، هەروەها ئـەو هاوکارییـەی نێـوان یەکێتی نیشتیمانیو پەکەکە بوو دژی پارتی. نـەبوونی رایەڵەیـەکی بـەهێزو تۆکمـە لەگـەڵ دەوڵەتـە هەرێمییـەکان، مانـای ئـەوەبوو کـە سـەرکردایەتی کـورد بـوارێکی بـەرفراوانی لـە بـژارەی سیاسـی لـەئیختیاردا بـوو، ئـەوەی " رادەیـەکی بەرچـاو لەســەربەخۆیی کــارو هەڵســوڕانی پــیّ بەخشــین".[٣٨٣] ئەمــەش ئــەو شــلرۆییە روونـدەکاتـەوە کـە لەریزبەنـدی هێزەکـانو سـەرلەنویّ ریزبەندبوونیانـەوە هـەبوو. هەرچەندە، پێش هەموو شت، ئەم حاڵەتە دەبووە هۆی ئەوەی کوردان بکەونـە ژێـر رەحمـەتی ویسـتو ئـارەزووی ئەکتـەرە مەزنـەکانی سـەر شـانۆ سیاسـییەکەو ئـەو

381 Olson (2001), p. 43.

٣٨٢ لەوانەیە لەبری هاوپەیمانی، دۆستایەتی چەمکێکی گونجاوتربێت کەلەم چوارچێوەیەدا بەکاربهێنرێت، بۆبەکارهێنانی ئەم چەمکانەو چۆنێتی بەکارهێنانیان بڕوانە:

Robert Kann, 'Alliances versus ententes', World Politics, Vol. 28, July 1974, pp. 611-621.

383 Ehteshami (1995), p. 164.

هەوڵانەی مایەپوچکرد کە لەپێناو یەکێتی کورداندا دەدران. لەڕاستیدا، گرنگی شوناسی لۆکاڵی لەنێو کورداندا پێدەچێت هێزی هاندەربێت لەپشت ئاکاری هاوپەیمانێتییەکانیانەوە لەسەر حسابی ئەو قازانجە بەرفراوانەی کە لەوانەیە دەشێت دەستیان بکەوێت گەر بێتو وەك جووڵانەوەیەکی هاوبەش و یەکگرتوو هەڵسوڕێن.[384]

گرفتەکانی شوناس لەچەندین کۆمەڵگای جیاوازدا رووبەڕووی خەڵك دەبێتەوە، بەلام بۆ کوردانی عێراق کە ئینتیما ئاینی، ئیتنی، خێڵەکی، نەتەوەیی و دەوڵەتییەکانی بەنەزمێکی راستداو لەساتەوەختێکی دیاریکراو ببڕێت فرە زەحمەتە بەهۆی دەستێوەردانی هێزگەلێکی دەرەکی بەعەقڵیەتی (پەرتکەو زاڵبە). هەروەك لەباسی سێیەم و چوارەمدا پێشاندراوە، کوردانی باکووری عێراق شوناسێکی فرەجۆریان هەیە، کاریگەری ئەوەش لەسەر سیاسەت بەوە قووڵدەبێتەوە کە زۆربەی ئەو شوناسانە لەگەڵ هێزە هەرێمییە مەزنەکان هاوبەشیان هەیە، هێندێك لەوانە لەهەمان کاتدا هەوڵی ئەوە دەدەن شوناسێکی دیاریکراو بەمەبەستی بەدەستهێنانی ئامانجی جۆراوجۆر بۆخۆیان بقۆزنەوە، هەروەها لەوانەیە شوناس وەك ئامرازێکی سیاسی راژەبکات بەشێوەیەك کەلەلایەن زلهێزە هەرێمییەکانەوە بۆ دابەشکردنی کۆمەڵگایەکی دیاریکراو سوودی لێوەربگرێت.[385]

لەڕاستیدا، نەتەوەی کورد" کەمتر بۆتە قەوارەیەکی کۆمەڵایەتی پێناسەکراوی هەرێمی".[386] بەلام دیاسپۆرای مەزنی کوردیی رۆڵێکی کۆمەڵایەتی-سیاسی فرە گرنگیان لەسیاسەتی کوردییدا هەیە: نموونەش بۆ ئەمە، ئەوان رۆڵێکی کاریگەریان لە پێشخستنی زمان و ئەدەبی کوردییدا بینیوە. کوردە چالاکە سیاسییەکانی خەڵکی عێراق یەکەمین کەسانێك بوون کە دیاسپۆرای کوردیان پێکهێنا، کاتێك لەناوەڕاستی سالانی ١٩٧٠کانداو بەرەوسەر ناچارکران روو لەتاراوگە بکەن. لەسالانی ١٩٨٠کاندا، کوردانی عێراق دەستیان بەسەر شانۆی دیاسپۆرای سیاسی گرتبوو، بەلام لەگەڵ

384 Yousif Freij (1998), p. 33.

٣٨٥ سیاسەتەکانی بریتانیا لەپاش یەکەمین جەنگی جیهانی لەرۆژهەلاتی ناوەڕاست نموونەگەلێکن بۆ ئەمە.

386 Van Bruinessen (1998), p. 48.

دامەزراندنی "کوردستانی ئازاد" زۆر لەوانە گەڕانەوە باکووری عێراق و کوردانی تورکی لەتاراوگە بوونە ڕەگەزی سیاسی بالادەست. شوناسی کوردیی بەشێوەیەکی بنەڕەتی لە دیاسپۆرا بەهێزبووە بەهۆی ئەو هەلومەرجەی لەبارەی ولاتانی پەنابەخش بۆیان دابینکردبوون. توندی ئینتیما خێڵەکییەکان پێویست نییە دوور لەکوردستان کە بڕە خەڵکێکی گونجاوی لێدەژین لاوازبێت، لەکاتێکدا کە بنەمای کۆمەلایەتی گرنگییەکی تایبەتی هەیە لە ولاتێکی نوێدا کە زۆرجار کەلتوورێکی بیانییان هەیە. ئەمە بە پلەی یەکەم ڕاستە ئەگەر کۆچبەران بە کۆمەڵگا نوێیەکەوە گرێ نەدرێن، لەدۆخێکی لەو چەشنەدا دابونەریت بایەخی مەزنی خۆی دەگێڕێتەوە، ئەو دابونەریتەی زۆرجار بەژیانی خێڵەکییەوە پەیوەستن.

هەڵوێست لەبارەی پوچبوونەوەی دەوڵەت-نەتەوەو داخورانی تەواوی نەزمی نێودەوڵەتی کە لەسەر بنەمای سەروەری ڕاوەستابێت، بەشێوەیەکی بەرفراوان لەم کۆڵینەوەیەدا ڕەتکراوەتەوە، گەشەکردنی پشت بەیەکتربەستنی دەوڵەتان لەتوانای تاك دەوڵەتەکان کەمدەکاتەوە کە سیاسەتەکانی خۆیان لەبوارەکانی ئابووری، سەربازی، دەرەکی و دیپلۆماسی فۆرمەڵەو جێبەجێبکەن، بەلام لەکاتێکدا مامەڵەکە لەسەر ئاستی حکومییە، ئەوە هەروەها بەشێوەیەکی پێکدژ ڕاژە بەچڕبوونەوەی دەسەلاتی دەوڵەت دەکات. فشار بۆ ناناوەندگەرایی و داوای ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوان، دەوڵەت ناچاردەکات بڕێکی زۆری بایەخی خۆی لەسەر ناوچە نائارامەکان چڕبکاتەوە، بەڵکو ئەوە دەکات کە لەتوانایدایە وەك تاکە بەدەنەیەکی کارگێڕی بۆ بەرجەستەکردنی بەرپرسیارێتی تەواو بەسەر هەرێمەکەو خەڵکەکەیدا. ئەمە پێشانیدەدات کە هەرچەندە، پێدەچێت دەسەلاتەکەی لەسەر شانۆی نێوخۆیی بکەوێتە ژێر پرسینەوە، هەروەها کەمبوونەوەی کاریگەریی سەبارەت بە توانا دەرەکییەکانی ئەزموون دەکات. لەوانەیە دەوڵەتەکە لەوە دووربێت دەسەلاتی خۆی بەسەر بابەتە سیاسییەکاندا لەدەستبدات. لەڕاستیدا، دەوڵەت-نەتەوەکان لەزۆربەی حاڵەتەکاندا دیسانەوە جەختیان لەدەسەلاتی خۆیان کردۆتەوە، هەروەك ڕەوشە پێکدژەکەی بنیاتی فیدراسیۆنی یەکێتی ئەورووپی پێشانداوە: ئەوە حکومەتە

نەتەوەییــەکانن کــە بەســەر بڕاریانــدا باڵادەســتن، وێــڕای پرۆســەی سیاسەتســازی. سیســتمی سیاســی نێودەوڵــەتی، کــە هێشــتا کۆمەڵگایــەك لەدەوڵــەتانی هــەرێمی پێکــدەهێنێت، پێدەچــێت تــاڕادەی زیــان بەرنەکــەوتوو مابێتــەوە بەبــەراورد بەوشــێوەیەی کــە بازاڕەکــانی دراو ئاوێتــەبوون بــۆ پێکهێنــانی ئــەو ئابوورییــە جیهانییەی ئێستاکە هەیە. بەوەش ئەو بەڵگەیەی لەسەرەوە پێشاندراوە ناچێتە ئەو دیــوی وێســتیفالیاوە بــەرەو پەرەســەندنێك کــە دەوڵــەت پێگــەی نــەریتی خــۆی لەدەستبدات بــەوەی رەگــەزو پێکهاتەیــەکی ناوەنــدی بێت بــۆ سیستمی نێودەوڵەتی دەوڵەت.

بینــینی دەوڵەت لەدیــدێکی ریالیستانەوە مانــای تێگەیشتنێکە ســەبارەت بــە نــەزمی نێودەوڵەتی وەك رەنگدانەوەی سەربەخۆی‌و سەروەری دەوڵەتان. هەرچــەندە، ئەمــە تــەرخانکردنی ریــالیزمی رەهــا نییــەو رابگەیــەنرێت کــە سیستمەکە چەقبەستووەو لەبەرامبەر گۆڕاندا خــۆڕاگرە. تائەوکاتــەی دەوڵــەتان خــەڵك بــە خاکــەوە گرێــدەدەن، هەربۆیە ئەوان پێویستن‌و دامەزراوەیەکن دەمێننەوە، بەڵام هــەروەها گرنگــە ئامــاژە بەوە بدرێت کە ئەوان قۆرخی سەروەری ناکەن، بەشێوەیەکی ساکار بەوهۆیــەی کــە چــیدی تــەواوی ئــەو توانایــەیان لەخۆنــەگرتووە کــە وەڵامــدەری هــەموو ئــەو بەپرســیارێتییانە بێــت کــە ســەروەری دوایــان لێــدەکات. ئــەم ئارگومێنتــە بــۆ بەجیهانیبوونی رەها درێــژ نابێتــەوە، بــەڵکو بــەجۆرێك لــەنێوان ئــەو دوو چەمکەدا دەمێنێتــەوە. رێکخــراوو پــرۆژە نێودەوڵەتییــەکان لەڕاســتیدا دەســەڵاتی ســەروەری دەوڵــەتیان گۆڕیــوە جگەلــە ئاژانســە ســەرەکییەکانی سیاســەتی جیهــانیش، ئــەوەی بۆماوەیــەکی دوور وەك دەوڵــەت دەبێــت‌و پێدەچــێت لــەوە دووربێــت کــە ببێتــە هەیئەتێکی نێودەوڵەتی.

لەڕاســتییدا گۆڕانــەکان بــەردەوامن لەکاتێکــدا گەشــەکردنی سیســتمی دەوڵــەت پرۆســەیەکی بەردەوامــە، بــەڵام لەبنەڕەتــدا گۆڕانــەکان لــەتوانای حوکمداریانــدا هەرچییەك بــن، دەوڵــەتان بایــەخی خۆیــان هەیــە. ئــەوەی گەیشــتووە بریتییــە لــە دیدێکی هــەموارکراو لــە تێڕوانینــە واقیعییەکــە. بیرۆکــەی ســەروەری هێشــتا دەســتی

پێوەگیراوە، لەلایەن هێزە سەرەکییەکانەوە پشتگیری دەکرێت وێڕای هێندێك لەو وڵاتانەی کە کاریگەرییەکی کەمیان لەسەر شانۆی نێودەوڵەتی هەیە. دەسەڵات تادێت زیاترو زیاتر هاوبەشی تێدا دەکرێت، بەڵام نە ڕێکخراوە نێوحکومییەکانو نە ناحکومییەکان شوێنی سیستمی دەوڵەتی گرتۆتەوە یان دەتوانێت بیگرێتەوە. بەوتەیەکی دیکە، سیستمی هەنوکەیی دەوڵەتان لەوانەیە ملکەچی وەرچەرخان بێت بەڵام پێدەچێت بونیادە سەرەکییەکەی وەك خۆی بەدەست لێنەدراوی بمێنێتەوە. هەرچەندە، لەدیدێکی گەشەکردووانەوە، ئەگەری ڕوودانی ئەوە هەیە کە سیستمی هاوچەرخی دەوڵەت وابێت کە یەکەمین نەزمی بونیادی ڕێکخراوی سیاسیو کۆمەڵایەتی بێت کە بەهۆی ئاشتییەوە وەرچەرخێت نەك بەهۆی جەنگەوە. ئاکامو ئاماژەی ئەمە لەسەر کەیسە کوردییەکە ئەوەیە کە دەوڵەتێکی کوردیی پۆتێنسال لەوە دوورە سەروەرییەکی تەواوو بێ ئەملاولا بەدەستبێنێت، بەڵام هەروەك روونبۆوە، خودی سەروەری ڕەها بەجۆرێك بۆتە بیرۆکەیەکی خۆدوورخەرەوە.

هۆکارێکی دیکە بۆئەوەی کەبۆچی دەوڵەت-نەتەوە هەڵنەوەشاوەتەوەو لەوانەش نییە هەڵبوەشێتەوە لەوانەیە ئەوەبێت کە چەمکی هەمیشە پایەداری سەروەریی ڕاژە بەرێگرتن لەباڵادەستیو هەژمونی زلهێزە سوپەرپاوەرەکان بکات. برێکی تەواو لەوڵاتە کەم هەژمونەکان چالاکانە بەدوای ئەو پاراستنەدا وێڵن کە چەمکی سەروەری دژی هەژمونی زلهێزەکان بۆیان فەراهەمدەکات، جا ئەو زلهێزانە هەرێمی بن یاخود نێودەوڵەتی. هەرچەندە، دارمانی سیستمی دەوڵەت بەگشتیو دەوڵەت-نەتەوەکانی عێراق، ئێران، تورکیاو سوریا بەتایبەتی پێناچێت لەئاسۆی نزیکدا دەرکەوێت. ئەرکی وەرچەرخاندنی کوردستان لە " objective / لێکراوەوە" بۆ "subjective / بکەر" لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ، بۆ ئەکتەرێك کە خاوەنی ئەجێندای خۆی بێت، پێدەچێت تاقەتپڕوکێن بێت.

وەك مشتومڕی لەبارەوە کراوە کە ئەو گۆڕانکارییانەی پەیوەندییان بەجیهانیبوونەوە هەیە (لەبواری تەکنەلۆجی، ئابووریو هێزە سەربازییەکانەوە) دەوڵەت لەلایەك لاوازو لەلایەك بەهێزدەکات. دەسەڵاتی دەوڵەت لاوازدەکات بەوەی

چیدی سنوورەكانی دەوڵەت ناتوانێت رێگە لەهوروژمی زانیاریو كاڵاو پارەو خەڵك بگرێت، ئەوەی بەشێوەیەكی ئاسایی وەك دەركەوتەیەكی دارمانی دەوڵەت-نەتەوە لێكدەدرێتەوە. وێرای ئەوەی، كە پرۆسەی بەجیهانییبوون نەك تەنیا شوناسە هەرێمییەكانو بونیادە لاوەكییە هەرێمییەكانیش بەهێزدەكات، بەڵكو دەسەڵات دەبەخشێتە رەگەزەكان كە شتێكی گشتگیر پێكبهێنن، هێزەكەش لەمەسەلەیەكی وادایە. لێرەشەوە بەجیهانییبوون وەك دراوێك دوو رووی هەیە كە لاوازكردن/ یان بەهێزكردنی سیستمی دەوڵەتە. سەبارەت بەكورد ئەوان تارادەیەكی زۆر سوودیان لە بەجیهانییبوون كردووە. بەگوێرەی قسەی شێركۆ بێكەس، شاعیری ناوداری كورد :" چیدی دوژمنان ناتوانن وەك پێشوو سەركوتمان بكەن، پێویستە ئەو هاوسەنگییە رابگیرێت لەنێوان ئەوەی بەشێك بین لە جیهانی هاوچەرخو هەروەها شوناسی خۆمان بپارێزین." [٣٨٧]

قەناعەتی چەسپاوی گیلنەر، كە نەتەوایەتی زادەی بەپیشەسازیبوونە، دەتوانرێت وەك بنەمایەك وەربگیرێت لە مشتومڕكردن سەبارەت بە ئاوابوونی وردە وردەی هێزی نەتەوایەتی. لەكاتێكدا كە پیشەسازی لەرێگەی پەرەسەندنێكی گشتیەوە، لە ئاستێكی لۆكاڵییەوە بۆ ئاستێكی نەتەوەیی وەرچەرخا. هاوكات ئینتیمای سیاسیش بەشێوەیەكی هاوكات لە لۆكاڵییەوە بۆ نەتەوایەتی پەرەیگرت. لەگەڵ زێدەبوونی گرنگی بەجیهانییبوون، پیشەسازی لەچەندین رووەوە بۆ ئاستی نێودەوڵەتی وەرچەرخاوە، كە پێدەچێت ئەو ئەنجامگیرییە بەدەستەوەبدات كە نەتەوایەتی وردە وردە شوێنی خۆی بۆ نێودەوڵەتی جێدەهێڵێت. بەهەرحاڵ، پێناچێت نەتەوایەتی هێزێك بێت رووڵە ئاوابوون بكات، هەروەك ئەوەی دەوڵەت-نەتەوەش وادەردەكەوێت لەوە بەدوور بێت بەشێوەیەك بەرەو تێكچوون مل بنێت كە لەودیو دانپێدانانەوەبێت.

بە لەبەرچاوگرتنی پەرتەوازەیی قووڵی نەتەوایەتی كوردییو ئەو دەلاقە جدییەی

387 Quoted from Hiwa Osman's 'Wired world of Iraqi Kurds', BBC, 15 August 2001.

لەنێوان پێشنیازکارانی ڕێبەری ئایدیۆلۆجی نەتەوایەتی کوردیدا هەیە، لەبورای کردارییدا، وادەردەکەوێت کەمو زۆر هەڵکشانو داکشانێکی بەردەوام لەنێوان نەتەوایەتیو ئیتنۆگەرایدا هەبێت، لەکاتێکدا کارەکان بەتوندی بەهۆی ئامانجە کورتخایەنەکانو هەروەها ڕەگەزی بەرجەستەی تەنگەتیلەییەوە کاریان تێدەکرێت. هەر کارەکتەرێکی وەرچەرخانی نەتەوایەتی کوردیی تووشی پێکدادان دەبێتەوە لەلایەن هێزی لەشکان نەهاتووی خێڵگەراییەوە لە لادێکانو هەروەها کەمتر لەپەرەسەندنی تەواوی بونیادە کۆمەڵایەتییەکان لەنێو چینی ناوەڕاستدا لەناوچە شارنشینەکان.[٣٨٨] جێگیربوونو چارەسەری گرفتی کوردیی لەعێراق واناکات هێزی نەتەوایەتی لەنێودا نەمێنێ، بەڵکو دەتوانێت بەباشی کوردایەتی کەلتووری بەهێز بکات، ئەوەی ئاماژەیە بە تۆکمەبوونی یەکێتی کەلتووری لەنێو کورداندا، هەروەها ئەگەرێکی زۆر هەیە بۆ لاوازبوونی کوردایەتی سیاسی وێرانکەر کە فەرمانی ڕزگاری دەدات.

## ٨ . ١ ئەگەرەکانی دروستبوونی دەوڵەتی کوردیی لەسەدەی ٢١ دا

لەمپەری مەزنی بەردەم دەوڵەتانی نوێ بریتییە لە دانپێدانانی نێودەوڵەتیو هەروەها لەڕاستیدا، " دانپێدانانیان وەك ئەندامانی نەتەوە یەکگرتووەکان کە بنەمای سەرەکییانە بۆ بانگەشەی ڕەوایەتی".[٣٨٩] ئەوەی کە وەك باوە لەڕێگەی بەکارهێنانی بنەمای خۆدیاریکردنی چارەنووسەوە بەدەستهاتووە، وەك لە پێشتر ئاماژەی بۆ کراوە، بەوەش پێگەی سەربەخۆیان پێدەچێت بەباشی زامنکرابێت. بەدارشتنەوەی لە قاڵبە کوردییەکەدا، دابەزینی بەهای چەمکی دەوڵەت-نەتەوە کە

٣٨٨ هەرچەندە، سیمایەکی بەرجەستە سەبارەت بە نەتەوایەتی بان نەتەوەیی کوردیی بریتییە لەچوارێوەی بەجیهانییکردن کەتێیدا کەوتۆتە هەڵسوڕان، وەك ئەو خۆپێشاندانو ناڕازییە هاوکاتانە دەریدەخات کە کوردان لەدیاسپۆرا دژی دەستگیرکردنی عەبدوڵڵا ئۆجالان لەفێبرایەری ١٩٩٩ لەلایەن تورکانەوە. بڕوانە:
Michael Humphrey's article 'Victim Diplomacy and Transnational Nationalism: Kurdish Diaspora Dilemmas', Journal of Arabic, Islamic and Middle East Studies, Special Issue, January 2000, pp. 1-16.
389 Strange (1986), p. 303.

پێشتر مشتومڕی لەبارەوە کراوە، مانای ئەوەیە کە کوردستانێکی خاوەن سەروەریی لەوانەیە کەمتر شایەنی هاتنەدیو ژیان نەبێت زیاتر لەو دەوڵەت-نەتەوانەی کە لەم دوا دەیەیەدا پێکهاتوون. ناتەواوی دەرەکی بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی نابێتە هۆی یەکخستنی دەوڵەتە نوێیەکە کە لە فەزا سیاسییە هەنوکەییەکەدایە، هەروەك جۆردن سمس دەڵێت :" پێدەچێت تەنانەت بتوانێت کە لەرێگەی هەڵسوڕان لەپەراوێزە دژوارەکانی بەرژەوەندی زلهێزە باڵادەستەکاندا سوود لەو لاوازییە دەرکەوتەیە ببینێت." [390]

وێڕای بەراوردنەکردن لە ئەزمونی سیاسی کەڵەکەبوو لەلایەن نەتەوەکانەوە لە رۆژئاوا، سەربەخۆیی کوردیی ناتوانرێت بەراوردبکرێت لەگەڵ ئەو هەڵپەی بەدەوڵەتبوونەی زۆربەی نەتەوەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا. سەرنجێکی مێژوویی پێمان دەڵێت کە پشکوتنو گەشەکردنی هەریەك لە دەوڵەتە هاوچەرخەکان، هەرچەندە لەئاکامی کۆمەڵێك هێزی ناوخۆییو دەرەکی پێکەوەپەیوەست کە بەبوونی پەیوەندییەکی دینامیکی لەنێوانیاندا جیادەکرانەوە، لەزۆربەی حاڵەتەکاندا، بەشێوەیەکی مەزن بەسترابۆوە بە هۆکارە دەرەکییەکان بۆی. هەروەك مێژووی سیاسی کوردان روونیدەکاتەوە کەبەشێوەیەکی تایبەت فاکتەرە دەرەکییەکان سەبارەت بەدامەزراندنی گریمانەی دەوڵەتێکی کوردیی، بنەڕەتیو یەکلاکەرەوە دەبن. کاریگەری دەرەکی لەوانەیە بەشێوەیەکی ساکار مانای ئەوە بێت کە جێپێی دەوڵەتانی دیکە هەڵگرن، هەروەك ئەو نموونەیەی شۆڕشگێڕە روسەکان بەرجەستەی دەکەن، ئەوانەی شۆڕشی فرەنسییان وەك مۆدێلێك بۆ شۆڕشەکەیساڵی ١٩١٧ی خۆیان وەرگرت. [391] ئەوەی کۆتایی جەنگی سارد لەگەڵ خۆی هێنای سەبارەت بەوەی نەتەوەگەلێك خۆیان کردە دەوڵەت، چەند نموونەیەکی دەرەکی بۆ کورد فەراهەمدەکات تاکو ئەوانیش بۆ خۆیانی کۆپی بکەنو لەبەر رۆشنایی ئەوانە خەباتی خۆیان دابڕێژنەوە.

---

390 A. D. Smith (1981), p. 206

391 For an account of this, see Adam Westoby 'Origins of the Bolshevik Party and Communist Statecraft' in James Anderson (ed.), The Rise of the Modern State, Brighton: Harvester Press, pp. 143-169.

دیاریکردنی کاتی پەرەگرتنی پێکەوەگرێدانی دەوڵەتەکان لەسیستمی نێودەوڵەتی دەوڵەتدا بەشێوەیەکی بەهێز کاردەکاتە سەر فۆرمی ئایندەی دەوڵەت. لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی کە جەنگی کوەیت لەگەڵ خۆی هێنای، هەروەها ئەو پەرەسەندنانەی بونیادی سیاسی لەباکووری عێراقدا هاتنەئارا، لەوانەیە سەدەی بیست و یەکەم ئاماژە بەسەرەتای دەستپێکردنی قۆناغێکی نوی بێت لەجەختکردنەوەی کوردیی، ئەوەی دەتوانێت زەمینە بۆ دامەزراندنی قەوارەیەکی کوردیی سەربەخۆ، ئۆتۆنۆم یان جیا خۆشبکات. پێکهێنەری یەکلاکەرەوەی دەوڵەتێکی بەم چەشنە پێدەچێت بەهۆی جەنگێکی دیکەوە نەبێت، بەڵکو توانای کوردان بۆ یەکگرتن و بەهێزبوونی یەکێتی کوردان دێتەئارا کاتێك رووبەڕووی فشارەکان دەبنەوە، کۆتگەلێك بەڵکو هەروەها دەرفەتگەلێکیش لەئاکامی رەوشە جیۆپۆلیتیکییەکەوە پەیدادەبن. وێڕای ئەوەی، دیاسپۆرای گەورەی کوردیی هاندەرێکی مەزن دەبەخشێتە پشکوتنی دەوڵەتێکی کوردیی. دەشێت زۆرینەی کوردی تاراوگە نەگەڕێنەوە بۆ نیشتیمانەکەیان، بەڵام بەشێوەیەکی بەهێز پشتگیری کوردستانێکی سەربەخۆ دەکەن- بەهەمان شێوەی جولەکە ئەمریکییەکان کە پشتگیری دەوڵەتی ئیسرائیلیان کرد.

لەوانەیە دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی ململانێیەك لەنێوان سەروەریی یاسایی و هێزە راستیینەکان ئەزمون بکات، هەروەها دەسەڵاتی حکومەتەکەی بۆ پیادەکردنی سەروەری تەواو بەسەر خەڵك و خاکەکەیدا ناکرێت وەك شتێکی ئاسایی وەربگیرێت. گرفتی ناوەندیی لەوەدایە کە پرۆسەی سەروەریی یاسایی هەمیشە لەگەڵ دەسەڵاتی راستیینەدا هاوجووت نابێت، هەروەها دۆخی وڵاتانی ئەوروپای رۆژهەڵات لەماوەی جەنگی سارددا نموونەیەکی باشە. هەروەك ئەم دەوڵەتە بەناو خاوەن سەروەریی بوون، کەچی ئەوان نەیاندەتوانی بەشێوەیەکی سەربەخۆ سیاسەتی خۆیان جیا لە یەکێتی سۆڤێت دابڕێژن سەبارەت بە بابەتگەلێك کە جێگەی بایەخی بەرژەوەندی سۆڤێت بوو، دەوڵەتێکی کوردیش لەوانەیە خۆی لەدۆخێکی وادا ببینێتەوە کە وابەستەی هاوسێ بەهێزەکانی بێت.

فاکتەرێکی گرنگ کە دەبێت لەبەرچاوبگیرێت کاتێك مشتومڕ لەبارەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی نوێوە دەکرێت بریتییە لەوەی کە چ کاریگەرییەکی لەسەر دۆخی هەنوکەیی دەستبەجێی هەرێمەکە دەبێت. بە لەبەرچاوگرتنی ئەوەی پەرەسەندنێکی بەم چەشنە لەرێگەی پێناسەکردنەوە پێویست بە لەدەستچوونی قەڵەمڕەوی لانیکەم دەوڵەتێکی هەرێمی دەکات بۆ ئەگەری زیان گەیاندن بە جێگیریی‌و ئارامی هەرێمی. ئەم لەدەستچوونەی قەڵەمڕەوە لەوانەیە بۆ دەوڵەتە هەرێمییەکە بێبەشبوونی ستراتیژی لەسەرچاوەکان لێبکەوێتەوە، بەڵام هەروەك یەك، ئەگەر تەنانەت زۆر زیانبەخشیش نەبێنت، پەرەسەندنێك لەدیدێکی درێژخایەنەوە، لەوانەیە تێکچوونی بارودۆخی سیاسی نێوخۆیی بەهۆی ئەو گۆڕانە بەرچاوەوە لێبکەوێتەوە کە لەپێکهاتەی ئیتنی دەوڵەتەکەدا روودەدات، ئەمە زیاتر بیرمان بەرەو ئێران دەبات کە لەدەستدانی کوردستانی ئێرانە (لەرێگەی فراوانبوونی دەوڵەتێکی کوردیی عێراقی خاوەن سەروەریی بەرەو "کوردستانی گەورە" یان بەشێوەیەکی ساکار جیابوونەوەی کوردانی ئێرانە)، ئەوەش دەتوانێت کاریگەرییەکی دۆمینۆییانەی هەبێت. هانی کاری هاوشێوەبدات لەلایەن کەمینە سەرەکییەکانی دیکەی ئێرانەوە، وەك : ئازەری، تورکمان، بلوچ‌و عەرەب. بەهەمان شێوە، سەبارەت بەکاریگەری ئاینی، ئەمە دەتوانرێت بەسەر رەوشەکەی عێراقدا جێبەجێبکرێت، ئەوەی پێویستی بەکوردانی سوننە هەیە تاکو هاوسەنگی شیعی-سوننی رابگرێت.

لەڕاستیدا، بێتو "کوردستانی ئازاد" دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی رابگەیەنێت، ئێران‌و تورکیا بەدڵنیاییەوە راپێچ دەکاتە خاڵی دەستێوەردان، ئەوانەی کە سنوورە کراوەکانیان بۆ کوردانی باکووری عێراق شارێگەی ژیان پێکدەهێنێت، ترسی وڵاتە هەرێمییەکان لەوەدایە کە دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردستان جووڵانەوە جیاخوازەکانی نێو سنوورەکانی خۆیان دەگەشێنێتەوە، هەروەك لەباسی پێشوودا پێشاندرا، هەربۆیە کارو هەوڵێکی هەماهەنگکارانە پێشانیدەدەن تاکو یەکێتییەك بەدیبێنن بۆ بەگژداچوونەوەی هەرکارێك کە ببێتەهۆی دامەزراندنی کوردستانی خاوەن سەروەریی یاخود دابەشبوونی عێراق. سنوورە نێودەوڵەتییەکان نابێت لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بگۆڕێن، لە مێسجێکدا کە بە بەردەوامی لەتاران‌و ئەنکەرەو

دیمەشقەوە دەیبیستین کاتێك ڕووبەڕووی ئەگەری هاتنەکایەی قەوارەیەکی کوردیی ئۆتۆنۆم دەبنەوە کە بەڕووی ڕەوشە جیۆپۆلیتیکییە هەنوکەییەکەدا لەهەرێمەکە بالادەستە.

بەبنیاتنان لەسەر ئەو ئایدیایانەی لەباسی ڕابردوودا سەبارەت بەنەتەوایەتی بە فۆرمە جیاوازەکانییەوە پێشکەشکراون، گرنگە ئاماژە بەوە بدرێت کە دەشێت دەوڵەتی کوردیی نموونەیەك بێت لەهەرێمەکەدا کە ئایدیا لیبراڵو هەروەها نەتەوەییەکان لەپرۆسەی دەوڵەتسازییدا بگرێتەبەر. یایل تەمیر، "هاوسەرگیری نموونەیی" نێوان ئەم دوو قوتابخانەی هزرە بەو وتەیە دەداتە قەڵەم کە " نەتەوایەتی دەتوانێت فاکتەرێکی چەسپاوی داڕشتنەوەی سنوورەکانی دەوڵەت بێت، پشتگیریی ئەو دیدە سەبارەت بەدەوڵەت بکات کە کۆمەڵگایەکە بە بەرپرسیارێتیی هاوبەشو هاوبەستەگیی نێوخۆیی تایبەتمەندە...لەکاتێکدا لیبراڵیزم دەتوانێت پرنسیپە مۆراڵییەکان (دابینبکات) کە بۆ ڕێبەریکردنی ئاکارە شەخسیو دامەزراوەییەکان پێویستن." [392]

نەتەوایەتی کوردیی نزیك بە سەدەیەکە جەخت لەو بانگەشەیە دەکاتەوە کە نەتەوەکانی جیهان مافی خۆدیاریکردنی چارەنووسیان هەیە، لەڕاستیدا، خودحوکمڕانی یان بەشێوەی بەڕێوەبردنی حکومەتی خۆییە لەچوارچێوەی دەوڵەت-نەتەوەکانی ناوچەکە یاخود دامەزراندنی دەوڵەت-نەتەوەی تایبەت بەخۆیان. مرۆ دەتوانێت مشتومڕ لەوبارەیەوە بکات کە فاکتەرێك بەقازانجی بەدەوڵەتبوونی کوردان بێت لە باکووری عێراق بریتییە لەو ئەنجامگیرییەی کە دەوڵەتە ئەسڵییەکانی وەك :عێراق تەواو بێکەڵکبوونو چیدی توانای دابینکردنی چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتی-سیاسی هاوبەستەو تۆکمەیان بۆ پێکەوەژیانی کوردی-عەرەبی نەماوە. هەروەها ئەوانەی خولیایەکی نەتەوەیی بەهێزو مەیلێکی جیاخوازییان هەیە لەوانەیە بەهەمان خولیاوە مشتومڕ لەوبارەیەوە بکەن کە جیاوازی نێوان هەرێمە ئۆتۆنۆمە کوردییەکەو عێراق لەماوەی ئەو دەساڵە دابڕانەی پێشوو بەشێوەیەکە کە تازە یەکگرتنەوە ئامانجێکە مەحاڵە بێتەدی.

---

392 Tamir (1993), p. 140.

## ٨ . ١ . ١ دەوڵەتۆکەی کوردیی

ئەگەر سەروەریی لەگەڵ مێژووی نەتەوەیی وڵاتێکدا تێکەڵبن، ئەوسا پرسی خستنە ژێر پرسیاری ئەم دەسەڵاتە رەهایە تەنانەت رەهەندگەلێکی مەزنتر دەگرێتەخۆ. ئەمەش بەتەواوی لەگەڵ کەیسەکەی عێراقدا دروستە، کە ئینتیما ئاینیو ئیتنییەکان پێکهاتەی سەرەکی دەوڵەتی عێراق پێکدەهێنن. کوردستانێکی سەربەخۆ، سەروەری پەسەندکراوی عێراق دەخاتە مەترسییەوە، بەڵام بەلەبەرچاوگرتنی ئەو دەساڵ سەربەخۆییە دیفاکتۆیە، سەروەریی عێراق نزیکەی سازشی بەسەردا هاتبوو. ئایا پێکهێنانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردیی عێراق تەنیا هەنگاوێکی شکڵیو تەشریفاتییە؟ ئایا کوردان ئەمێستا پاش دەیەیەك هێندە بەهێزن کە بتوانن کۆتایی بەو پەیوەندییە درێژماوەیەی نێوان خۆیان بەغدا بهێنن.

لەگەڵ بوونی رەگەزەکانی تورکمانو عەرەب، کوردستانێکی سەربەخۆی عێراق بەتەواوی لەگەڵ پێناسەی گشتی بۆ دەوڵەت-نەتەوە نایەتەوە، ئەوەی بەپێچەوانەی زۆربەی وڵاتانی ناوچەکەوە " حکومەتێکە بۆ گەلێکی یەکرەنگو هۆمۆجین کە خاوەنی هەمان کەلتوورو هەمان زمانن، ئەوەی لەلایەن ژمارەیەك لەخۆیانەوە بەڕێوەدەبرێن، ئەوانەی خزمەتی بەرژەوەندییەکانی گەلەکە دەکەن".[٣٩٣] ئەو دوو پێکهاتەیەی دوایی لەرووی مێژووی کوردەوە بایەخی تایبەتیان هەیە.

بەوەش کوردستانێکی عێراقی سەربەخۆ، نابێتە دەوڵەتێکی "رەسەن" لەکاتێکدا کە سنوورەکانی تەنانەت خاکی دەوڵەتۆکەیەکی کوردیش (بەپێکەوەگرێدانی ئەوەی ئەمڕۆ باکووری عێراقێکی ئۆتۆنۆمە لەگەڵ سنوورەکانی کۆمەڵگایەکی ئیتنی یەکرەنگ نایەتەوە. پێکهێنانی دەوڵەتێکی کوردی لەباکووری عێراقی ئەمڕۆ، رووبەڕووی کێشەی "هاوجووتبوونی نەتەوەیی" دەبێتەوە، بەشێوەیەك کە دەوڵەتو نەتەوە لەیەك قاڵبدابن.[٣٩٤] ئەمە بەدڵنیاییەوە ناوکێکی ئیتنی کوردیی دەبێت، بەڵام

393 Navari (1981), p. 13.
394 A. D. Smith (1986b), p. 262.

هاوكات لەگەڵ بـوونی شوناسـی ئیـتنی دیكـەدا، زۆر بەتایبـەتی توركمانـەكان، لەگـەڵ كوردان وادەكات پێویست بە كارو هەوڵێكی زۆر بكات لەلایەن دەوڵەتە نوێیەكەوە.[٣٩٥] توركمانەكان بەتایبەتی یەكێتی ئیتنیكی دەوڵەتێكی كوردیی دەشێوێنن، بەهۆی ئـەم ناهەماهەنگیو فرەرەنگییەوە لەڕووی ئیتنیكییەوە، تەنانەت لەدەوڵەتێكی كوردیشدا پێویســت بەهــەوڵێكی زۆر تایبــەتو وردی نەتەوەســازیی دەكــات. هەرچــەندە، دەوڵەتێكی كـوردیی بـەبوونی رەگـەزێكی بەرچـاوی توركمـانی، پێدەچـێت لەكەوتنـە ئـەو تەڵەیـە دووریبخاتــەوە كـە پێشـتر دەوڵـەت-نەتـەوەكانی دیكـە تێیكـەوتوون، لەڕێگەی بنیاتنانی كۆمەڵگایەكی تۆكمە كـە لەسـەر بنـەمای هەماهـەنگیو هاوبەشـی بێتەكایەوە.[٣٩٦]

لەڕاسـتیدا، زۆر كـەم دەوڵەتگـەلێك هـەن دەتـوانن هیـوای بەدەسـتهێنانی حاڵـەتی دەوڵـەت-نەتـەوەیان هـەبێت بـەهۆی كارەكتـەری (پلـوراڵ)و فرەرەنگییانـەوە. زیـاتر، چـاویان لەوەیـە كـە ببنـە دەوڵـەتانێكی نەتـەوەیی كـە دانیشـتووانە فرەرەنگەكـەی بتـوانن لـە كـەلتوورێكی گشـتی هاوبـەش بەهرەمەنـدبن.[٣٩٧] هـەروەها پێكهاتەیـەكی دەوڵەتی كوردیی دەبێت دەوڵەتێكی نەتەوەیی بچەسپێنێت كە بەرهەڵستی دەوڵـەت-نەتەوە بێت بەهۆی بوونی چەندین رەگەزە "فرەرەنگ"ەكانییەوە.

خـودی پرەنسـیپی "خۆدیـاریكردنی چـارەنووس" كـە پێشـتر گەنگەشـەی لـەبارەوە كراوە، دەشێت ببێتە هۆی لێكگیربوونی نێوخۆییش لەكوردستانێكی عێراقـی خـاوەن سـەروەرییدا، دامەزرانـدنی ئـەوەی لەوانەیـە كاریگـەری دۆمینۆیـان لێبكەوێتـەوە-

٣٩٥ لبەگوێرەی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، نزیك بە ٢ملیۆن توركمـان لـەعێراق دەژیـن، زۆربـەیان لەدەوروبـەری شاری كەركوكن، لەگەڵ نزیكەی ٢٥٠٠٠٠توركمانێك كە لەناوچانەی ژێر كرنترۆڵـی كاریگێڕییـە كوردییەكـەن، ئـەو توركمانانەی كەلەعێراق دەژین لەدەرەوەی دەسەڵاتی بەغدا، ئەوانە بەشدارییان لەهەڵبژاردنەكانی ساڵی ١٩٩٢دا نەكرد، پشتگیریی تەواوی توركیایان لێكـراوە، بـەڵام لـەدوو پارتـە كوردییەكـە، زیـاتر پارتیـان بـەلاوە باشـترە بەهۆی پەیوەندی بەتوركیاوە.
Professor Nouni Talabany, an authority of Turkmen and Kurds, London, 1999.)

396 Such a society is eloquently argued by A. D. Smith (1986b), p. 230.

397 17.Concept that of A. D. Smith (1992), p. 61-62.

دەوڵەتێکی کوردیی، کە لەوە دوورە تەنیا لەرەگەزگەلێکی پوختی کوردیی پێکبێت. بەتایبەت تورکمان، لەوانەیە پەنابەرن بۆ بژارەی مافی خۆیان لەدیاریکردنی چارەنووسداو داوای دابەشبوونی زێدەتری خاکەکە بکەن، ئەوەی بەجۆشەوە لەلایەن تورکیاوە هاندەدرێت. لەبەرئەوە، ئەگەر جێگیری هەرێمی هۆکارێکی سەرەکی بێت بۆ دامەزراندنی "کوردستانی ئازادی" سەربەخۆ، ئەوکات دەوڵەتێکی تاکەلایەنەی یەکگرتوو وەك ئەفسانەیەك هەڵخەڵەتێنەرانە دەبێت.

قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆی کوردیی لەباکووری عێراق دەبێت وەك دەوڵەتێکی ناوەندگەرا کارنەکات بۆئەوەی دەسەڵاتی خۆی بەسەر سەرجەم ناوچەکاندا بچەسپێنێت، دەبێت ئەوەی بەدڵنیاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو پێکدژییەی نێوخۆی بکات. پێویستە دەوڵەتەکە خۆی وەك ناوبژیوانێك پێشکەش بکات تاکو رێگە لەو ململانێیە لەمپەرئاسایانە بگرێت کە دەگونجێت لەنێو بژاردەکانو هەروەها لەنێو چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵگادا بێتەئارا. ئەمەو وێڕای پێویستی ئاشکرا بۆ بەرگریکردن لەسنوورەکانی لەحاست داگیرکارییە دەرەکییەکان، کە زۆر لەوانەیە لەرێگەی هێزی فیزیکییەوە بێت، بەڵکو هەروەها لەڕووی ئایدیۆلۆجیشەوە، هەروەها دەشێت هەوڵی کۆنترۆڵکردنی جووڵانەوەی دیمۆگرافی بدات، بەتایبەتی بە لەبەرچاوگرتن بە بەرنامەکانی راگواستنی زۆرەملێی بەعس، بۆئەوەی لاوازنەبوونی حکومەتەکەی بەهۆی کارگەلێکی بەغداوە زامنبکات.

ئەگەری گرفتێکی جدیی لەسیناریۆی سەربەخۆیدا بریتییە لە ململانێی سنوور. لەوناوچانەی کوردستانی ناوەندی کە هێشتا لەژێر دەسەڵاتی بەغدادا ماونەتەوە، هەروەها بەتایبەت لەوشوێنانەی دەکەنە ناو و هەروەها دەوروبەری کەرکوکی پڕ نەوتدا، رژێمی عێراقی بۆماوەی چەندین ساڵە بەرنامەی بەعەرەبکردنو هەروەها دەرکردنی کوردانی جێبەجێکردووە، بۆئەوەی دیمۆگرافی ناوچەکە بگۆڕێت، لەبنەڕەتدا ئەو شوێنانەی زۆرینەی کوردی تێدابوون. بۆگێڕانەوەی ژمارەیەکی زۆری ئەو خەڵکە راگوێزراوەی نێوخۆ بۆ ناوچە رەسەنەکانی خۆیان، پێویستە دەسەڵاتداران، ئەو ئەندازەگیرییە کۆمەڵایەتییە پێچەوانە بکەنەوەو هانی

عەرەبەکان بدەن بگەڕێنەوە باشووری وڵاتەکە. گێڕانەوەی خاکی کوردیی‌و هەروەها بەشێوەیەکی گشتی دیسانەوە دانوسان سەبارەت بە سنووری کوردی-عەرەبی نابێتە ململانێیەکی هەرێمی بەشێوە تەقلیدییەکەی. ئەمە گرفتی درێژخایەنی کەرکوك بەرجەستە دەکات بۆئەوەی سەربەخۆی سیاسی ببێتە واقیع، ئەو سیناریۆیەی پێدەچێت وابێت کە ململانێی سنوور بەردەوام بێت.

سەبارەت بەمشتومڕکردنی پێشوو لەبارەی کۆمپانیا فرە رەگەزەکان، ئەمانە پێدەچێت بەرژەوەندییەکی دارایی مەزنیان لەو دەوڵەتە کوردییەدا هەبێت کە لەعێراقی پڕنەوت جیابۆتەوە. ئەم کۆمپانیانە دەتوانن کاریگەرییەکی مەزنیان لەمامەڵەکردن لەگەڵ دەوڵەتۆکەکەدا هەبێت، هەرچەندە، ئاکامی پوختەی کارەکانیان، دەوڵەتەکە دەخاتە پێگەیەکی بەهێزترەوە. کاتێك سنووردارییەکی جیۆگرافی بۆکارو هەڵسوڕانەکانیان دیاریبکرێت- بەمانایەکی دیکە، کۆمپانیا نەوتییەکان نەتوانن بەتەواوی مامەڵە بەکێڵگە نەوتییەکانەوە بکەن، کۆنترۆڵکردنی بازرگانی سامانە سروشتییەکان، سامانێکی بەرچاو بە هەر حکومەتێکی کوردیی دەبەخشێت کە دەگۆڕێت بۆ کاریگەریی لەسەر ئاستی هەرێمی‌و نێودەوڵەتی.

کاتێك نەتەوە بۆ ئەودیو سنووری دەوڵەتە هەنوکەییەکە درێژ دەبێتەوە، هەروەك لەکەیسەکەی کوردستانی عێراقدا خاوەن سەروەریی دەبێت، قەوارەیەکی بەوچەشنە، ئەگەر لەژێر کاریگەری نەتەوایەتی ئیتنیکیدا بێت، بەئاسانی دەتوانێت پەرە بەسیمای رزگاری بدات لەڕێگەی گێڕانەوەی ناوچە "لەدەستدراوەکان".[398]- دەگونجێت جۆرە دەستەواژەیەکی نەتەوەیی بەم چەشنە بەکاربێت. لەو جۆرە لاوەکییانەی کە هۆرویتز پێشانیداوە، یەکێکیان بەتایبەت " هەوڵی جیاکردنەوەی خاك‌و خەڵکی دەوڵەتێك دەدات بۆئەوەی بە دەوڵەتێکی دیکەی ببەستێتەوە."[399]

ئەوەی شتێکە جێبەجێکردنی بۆ کوردستانی عێراقە سەربەخۆکە چاوەڕوانکراوە، کە ئەو خولیایانەی چاندووە پارچەکانی دیکەی مێژوویی کورد بخاتەوە سەر

398 A. D. Smith (1981), p. 188.
399 Horowitz (1992), p. 119.

بونیاده سەروەرییەکەی تایبەت بەخۆی. سیاسەتی رزگاریخوازی لەڕاستیدا پێدەچێت گوزارشتێکی نوێ بێت بۆ فراوانخوازی، کە خۆی لەخۆیدا دیاردەیەکی کۆنە.[400] ئەوەی لەکەیسە کوردییەکەدا دەتوانرێت ناوی "پێویستی بۆ پێکهێنانی "نەتەوەیەکی تۆکمە"ی لێبنرێت، هەروەها نیشتمانێکی مێژوویی دەگێڕێتەوە کە لەلایەن هێزە کۆلۆنیالە رکابەرەکانەوە پارچەکراوە."[401] کاتێك کوردستانی عێراقی خاوەن سەروەری پاڵپشتی خولیا رزگاریخوازیەکان لەکوردستانی ئێراندا دەکات، بۆ نموونە، تاران بەشێوەیەکی سروشتی ئەمە وەك هەڕەشەیەك لەسەر یەکێتی خاكو ئاسایشی نەتەوەی کۆماری ئیسلامی درك دەکات، سیاسەتە سەرکوتکارییەکانی خۆی پەرەپێبدات بۆ پێشگرتن لەکوردەکانی خۆی تا پشتگیریی لە کاری برا ئیتنییەکانی خۆیان بکەن. هەرچەندە، هەنگاوە سەرکوتکارییەکان لەناوەندەوە بەشێوەیەکی گونجاو پاساوێك بداتە رزگاریخوازانو وایان لێبکات پەیوەندییەکی بەهێزتر لەگەڵ کەمینەکەدا پەرەپێبدەن، ئەوەی کەلەوانەیە مەسەلەکە بەئاقاری ململانێیەکی دیکەدا بەرێت، کە کەمینە بەدەگمەن لەم چەشنە ململانێیەدا سەرکەوتوو دەبێت، بەلام ئەگەر لەلایەن دەوڵەتە رزگاریخوازەکەوە "دەوڵەتی دایك" هەڵبمژرێت- سەرکردایەتی کەمینە لەوانەیە نیگەرانی دیکە پەرەبێبدات، وەك ئەوەی کاریگەریو دەسەلاتی لەبنەڕەتەوە لاوازبێت. بەوەش دەردەکەوێت کە زۆر لەوانەیە کەمینەکە (لێرەدا ئاماژە بەکوردانی ئێرانە)، زیاتر بەدوای چالاکییە جیاخوازییەکاندا بچن زیاتر لەوەی پشتگیری جووڵانەوەی رزگاریخوازەکە بکەن (ئەوەی لەکوردستانی عێراقەوە سەرچاوە دەگرێت).

گەنگەشەی های سەبارەت بە "هەستکردن بەبالادەستی لەئاکامی سەرکەوتنەوە"[402] لەوانەیە بەسەر ئایندەی کوردستانی عێراقی سەربەخۆدا جێبەجێبێت. دەشێت سیناریۆیەك بپشکوێت، تێیدا ئەوانەی خاوەن عەقڵێکی لیبراڵن، ئەوانەی خەبات بۆ

400 For an analysis of this, see Ben-Israel, Hedva (1991), "Irredentism: Nationalism Reexamined" in N. Chazan (ed.) Irredentism and International Politics, Boulder, CO: Lynne Rienner, pp. 23- 35.
401 A. D. Smith (1981), p. 198.
402 Hayes (1949), p. 227.

ئازادی تەواوی نەتەوەی کورد دەکەن، کاتێك سەربەخۆییان بۆ ناوچەکانی خۆیان بەدیهێنا، بکەونە ئەوەی بەچاوێکی دیکەوە سەیری جیهان بکەن. ئەو لەخۆڕازیبوونەی پاش گەیشتن بەئامانج دەتوانێت ببێتە هۆی ئەوەی دۆخی برا کوردەکانیان لەوڵاتانی دراوسێ لەبەرچاوبگرنو لەپێگەیەکی باڵادەستەوە خولیای حوکمداریکردنی ئەو ناوچانەو خەڵکە "دواکەوتووەکان" یشیان لەمێشکدا بگەڕێت کە بیانخەنە ژێر توانای تازە وەدەستهاتووی دەوڵەتە کوردییە سەربەخۆکە.

## ٨ . ١ . ٢ کوردستانی مەزن

ئەزمونی دەوڵەتسازیی کە لەساڵی ١٩٩٧ەوە لەباکووری عێراق بەردەوامبوو، کوردانی عێراقی خستە پێگەیەکی زۆر لەپێشترەوە بەبەراورد بە کوردەکانی ئێرانو تورکیاو سوریا سەبارەت بە ئەگەرەکانی بوون بەدەوڵەت. لەوانەیە ناوچە کوردییەکانی باکووری عێراق تەنانەت بتوانێت وەك دەوڵەتێکی یان کوردیی لەقۆناغێکی کۆرپەلەییدا لەقەڵەمبدرێت، بەجۆرێك کوردانی عێراق رۆڵێکی یەکلاکەرەوە لەدامەزراندنو بەهێزکردنی ئەم "کوردستانی گەورە"یەدا بگێڕن.
بۆئەوەی "کوردستانی گەورە" لەدایکبێت، پێویستە ئەو دەوڵەتە کوردییە بچووکەی لەعێراق جیادەبێتەوە هەوڵی بەدەستهێنانی سەروەری یان نەتەوەیی بدات. سەبارەت بە بیرۆکەی "کوردستانی گەورە" چەند دیدێکی جیاواز هەیە لەبەرچاوبگیرێت، ئەویش ئەوەیە کە ئەوە تەنیا بەڕاستی کوردانی تورکیان یاخود پەکەکەیە کە پشتگیری بانگەشەی یان کوردیی دەکەن. بۆ ئەوان، سەربەخۆیی کوردیی لەماوەی ساڵانی ١٩٨٠کاندا، تەنیا چارەسەری پەسەندکراوە بۆ ئەو ململانێ خوێناوییە درێژخایەنەی لەگەڵ کۆماری تورکیادا هەیە. ئامانجی بنەڕەتی پەکەکە دامەزراندنی دەوڵەتی کوردییە لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا، کە دەکرێت ببێتە یەکەمین هەنگاو بەرەو پێکهێنانی "کوردستانی گەورە" بۆ گرتنەخۆی پارچەکانی دیکەی وڵاتانی هاوسێ – ئەو خولیایەی کە لەلایەن بەدەنە سیاسییە کوردییەکانی

دیکەوە هەرگیز بەتەواوی بەشداریان تێدا نەبووە. کوردە چالاکە سیاسییەکانی ئێران خۆیان وەك پان کوردستانی بەجۆش نەنواندووە، بەڵکو لەدوای شۆڕشی ساڵی ١٩٧٩ەوە "دیموکراسی بۆ ئێران و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان"یان کردۆتە ئامانج. کوردانی سوریاش هیچ کات بەتەواوی لەسەر شانۆکە دەرنەکەوتوون، بەڵام داوای مافێکی کەلتووری گەورەتر دەکەن.

پرسیاری ناوەندی سەبارەت بەدامەزراندنو پاراستنی "کوردستانی گەورە" بریتییە لە هەڵسەنگاندنی ئەوەی تاچەندە عێراق، ئێران، تورکیاو سوریا سەرکەوتووبوون لە دابەشکردنی نەتەوەی کورددا. ئەو نیگەرانییانەی کە ئەم وڵاتە هەرێمییانە سەبارەت بەخولیا لەمێژیینە درکپێکراوەکانی کوردانی عێراق پێشانیانداوە، بەشێوەیەکی تایبەت پێدەچێت وەك ترسێك لێکبدرێتەوە لەپرۆژەیەکی مەزنی هەژموندار لەئامانجی کوردان بۆ دەستبەسەرداگرتنی بەشێکی بەرچاوی خاکی هەریەك لەو دەوڵەتانە. ئەم هەستگەلە لەسروشتدا پێش وێستیفالیایانە دەردەکەوێتو رەنگدانەوەی یەکێکە لەو هۆکارە بنەڕەتییانەی جەنگی سی ساڵەی ئەوروپییەکان: دژوارییەکانی نێوان ناوەندگەراییو ناناوەندگەرایی/ هەرێمێکی خاوەن حوکمڕانی ناوەندیو هەروەها رۆیشتن بەرەو نەزمێکی ناناوەندگەرایی سیاسی کە دەوڵەت-نەتەوە دەتوانێت ئۆتۆنۆمی خۆی لەحاست خولیا هەژمونگەراکاندا بپارێزێت. دەوڵەتانی هەرێمی بەشێوەیەکی سروشتی ئەم نەزمەی ئێستاکێیان پێ باشە کە لەسەر مۆدێلی وێستیفالیا راوەستاوە تاکو بەپارێزراویو سەلامەت بمێننەوە، ئەوەی دەتوانێت رووبەڕووی هەر پلانێکی فراوانخوازیی کوردیی ببێتەوە. هەروەك لەئەوروپای پاش وێستیفالیا کە فرەنسا لەسایەی لویسی چواردەیەمدا لەنیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەیەم، خولیای هەژموونگەرایی پەرەیسەند، ئەوەی لەلایەن ئینگلتەراو هۆڵەنداوە بەرهەڵستیکرا — ئەوانەی لەنێوان خۆیاندا لەدەستبەسەرداگرتنی دەریاو رێگا بازرگانییەکان لەکێبڕکێدا بوون- وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناکۆکییەکانیان وەلادەخەنو هەرکاتێك هەڕەشەی کوردیی سەردەرکات، هاوپەیمانی دەکەن. هەروەك لەسەدەی حەڤدەیەمی ئەوروپادا، ئەمە

بەرجەستەی واقیعبینی رووت وێنادەکات بۆئەوەی هاوسەنگی دیالێکتیکی دەسەڵات بەپارێزراوی‌و بێ زیان بهێڵێتەوە.

لەبوونی هەلومەرجێکی دروستدا، "کوردستانی گەورە" دەبێتە هێزێکی هەرێمی سەرەکی لەکاتێکدا دەکەوێتە سەرەڕێگای تورکیاو ئێران‌و خاکی عەرەبان. دەتوانرێت وەك پردێك لەنێوان ئەم کەلتوورو شارستانییانەدا راژەبکات.لەوەش زێدەتر، هێزی سیاسی کوردان بەشێوەیەکی زێدە دەبێت ئەگەر ئەوان لەسەر شانۆ سیاسییەکە خۆیان وەك یەك قەوارە پێشکەشبکەن. شێوەی نەزمێکی ئەلتەرناتیف کە دابەشبوونە بۆ قەوارەگەلێکی جیا لەیەك، "پەرتەوازەیی سەقفی سیاسیان"[٤٠٣]، بەدڵنیاییەوە پێگەی دەستەجەمعیان وەك گەلێك لەسەر شانۆی سیاسی پتەوناکات.

بەبنیاتنان لەسەر بیرۆکەی "بەکوردییبوون" وەك ئامرازێك بۆ کۆکردنەوەی سەرجەم گەلی کورد لەقەوارەیەکی سیاسی یەکپارچە ئەرکێکی ئاسان نییە، ئەو پێویستی بەجەنگانە لەگەڵ چەمکە سەرەکییەکانی عەرەبیزم‌و فارسیزم‌و تورکیزم کە هەموویان لەسەر خاکی کوردیی بەیەك دەگەن. گرفتێکی دیکەی ئەم پرسە کێشەی پێشمەرگەو رۆڵیانە لە"کوردستانی گەورە" دا، حیکمەتێکی باو سەبارەت بە جەنگاوەرانی ئازادی دەڵێت :" چەندە زێدەتر بجەنگن هێندە زێدەتر نەتەوەخوازیان گەشە دەکات"، هەرچەندە، لەسایەی رەوشێکی دیاریکراودا، وەك ئەوانەی لەو چەشنەی کوردستان، ئەمە بەئاسانی جێبەجێ نابێت. پێشمەرگە چەکدارەکانی کورد دەتوانرێت زۆرجار بەشێوەیەك ببینرێن کە لەپێناوی خێڵەکەیان یان پارتەکەیاندا دەجەنگن زیاتر لەوەی بۆ کێشەی کورد بێت، بەوەش چەندە زێدەتر بجەنگن، هێندە زێدەتر دەمارگیرییان بۆ گروپە سیاسییە دڵخوازەکەیان توندتر دەبێت، ئەو راستییەی کە راژە بە بەهێزبوونی چالاکییە نەتەوەییە یان کوردییەکە ناکات.

لەهەموو ئەو جۆرە نەتەوایەتییە جیاوازانەی کە پێشتر ریزبەندیکراوە، جۆری یەکگرتووخوازیان بایەخێکی گرنگی هەیە بۆ گەنگەشەکردن سەبارەت بە

---

403 Gellner (1983a), p. 135.

سـەربەخۆیی سیاسـی کـوردیی، لەکاتێکـدا نەتەوایەتییـەکی کـوردیی بـەرفراوان دەتوانرێـت وێنابکرێـت، ئـەوەی دەشـێت سـیفەتی ئایدیۆلۆجییایـەکی نەتەوایـەتی یـەکگرتووخواز بەدەسـتبێنێت. ئەگـەر سـەربەخۆیی بـە شـێوە هەنوکەییەکـەی بەدەسـتبێت، دەشـێت جووڵانەوەیـەکی بـەهێزی بارگـاوی بـەئاکاری رزگـاریخوازی بانگەشـەکانی فراوانخـوازی لـەدژی دەوڵـەتێکی هاوسـێ پەرەپێبـدات، ئـەوەی دواجـار دەبێتـە نەتەوایەتییـەکی یـەکگرتووخواز بـۆ هـەموو کـوردانو هـەوڵی بـەدیهێنانی پێگەی سیاسـی "کوردسـتانی گـەورە" دەدات. ئەگـەر یـەك یـان دووان، تەنانـەت سـێ هەرێمی کارگێڕی ئۆتۆنۆمی کوردیی لەپاڵ ئەوەکەی باکووری عێراقەوە دابمـەزرێت. نەتەوایەتییـەکی کـوردیی سـەرلەنوێ بنیـاتنراو دەتوانرێـت بێتـەدی، ئـەوەی بەهەسـتگەلێکی یەکگرتووخوازییـەوە جیادەکرێتـەوە، تایبەتمەندییـەکی بنـەڕەتی نەتەوایەتییەکی یەکگرتووخوازی سەرکەوتوو، هەروەك بریویلی ئاماژەی بۆ کردووە، ئەوەیـە کەلەسـەر ئاسـتی دەوڵەتـە تاکەکـە (لـەم کەیسـەدا پێکهاتـەی دەوڵەتـە ئۆتۆنۆمەکەی باکووری عێراقە)و لەودیو ئەویشەوە سەرکەوتن بێنێتەدی. گرفتەکـە دەکەوێتـە ئـەو دۆخـەوە کـە پێدەچێت بەشێوەیەکی زێـدە " وابێـت پەرەسـەندنی جووڵانەوە نەتەوەییەکەی لەتاکە دەوڵەتێکدا پـێ بـاش بێـت تـاکو یـەکێکی دیکـە"، بەوەش " وردە وردە جووڵانەوە نەتەوەییەکە کۆپی رەوشی ئەو دەوڵەتە دەکات".[٤٠٤] رووداوەکانی ساڵی ١٩٩١ ئەو نمونەیەی شێوان کە زیاتر لەنیو سەدەبوو زووتر بەسـەر ناوچەکەدا سەپێنرابوو کاتێك پۆلێك دەوڵەت-نەتەوەی نوێ لەرۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەسـەر نەخشـەکە دەرکـەوتن. هەرچـەندە، لەلایـەن هێـزە هەرێمییەکانـەوە هـەوڵی بنیاتنانـەوەی نـەزمی جیۆپـۆلیتیکی پێشـوو نەدراوەتـەوە. بەهـەرحاڵ، رووداوەکـانی سـاڵی ١٩٩١ دەرگـای لەسـەر دەرکـەوتنی هێزگـەلی نـوێ کـردەوە کەلەوانـە بەباشـی لەسـەدەی نـوێ دا خـۆی بچەسـپێنێت. بـەوەش نەتەوایـەتی، دەتوانێـت، هـەروەك لەکەیسـەکەی ئـەڵمانیاو ئیتاڵیـادا، ببێتـە پاسـاوێك بـۆ یەکخسـتنی زۆربـەی ناوچـە کەلتوورییـە کوردییـەکان لەسـایەی سـەرکردایەتی کوردییـدا بـەرەو دەوڵـەت-

404 Breuilly (1993), p. 121-22.

نەتەوەیەکی کوردی گەورەتر کە "کوردستانی گەورە" یە.

لەپەیوەندی بەو مشتومڕەی لەباسی دووەمدا هاتووە، نەتەوەی کورد دەتوانێت تەنیا ڕۆڵی "دەوڵەت پتەوکەر" بەدەستبێنێت ئەگەر هەموو پارچەکانی کوردستان لە ئۆرگانێکی تەواودا پێکەوەبن وادەکات هاوسنووربێت لەگەڵ ئەو دەوڵەتانەی هەن. لەکاتێکدا کە نەتەوەی کورد لەزۆربەی ماوەی سەدەی بیستەمدا "دەوڵەت تێکدەر"بوون، قەوارەی بچووکتریان لەنێو دەوڵەتە گەورەکەدا پێکهێناوە، ئەوان دەتوانن، هەروەك لە کەیسی سەربەخۆیی بۆ کوردستانی عێراقدا، ڕۆڵی دەوڵەت ئەفرێنەر بن، ئەوەی دواتر خۆی گەورەتر دەبینێتەوە لەو دەوڵەتەی کە هەیە.

بیرۆکەی "کوردستانی گەورە" هەروەها دەشێت وا لێکبدرێتەوە کە فیدراسیۆنێکی نەچەسپاوی نێوان سێ بۆ چوار هەرێمی کوردیی بێت بە ئۆتۆنۆمی بەرفراوانەوە. بەلەبەرچاوگرتنی بەرفراوانی نەتەوەی کورد، فیدراسیۆنێکی بەم چەشنە، هەرچەندە، دەشێت هەڵوەشێتو ببێتەهۆی دامەزراندنی دەوڵەتگەلێکی کوردیی تەواو جیاواز لەیەکتری – پەرەسەندنێکی بەو چەشنە پێویست نییە زیان بە پان کوردیزم بگەیەنێت، لەکاتێکدا هێشتا دەتوانرێت یەکێتی کوردیی پێکبێت، بەڵام هی خەڵك نەك نەتەوە، ئەم یەکێتییە نزیکەی لەفۆرمی پۆتێنساڵیدا هەیە، لە دابونەریتو کەلتووری خەڵکەکەیدا، وێڕای ئەوەی دەزگا فەرمانڕەواکانی ئەو دەوڵەت-نەتەوانە خەڵکەکەیان لەحاڵەتی دابەشکردنو ئیستغلالکراودا ڕاگرتووە.

## ٨ . ١ . ٣ چەند کۆمارێکی کوردیی

نەبوونی مێژوویەکی سیاسی هاوبەشی هاوچەرخ بۆ هەموو کوردستان، وێڕای ئامادەگی خێڵگەرایی، لەگەڵ سیتمی تازە بەو دواییە هەڵوەشاوەی دەرەبەگایەتی (کە خودی خۆی لەمپەرێکی مەزنە لەرووی ئابووریو کۆمەڵایەتییەوە لەبەردەم هەوڵەکان بۆ بەهێزکردنو یەکخستنی نەتەوەی کورد) گرفتگەلێکی کەموێنە لەبەردەم بونیادێکی مەزنی دەوڵەت بۆ دامەزراندنی "کوردستانی گەورە"

پێکـدەهێنن. وێـڕای ئـەوەش، بەدەسـتهێنانی ئامـانجی یـەکێتی یـان کـوردیی لـە "کوردسـتانی گـەورە" پێویسـت بـەوە دەکـات هـەر گـروپ‌و تـاقمێکی سیاسـی لەسەراسەری کوردستاندا بنکەی دەسەڵاتەکەی خۆی لەناوچە خۆجێیـە تایبەتەکەی هەڵوەشێنێتەوە، بـەدیهاتنی مەسـەلەیەکی بەوچەشـنە ئەسـتەمە بهێنرێتـە بەرچاو. ئەو راستییەی کە بنکەی دەسەڵاتی پارتی دیموکرات‌و یەکێتی نیشتیمانی وەك یـەك بێ دەستلێدان هێڵرانەوە کاتێك کارگێڕییەکی کوردیی پێکهێنـرا، بـەوەش رێگـری لـە کـارو هەڵسـوڕانی دامـەزراوە حکومەتییـە هاوبەشـەکە کـراوە، کـە ئـەزموونێکی دڵخۆشکەر نییە کاتێك هاوکاریی لەسەر ئاستێکی مەزنتر بهێنرێتە بەرچاو.

لێرەشـەوە، لـەڕووی نـەبوونی یـەکێتی سیاسـی لـەنێو کوردانـدا، هـەروەها نـەبوونی ستراتیژییەکی سیاسی هاوبەش، پێدەچێت بانگەشەکردن بۆ ئەوە دروست نەبێت کە کـوردان تـەنیا یـەك دەوڵـەتی سـەربەخۆیان دەوێـت. لەڕاسـتیدا، لەوانەیـە سـەدەی بیسـت‌و یەکـەم زیـاتر لـە یـەك دەوڵـەتی سـەربەخۆی کـوردیی بـەخۆوە ببینێـت، هـەروەك ئـەوەی چـەند دەوڵـەتێکی عـەرەبی هەیـە. پەرەسـەندنێکی بـەم چەشـنە لەوانەیە زادەی واقیعی جیۆپۆلیتکی بێت بەو مانایەی کە لەمپـەرە جیۆگرافییـەکان (وەك سـیمای شـاخاوی کوردسـتان) قـۆرت دەخەنـە بـەردەم کارلێکـە مرۆییـەکان، هـەروەها ئەگـەر بەسـەر ئـەم لەمپـەرو قۆرتانـەدا زاڵنـەبن، پێدەچـێت پێکهاتـەی دەوڵـەتی جیـا چاوەڕوان بکرێـت. ئەمـەش بەهاوتـەریب لەگـەڵ ئـەو ئەگـەرەی کـە سـەربەخۆی بـۆ کوردسـتانی عێـراق لەوانەیـە بـە باشـی هـانی کـاری هاوشـێوە بـدات لەپارچـەکانی دیکـەی کوردسـتاندا، بـەڵکو لـەبری ئامـانج بـۆ خۆبەسـتنەوەو بـوون بەبەشـێك لـە بونیـادی دەوڵـەتێکی کـوردیی/عێـراق، ئـەم جووڵانـەوە جیاخوازانـە دەشێت بەئومێدەوە بۆ خولیای سەربەخۆیی نێوخۆیی بڕوانێت.

کاتێك بەغدا لەساڵی ١٩٩١دا وازی لەدەسەڵاتی خۆی لەسێ پارێزگاکەی باکوور هێنـا، ناوچەکە بەهـەموو مەبەسـت‌و ئامانجێـك سـەربەخۆ بـوو، ئـەوەش بـەگوێرەی وتـەی رۆزینلو :" گواسـتنەوەیەکی کورسـی دەسـەڵات بـوو".[405] کاتێـك گروپێکـی نەتـەوەیی

405 Rosenau (1995), p. 208.

لاوەکـی دەسـتی بەسـەر دامەزراوەکانـدا گـرتو لـەو ناچـانە لەحکومـەتی ناوەنـدی وەرگرتــەوە کــە زۆرینــەیان تێــدا پێکــدەهێنا. مــرۆ دەتوانێــت وێنــای "پرۆســەی گواســتنەوە"یــەکی لــەم چەشــنە بکــات کــە لەسروشــتدا گشــتگیرتربێو ســنووری نەتەوەییش دەبەزێنێت، بەشێوەیەك وا لـەکوردانی ئێـرانو تورکیـاو سـوریاش بکـات رۆڵێکـی گـەورەتر لەبـەڕێوەبردنی کاروبارەکـانی خۆیانـدا بگێـڕن. لەوانەیـە ئـەوان خواسـتی ئـەوەیان نـەبێت بـەدوای خولیاکـانی بـرا کوردەکانیـان لـەو دیـو سـنوورەوە بکەونو بەرەو "کوردستانی گەورە"، هەروەها لەئاکامی چەند ئاراسـتەیەکی جیـاواز کـە تێـدا پێدەچێت دەسـەڵات بگوێزرێتـەوە، دەشـێت ئـەوان بگەنـە ئـەو ئامانجـەی قەوارەی سەربەخۆی تایبەت بـەخۆیان دابمـەزرێنن. لەرێگـەی ئـەم هـەوڵو هـەنگاوە ناناوەندگەرایانـەوە، کەلەوانەیـە رەنگدانـەوەی سیاسـەتگەلێکی بەئەنقەسـت نـەبێت لەلایـەن حکومـەت ناوەندییەکانـەوە، بـەڵکو ئاکـامێکی لابـەلای رێحـەزو فشـارەکانی بەجیهانییبوون بێت، زیاتر لەکۆمارێکی کوردیی رۆژی روناك ببینن.

## ٨ . ١ .٤ ئەگەرەکان دژ بەسەربەخۆیی کوردیی

بۆ هەموو ئەو سیناریۆیانەی لەسەرەوە سەبارەت بە سەربەخۆیی کوردان ئاماژەی بۆ کراوە رۆڵی جیۆپۆلیتیك دەبێت چـەندە دیاربێـت، کوردسـتان رووبـەڕووی لەمپـەری زۆر ئاڵۆز سەبارەت بە بەدەوڵەتبوون دەبێتەوە: کۆمەڵە فاکتـەرێکی نـاوازەی نالـەبار کە وا دەکات بیرۆکەی دەوڵەتی سەربەخۆی کوردیی تەنیا شتێکی ئەبستراکت بێت. بــەگوێرەی ریچــارد فالــك، وڵاتێکــی بچــووك تــەنیا ئــەو کاتــە مانــەوەی خــۆی دەچەسـپێنێت کـە "ئاراسـتەکەی بەشـێوەی درککـردن بێـت بـە سـوودمەندی هێـزە جیۆپۆلیتیکـە باڵادەسـتەکان".[٤٠٦] بـۆ نموونـە، وەك کەیسـەکەی ئیسـرائیلی غـەیرە عەرەبی غیرە موسوڵمان. هەست بەوە دەکرێت کە تەنیا بەدارمانی سیستمی دەوڵەت لەهەرێمەکەدا پێدەچێت دەوڵەتی کوردیی بپشکوێت، هـەروەك "کۆتـایی جەنگـەکان

406 Falk (1991), p. 383.

بۆنەگـەلێکن بـۆ دارِشـتنەوەی جیۆپـۆلیتیکی".[407] فالـك دان بـەوەدا دەنێـت کـە "دەرفەتگــەلێکی بەرتەسـك هەیــە لــە چوارچــێوەی ئــەو دۆخــە جیۆپۆلیتیکــەی هەرێمەکەدا".[408] بەڵام بەئاسانی تێبینی ناکرێن. جیۆپۆلیتیکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەپاش جەنگی کوەیت دەرگای لەسەر دەرفەتەکان بـۆ کـوردانی عێـراق کـردەوە تـاکو کۆمەڵگایەکی سیاسی ئۆتۆنۆم دامەزرێنن کە نە بەتەواوی لەئاستی دەوڵەتدایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش پێکهاتەیەك بوو کە پێشتر وێنەی نەبوو.

تەنیا پشتگیریی‌و فشاری نێودەوڵـەتی ناچارکەر لەوانەیـە پاڵپشـتی دەوڵـەتێکی نـوێ لەرۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتدا بکـات، فشـارێك کـە بەهـەموو ئەگەرەکانییـەوە لەریشـەی بەرژەوەندییــە ئــابووری‌و ســتراتیژییەکانی ســوپەرپاوەرە تــەنیا باڵادەســتەکەوە سەرچـاوە بگرێـت، ئەگـەر دەوڵـەتێکی کـوردیی کیشـوەری لەسـایەی ئـەم رەوشـەدا بپشکوێت، ئەو کاتـە تووشـی ریسکی دانپێدانـەنانی هاوسـێکان‌و دابڕانـی دیپلۆماسـی لەئاستی هەرێمیدا دەبنەوە، ( دیسانەوە بـەئاماژەدان بـە ئیسـرائیلی بێـزراو)، لەگـەڵ ئەوەش، واقیعە جیۆپۆلیتیکیەکان بەشێوەیەکن کە بۆچی دەبێت دەوڵەتانی هەرێمی دان بە کوردستانێکی عێراقی سـەربەخۆدا بنـێن: ئـەو هانـدەرو هەڕەشـانە چـین کـە دەگونجێت بتوانرێت لەبەرامبەر ئەم دانپێدانەدا بدرێت.؟ ئەو کاتەش لێدانی مـۆری پەسەندی لەلایەن هێزە هەرێمییە باڵادەستەکانەوە بەشێوەیەکی پێویست رەوشـێکی لەبار بۆ دەوڵەتە نوێیەکە ناهێنێتەئارا. وێـڕای ئـەوەش، ئـەزمونی کـوردی سـەبارەت بەخیانــەتی جیۆپــۆلیتیکی لەلایــەن هێــزە جیهانییەکانــەوە بەچەشــنێکە کــە سەرکردایەتی کوردیی دوودڵە لەمتمانەکردن بە هەر هێزێکی دەرەکـی سـەبارەت بـە سەپاندنی چارەسـەرێك بەسـەر هاوسـێ رەتکـەرەوە بەرهەڵسـتکارەکانی. ئەگـەر وەك مەسەلەیەکی زۆردارانە لەقەڵەم بدرێت، ئـەوا نەزمەکـە بەرهەڵسـتی دەکرێـت‌و وەك هەنگاوێکی پوچ‌و رەتکراوە رادەگەیەنرێت، هـەرکاتێك یـەکێك یـان زیـاتر لـەو وڵاتـە کاریگەرانە ئەوەندە هێزی تەواوی هەبێت کارێکی بەو چەشنە ئەنجامبدات.

---

407 Ibid. p. 385.
408 Ibid. p. 392.

لـەوەش زیـاتر، ئەگـەر سـەربەخۆیی، بـەئازادیی ڕەهـا لـە وابەسـتەیی ئـابووریو سەربازیو سیاسی لەقەڵەمبدرێت، دەوڵـەتێکی کـوردیی زۆر بـەگران بـەهۆی واقیعـی وابەسـتەییەوە دەتوانێـت چـالاكو بـەردەوام بێـت. بـە پێـدانی تـەنیا سـیفەتی سـەربەخۆیی هەمیشـەیی، پێدەچـێت کوردسـتانێکی خـاوەن سـەروەریی خـۆی لەپێگەیەکـدا ببینێتـەوە کـە نـاوێکی بێنـاوەرۆك بێـت. بڕیـارە سیاسـییەکان لـە واشینتگتۆن دی سی یـەوە وەربگیرێـن، سیاسـەتی ئـابووری لەلایـەن بـانگی جیهـانیو (IMF) ەوە ئاراستە بکرێن، هەروەها کەلتووری کوردیش لەژێر کاریگەری بـەهێزی بەغـداو ئەنکـەرەو تارانـەوە پوچـدەکرێنەوەو لاواز دەکـرێن، ئـەوەی پەیوەندییـەکی لاوازکەرانەی لێدەکەوێتەوە.

لـەنێو سیاسـەتی هەرێمیـدا، ئەزمونـە کوردییەکـەی عێـراق پەیوەسـتە بـە پرۆسـەی دەوڵەتسـازییەکەی فەلەسـتینییەکانیەوە، کـە دامەزرانـدنی نوێنەرایەتییـەکانی دەستپێکرد. ئەو ڕاستییە کە دەوڵەتە فەلەستینییە ساواکە لـەنێو خـاکی "دەوڵەتـە گەورەکـە"ی ئیسـرائیلدا ماوەتـەوە. پەرەسـەندنەکانی فەلەسـتینی/ئیسـرائیلی ڕەهەندێکی هەرێمی دەبەخشێتە ڕەوشە سیاسییەکە لـەباکووری عێـراق: بەتایبـەتی، دۆخـی هـەرێمی وابێتـە ئـارا کـە دەوڵـەتێکی فەلەسـتینی تێـدا دابمـەزرێت، ئـەوکات هیوایـەکیش بـۆ دەوڵـەتێکی کـوردیی دەبێـت. ئەگـەر ئیسـرائیل بەشـێوەیەکی هەمیشەیی واز لەو خاکە بێنێت، ئایا ئێرانو عێراقو تورکیاش دەشێت هـەمان شت ئەنجامبدەن؟ وەڵامی ئەم پرسیارە تائاستێکی زۆر خۆی لـە پەیوەنـدی هەریـەك لـەو دەوڵەتانەوە بە ئەمریکاوە دەبینێتەوە، بـەڵام زۆر پێدەچێت تەنانـەت فشاری زۆری نێودەوڵەتیش بتوانێت ئـەم دەوڵەتانـە ناچاربکات ڕێگـە بەدامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی کـوردیی بـدەن. ڕەوشـەکە هێشـتا لەوەکـەی فەلەسـتییەکان ئـاڵۆزترە.[٤٠٩] جگەلـەوەی

---

٤٠٩ لێکچـواندنو بـەراوردێکی بـەم چەشـنە دەشـێت سـوودبەخش بێـت بـەڵام مـرۆ دەبێـت تایبەتمەندییـەکان لەبەرچاوبگرێت. لێکچوونێکی سنووردار لەنێوان هەردوو ئەزموونەکەدا هەیە، بەڵام جیاوازییەکان هێندە مـەزننو ڕەوشەکان زۆر نالکێچوون کە بەراوردکاری لەنێوان کوردو فەلەسـتینییەکان پێویسـتی بـە تێزێکـی تایبـەت بـەو بابەتە خۆیەتی.

کوردان کەمتر یەکگرتووترو ڕێکخراوترن، ئەوان دەبێت بۆ بەدەوڵەتبوون بەرخورد لەگەڵ چەندین وڵاتاندا بکەن. مافی بەدەوڵەتبوون خۆی لەخودیدا بەتەنیا بەس نییە لە سەردەمو ناوچەیەکدا کە جیۆپۆلیتیک کاریگەری زۆری لەسەر بڕیاردان لەمەسەلەکان هەیە.

## ٨ . ٢ نەتەوەیەکی بێ دەوڵەت

پرسیارێك کە خۆی لەم مشتومڕەوە بەرجەستەدەکان ئەوەیە کە داخۆ نەتەوەیەك پێویستی بەدەوڵەتی تایبەت بەخۆیەتی یان نا. بە وتەیەکی دیکە، داخۆ ئەوەی پێشوویان دەتوانێت بێئەوەی دواییان ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە. نەتەوەییە بەراییەکانی وەك هێردەرو ڕۆسۆ مشتومڕیان لەوبارەیەوە کردووە کە نەتەوەکان تائەوکاتەی کەلتووریان بەهەڕەشە نەکەوتووە دەتوانن بەباشی هەڵسوڕێن بێئەوەی دەوڵەتی تایبەت بەخۆیان هەبێت.[410] هەرچەندە، فیختە، هزری دوژمنکارانەی زێدەتری هێنایەئاراو تێیدا بانگەشەی بۆئەوە کرد کە بۆئەوەی نەتەوەیەکی ڕەسەن بێتو بە ڕەسەنی بمێنیتەوە، پێویستە تۆ دەوڵەتی خۆتت هەبێت."[411] ئەو پرسیارەی کە داخۆ نەتەوەیەك پێویستی بە دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆی هەیە یان نا، زۆرجار ئەو پرسە باڵی بەسەریدا دەکێشێت کە داخۆ نەتەوەییەکان دەگونجێت دوائامانجی خۆیان کە سەربەخۆیی سیاسییە بۆ نەتەوەکەیان بەدەستبێنن. خواستی بەدیهێنانی دەوڵەت-نەتەوەیەك بۆ نەتەوەیەك، بەگوێرەی سیستمی دەوڵەت-نەتەوە بانگەشەیەکە لەڕووی ئەخلاقییەوە شایەنی بەرگری لێکردنە. بەڵام وێڕای ئەوە، بانگەشەیەکە پابەندی ڕادەیەکی بنەڕەتییە لەململانێ کە زۆرجار دەبێتە هەوڵێکی بێهودەو وێرانکەر بۆ شتێکی مەحاڵ.

---

410 On Herder see F. Barnard (1965), Herder's Social and Political Thought, Oxford: Clarendon Press, and on Rousseau see A. Cohler (1970), Rousseau and Nationalism, New York: BasicBooks

411 See chapter three in John Holland Rose (1916), Nationality as a factor in modern history, London: Rivingtons.

مشـتومڕی فـره بـاو بـۆ گـەلانی خـۆ بەنەتـەوەزان کەپێگـەی دەوڵـەت-نەتـەوەیان پێبدرێت ئەوەیە کە ئەوان نـاتوانن بـەبێ ژیـان لـەنێو دەوڵـەتێکی تایبـەت بـەخۆیان پـارێزراو بـن، یـان ئـەوەی کەئـەوان وەك گـەلێك نـاتوانن پێشـبکەون ئەگـەر وەك نەتەوەیـەکی بێدەوڵـەت بمێننـەوە، "لەبەرئـەوەی ئەمـە تـەنیا مەرجێکـە بۆئـەوەی لـــەژێر فشـــاری هێنـــدێك لـــەهێزە دەســـەڵاتدارو دەســـتوەردەرەکان خۆیـــان دووربخەنەوە".[412] بەڵام ئایا ئەمە بۆ کوردانی عێـراق دروسـتە؟ لەکلاورۆژنـەی ئـەم شرۆڤەکارییانەی لەم کۆڵینەوەیەدا پێشکەشکراون، ئایا نەتـەوەی کـورد پێویسـتی بـە دەوڵەتێکە بۆئـەوەی زامـنی بوژانـەوەی سیاسـیو کـەلتووری خـۆی بکـات؟، وەڵامەکـە ئەرێی دەبێت ئەگەر دیدی رۆبێرت فاین پەسەندبکەین، ئەوەی دەڵێـت:" لانـەوازانی هاوچەرخ – ئەو خەڵکە پەنابـەرو بـێ شـوێنو راگوێزراوانـەی دەوڵـەتێکیان نییـە – بوونەتـە بەڵگەیـەکی دیـار بۆئـەوەی ئەنـدامبوونی نەتەوەیـەك کـە دەوڵـەتی خـۆی هەبێت دەبێتە مەرجی ئەوەی مافگەلێکی هەبێت کە بنەما رۆشنگەرییەکان بە هـەر تاکێکیان رەوابینیوە بەهۆی مرۆڤبوونەوە".[413]

لەبنەڕەتدا هـەمان هەسـتگەل لەلایـەن میشـێل ئیگناتیڤـەوە دووبارەکراوەتـەوە، لـەو بانگەشەیەیدا کە " مافی بوونی هەر مافگەلێك بەگشتی تـەنیا بەشـێکە لەوانـەی کـە دەوڵەتێکیان هەیە".[414] هەرچەندە، مـرۆ ئـارەزووی مشـتومڕ لەوبارەیـەوە دەکـات کـە پرۆسـەگەلی نەتەوەیـەك بـۆ ئـەوەی "بێتـەدی" پێویسـتی بـەوە نییـە کـە دەوڵـەت-نەتەوەیەك دابمەزرێنێت کە هەڵگری ناوی خۆی بێت، بەگوزارشتێکی دیکە، پێویست ناکات هەموو نەتەوەیەك ببێتە دەوڵەت-نەتەوە، دەتوانرێت بوترێـت کـە نەتـەوەکان ژیانی تایبەت بەخۆیان هەیە، ئەوان قەوارەگەلێکی سـەربەخۆن لەدەوڵـەتو بـەوەش پشـــت بـــە دەوڵـــەت نابەســـتن بـــۆ زامنکردنـــی ژیـــانو مانـــەوەیان. هـــەروەك لەشـــرۆڤەکارییەکانی باســـی دووەم روونبۆتـــەوە، نەتـــەوەکان لـــەڕووی مێژووییـــەوە سـنووردار نـەکراون بـە پێکهـاتنو پەرەسـەندنی دەوڵـەتی نەتـەوەیی هاوچـەرخەوە

412 Taylor (1993), p. 50.
413 Fine (1999), p. 150
414 Ignatieff (1999), pp. 142-143.

کەلەئەوروپادا سەدەیەك پاش شۆڕشی فرەنسی سەریانهەڵدا، بەوەش پێویست ناکات ئەوان بۆ بوونی بەردەوامیان پشت بەدەوڵەت ببەستن.
لەڕاستیدا، پرسگەلی سیاسی بەرتەسکی نەتەوە، دەوڵەتو نەتەوایەتی، ئالۆزیی تایبەت بەخۆی هەیە، هەروەك بینیمان لەماوەی پاش کۆلۆنیالی، بڕێکی زۆر ئەندازەگیری کۆمەڵایەتی روویانداوە، هەروەها لێکدانەوەی باوی نەتەوە لەنێوان نەتەوەسازاندا بریتیبووە لە هاوڵاتیانێك لەسەر خاکی دەوڵەتێکی نوێ بژین. لەم پرۆسەگەلەدا شوێنێك بۆ دەوڵەتێکی کوردیی نەبووە، بەشێوەیەکی گونجاو لەلایەن ئەو جووڵانەوە نەتەوەییە سەرکەوتووو زاڵەکانەوە کە لەلایەن هێزە جیهانییە دەسەڵاتدارەکانەوە پاڵپشتی کراون. هەرچەندە، نەتەوەی کورد بەبێ دانپێدانان نە لەناوچووەو نە لاوازیش بووە.
بەتێپەڕینی ماوەیەکی زۆر، کۆمەڵگای نەتەوەیی کورد، بەبوونی بڕێکی زۆر لەبەردەوامی هەرێمیو هەروەها نەریتی ئۆتۆنۆمی خۆماڵی (نموونە بەراییەکانی میرنشینە کوردییەکان) خۆی وەك گەلێکی تایبەت پێناسەکردووە، نەتەوەیەك لەچوارچێوەگەلێکی جۆربەجۆردا، دژی دوژمنە جۆربەجۆرەکان، نەتەوەیەك کە بۆتە چەند بەشێك لە چەند دەوڵەتێکی جیاواز، لەمێژووی هاوچەرخدا، خاوەن دەوڵەتی تایبەت بەخۆی بووە (کۆماری مەهاباد، هەرچەندە، لەسەر بەشێکی سنوورداری خاکەکەیو لەسەر خاکی ئێران بوو، نەك عێراق)، ناوبەناو هەوڵی بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی داوە بێئەوەی مەترسییەك لەسەر خاکی دەوڵەتی عێراق پێکبهێنێت، هێنانی کۆچبەران (بەئاماژە بەشیعە نیشتەجێکراوەکان کەلەباشوورەوە بەزۆر راگوێزرابوون)، نەهامەتیو داماوی زۆری بەسەردا هاتووەو هێشتا وەك کوردستان هەیە. ئەو زەحمەتو سەرکوتکارییەی رووبەڕووی بۆتەوە پێدەچێت تەنیا بەهێزکردنی نەتەوەکەی لێکەوتۆتەوە کە لەناونەچێت. هەلومەرجێکی سیاسی لەبار ژینگەیەکی ئارام پێکدێنێت کە بەباشی گەشەکردنی کۆمەڵگا نەتەوەییەکان بەخۆوە دەبینێت، ئەوەی کەلتوورەکانیان رێگرییەکی نایەتەڕێ کە گوزارشت لەخۆی بکات. ئەوە تەنیا بەدەستهێنانی ئەو هەلومەرجە لەبارەیە

بۆئـــەوەی نەتـــەوەی کـــوردی تێـــدا گەشـــەبکات، ئـــەوەی پێدەچـــێت زیـــاتر لـــە فـــەزا سیاسییەی ئێستادا بەربلاو بێت.
لەوەش زیاتر، لەکاتێکدا لەجیهانێکدا دەژین کە نەتـەوەکانی تێـدا زیـاتر لەدەوڵـەتان دەژین، هەربۆیە ماقووڵ نییە کە نەتەوەکان یەکسانو هاوجووت بەدەوڵەتان بکەین. ڕێژەیـــەکی ئەژمارنـــەکراو لەســـنوورەکان بـــەقووڵی بگـــۆڕێن ئەگـــەر ئەگـــەری چارەســـەرکردنی ئاشـــتییانەی کێشـــەی نەتـــەوەکانو دەوڵەتـــەکان بەشـــێوەیەك بچێتەپێش کە هەر نەتەوەیەك دەوڵەتێکی هەرێمی بۆخۆی قوتبکاتەوە. لەسەرەتای سەدەی رابـردوودا کـوردان لەجـەنگی دامەزرانـدنی دەوڵـەتی کوردییـدا لەناوچـەکەدا شکستیخوارد، بەڵام ئەوە نەبووە مـەرجی لەناوچوونی نەتـەوەی کـورد. نەتەوەیـەك بـەبێ دەوڵـەتێك لەوانەیـە هـەموو ئـەو گرفتانـە تاقینەکاتـەوە، لەکاتێکـدا ئـەو دەوڵەتانەی هاوجووت نین لەگەڵ نەتەوەیەکدا تـەنیا دەتوانێـت بەکۆمـەڵێك گـرفتی بەرچـاوەوە ببێـت. خولیـای لەمێژینـەی کـوردان بەدەوڵـەتی سـەربەخۆ لەوانەیـە بەڵگەیـەك بێـت بـۆ بـوونی بانگەشـە بـۆ چـەمکی دەوڵـەت-نەتـەوە لـەنێو کوردانـدا. لەوانەیە تەنانەت کۆبوونەوەیەکی لۆژیکیانەو نالۆژیکیانەش چەسپێنرابێت لـەبیری دەوڵـــەت-نەتـــەوەدا تـــاکو بەوشـــێوەیە بۆتـــە مـــەراقی گـــەلان بەتایبـــەت ئەوانـــەی دەوڵەتێکیان نییەو ئارەزووی راگەیاندنی دەوڵەتێکی تایبەت بەخۆیان دەکەن.
هەرچـــەندە، دەوڵـــەت-نەتـــەوە بۆخـــۆی پێناچـــێت فـــۆرمێکی کۆتـــایی ڕێکخســـتنی کۆمەڵایەتی بێت بـۆ نەتـەوەی کـورد.[415] کاتێـك مـۆدێلی دەوڵـەت-نەتـەوەی ئـەوروپی لەلایەن کۆمەڵگەگەلێکەوە کۆپی دەکرێت بێئەوەی بنەمایەکی ئـابووری-کۆمەڵایـەتی وەك ئەوەی ئەوروپا یان لانیکەم هاوشێوەیان هەبێت، ئەوا گرفتگەلێك بەشـێوەیەکی حـەتمی سـەرهەڵدەدەن. بـە نەگـەڕان بـەدوای دەوڵـەتێکی نوێـداو جـەنگان لـەپێناو پاراسـتنی نەتەوەکـەیانو خـەباتیان بـۆ گونجانـدنی لـەنێو بنیـاتێکی سیاسـی نوێـدا، کوردان خۆیان لەحاڵەتێکدا دەبیننەوە کە بگەڕێنـەوە حاڵەتـە رەسـەنەکەی خۆیـانو وەك خـــەڵکێك بەشوناســـێکی زمـــانیو کـــەلتووری ئاشـــکراو نـــەزمێکی شـــلڕۆی

---

٤١٥ هەروەك دکتۆر رەشید دەڵێت :" ئەوە بەشێوەیەك بۆ ناوچە کوردییەکە بەسەرچووە: ، لەندەن، ١٩٩٩.

دەسەڵاتەوە- هەموو ئەو سیمایانەی پێدەچێت سیمای قۆناغی نوێی زانیاری بن کە ئێستا تێیدا دەژین.

دیدی گیدنز سەبارەت بە نەتەوە تەنیا ئەو دەمە گرنگە هێندەی پەیوەندی بە دەوڵەتەوە لەبەرچاو بگیرێت، بەمانایەکی دیکە کاتێك سەرکەوتوو دەبێت لەبەدەستهێنانو پاراستنی هێزی دەوڵەت- هەروەها لەدەرەوەی دەوڵەتدا حاڵەتێکی سەربەخۆی تایبەت بەخۆی نییە، دەتوانرێت ئێستا وەلابنرێت. ئەگەر حاڵەتەکە وابێت، خەڵکی سکۆتلەندی یەك لەچەندین نموونەکان دەگرێتەخۆ، ئەویش ئەوەیە کە نەتەوە پێکناهێنێت هەتاکو ئەو رۆژەی سکۆتلاند لەبریتانیا جیادەبێتەوەو دەوڵەت-نەتەوەی خۆی دادەمەزرێنێت. بەشێوەیەکی روون، سیمای کەلتووری نەتەوەیەك لەسیما سیاسییەکەی گرنگترە، تەنانەت پێدەچێت بۆ مانەوەو بەردەوامی بەژیانی نەتەوە لەوەکەی دواتریان یەکلاکەرەوەو گرنگتربێت. کاتێك کەلتووری کوردیی بەدامەزراوەیی دەکرێت، نەتەوایەتییە کەلتوورییەکەی، نەتەوەکە بەزیندوویی دەهێڵێتەوە.

هەروەك لەباسی دووەمدا سەبارەت بەنەتەوایەتی جەختی لێکراوەتەوە، پێویست بەمەیلو ئارەزوویەك لەلایەن ئەو خەڵکەوە دەکات کە نەتەوە پێکدێنن بۆئەوەی وەفادارییەکی بنەڕەتیو بەردەوام بەکۆمەڵگاکەیان ببەخشن، هەتاکو ئەم وەفادارییە گومانلێکراو بێت، نەتەوە ناتوانێت بەرەو قۆناغی داهاتوو ببزوێت، بەمانایەکی دیکە، بۆ سوود وەرگرتن لەمافی خۆی بۆ رێکخستنی وەك دەوڵەتێکی سەربەخۆ- تەنانەت ئەگەر هەلومەرجەکانی دەرەکیش لەباربن. ئینتیما خێڵایەتییەکان هێشتا بەهێزنو بەوەش پەرەسەندنی نەتەوایەتی کوردیی دەشێوێنن. هەرچەندە، فرەجۆری جەمسەرەکانی پێناسەکردن لەکۆمەڵگای کوردیدا دەتوانێت، بەوەرگرتنی مانای وتەی گیلنەر، نەتەوەیەکی خێڵەکیی (رێژەیی) دەتوانێت بۆ ماوەیەك لەباری نێوخۆییەوە خێڵەکییو لەباری دەرەکییشەوە نەتەوەیی بێت."[٤١٦] بەوتەیەکی دیکە، خێڵگەرایی پێویست نییە کە پێناسەی نەتەوەیەك پوچبکاتەوە.

---

416 Gellner (1983), p. 138.

ئەگەر ئەوە پەسەندبکەین کە خێڵگەرایی بەشێکی بنچینەیی کۆمەڵگای کوردییە کە تێیدا بەردەوامی بونیادە کۆمەڵایەتییە خێڵەکیو سیاسییەکان ئەگەری بەردەوامی هەیە، ئەم دیاردەیە دەبێت بەشێوەیەکی پێویست لەگەڵ بونیادی دەوڵەتدا بگونجێنرێت. دەتوانرێت ئەمە ئەنجامبدرێت لەڕێگەی پێشکەشکردنی هەنگاوگەلێکی ناوچەگەرێتی لەسیاسەتەکانی حکومەتدا کەبتوانێت وەك هێورکەرەوەیەك راژەبکات بۆ قەوارەگەلێکی خێڵەکی دیاریکراو کە سروشتێکی زێدە جەنگاوەریان هەیە. نەزمێکی بەم چەشنە رێگە بە پەرەسەندنی نێوخۆیی دامەزراوە کەلتووریيو سیاسییەکان دەداتو هانیدەدات کە بتوانن لەنێو ناوچە هەرێمییەکەی خۆیاندا هەڵسوڕێن لەگەڵ دەسەڵاتێك کە ئەرکە کارگێڕییە ساکارەکان تێپەڕێنێت جگە لە وەزیفەکانی سەروەریی. ئەم جۆرە حکومەتە هەرێمییە لەوانەیە وەك بنەمایەکی نێوەند لەنێوان فیدرالیزمو پێدانی دەسەڵات بەدەسەڵاتە ناوچەییەکان لەقەڵەم بدرێت، ئەم هەرێمانە یاخود حکومەتە هەرێمییانە دەبێت لەلایەن حکومەتی ناوەندییەوە پێکبهێنرێت. ئەوەی هەروەها دەسەڵات بۆ خۆی دەهێڵێتەوە تاکو ئەگەر پێویستی کرد بە بەڕێوەبردنی ئەو کاروبارانەدا رابگات. لەسایەی ئەم نەزمەدا پێویستە داواکارییە خێڵەکییەکان بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە مامەڵەیان لەتەکدا دەکرێت.

## ٨ . ٣ . کوردان لەعێراقی پاش سەدام دا

نەزمی کاتی ناتوانێت بەشێوەیەکی هەمیشەیی چارەسەری گرفتەکان بکات، هەروەك دامەزراندنی هەرێمە ئۆتۆنۆمەکەی ساڵی ۱۹۹۱ سەلماندوویەتی، بەڵام ئەم دۆخە هەنوکەییە لەعێراقو کوردستانی عێراق ناتوانرێت وەك کۆتا پێکهاتە لەقەڵەمبدرێت. دامەزراندنی ناوچە خودحوکمڕانەکەی لەوکاتەدا وەك چارەسەرێکی فرە کاتی بۆ ئەو رەوشە پشێوییەی دوای کۆتایی جەنگی کوەیت هاتەئارا. ئەمێستا پاش دەیەیەك، کوردانی عێراق لەحوکمدارێتی خۆیاندا بەیارمەتییەکی کەمی

نەتــەوە یــەکگرتووەکان بــەردەوامن. بــەڵام هێشــتا ئەمــە نابێــت بــە چارەســەر بــۆ گرفتێکی پایەدار لەعێراق بدرێتەقەڵەم.

پێدەچــێت کێشــەی کــورد لــەگرنگی سیاســی هەرێمییــدا بەشــێوەیەکی بــەهێزتر گەشەبکات، هەروەها لەوانەیە لەم سەدە نوێیەدا لەڕووی قەبارەوە کێبڕکێ لەگەڵ ململانێــی عــەرەب-ئیســرائیلدا بکــات. کاتێــك گــۆڕانی سیاســی لــەعێراق روودەدات، دەشێت کوردانی بێدەوڵەت بـەڵام خودحـوکمڕان رۆڵێکـی بنـەڕەتیو گـرنگن بگێـڕن. هەروەها گرنگە تێبینی رایەڵەی نێوان ئاوێکی زۆرو کوردان بکرێت - ئەو گرنگییـەی کە بەدەگمەن لەکەمبوونەوەدایە-. بەکارهێنانی سوریا بۆ کارتی پەکەکە لەو ترسەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەئاو بێبەشبکرێت، هەروەها تورکیا وەك بـەهێزترین یـاریزان لەسیاسەتە هەرێمییەکاندا هاتۆتە نێو سەدە نوێیەکەوە، بەتایبەت لەبـەرەی ئـاوەوە، زیـاتر بــەهۆی ســەرکەوتنی لەجڵــەوگرتنی چــالاکی جــەنگاوەرانی کــورد. ئەنکــەرە لەرێگەی ئەو زنجیرە بەنداوەی کە خەریکە تەواوبێت بەناوی پرۆژەی ئەتاتورکـەوەو بەرێکــەوت کەوتۆتــە بــاکووری کوردســتانەوە، کــۆنترۆڵێکی تــەواوی بــازاڕی ئــاوی لەرۆژهــەڵاتی ناوەڕاســتدا کــردووە، هاوشــێوەی دەســەڵاتی OPEC ئۆپێــك بەســەر بازاڕی نەوتدا لەساڵانی ١٩٧٠کاندا. بەڵکو، ئەمە فرە گرنگە، تورکیـا دەتوانێـت تـەنیا هەوڵ بۆ زەبتکردنــی ئاکاری سیاسی عــەرەب لەرێگەی وەستاندنی رێــڕەوی ئاوەکــە بەرەخوار گەربێتو کـوردان قـۆرت نەخەنـە بـەردەم هەڵمـەتی بنیاتنـانی بەسـتەکان. ئەوە بەچاکی کێشەی کورد دەبێـت کـە دیاریـدەکات داخـۆ تورکیـا لەدەیـەی یەکـەمی سـەدە نوێیەکـەدا بەبـەهێزی دەمێنێتـەوە یـان نـا، ئـەو کێشـە کوردییـەی کـە زیـاتر لەکوردستانی عێراقدا چەقی گرتووەو لەوێ پەرەیگرتووە.

ئــەو نائاراميیــەی بۆتــە تایبەتمەنــدی رەوشــە سیاســییەکە لــەباکووری عێراقــدا تاڕادەیــەکی زۆر زادەی ململانێــی دەســەڵاتی درێژخایــەنی نێــوان هــەردوو حیزبــە سیاســـییە کوردییـــە ســـەرەکییەکەی عێـــراقو دوژمنایـــەتی شەخســـی نێـــوان ســەرکردەکانیانە. هەرچــەندە، هەنوکــە لەوانــە نییــە بەردەوامییــەکی ئۆتۆمــاتیکی رابــردوو بێــتو ئاینــدەش پێویست نییــە کــە ئاوێنــەی هەنوکــە بێــت، لەوانەیــە زۆر

گەشبینی بێت واچاوەڕوانبین ئەم دووانە گرفتەکانیان لەئایندەی نزیکدا بەشێوەیەکی بنەڕەتی چارەسەربکەن. هەر لەو کاتەی کوردان لەپاش رێکەوتننامەی جەزائیر شکستیانهێناو قۆناغی سەردەمی مەلامستەفای ئەفسانەیی پێچرایەوە، ململانێیەکی نێوخۆیی بەردەوام لەنێوان رێبەرانی ئێستای کوردیدا لەئارادا بووە. ئەو پێگە ناوازەیەی سەرۆکی پێشووی پارتی هەیبوو،• نزیکەی سەبارەت بە بەدەستهێنانی یەکێتی لەنێوان کورداندا، تەنانەت لەودیو سنوورەکانی عێراقیشەوە لەو کاتەوە بووە ئامانجێکی کۆتایی هەر سەرکردەیەك.

رووداوەکانی سالآنی ١٩٩٠کان بەلگەی پێگەیشتوویی سەرکردایەتییەکانی کوردیان بەدەستەوە نەدا، هیچ کام لە مەسعود بارزانیو جەلال تالەبانی وەك دەولەتمەدار دەرنەکەوتن. لەبری ئەوەی پەرەسەندنەکان بەئاشکرا سەلماندیان کە بەرژەوەندییەکانی زلحیزبەکان خرابووە سەرو بەرژەوەندییەکانی "کوردستانی ئازاد" وەك قەوارەیەکی سیاسی. جارێکی تر تیۆری هاوسەنگی گشتگیر دەتوانرێت جێبەجێبکرێت، ئەوەی کە پێیوایە "پێویستە سەرۆکی دەولەت زیاتر لە خودی دەولەتەکە بۆ شرۆڤەکارییەکان بەکاربهێنرێ."[٤١٧] بارزانیو تالەبانی ئەگەری کردنی چ کارێکیان هەیە؟ پێدەچێت ماقوولْ نەبێت بڕوا بەوە بکرێت کە یەکێکیان

---

• لەڕاستیدا ئەم نیوەی دووەمی سالآنی ١٩٦٠کاندا گۆڕانێکی دراماتیکی بەرەو دووبەرەکیو ناکۆکی قوولْ بەخۆوەبینی، دابەشبوونی جوولآنەوە چەکدارییەکەی ئەیلول لەنێوان سەرۆکایەتیو مەکتەب سیاسی پارتی (هەردوو بالّی مەلاییو جەلالیی) هەلگیرسانی شەڕی نێوخۆی ئەو دووبالە نەك هەر یەکڕیزی جوولآنەوەکەی لەڕیشەوە هەلّوەشان بەلکو خودی جوولآنەوەکەشی خستەژێر پرسیار. هەروەك جەمیل مەردۆخی نووسیویەتی:" هەر لەسالّی ١٩٦٦ەوە  کە دووبەرەکیی تەواوی هێزی پێشمەرگەی داگرتبوو، لەهێزی قەرەداغ ئینقیلابێکی عەسکەریی روویدا، بەوەش ئیدی پێشمەرگایەتیی لە خەباتێکی نەتەوەیی چووەدەرو بووە جەنگێکی نێوخۆ، ئەوەی من شانازیم بە بەشداریکردن تێیدا نەکردو بڕیاری وازهێنانم دا، بەکورتی رۆژێکی زۆر تاریك و نادیار بوو، کەس متمانەی بەکەس نەمابوو، لەم لا پێشمەرگە ئەچوو بۆ ئەولاو لەولاوە ئەهات بۆ ئەملا، سەرگەردانییەکی بێشومار روویدابوو" بڕوانە: بیرەوەرییەکانی "جەمیل مەردۆخیی" سەبارەت بە قۆناغێکی گرنگی شۆڕشی کوردستان ،ئامادەکردنی : دکتۆر یاسین سەردەشتیی، هێشتا چاپ نەکراوە.

417 David (1991), P. 237.

بەتەواوی دەست لە کۆنترۆڵی ناوچەکەی خۆی هەڵبگرێت بەقازانجی تەواوی کوردستانی عێراق. دابەشبوونی ئێستاکەی ناوچەکە لەوانەیە بیسەلمێنێت ئەوەی چەسپاوە ئەوەیە کە ئەم ناوچەیە لەسایەی کارگێڕی کوردیداو لەئایندەی فیدراسیۆنێکی عێراقی-کوردیدا بۆ دوو ناوچەی نفوز بەدابەشکراوی دەمێنێتەوە.[٤١٨]
بەگوێرەی بنەمای خۆدیاریکردنی چارەنووس، کوردان شایستەی دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردستانن، بەڵام ئایا ئەمە تەنیا ئەلتەرناتیڤی چارەسەری کێشەی کوردە لەعێراق؟ ئەوانەی جەخت لەوە دەکەنەوە کە ئەمە لایەنگرییە لەهیواو ئارەزوویەك تاکو زیاتر بڕیارگیرییەکی ماقووڵو چەسپاو بێت. هێندێك پێدەچێت گەنگەشە لەوبارەیەوە بکەن کە مادامەکی دێوە کوردییەکە ئەمێستا سەری لەسەندوقەکە دەرهێناوە، سەربەخۆی سیاسی بۆتە شتێکی حەتمی، بەڵام ئەم هەڵسەنگاندنە ساکارە لەم شرۆڤەکارییەدا پەسەندنەکراوە. ئەوە شتێکی دروستە کە چیدی نەدەتوانرا تاماوەیەکی زۆر کوردان پشتگوێ بخرێن هەروەك ئەوەی پێش ساڵی ١٩٩١دا، بەڵام بژارەیەکی دیکە هەیە بۆ بەدەستهێنانی چارەسەرکردنی هەمیشەیی ئەم پرسە.

نەتەوایەتی سیاسی مشتومڕ لەوبارەیەوە دەکات کە تەنیا خەڵکە خودحوکمڕانەکان خەڵکانێکی ئازادن. هەندێك هەن پێشنیاز دەکەن کە ئەو هۆکارەی هانی کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی دەدات دەوڵەتی تایبەت بەخۆیان دابمەزرێنن بەشێوەیەکی سەرەکی لەبەر ئەو هۆیەیە کە ئەوان خوازیارن کاروباری خۆیان بەڕێوەبەرنو بێهودە وابەستە نەبن.[٤١٩] ئەوسا گریمانەکە ئەوەیە کە نەزمی فیدراڵی خواستو

---

٤١٨ بەگەڕانەوە لەساڵی ١٩٩٥دا دیڤید ماکدۆواڵ وتویەتی لەکاتێکدا هەریەك لە بارزانیو تاڵەبانی بەدوای باڵادەستیو هەژمونی خۆیان بوون :" تەنیا رێگە ئەوە بوو کە کوردستان هێندە گەورەیە کە بەشی هەردووکیان بکات، هەربۆیە ناوچەکەیان لەنێو خۆیاندا دابەشکرد. ئەمە هێشتا پێدەچێت ناوەرۆکی کەیسەکە بێت. بڕوانە:
The struggle for Kurdistan', ME!, No. 499, 28 April 1995, pp. 17-18.
419 As argued by, for instance, Charles Taylor in his 'Why Do Nations Have to Become States?' in Taylor, Charles (ed.) (1993), Reconciling the Solitudes. Essays on Canadian Federalism and Nationalism, Montreal: McGill-Queen's University Press, pp. 40-58.

پێویستییەکانی خودحوکمڕانی تێرناکاتو پێی راناگات، لەکاتێکدا تەنیا رێگایەك بۆ خودحوکمڕانییەکی رەسەن خۆی لەرێگەی سەربەخۆیدا دەبینێتەوە.[420] هەروەك پێشاندرا کاتێك گفتوگۆ لەبارەی هێزی بەجیهانیبوونی ئابووریو سیاسیو کاریگەرییەکانی کرا لەسەر دەوڵەت-نەتەوە، سەربەخۆی سیاسی زۆربەی کات ئایدیایەکی هەڵخەڵەتێنەرانەیە، ئایدیایەك کە ناتوانێت رەزامەندییەکی سیاسی بێنێتەکایەوە، هەروەك تایلۆر نووسیویەتی:" لەباشترینی هەموو جیهانەکان، نەتەوەگەلێك هەن کە پێویست ناکات کە دەوڵەت بن: هێشتا پێویستە خۆدیاریکردنی چارەنووس بژارەیەك بێت، بەڵام خولیای باڵا بریتییە لە یەکێتی بان نەتەوەیی." [421]

عێراق ئەو وڵاتەیە کە وەحشیانەترین شێوازی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کوردانی خۆیدا گرتۆتەبەر – کوردان لەسەرە رێگای خولیا پان عەرەبییەکانی سەدام حسێندا بوون بەرەو بابلی مەزن – مایەی گاڵتەجاڕییە کە عێراق ئەو دەوڵەتەش بووە کە ناوبەناو کوردان ئۆتۆنۆمییەکی دیارییکراویان تێیدا هەبووە. هەرچەندە، وێڕای ئەو گۆڕانکارییە بەرفراوانەی کە لەماوەی دوا دەیەدا روویانداوە، واپێدەچێت کە کوردانی عێراق لەسەرەتای ساڵانی ١٩٩٠کان زیاتر لەساڵانی ١٩٧٠کان ئازاد نەبووبن کە بڕیار لەئایندەیان بدەن. بەوهۆیەی کۆدەنگییەکی هەرێمی (یان نێودەوڵەتی) بۆ سەربەخۆیی کوردان نەبوو. لەو هەستگەلەوە کە پێگەو پەیوەندییان لەگەڵ بەغدادا بەشێوەیەکی بایەخدار نەگۆڕابوو، پێدەچێت کوردانی عێراق چ بژارەیەکی دیکەیان نەبێت، جگە لەوەی زوو یان درەنگ لەگەڵ حکومەتی ناوەندی بکەونە دانوسانەوە.

ئەگەر نەتەوەی کورد وڵاتێکی دەوێت کە لە باڵادەستیو زاڵبوونی عەرەب بیپارێزێت، نەزمێکی سیاسی کە ببێتە هۆی کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ناوەندی بەسەر ناوچە کوردییەکەدا، ئەو فەزا سیاسییە دەبەخشێتە کوردان بێئەوەی پێویست بکات داوای سەرەوەرییەکی سیاسی پەرگرانە بکەن. ئەمە بەتایبەتی

420 Taylor (1993), P. 44.
421 Ibid. p. 58.

بەلەبەرچاوگرتنی ئەو راستییەی کە جیهان فرە ئالۆز بووەو بزووتن بەرەو سەربەخۆیی بۆ تێرکردنی پێویستیو خواستەکانە".[٤٢٢]

ئەو پێکهاتە دەستکردەی عێراقی لێ پێکهاتووە، رەوشێکی هێنایەئارا کە گروپێکی نەتەوەیی لاوەکی وەك کوردان قەرزارباری ئینتیمای بەرژەوەندیگەلێك بن جگە لەبەرژەوەندی نیشتیمانی، لەوەدا شکستیانهێناوە کە ئیتنیمایان بۆدەوڵەت بێت، تاکەکان وەفاداری خۆیان بەگوێرەی هێڵە ئیتنی، ئاینیو خێڵەکییەکان دیاریدەکەن. لەکاتێکدا کە ئاستی سەرکوتکاری بەشێوەیەکی چەسپاو لەعێراقی ژێر سایەی بەعسدا زێدەبوو، هاوجووتبوون لەگەڵ نەتەوەی کورددا بەسەر ئینتیما بۆ عێراق زێدەتر بەهێزبوو. هەرچەندە، پێدەچێت رەگەزی عێراقی بۆ "کوردستانی ئازاد" شایەنی بینین بێتو سەربەخۆیی تەواو هەر لەسەرەتای دامەزراندنی قەوارە خودحوکمڕانەکەوە لایەنگریو پاڵپشتی لێ نەکراوە. عێراقێکی یەکگرتووە، بەلام ناناوەندگەرا، دەتوانرێت لەپاش سەدام حسێنەوە بپشکوێت. لەبری ئەوەی دەوڵەت بەرجەستەی گروپێکی دەسەڵاتبەدەستی نێو پایتەخت بکات، دەتوانێت بۆ قەوارەیەکی تێکەڵی هاوبەش گەشەبکات، کە کوردان نوێنەرایەتییەکی تەواو شیاوی خۆیانی تێدا ببیننەوە. لەکاتێکدا کە رژێمی ئێستای عێراق، بەهۆی سیاسەتەکانییەوە لەحاست ناوچە کوردییەکان بۆتە رژێمێکی ناشەرعی، ئەوە تەنیا لەسایەی پلانێکی ناناوەندگەرایی بەرچاوی دەسەڵاتی دەوڵەتەوەیە لەوانەیە کوردان دیسانەوە خۆیان لەژێر چەتری دەوڵەتی عێراقدا بگونجێننەوە. لەسایەی نەزمێکی فیدراڵیدا، کوردستان دەبێتە کوردیی وەك چۆن بەسرە عەرەبییە، بەڵکو هێشتا دوو نەتەوەکە دەبێت لەنێو یەك بونیادی سیاسی هاوبەشدا پێکەوە گرێبدرێن.

سەبارەت بەکورد، ریچارد فالك دەڵێت:" ئەوە روونە کە نەهامەتییەکان بەباشی دەریدەخات نەتەوەیەك بێ دەوڵەتێکی چەسپاو چ مەترسیو ئەگەری پەلامارێکی هەرێمی لەسەرە".[٤٢٣] بێ بەرووداوەستانەوەی ئەو راستییەی لەم دەربڕینەدا هەیە،

422 Rosenau (1995), p. 202.
423 Falk (1991), pp. 386-7.

**وێڕای ئەوەش هەستدەکرێت کە ئەگەر عێراقێکی فیدراڵی باش هەڵسوڕاو لەنێوان کوردو عەرەبدا بێتەئارا، گەلی کورد ترسێکی کەمتریان لەگەمەی هێزە جیۆپۆلیتیکییەکان دەبێت. پێویستە بڕە فەزایەکی سیاسی بۆ کوردان هەبێت تاکو ئەو ئەگەرانە بۆ دەربڕینی شوناسەکانیان ببیننەوە.**

**کوردانی عێراق لایەنگری لەفیدراڵییەکی دیموکراتی نێوان کوردو عەرەب دەکەن، هەروەك بەئاشکرا لە راگەیاندنی پێکهێنانی دەوڵەتێکی فیدراڵی کوردییدا لەساڵی ١٩٩٢دا هاتووە،[٤٢٤] کەنەك هەر چارەسەرێکی ریالستیو هەمیشەیی بۆ گرفتی کورد لەعێراق پێشکەش دەکات، بەڵکو پاراستنێکی یەکێتی وڵاتەکەش راژەدەکات. ئەم نەزمە فیدراڵییە کۆمەڵێك دامەزراوە بەکوردان دەبەخشێت کە وەك (هی خۆیان) ببینن، وەك سیمایەکی گرنگی بەشەرعیکردنی هەر چارەسەرێك. کوردستانی عێراق لەوە دەکەوێت ناوچەیەکی نەتەوەیی ناڕازی بێت، وێڕای ئەوەی خولیا سیاسییەکانی بەشێوازێکی گونجاو بەیەکتر دەگەن.**

**فیدراڵیزم سیستمێکی دەستووریی گشتییە، کە هەمان رادەی ئۆتۆنۆمی بەهەریەك لە یەکە فیدراڵییەکان دەبەخشێت. ئەو تەرزە حکومەتێکە کە بەرژەوەندییە جیاوازەکانی تێدا هاوساز دەکرێت، بونیادێکە بەئاشکرا لە دووبارەبوونەوەی زێدە ناوەندگەرایی سیستمی تاکلایەنە خۆی بەدوور دەگرێت، وێڕای ناناوەندگەرایی رەهاو لەیەکتردابڕانی کۆنفدراسیۆنەکان.[٤٢٥] ئەرکی سیستمی فیدراڵ لە فرەجۆری چێوە سیاسییە جیاوازەکانێتیو هەروەها گرنگە ئاماژە بۆ ئەوەش بکرێت کە وەك**

---

٤٢٤ لەسەرەتای ساڵانی ١٩٩٠کاندا، پرۆفیسۆر نوری تاڵەبانی رەشنووسی دەستوورێکی گشتکیری بۆ هەرێمی کوردستانی عێراق ئامادەکرد(ئەوەی لەئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٩٢دا لەلایەن پەرلەمانی هەڵبژێردراوە پەسەندکرا) بڕوانە:

Noun i Talabany (1999), The Kurdish View on the Constitutional Future of Iraq, London (publisher unknown).

٤٢٥ فیدراڵیزم دەبێت تەنیا لەبەشداری ئاسایی دەسەڵات یان هاوپەیمانی جیابکرێتەوە بڕوانە:

Arend Lijphart has written extensively on consociational democracy – see for instance Democracy in Plural Societies, (1977), London: Yale University Press.

لەهەر سیستمێکی حکومەتی دیکەدا، نەزمی فیدراڵ وەك كاڵایەك پێویستە بە باڵای رەوشێکی تایبەتی وڵاتێکدا ببڕێت، هەروەها وەختێك سەرکەوتوو دەبێت گەربێتو وەڵامدەری پێویستییەکانی ئەو خەڵکە بێت کە حوکمدەکرێن.
کوردان لەبانگەشەی خۆیاندا بۆ سیستمی فیدراڵ، پێویستیان بە هێزو دەسەڵاتە بۆئەوەی لەنێوان هەرێمە کوردییەکەو بەغدا هاوبەشی بێتەئارا. ئەمە بەمانای بوونی نوێنەرایەتی کورد لە حکومەتی ناوەندیداو پارلەمانی دیموکراتیکی هەڵبژێردراو (واتە بەشداری لەدەزگای جێبەجێکردن‌و یاسادانان‌دا)، ئەوەکەی دواییان کە پێویستی بەدوو ئەنجومەنە: یەکێکیان نوێنەرایەتی تەواوی عێراق بەگشتی دەکات‌و ئەوەکەی دیکەشیان بۆ دوو هەرێمە فیدراڵەکەی پێکهاتوون .
بونیادێکی فیدراڵی دیموکراتیکی بەم چەشنە، پێویستی بەوەیە باڵادەستی تاکە پارتێکی هەژمونگەرا کۆتایی بێت. بەپێشنیازکردنی فیدراڵیەتێك بۆ کوردو عەرەب لەبری پەسەندکردنی ئۆتۆنۆمییەکی ناوچەیی کە لەلایەن حکومەتێکی ناوەندییەوە پێیان بدرێت، کوردان بەدوای رێکەوتنێکی دوولایەنە لەنێوان دو لایەنی یەکسان‌و چوونیەك، ئەمەش دەسەڵات‌و ئاسایش بەکوردان دەبەخشێت، ئەوەی لەو یاسا ئۆتۆنۆمییەدا فەراهەم نابێت کەبەئاسانی دەتوانرێت رەتبکرێتەوە.[٤٢٦] پێویست بەوتن ناکات، سیستمێکی فیدراڵ لەنێوان کوردو عەرەب تەنیا لەعێراقی پاش سەدام ئیحتیمالی هەیە، ئەوەی پێویست بە لادانی رژێمەکەی سەدام حسێن دەکات — رژێمێك کە توانای قبووڵکردنی نەزمی دابەشکردنی دەسەڵاتی هەیە. تەنیا عێراقێك کە بەکردار بتوانێت شوناسێکی فرەرەنگی پەسەندبێت دەتوانێت بەتەواوی بەرووی پەرەسەندنی دیموکراتیدا بکرێتەوە. کەلتووری سیاسی پێویستە بگۆڕێت ئەگەر عێراقی نوێ بیەوێت لەئارامییەکەی بنەڕەتیدا بژی. کاتێك گروپێکی سیاسی بێبەش لەنێو سیستمەکەدا دەنگ بەدەستدەهێنێت، بەدەرچوون لەو سیستمە دەنگی

---

٤٢٦ ئەم دیدە کوردییە بۆ سیناریۆی فیدرالیزم لەلایەن پرۆفیسۆر نوری تاڵەبانییەوە لێکدراوەتەوە، لەندەن ١٩٩٩.

خۆی لەدەست دەدات.[427] ئەو عێراقە لەوانە نییە وەك قەوارەیەك بمێنێتەوە لەپاش لاچوونی سەدام حسێن لەسەر شانۆ سیاسییەکە، ئەمە ئارگومێنتێك بوو بەشێوەیەکی سەرەکی لەلایەن خودی سەرۆکی عێراقەوە پێشکەشدەکرا. دەشێت عێراق بەهێزتر لەهەر هێزێکی هەرێمی دیکە بمێنێتەوە.
لەسۆنگەی پێکهاتەی عێراق کە کوردی سونیو عەرەبی سونیو عەرەبی شیعەی لەخۆگرتووە، دەوڵەتێکی فیدراڵی ئایندەیی لەعێراق کەلێنی تێدەکەوێت، ئەوەی جێگیریی بە سیستمەکە دەبەخشێت. کەلێنە مەزهەبییەکە لەگەڵ کەلێنە ئیتنییەکەدا یەکتری دەبڕن، کە ڕێگری لەمانەوەی فاکتەری زۆرینە دەکات. لەراستیدا، " دژوارییە پۆتێنساڵەکان دەبێت ڕەتبکرێنەوە لەکاتێکدا بەم ڕێگەیە کەلێنە فەردییەکان لەم سیستمەدا تێناپەڕێنرێت".[428]
عێراق لەڕووی دەستوورییەوە دەوڵەتێکی فرە نەتەوەیە، بەلام فیدرالیزم لەوانەیە گرفتی ئیتنۆ-هەرێمی چارەسەربکاتو عێراق بکاتە دەوڵەتێکی فرە نەتەوەی ڕەسەن. کوردان وەك گروپێکی ئیتنۆنەتەوەیی ناتوانرێت لەگەڵ دەوڵەتی عێراقدا بناسێنرێن، وێڕای دانپێدانانیان لەڕووی دەستوورییەوە، ئەوان لەرێگای جووڵانەوە نەتەوەییەکەیانەوە پێشتر هەوڵی ڕێکخستنەوەی بونیادی دەوڵەتی وەختیان داوە. شوناسی فرەرەنگی کوردان هەروەها بەشێوەیەکی سروشتی لەنێو ئەم بونیادە نوێیەدا گەشەدەکات، هەروەها کاتێك ئەم سیما نوێیەی شوناس گەشە دەکات، کوردستان یەکەمجار لەنێوخۆی عێراق و پاشتر پێکەوە لەگەڵ عێراقدا جەخت لەخۆی دەکاتەوە.[429] هاوڵاتیانی عێراقێکی فیدراڵ دەتوانن هاوکات عێراقی، کوردی، خێڵەکییەکی کرمانجی بن بێئەوەی ببێتەهۆی پێکدژییەکی نێوخۆیی. نە زمانی کوردیو نە ئیتنیمای خێڵەکیو نە ئینیتمای ئاینی بنەمای داواکاری سیاسی بۆ

427 See Albert Hirschman's classic Exit, Voice and Loyalty (1970), Cambridge, Mass.: Harvard University Press.
428 Khashman (1999), p. 91.
429 With reference to Yael Tamir's discussion (1993) regarding Israel and Palestine

کوردانی عێراق پێکدەهێنێت، بەڵام ئەوانە بەگرنگیو بایەخداری دەمێننەوە. ئەم داوا زمانییە سیاسییانە دەتوانرێت لەگەڵ بونیادێکی فیدراڵیدا بگونجێنرێت.

هەرچەندە، پێویستە تێبینییەکی وریاکردنەوە زێدەبکرێت. هەروەك ئەوەی نیشانەی پرسیار لەسەر پایەداری دەوڵەتی کوردیی سەربەخۆ دادەنرێت، ئەوەش روون نییە کە قەوارەیەکی فیدراڵی کوردیی چەندە دەتوانێت خۆی بەڕێوەبەرێت، وێڕای ئەو راستییەی "کوردستانی ئازاد" بۆماوەی زیاتر لەدەیەك بێ دەستێوەردانی بەغدا خۆی بەرێوەبردوە. ئایا دەرفەتێك هەیە پارێزگاکان خۆی وەك ناوچەیەکی رزگارکراو رابگەیەنێتو بانگەشەی سەربەخۆیی بکات؟ ئایا سەرکردایەتی هەرێمە کوردییەکە دەتوانێت بەرپرسیارێتی تەواوی سیاسەتی بەرگریو دەرەکی رادەستی حکومەتی ناوەندی بکاتەوەو ئەو حەزەی بۆ پێکهێنانی سیاسەتێکی سەربەخۆ رابگرێت بۆنموونە سەبارەت بەپەیوەندی بەو ناوچە کوردییانەی بەدرێژایی سنوورەکانی باکوورو رۆژهەڵات هەن؟ ئەمە دەشێت دژواریی بێنێتەئارا.

دامەزراندنی "عێراقی نوێ" لەپرۆسەیەکدا کە چاوەڕێی ئەوە ناکرێت سنوورەکانی پاش یەکەمین جەنگی جیهانی بگۆڕێت، ئەوەی هەروەها قازانجێکی بنەڕەتیش بۆ هاوسێکانی دێنێتەئارا. بۆ نموونە، بارگرانی ئابووری تورکیا کەمدەبێتەوە، هەروەها هەوڵەکان بۆ بەهێزکردنی ناوچەی دژەفڕین بەرەو گەشەکردنی ئابووریو وەبەرهێنان لەبنیاتنانەوەی عێراقدا ئاراستەدەکرێتەوە، گەشەکردنی بازرگانیو ژێرخانی کشتوکاڵی لەم هەرێمانە، هەروەها زامنکردنی دەستپێڕاگەیشتنی سەرچاوەکانی وزە. لەراستیدا کوردستان لەهەردوو رووی سنووری عێراقی-تورکی لەپێکهێنانی هەرێمێکی پێکەوەنزیك دەتوانرێت گەشەبکات بۆ زۆنێکی بەو چەشنە، بازرگانی، کەلتوورو گواستنەوە نزیکەی هەرێمەکە پێکەوە پەیوەست بکات. گەشەکردنێکی بەم چەشنە دەتوانێت بەشداری بکات لەوەی پێگەی سیاسی کورد بەدرێژایی ئەمبەراوبەری سنووور یەکسانتر بێت.

عێراقێکی فیدراڵ لەنێوان عەرەبو کورد پێویست نییە یۆتۆپیا بێت. وێڕای هەموو شت، " ململانێ لەعێراقدا لەنێوان کەلتووری نەتەوایەتییەکاندا نییە، گرفتەکە

لـەنێوان حكومـەتی ناوەنـدیو خەڵكدایـە."[٤٣٠] لەوەدەچـێت عێـراق لەسـەر شـانۆی هەرێمی دەركەوێتەوەو جەخت لەدەسەڵاتی خۆی بكاتـەوە، بـەڵام لەشـكڵێكی نـوێدا، لەفیدراڵییەتێكـدا كـە لـەكوردو عـەرەب پێكبێـت. لـەدەی داهـاتوو یـان دوو دەیـەی دیكـەدا، "عێراقـی نـوێ" لەوانەیـە بـە قەوارەیـەكی بـەرفراوانترەوە گرێبـدرێت، رۆژهــەڵاتێكی ناوەڕاســتی بەشــۆڕش دیمــوكراتیزەكراو كــە بــۆ چــەند تــۆڕێكی جۆربەجۆری حكومەتە هەرێمیو ناوچەیی وەردەگێڕرێت، لەگەڵ رێكخراو و كۆمەڵە مەدەنییەكان، ئەوەی ئاسۆی پەیوەندییـەكان لەسەراسـەری هەرێمەكـەدا دووبەرابـەر دەكات، بەڵام لەگەڵ سیستمی دەوڵەت-نەتەوە لەشوێنی گونجاوی خۆی.

430 Dr. Rashid, London, 1999.

Bibliography


Abdulghani, Jasim M. (1984), Iraq and Iran: The Years of Crisis, Sydney London: Croom Helm.

- Ahmad, A. (for the Kurdistan Medical Association in Sweden) (1989), Facts about Kurdish Refugees from Iraq in Turkey, Stockholm (publisher unknown).

- Allawi, Ali (1994), 'Federalism' in Hazelton, Fran (ed.), Iraq since the Gulf War: Prospects for Democracy, London: Zed Books, pp. 211-222.

- Amin, Samir (1980), Class and Nation. Historically and in the Current Crisis, London: Heinemann Educational Books Ltd.

- Aminzadeh, Mohsen (1999), 'New Regional Geopolitical Developments and the National Security of the Islamic Republic of Iran' (a round-table discussion) in Discourse: An Iranian Quarterly, Vol. 1, No. 1, pp. 5-48.

- Anderson, Benedict (1991) [1983], Imagined Communities. Reflections on the Origin and Spread of Nationalism, London: Verso.

- Andreopoulos, George (ed.) (1994), Genocide: Conceptual and Historical Dimensions, Philadelphia: University of Philadelphia Press.

- Armstrong, John A. (1982), Nations before Nationalism, USA: The University of North Carolina Press.

- Ayubi, Nazih N. (1995), Over-stating the Arab State: Politics and Society in the Middle East, London: I.B. Tauris.

- Bani Sadr, Abol Hassan (1991), My Turn to Speak: Iran, the Revolution and Secret Deals with the US., London: Brassey's.

- Banton, M. (1983), Racial and Ethnic Competition, Cambridge: Cambridge University Press.

- Baram, Amatzia (1997), `Neo-tribalism in Iraq: Saddam Hussein's Tribal Policies 1991-96', International Journal of Middle East Studies, Vol. 29, pp. 1- 31.

- Barker, Colin (1978), 'A note on the Theory of the Capitalist State', Capital and Class, Vol. 4, pp. 118-26.

- Barker, Ernest (1927), National characters and Factors in Its Formation, London: Methuen. 320.

- Barnard, F. (1965), Herder's Social and Political Thought, Oxford: Clarendon Press. (ed.) (1969), 1G Herder on Social and Political Culture, Cambridge: Cambridge University Press.

- Bartlett, Robert (1996), 'Language and Ethnicity in Medieval Europe' in Hutchinson, John and Smith Anthony D. (eds.), Ethnicity, Oxford: Oxford University Press, pp. 127-132.

- Batatu, Hanna (1978), The Old Social Classes and the Revolutionary Movements of Iraq. A Study of Iraq's Old Landed and Commercial Classes and of its Communists, Ba'thists, and Free Officers, Princeton NJ: Princeton University Press.

- Bauer, Otto (1978), 'The concept of the nation', and 'Socialism and the principle of nationality' in Bottomore, Tom and Goode, Patrick (eds.), Austro Marxism, Oxford; Clarendon Press.

- Bauman, Zygmunt (1989), Modernity and the Holocaust, New York: Cornell University Press.

- Beaudin-Saeedpour, Vera (1992), 'Establishing State Motives for Genocide: Iraq and the Kurds' in Fein, Helen (ed.), Genocide Watch, New Haven: Yale University Press, pp. 59 69.

- Beck, Lois (1980), 'Tribe and State in Revolutionary Iran: The Return of the Qashqa'i Khans', Iranian Studies, Vol. XIII, Nos. 1-4, pp. 215-255.

- Berki, R and Hayward, Jack (1986), State, Class, Nation, Hull: Hull University Press.

- Berridge, Geoff (1987), International Politics. States, Power and Conflict since 1945, New York: St. Martin's Press.

- Billig, Michael (1995), Banal Nationalism, London: Sage Publications.

- Birch, Anthony H. (1978), 'Minority nationalist movements and theories of

political integration', World Politics, Vol. 30, No. 2, pp. 325-344.

- Blau, Joyce (1992), 'The Kurdish Language and Literature in International Paris Conference 14-15 October 1989; The Kurds: Human Rights and Cultural Identity, Paris: Kurdish Institute of Paris, pp. 47-52.

- Bondi, Liz (1993), 'Locating identity politics' in Keith, Michael and Pile, Steve (eds.), Place and the Politics of Identity, London: Routledge, pp. 84-101.

- Bozarslan, Hamid (1998), 'Minority Nationalism and Political Islam: the Kurdish Case': paper presented at the Kurdological Conference Between Imagination & Denial. Kurds as subjects and objects of political and social processes, May 29-31, Berlin.

- Brass, Paul (1991), Ethnicity and Nationalism. Theory and Comparison, London: Sage Publications.

- Bretherton and Vogler (1999), The European Union as a Global Actor, London: Routledge.

- Breuilly, John (1982), Nationalism and the State, Manchester: Manchester University Press.

- Bromley, Y. V. (1984), Theoretical Ethnography, Moscow: Nauka Publishers. van Bruinessen, Martin (1982), 'Popular Islam, Kurdish nationalism and rural revolt: the rebellion of Shaikh Said in Turkey (1925)' in Bak, Janos M and

- Benecke, Gerhard (eds.), Religion and rural revolt, Manchester: Manchester University Press, pp. 281-295.

(1983), 'Kurdish Tribes and the State of Iran: The Case of Simko's Revolt' in Tapper, Richard (ed.) The Conflict between Tribe and State in Iran and Afghanistan, New York: St. Martin's Press, pp. 364-400.

(1986), 'The Kurds Between Iran and Iraq', Middle East Report, No. 141, July/August, pp. 14-27.

(1992a), 'Traditional Kurdish Society and the State', in International Paris Conference 14-15 October 1989; The Kurds: Human Rights and Cultural

